# ئەشکەنجەو زیندان

## پێشمەرگەیەک، بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیرکەردا

گفتوگۆ لەگەڵ
ماموستا عەلی باپیر،
ئەمیری
کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان

# ئەشکەنجە و زیندان

پێشمەرگەیەک، بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیرکەردا

گفتوگۆ لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیر،

ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان

www.alibapir.net

له بڵاوكراوه‌كانی رۆژنامه‌ی كۆمه‌ڵ

ژماره (٥)

# ئه‌شكه‌نجه و زیندان

## پێشمه‌رگه‌یه‌ك، بیست و دوو مانگ له زیندانی داگیركه‌ردا

## گفتوگۆ له‌گه‌ڵ مامۆستا عه‌لی باپیر، ئه‌میری كۆمه‌ڵی ئیسلامیی كوردستان

ئاماده‌كردنی:

هاوژین عومه‌ر

چاپی دووه‌م

١٤٢٧ی كۆچی - ٢٠٠٦ی زاینی




# ئەشكەنجە و زیندان

## پێشمەرگەیەك، بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیرکەردا

## گفتوگۆ لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیر، ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان

* ئامادەکردنی: هاوژین عومەر hawzheenk@yahoo.com
* لە بڵاوکراوەکانی رۆژنامەی کۆمەڵ، ژمارە (٥).
* ژمارەی سپاردن: (٣٣٣)ی ساڵی ٢٠٠٦ی وەزارەتی رۆشنبیری.
* چاپی دووەم، سلێمانی ٢٠٠٦.
* تیراژ: ٣٠٠٠ دانە.
* چاپخانەی چوارچرا.
* تایپ: زەکەریا عەبدوڵڵا
* نەخشەسازیی بەرگ: هاوژین عومەر.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي
كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ الْجَاهِلِينَ، فَاسْتَجَابَ لَهُ رَبُّهُ
فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ

(يوسف: ٣٣ - ٣٤).

## ئەم بەرهەمە پێشکەشە:

ـ بە هەموو ئەوانەی، گەر بۆ تەنها ساتێکیش بێت، بە ناهەق زیندانیی کراون و ئەشکەنجە دراون.

ـ بە هەموو ئەوانەی، بە شێوەیەکی دروست، قەڵغانێکی پتەو بوون لە بەرانبەر پرۆژە ستەمکاریی و داگیرکارییەکاندا.

## سوپاس و پێزانین

ـ بۆ برای ڕۆژنامەنووس عومەر عەبدوڵڵا گوڵپی، کە لە هەموو گفتوگۆکاندا، لەسلێمانی و لە هەولێر، لەگەڵم ئامادە بوو بە چەند پرسیارێك گفتوگۆکانی دەوڵەمەندتر کرد.

ـ بۆ برای ڕۆژنامەنووس کەمال حەمە سەرگەڵوویی، کە لە زۆربەی گفتوگۆکاندا، لە سلێمانی و لە هەولێر، لەگەڵم ئامادە بوو هاوکاریی زۆری کردم، بەتایبەت لە وێنەگرتنی گفتوگۆکاندا.

- بۆ برایان مافناس زانا سەعید ڕۆستایی، ڕێدار ئەحمەد.

ـ بۆ ستۆدیۆ و برایانی ژووری کۆنترۆڵی هەردوو کەناڵی سلێمانی و هەولێری تەلەفزیۆنی کۆمەڵ، کە کاری تۆمارکردنی هەر دوانزە سەعاتەکەی ئەم زنجیرە گفتوگۆیەیان لە ئەستۆ گرت.

- بۆ برایان سەلاح سالار، موحەممەد جەمال و عیرفان عوسمان، کە کاری خستنە سەر کاغەزی زۆربەی تەوەرەکانی ئەم زنجیرە گفتوگۆیەیان لە ئەستۆ گرت.



# پێڕست




# پێشەکی

ئێوارەی رۆژی پێنجشـەممە ٢٠٠٣/٧/١٠، کاتێك بە تەواوی بۆم یەکلایی بوویەوە کە مامۆستا عەلی باپیر ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان و هاوەڵانی، لە میانەی بانگهێشتکردنەکەیاندا بۆ کۆبوونەوەیەك لەگەڵ ژمارەیەك بەرپرسی سەربازیی هێزەکانی ئەمریکا، لە ئوتێل ئاشوور لە هاوینەهەواری دوکان، لەسەر رێگەی سلێمانی ـ دوکان و لە گوندی (قەمچوغە)، لە لایەن هێزێکی سەربازیی زۆری ئەمریکییەکانەوە دەستگیرکراون‌و بۆ شوێنێکی نادیار رفێندراون، راستەخۆ خەمێکی زۆر بەرۆکی گرتم.

ئەو خەمە زۆرەی من، بە تەنها لەبەر ئەوە نەبوو کە من رێکخەری ئەو سەردانییە بووم و ئەمریکییەکان، بۆ دانانی وادە و شوێنی کۆبوونەوەکە بە تەلەفۆن لەگەڵ من قسەیان کرد، پاشان منیش داواکەیانم گەیاندە خودی مامۆستا عەلی باپیر و برایانی سەرکردایەتیی کۆمەڵ و ئەوانیش، پاش تاووتوێکردنی، رەزامەندییان لەسەر نیشان دا. ئەو خەمەی من تەنها بەو هۆیەشەوە نەبوو کە جیا لە زۆر کەسیتر، لە حاڵەتی دروستبوونی هەر کێشەیەك، یان لە حاڵەتی تووشبوونی هەر مسوڵمانێك بە کێشەیەك،

ناڕەحەتییەك، دەستگیرکردن یان ئازاردانێك، جا لە هەر رووبەرێکی ئەم دنیایەدا بێت، من دڵەڕاوکێی زیاتر تووشم دەبێت و بەردەوام لە خەمیدا دەبم، گەر بە بیرکردنەوە و دوعای خێریش بێت. بەڵکو خەمی گەورەی ئەمجارە، بەو هۆیەوە بوو کە رووداوی دەستگیرکرانەکە، زۆر ئاماژە و مانا و مەدلوولی تری هەبوو، زۆر ستەم و ناعەدالەتیی و بێڕێزییکردن بەرانبەر مرۆڤ و مافەکانی، هەروەها عورف و یاسا نێودەوڵەتییەکانیشی بیر خستمەوە، کە هەریەکەیان لەوی تریان بە ئێشتر بوو نەك بە تەنها دەروون و روحی منیان ئازار دەدا، بەڵکو روحی هەر کەسێکی تریشیان ئازار دەدا کە پێی وایە مرۆڤ دەبێت وەکو مرۆڤ و مرۆڤانە مامەڵە و رەفتاری لە تەکدا بکرێت.

ئەم رووداوی دەستگیرکران و رفاندنە، خاڵێکی دەستپێکی زۆر گرنگ بوو بۆ ئەوەی لە کوردستانیش، وەك هەر ناوچە و وڵاتێکی ئازادیخواز و مرۆڤدۆستی دنیا، قسەکردنی جددی بە شێوەیەکی بەربڵاو لەسەر بەرنامە و پرۆژە ئیمپریالیستییەکانی ئەمریکا لە عیراق و کوردستان و، پاشانیش ناوچەکە و جیهان دەست پێ بکات، پرسیار بکرێت تا چەند ئەمریکا باوەڕی بەو "هاوپەیمانێتی"یە هەیە کە سەرانی کورد زوو زوو باسی لێوە دەکەن؟ یان تا چەندێك ئەمریکا مەبەستێتی لە خزمەت گێڕانەوەی مافەڕەواکانی گەلی کورددا بێت کە دەیان ساڵە لە لایەن رژێمە یەك لەدوا یەکەکانی عیراقەوە لێی زەوت دەکرێت؟ یان لانیکەم هەڵوێست و بەرنامەی راشکاوانەی ئەمریکا لە بەرانبەر گێڕانەوەی کەرکووك و ناوچە رزگارکراوەکانی تردا بخرایەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە و هەڵوێست لێوەر گرتن. پاشانیش و لە دوای هەموو ئەوانەوە، قسە لەو قەتڵوعام و بێڕێزییە زۆرانە بکرایە کە ئەمریکا لە عیراق و ئەفغانستان و هەروەها لە زیندانەکانی "گوانتانامۆ" و "باگرام" و "ئەبوغرێب"دا بە شێوەیەکی نەخشەبۆدارێژراو ئەنجامیان دەدا.

هەروەها دەکرا ئەم رووداوە رەهەندێکی هەرێمی و نێودەوڵەتییانەی وەر بگرتایە، چونکە تەنها وابەستە نەبوو بە کەسێك، یان کەسانێك لەنێو لایەنێکی ئیسلامییدا، تا لە ئاستی گەورەیی و قەبارەی ئەو لایەنەدا مامەڵەی لە تەکدا بکرێت، بەڵکو ئەم رووداوە هیچی کەمتر نەبوو لەو رووداو و فەزیحەتانەی لە سەرانسەری دنیادا ئاشکرا دەبن و سەدا دەدەنەوەو لەسەر دەستی پیاوانی سەربازی، سیاسی، دبلۆماسی و

هەواڵگریی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی روو دەدەن. لەم رووداوەدا بێڕێزیی بەرانبەر کەسێکی ئیسلامیی نەکرا، هێندەی ئەوەی بێڕێزی بوو بەرانبەر هەموو تاکێکی کورد و لەسەروو هەمووشیانەوە دەسەڵاتی کوردی، کە لەنێو سنووری دەسەڵاتی ئەودا، وەها کارێك ئەنجام درا.

بەڵام بە داخەوە، هیچ یەکێك لەوانە نەکران، رووداوەکەش تەنها رەهەندێکی ناوخۆیی وەرگرت و تا ئەو رۆژەی هەموو برایانیش ئازاد کران، هەروا مایەوە، بگرە ئازادبوونەکەش بە هەمان شێوەی دەستگیرکردنەکە چوو، سەداکەی تەنها لەسەر ئاستی ناوخۆ بوو.

بۆ ئەمەش، بە لای منەوە چەند خاڵێکی سەرەکی هەبوون:

**یەکەم:** پێموایە هیچ یەکێك لە دەسەڵاتداران و سەرکردەکانی کورد، لە لایەك بە هۆی تێڕوانینی سیاسییانەی خۆیان و لە لایەکی تریش بە هۆی ئەوەی خۆشیان و دەسەڵات و ئیدارەکانیان لە بازنەی بەرژەوەندی و پرۆژەکانی ئەمریکادا توابوونەوە، ئامادە نەبوون وەها کارێك بکەن کە ئەمریکا لە خۆیان بڕەنجێنن.

بە داخەوە، دەسەڵاتدارنی کورد، بە راگەیاندن و ئەندام و کادر و دامودەزگاکانیانەوە، عەشقی ئەمریکا هێندە کوێری کردبوون کە نەیان دەتوانی بە بێلایانانە، بگرە بە ئینسافانە تەغتییەی هەواڵ و پەرەسەندن و چالاکییەکانی تایبەت بە رووداوەکە بکەن، بگرە زۆرجاران دەبوونە مایەی فشاری زیاتر لەسەر کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان.

**دووەم:** ئەوا هەرچی سەرکردایەتیی کۆمەڵی ئیسلامییشە، جگە لەو فشارە سیاسی و ئەمنی و داراییەی خرابوویە سەریان و تا رادەیەك شەکەت و سەرقاڵی کردبوون، هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا کە جار هەبووە بەشێکی زۆریان دەربەدەر و ئاوارە بوون، یان لە زیندانی ئەمریکادا خۆیان دەبینییەوە، بەڵام بە هۆی کەمئەزموونی و کەمتوانایی لەو بوارەدا، نەیانتوانی ئەو کارە گرنگە بکەن، تا لە بەرانبەردا ئەوان لە رێگەی بەجیهانناساندنی ئەو ستەمە گەورەیەوە، فشاریان بخستایەتە سەر دەسەڵاتی ئەمریکا لە عیراق و ناچاری ئازادکردنی ئەو بەڕێزانەیان بکەن.

سـەرەڕای هەمـوو ئەوانـەش، ناکرێت ئێمە چاو لەو ڕاستییە بنووقێنین کە هەر ئەو سـەرکردایەتییە (لەگـەڵ کۆمەڵێك کادری ماندووبینەناس)، لە هەوڵی شەو و ڕۆژدا بوون بۆ پارێزگارییکـردن لـە کۆمەڵـی ئیسـلامیی و دەرهێنانـی لـەو بـارە ناهەمـوارەی تێـی کەوتـبوو، یـان بـۆی دروسـت کـرابوو، بارێـك کـە هەمـوو لایەنەکانی ئابووریی و دارایی، سیاسـی، ئەمنـی و ڕاگەیاندنـی گـرتبۆوە و تـا ڕاددەیـەك هەوڵ و تواناکانیان سنووردار کـردبوو. بـۆ نموونە: نـزیکەی یـەك سـاڵ هـیچ بـودجەیەك (کـە دەبوو بدرایە) نەدرا بە کۆمەڵـی ئیسـلامیی، ئەمـە لەگـەڵ دەسـتگیرکردن و ڕاوەدوونانـی بـەردەوام و بگـرە تیرۆرکردنـی بەشێك لە ئەندامەکانی، سەرەنجامیش (بە پشتیوانیی خوای پەروەردگار و پاشـانیش مسوڵمانانی کوردسـتان) توانیـیان ئەو کۆمەڵە، بە بێ دەستهەڵگرتن لە هیچ یەکـێك لـەو بنەمایانەی لە پێناویدا دروستبووە، پارێزگاریی لێ بکەن، تا دواتر و بەهۆی بەشـدارییکردن لـە هەڵبژاردنەکاندا، کۆمەڵـی ئیسـلامیی بوونـی خۆی سەلماند و توانی ئەو ئابڵووقەیە بشکێنێت کە بە ناهەق لەسەری دانرابوو.

**سێیەم:** ئەمە لەگەڵ ئەوەی نابێت چاو لەو ڕاستییە دابخەین کە دامودەزگا ئیعلامی و کەناڵـە ئاسمانیـیە عەرەبیـیەکان، بـە ئەهلـی و ئازادەکانیشـیانەوە، نـیو هێـندەی ڕووداوی دەسـتگیرکردن یان تیرۆرکردنی کەسایەتییەکی عەرەبیی گچکە، جا ئیسلامیی بێت یان نا، ئاماژە و گرنگییان بە ڕووداو و کارەساتی دەستگیرکرانی ئەو برایانە نەدا، کە هەندێکیان لە زۆر کەسایەتیی عەرەبی ناوبانگیان زیاتر بوو. بێگومان تاووتوێکردنی ڕووداوگەلێکـی لـەو شـێوەیە لـەو کەناڵانـەوە، دەبـووە خاڵێکـی گـرنگ بـۆ ناسـاندنی ڕووداوەکـە بـە هەمـوو جیهان و کـەس و دەزگـا و لایەنـە پەیـوەندیدارەکان و بەمـەش فشارێکی نەوعی لەسەر دەسەڵاتی ئەمریکا لە عێراق دروست دەبوو.

**چوارەم:** سەبارەت بە نووسەران و ڕووناکبیرانی کوردیش، زۆرینەی زۆریان بە سەر لایـەن و حـزبە سیاسییەکاندا دابەش بوون و ڕایان هەمان ڕای بەرپرسە سیاسییەکانیان بـوو، هـەر وەکـو ئەوانـیش بـیر دەکەنـەوە و گفتوگۆ دەکـەن. تەنها ژمارەیەکی کەم و دیاریکـراویان نەبـێت، هەڵوێسـتی دیـار و مەردانـەیان نەبـوو، ئەمـە لەگـەڵ چـەند ڕووناکبیرێکـی دیاری سەربەخۆ، کە لە نووسینەکانیاندا ئاماژەیان بەو کارە بەربەرییەی

ئەمریکا کرد. بەڵام هەموو ئەو دەربڕین و نووسینانەش نەیانتوانی لە دەرەوەی سنووری کوردستان دەنگدانەوە دروست بکەن.

لەگەڵ ئەو هەوڵە سنووردارانەی بۆ بەرگرییکردن لە مامۆستا عەلی باپیر و هاوەڵانی دران و وەکو پێویست نەبوون، ئێمە دەبێت لێرەدا ئاماژە بەو ڕۆڵە گرنگ و مەزنەی جەماوەری مسوڵمانی کورد لە سەرانسەری کوردستاندا (بگرە لە هەندێك وڵاتی ئەورووپیشدا) بە گشتی و ئەندامانی کۆمەڵی ئیسلامیی بە تایبەت بکەین کە لە ماوەی زیندانییکرانی ئەو بەڕێزانەدا پێی هەستان، ئەوانیش لە هەر یەك لەم چالاکییانەی خوارەوەدا خۆیان دەبینییەوە:

* ڕێپێوانی جەماوەری شاری سلێمانی و دەوروبەری کە بە پەنجا هەزار کەس مەزەندە دەکرا.

* ڕێپێوانی جەماوەری شاری هەولێر کە بە نزیکەی ١٥-٢٠ هەزار کەس مەزەندە دەکرا.

* هەروەها ڕێپێوانێکیش لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا کە لە لایەن ڕەهەندی کوردیی ئەو شارە و ئەندامانی کۆمەڵی ئیسلامییەوە ساز کرا و بە دەیان کەس تیایدا ئامادەبوون.

* کۆکردنەوەی هەزاران ئیمزا لە نێو سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگەی کوردستاندا، لە میانەی هەڵمەتێکی ئیمزاکۆکردنەوەدا.

* سازدانی کۆنگرەیەك لە شاری سلێمانی بە ناونیشانی (کۆنگرەی پشتیوانیی لە ئازادبوونی مامۆستا عەلی باپیر)، کە تیایدا ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتیی حزبی، ڕووناکبیریی و کۆمەڵایەتیی و زانایانی ئاینیی ئامادەبوون و تیایدا بەلاغی کۆتایی ئامادە کرا و ئاڕاستەی دامودەزگا بەرپرسەکان کرا.

وەکو ئەوەی ئەو کارە پێویستانە (ی لە هەر چوار خاڵەکەی سەرەوەدا ئاماژەمان پێدان) لە کات و شوێنی خۆیاندا نەکران تا ڕووداوی دەستگیرکردنەکە بکرێتە ڕووداوێکی هەرێمی و نێودەوڵەتی، بێگومان ئەم کتێبەش ناتوانێت قەرەبووی ئەو هەموو کەموکوڕی و کەمتەرخەمییانە بکاتەوە و بتوانێت دنیا لەو ڕووداوە پڕ بکات، یان دوای چەندین مانگ لە ئازادبوونی کەسی دیاری ڕووداوەکە لە زیندان، بتوانێت

داوای ڕەددی ئیعتیباری بۆ بکات. بەڵکو ئەم کتێبە، لە لایەك هەوڵێکی سنووردارە بۆ ئاشکراکردنی ئەو ڕاستییانەی دەکرا پێشتر باسیان لێوە کرابا، لە لایەکی تریش باسکردنی درێژەی بەسەرهاتی بیست و دوو مانگ زیندانییکردنی مامۆستا عەلی باپیرە لە زاری خۆیەوە، نەك لێکۆڵینەوە لە ڕەفتار و مامەڵەی دژەمرۆڤی و دژەئەخلاقی و دژەویژدانانەی هێزەکانی ئەمریکا لە تەواوی جیهاندا، دەکرێت لێکۆڵینەوە لەو سلوك و ڕەفتارە بەربەری و دژەمرۆڤانانەی ئەمریکا و هاوپەیمانانی، لە دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە دەست پێ بکات، ئەم کتێبە دەکرێت بکرێتە یەکێك لەو سەرچاوانەی پێویستە بۆ ئەو مەبەستە بەکار بهێنرێن، بگرە پێم وانییە هیچیشی کەمتر بێت، لە رووی زانیارییەوە، لەو سەرچاوانەی لەسەر زیندانەکانی وەکو "گوانتانامۆ"، "باگرام"، "ئەبوغرێب" و زیندانەکانی تر دەنووسرێن، چونکە ئەو عەقڵیەتەی لە "گوانتانامۆ" ڕەفتاری بەربەرییانە دەنوێنێت، هەر ئەو عەقڵیەتەیە کە لە "باگرام"، "ئەبوغرێب"، "کرۆپەر" و زیندانە نهێنییەکانی هەوالگریی ئەمریکا لە بەشێك لە وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات و وڵاتانی عەرەبی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش ڕەفتار دەکات.

بە هەرحاڵ، ئێمە لەم پێشەکییە کورتەدا ناتوانین لە بارەی هەموو ئەو خاڵانەوە بنووسین کە دەبوو بکرابانایە و کەچی نەکران، بەڵام بەو هۆیەی ئەمڕۆ باسکردن لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە تاکی و کۆمەڵییەکانی مرۆڤ بووەتە کارێکی جیهانیی و وەکو سەدەی ڕابردوو لە کارێکی نیشتمانیی بەرتەسکدا نەماوە، هەروەها وەکو سەدەی ڕابردوو لە لای ژمارەیەکی کەم لە بیریارانی ریفۆرمخواز قەتیس نەماوە و قسەکردن لەو مافانە و چاودێرییکردنیان لە مەیدانی پرنسیپ و بنەما ئەخلاقی و تیۆرە فەلسەفی و ئایدیۆلۆجییە سیاسی ـ کۆمەڵایەتییەکانەوە گوازراوەتەوە بۆ مەیدانی مومارەسەی واقعیانە لە لایەن تاك و کۆمەڵەکانەوە[1]، بەو هۆیەوە دەکرێت کەمێك شیکاری عەقڵیەت و بیرکردنەوەی کەسی ئەمریکی بکەین. پاشانیش بپرسین" ئاخۆ دەبێ چی

---

[1] خوێندنەوەیەك بۆ کتێبی: (حقوق الانسان.. الرؤى العالمية والاسلامية والعربية) لە ماڵپەڕی "ئەلجەزیرە نێت"دا.

بکرێت بۆ ئەوەی بەر لەو بێڕێزییانە بگیرێت کە ئەمریکا و هاوشێوە و هاوپەیمانەکانی بەرانبەر مرۆڤ و مافەکانی دەیکەن؟

لە پاش ئەوەی بەرەی رۆژئاوایی سەرمایەداریی بە پێشەوایەتیی ئەمریکا سەرکەوت، ئەم بەرەیە لە هەوڵی ئەوەدا بووە تێگەیشتنی تایبەتیی خۆی سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسی بەسەر تەواوی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییدا بسەپێنێت، بەو پێیەی ئەم تێگەیشتنە باشترین و بە تواناترین تێگەیشتنە.. بەشێکیش لە لێکۆڵەرەوان پێیان وایە کە ئەمریکا لە دوای کۆتاییهاتنی جەنگی ساردەوە، وەکو بەرژەوەندییەکی نەتەوەیی ئەمریکی بۆ مافەکانی مرۆڤی روانیوە[2]. هەموو ئەم راستییانەش، بە تایبەتی لە ماوەی دوای جەنگی ساردەوە تاکو بە ئێستا دەگات، لەمیانەی ئابڵوقەی ئابووریی سەر عێراق، جەنگەکانی ئەفغانستان و عێراق و چەندین شەڕ و دەستتێوەردانی تردا لە کاروبار و ململانەی وڵاتان، وەکو رۆژی رووناك دەدرەوشێنەوە، هەر ئەم تێڕوانینە بەرژەوەندخوازانەیەشە وای لە ئەمریکا کردووە بەشێوەیەکی دووفاقییانە مامەڵە لەگەڵ کێشەکانی ئەمڕۆی جیهاندا بکات، بە تێڕوانینێکی سەرپێییانەش لە کێشەی فەلەستین، ئەو راستییەمان بۆ دەردەکەوێت.

لە لایەکی تریشەوە، ئەم گاڵتەکردنە بە مرۆڤ و روحی مرۆڤ و بە سووکسەیرکردنی، تەنها پەیوەندیی بە رووکارە دەرەکییەکەی هێز و توانای تەکنۆلۆجی و سەربازییانەی ئەمریکاوە نییە، تا بە هۆی نەدیتنی بەرانبەرێکی بە توانا، تووشی لە خۆباییبوونی بکات و بە ئارەزووی خۆی راوی مرۆڤ و دەوڵەتان بکات، تۆ گەر نموونەی نێو زیندانێکی ئەمریکی وەربگریت، ئەوا چەندێك ئەو یاریکردنە بە روح و جەستەی مرۆڤەکان پەیوەندیی بە بەهێزیی پاسەوان و بێهێزیی زیندانیی، یان دیلەکەوە هەیە، سەد هێندە و زیاتریش پەیوەندیی بە پێکهاتەی عەقڵی و بیرکردنەوەی بابایەکی رۆژئاوایی و ئەمریکییەوە هەیە کە لەسەر دابڕان لە بەها و قیەمە رەهاکان و هەروەها تاکرەهەندکردنی مرۆڤ و بە ماددییکردن و بە شتکردنی دامەزراوە، هەر ئەم بیرکردنەوە و تێڕوانینە بنەڕەتی هەموو بێڕێزیی و سووکایەتییکردنێکە نەك بە جەستەی

---

[2] هەمان سەرچاوە.

مرۆڤەکان، بەڵکو بنەڕەتی هەموو بێڕێزییکردنێکە بەرانبەر بە روح و هەستی مرۆڤ بە پلەی یەکەم، هەروەها نەك بە تەنها سووکایەتییکردنە بە روح و جەستەی بەرانبەرەکە، بەڵکو خودی بابای ئەمریکاییش قوربانیی ئەو جۆرە بیرکردنەوە و بیروبۆچوونانەیە، کە هەر جارە و لە ژێر ناوێك و تێزێکی فیکرییدا (عەلمانییەت، مۆدێرنیتی و پۆست مۆدێرنیتی و ..) خۆیان بەیان دەکەن. خوای پەروەدگاریش لەو بارەوە دەفەرموێت: (.. نَسُوا اللَّـهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ) (الحشر : ١٩). کە بێگومان لەبیرکردنی خوای پەروەردگار و بەرنامەکەی لە چۆنێتیی بەڕێوەبردنی ژیان و مامەڵەکردن لەگەڵ مرۆڤەکاندا، بنەڕەتی لە ناوچوونی خودە بەر لە هەموو شتێکی تر.

"لە جیهانێکی داڕنراو لە بەهادا، هەموو شتەکان یەکسان دەبن، پاشانیش هەموو شتەکان دەبنە رێژەیی، کاتێکیش ئەوە روو دەدات، ئەوا زۆر ئەستەمە بتوانیت حوکم بەسەر شتێکدا بدەیت. جیاکردنەوەی چاکە لە خراپە، ستەم لە دادگەری، بگرە جیاکردنەوەی جەوهەریی لە رێژەیی، لە دواجاریشدا جیاکردنەوەی مرۆڤ لە سروشت، یان مرۆڤ لە ماددە دەبێتە شتێکی مەحاڵ.

لێرەشەوە ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات" ئایا چۆن دەتوانرێت ململانە و ناکۆکییەکان یەکلایی بکرێنەوە؟ یان چۆن دەتوانرێت جیاوازییەکان نەهێڵدرێن؟ کە ئەمانە هەموویان کرۆکی بوونی مرۆڤن. لە غیابی چەند بەهایەکی موتڵەقدا کە مرۆڤ بتوانێت ملکەچیان بێت و بۆیان بگەڕێتەوە، مرۆڤی تاك یان کۆمەڵی عیرقی خۆیان دەبنە مەرجەعی خۆیان و هەر شتێك لە بەرژەوندیی خۆیان بوو، ئەوە چاکە و بنەڕەتە و هەر شتێکیش لە بەرژەوەندییان نەبوو، ئەوە خراپە"[3].

گەر لایەنی یەکەم (هێزدار) بڕوای بە بەها باڵاکان و قیەمە ئینسانییەکان هەبێت و لە ناخەوە بڕوای وابێت قیەمی موتڵەق لە ژیانیدا هەیە و خۆی سەنتەری گەردوون و هەموو شتەکان نییە، ئەوە با چەند بەهێزیش بێت، هەرگیز هیچ مرۆڤێك لە ژێر دەست

---

[3] بابەتی: الحداثة ورائحة البارود، الدكتور عبدالوهاب المسيري. بڕوانە ماڵپەڕی "ئەلمەسیری" لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.

و سایەیدا بێڕێزی بەرانبەر روح و جەستەی ناکرێت، بگرە تا لایەنی یەکەم هێزی زیاتر بکات، ئەوە زیاتر هەستی لێبوردەیی و بەزەیی پێداهاتنەوەی لا زیاتر دەبێت.

بۆ نموونە" لە سەردەمی بەهێزبوون و بەهێزتربوونی دەسەڵاتی ئیسلامییدا، بە تایبەت لە قۆناغە سەرەتاییەکانیدا، کاتێك مسوڵمانان بە هێزێکی زۆرەوە بە رووی چەندین نەتەوە و رەگەزی جیاوازدا دەکرانەوە، یان لە گۆڕەپانی جەنگدا رووبەڕوو دەبوونەوە، هەرگیز بەدی ناکەیت کە حاڵەتێکی نەخشەبۆدارێژراو لە کوشتنی بە ناهەق، یان ئەشکەنجە و سزای بە ناهەق، لەسێدارەدان و زیندانییکردنی بە ناهەق رووی دابێت، بگرە زۆرینەی دیلەکانیش لە بەرانبەر دابینکردنی پێویستییەکی کەمی مسوڵماناندا، بە رێزەوە ئازاد دەکران، یان هەر مسوڵمان دەبوون و لە ریزی مسوڵماناندا دەمانەوە.

ئەو هێزەی ئیلهام و بیرکردنەوەی خۆی لە هێزێك، لە ئایین یان مەنزوومەیەکی قیەمی وەردەگرێت کە تیایدا سەرجەم مافەکانی مرۆڤ پارێزراون، ئەوا هەرگیز نەك بیر لە پێشێلکردنی ئەو مافانە ناکاتەوە، بەڵکو بیریش لەوە ناکاتەوە هێز و دەسەڵاتەکەی بە شێوەیەکی ناحەکیمانە بەکار بهێنێت، چونکە دڵنیایە لەوەی ئاکامی جیابوونەوە و لێکترازانی حیکمەت و هێز، نەك بەرانبەرەکەی بەرەو فەوتان و لەناوبردن دەبات، بەڵکو زۆر جار خودی خۆشی بە هەمان دەرد دەبات.

ئەم حاڵەتەی ئەمرۆ بە تایبەت ئیدارەی ئەمریکا و هێزەکانی تێی کەوتوون، حاڵەتێکی نوێ نییە، چەندانی پێدا رۆشتوون و چەندانی تریشی پێدا دەڕۆن، ئەمەش ململانەیەکی هەمیشەیی نێوان حیکمەت و هێزە.

لە ساڵانی سییەکان یان چلەکانی سەدەی رابردوودا، ئەدیب و شانۆنووسی بەناوبانگ تۆفیق ئەلحەکیم، لە میانەی یەکێك لە شانۆگەرییە بەناوبانگەکانیدا بەناوی "سلێمان ئەلحەکیم"، دوانەی حیکمەت و هێزی چارەسەر کردووە.

لەو شانۆییەدا، تۆفیق هێزێکی وای داوە بە سولەیمان پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) کە تا ماوەیەکی کەمی بەر لە ئێستا هیچ پێشەنگ و پێشەوایەك نەیبووە، هێزێکی ماددیی پشتئەستوور بە هێزی غەیبی کە هیچ شتێك ناتوانێت بەری لێ بگرێت

لــە بەدیهێنانــی ئامانجەکانــیدا، هێزێکــی هاوشــێوەی ئــەوەی ئەمــڕۆ مووشــەکە کیشوەربڕەکان دەتوانن بیکەن.

بەڵام ئیغرائاتەکانی ئەو هێزە، سولەیمانی لە کاربەجێیی و حیکمەت بەکاربردن دوور نەخستەوە، ئەو پێغەمبەر بوو، هەموو تەعلیمات و ڕێنموونییەکانی لە خوای پەروەردگارەوە وەر دەگرت، ئەو چاك دەیزانی کە بەرەوپێشچوون و پەرەسەندنی ژیانی بڕوادارانە، بە تەحەکومکردنی حیکمەت و کاربەجێیی بەسەر هێزدا بەدی دێت، نەك بە پێچەوانەوە.

ئەوە بوو ئەو پێغەمبەرە (سەلامی خوای لەسەر بێت)، هاوشێوەی پێغەمبەرانی تر، دەوڵەت و قەوارەکەی خۆی بە لۆجیکی هاوسەنگی لە نێوان هێز و حیکمەتدا بەڕێوە دەبرد، دەستدرێژی نەدەکردە سەر کەسێك چ جای قەوارەیەك، کۆمەڵێك یان ئوممەتێك، توانا سەیروسەمەرەکانی خۆشی بۆ جەبەرووتنواندن لەسەر زەویدا بەکار نەدەبرد، وەکو ئەوەی ئەمڕۆ بە عەرزی عەزەڵات ناو دەبرێت.

ئەو هەلومەرجەی ئەمڕۆ باڵی کێشاوە بەسەر جیهاندا، بریتییە لەوەی ئەمریکا، بەو هێز و سامانە زۆرەی لە بەردەستیدایە، دەیەوێت بە هەر باجێك بێت، ئەو هەیبەت و شکۆیە بۆ خۆی بگێڕێتەوە کە لە یانزەی ئەیلوولدا بۆیان شکاند، هەر ئەمەش وای لێکردووە بە شێوەیەك مامەڵە بکات کە هەموو ئەگەرەکانی حیکمەت و کاربەجێیینواندنی لە دەست داوە، وەکو بەهێزترین دەوڵەت، بێهێزترین دەوڵەت داگیر و وێران دەکات[4].

ئەمڕۆ لە سایەی هێز و دەسەڵاتی ئەمریکادا، بەشێکی گەورەی دنیا بۆتە گۆڕستان، لە "خانەی مەرگ"[5] دەچێت و بۆنی ساردی تەرمی مردووەکانی لێدێت، پاڵەوانەکانی ناوی، هەرگیز ڕەنگیان لە ڕەنگی مرۆڤی ئاسایی ناچێت، لە ژێر سایەی

---

[4] الدكتور عمادالدين خليل، مذكرات حول واقعة الحادي عشر من أيلول (سبتمبر)، خواطر في مقالات قصيرة، ص ١١-١٤.

[5] خانەی مەرگ ئەو شوێنەیە کە لە سەردەمی فیرعەونەکاندا لە میسر مردووەکانیان تێدا مۆمیا دەکرد. بڕوانە کتێبی: (سینۆهە، پزیشکی تایبەتی فیرعەون، میکاڤالتاری، وەرگێڕانی سەیدا شێخ زرار).

ئـەو رەشماڵـەی ئەمریکا هەڵـیداوە، مـرۆڤ، یـان کۆمەڵ و ڕێکخراوەکان، یان دەوڵەت و وڵاتـان دەبێت لـە نـێوان ڕەش و سپییەکەی جۆرج بوشی کوڕدا یەکێکیان هەڵبژێرن و ڕێگەچارەی سێیەمیان بۆ نییە. ئـەو هێزە چونکە پشت ئەستوور نییە بە هێزێکی غەیبـی و پابەنـد نییە بـە هیچ مەنزوومە و قیەمێکی ئینسانی و ئەخلاقییەوە، هەروەها بـە هـیچ یەکـێك لـەو ڕێکەوتـنـامە نێودەوڵەتییانەی بۆنـی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و ژینگە و ..یـان لـێدێت (مەگـەر بـەو شـێوەیە نەبێت کە خۆی تەفسیریان دەکات)، ئەوا بـەر لـەوەی بەشـێکی زۆری جیهانـی (بـە تایبـەت جیهانـی ئیسـلامیی) لـە فـەوتان و لەناوبردن نزیك کردبێتەوە، خۆی بەرەو هەڵوەشانو لێکترازانی حەتمی بردووە.

هەرچـەندە ئـێمە لێـرەدا کەمـێك درێـژەمان بـە باسـکردن لـە ڕاددەی تێڕوانینـی ئەمریکییانەی ئێستا بۆ مافەکانی مرۆڤ دا، بەڵام خۆمان بە ناچار بینی، چونکە لێرەدا قسـەکردن لـە ڕووداوی دەسـتگیرکردن و ڕفاندنـی ژمارەیـەك هاووڵاتـی و کەسـایەتیی کـورد، ناکرێت بـە جیا لە هەموو ئەو ڕووداوانە سەیر بکەین کە لەسەر دەستی پیاوانی ڕەسمیـی ئەمـریکا ڕوو دەدەن، یـان بـە جـیا لـەو کەڵکەڵانـە تەفسـیری بکـەین کـە لـە مێشـکی هـەر بابایەکـی ڕۆژئاوایی یان ئەمریکیدا ڕەگیان داکوتیوە، هەروەها قسەکردن لـە دەستگیرکرانی مامۆستا عەلی باپیر و برایانی تر، شتێکی ناماقوڵ و بێبناغەیە ئەگەر تـیایدا باس لەو تێگەیشتنەی ئەمریکا و ڕۆژئاوا نەکرێت کە بۆ دیموکراسی و مافی مرۆڤ و ئازادییەکان هەیانە، بە تایبەت مافەکانی مرۆڤی مسوڵمان و مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی.

پرسـیاری سـەرەکیش لێـرەدا ئەوەیـە" پێویسـتە چـی بکـرێت تـا بـەر لـەو هەمـوو بێڕێـزییانە بگیرێـت کـە ئەمـڕۆ بـە نـاوی پەخشـکردنی دیموکراسـی و بڵاوکـردنەوەی کەلـتووری لێـبوردن و ڕێزگـرتن لـە مافەکانـی مـرۆڤ و ئازادییەکانـی و چەندین دروشمی تـری بریقەدارەوە ئـەنجام دەدرێـن؟ ئـەم پرسـیارەش لـە کاتـێکدا نییە کە هیچ شتێك نەکـرابێت، یان کەسانێك، ڕێکخراوگەلێك بیریان لە وەها کارێك نەکردبێتەوە و کاریان بۆ نەکـردبێت و بەردیان بۆ لەسەر بەرد نەنابێت، بەڵکو کاری بەرچاو کراون و ڕێکخراوگەل و کەسـانی چالاکی بواری مافەکانی مرۆڤ دروست بوون، تەنانەت زۆرێکیشیان ئەمریکین و لـە نـێو خودی ئەمریکادا کار دەکەن. بێگومان بۆ دەربازبوون لەم قەیران و تەنگژەیە و بـۆ دەسـتەبەرکردنی زیاتـری ڕێزگـرتن لـە مافەکانـی مـرۆڤ، پێویسـتە بیریـاران و

رووناکبیران و ویژدانزیندووان له ئاست بەرپرسیارێتیی خۆیاندا بن، هەروەها دەوڵەت و قـەوارە سیاسـییەکانیش دەسـت بـەو پرنسـیپانەی مافەکانـی مرۆڤەوە بگرن کە کۆڕای ئاینیـی و جیهانیـی و مـرۆییان لەسـەرە[6] هـەر کاتێکـیش هەمـوان لـە ئاسـتی ئـەو بەرپرسـیارێتییەدا بوون، ئـەوا هیچ یەکێك نە بە ناهەق زیندانیی دەکرێتو نە مافەکانی زەوت دەکرێن، نەخـوازەڵلا ئـەو کەسـانەش لـە وێـنەی مامۆستا عەلی باپیر و هاوەڵانی بن.

**هاوژین عومەر**

**سلێمانی**

**١٤٢٧/٢/٢٠ ك ـ ٢٠٠٦/٣/٢٠ ز**





[6] خوێندنەوەیەك بۆ کتێبی: (حقوق الانسان.. الرؤى العالمية والاسلامية والعربية) لـه ماڵـپەڕی "ئەلجەزیرە نێت"دا.




# تەوەرەی یەکەم:
# هەلومەرجی بەر لە زیندانییکردن

**٢٠٠٥/٦/١٣**

**ستۆدیۆی کەناڵی هەولێری تەلەفزیۆنی کۆمەڵ**

**+ مامۆستا عەلی باپیر، وەکو سەرەتایەك، دەکرێت خوێندنەوەیەکی ئەو قۆناغەمان بۆ بکەن کە تیایدا دەستگیرکران؟ ئەو قۆناغەی تیایدا چەندین ستەم لە کۆمەڵی ئیسلامیی کرا؟ گرووپی ئەنصار بوونی هەبوو؟**

ـ بسم الله الرحمن الرحيم، الحمدلله، والصلاة والسلام على رسول الله، محمد وآله وصحبه ومن اهتدى بهداه.. لای هەموو لایەك ئاشکرایە کە کاتی خۆی، بینا لەسەر چەند ڕێککەوتنێك، بزووتنەوەی ئیسلامیی پێشوو لە ناوچەکانی شارەزوور و هەورامان نیشتەجێبوو، لە هەموو ناوچەکانی ترەوە بارەگاکانی هێنران بۆ ئەوێ، دوا ئەوە کە یەکەمین کۆنگرەی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی، لە مانگی ئابی ساڵی (٢٠٠٠) گرێدرا و ئەنجامەکانی دەرکەوتن، هەندێك کەس بەئەنجامەکانی ڕازی نەبوون، ئێمە ئەوانەی کە پابەندبووین بە ئەنجامەکانی کۆنگرەوە، دوای نۆ مانگ چاوەڕوانی و گفتوگۆ و بە یەکەوە دانیشتن‌و هەوڵدان بۆ یەکتر ئیقناعکردن، ناچاربووین کە لە ٥/٣١ /٢٠٠١ کۆمەڵی ئیسلامیی ئیعلان بکەین، ئەوکاتەش گوتمان کە کۆمەڵی ئیسلامیی هەر بریتییە لە بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی پێشوو، بەڵام ناوەکەمان گۆڕیوە.

خۆمان واڕاگەیاند کە ئێمە درێژەپێدەری خەبات‌و سەروەرییەکانی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی پێشووین، دوای ئەوەی خەڵکی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی پێشوو بەو شێوەیان لێهات، لە لایەك کۆمەڵی ئیسلامیی کە زۆربەی زۆری سەرکردایەتییەکەی هەڵبژێردراوی نێو کۆنگرەبوون، زۆربەی هێزەکان، زۆربەی هەرەزۆری مەڵبەندەکان‌و بنکەو بارەگاکان هاتنە نێو کۆمەڵی ئیسلامیی، هەر بزووتنەوەی یەکبوونەکەی پێشوو بوو، ئەویش دوای گۆڕینی ناوی‌و دەستکاریکردنی هەندێك لەو مەنهەج‌و بەرنامەیە، بەو شێوەیەی کە سەرکردایەتیی کۆمەڵی ئیسلامیی بڕوای پێیەتی بۆ کاری ئیسلامیی، لەولاشەوە جەنابی مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز بەناوی بزووتنەوەی ئیسلامیی مایەوە، کە زیاتر لە شاری هەڵەبجە و دەوروبەری بوون، خەتێکی تریش بە بێلایەن مایەوە، ئەوانیش جەنابی مامۆستا شێخ موحەممەد بەرزنجی‌و کاك حاجی قاسم‌و چەند برایەکی تری سەرکردایەتی بوون، کە دواتر هاتنە نێو کۆمەڵی ئیسلامیی.

لەولاشـەوە هێزی دووی سۆران و هەندێ خەڵکی دیکەی پەڕاگەندە مانەوە، کە دوای ماوەیەك بـەناوی "جوندولئیسـلام" خـۆیان ڕاگەیانـد، پاشـان (١ - ٢) گرووپـی بچووك بەناوەکانـی "تەوحـیدو حـەماس"هەبوون، دواتر ئەوانیش هەرسێکیان یەکیان گرت کە مامۆسـتا کرێکاریشـی تـێدا بـوو، بەسەرپەرشـتی ئـەو ناویـان لەخـۆیان نـا "ئەنصارولئیسلام"، مامۆستا کرێکاریشیان بەبراگەورەی خۆیان هەڵبژارد.

ئـەوکات، واتـە قۆناغـی پـێش دەستگیرکرانی بەندە، خەڵکی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسـلامیی بـەو شـێوەیە بـوون، ئـەو ڕووداوانـەی کـە ئامـاژەم پێکـردن، گـرنگترینیان شـەهیدکرانی مامۆسـتا عەبـدوڵڵای قەصـرێ، ئەندامـی مەکتەبـی سیاسـیی بـوو، کـە برایەکـی زۆر لـێهاتوو بەتـواناو زۆر خۆشەویسـتو لـە دڵـی خەڵکـی موسـڵماندا بـوو، کاریگەریـی زۆری هەبـوو لەسـەر ئـەو کەسـانەی گوێبیسـتی وتـارو قسـە شـیرینەکانی دەبوون، کاریگەری زیاتری هەبوو لەسەر ئەو کەسانەی لەنزیکەوە دەیانناسیو تێکەڵی بوون.

کۆبـوونەوەی مەکتەبـی سیاسـیمان هەبـوو، مامۆسـتا عەبـدوڵڵا بـەرەو لای ڕانـیە گەڕایـەوە، لـە بازگەی تاسلۆجە زۆر بەناحەق شەهیدکرا، بەزاراوەی ئەمڕۆ (تیرۆر) کرا، دیـارە لـە لای یەکێتییەوە. بەڵام دوایی یەکێتیی نیشتیمانی وتیان "ئەوە بەهەڵە بووە، ئێمە وامـان زانیوە کە ئەو ئۆتۆمبێلە ئۆتۆمبێلی ئەنصارە، بەئەنقەست نەبووە". ئەوە یـەکێ بوو لـەو ڕووداوانـەی کـە بێگومان مەزلومیەتێکـی گەورە بوو هاتە سەر کۆمەڵی ئیسلامیی.

ئـێمە هەلـومەرجمان وابینـی کـە دانمـان بەخـۆماندا گـرت، دوایی مام جەلال زیاد لە جارێك نامەی نارد، ئێمەش نامەمان بۆ ناردەوە، دوایین نامەی مام جەلال ئەوە بوو کە زۆر تەئکـیدی کـردەوە: "ئـەو ڕووداوە هەڵەبـووە (ئیشـتیبا بـووە)، بـە ئەنقەسـت نەبووە". مـن لـە وەڵامـی دوایین نامەیدا بۆم نووسیبوو: باشە مام جەلال، ئەگەر بە ئەنقەسـت بووە، یاخـود بـە هەڵـە بووە، بـەڵام خـۆ لـە ڕووی شـەرعییەوە، شـتێك کە دەکرێ، ئەگـەر بـە ئەنقەست بێ، واتە بە عەمدی سزایەکی هەیەو ئەگەر بە هەڵەش بێ سزایەکی هـەر هەیـە، بـەڵام ئـێمە هـیچ ئیجرائاتێکمان نەبینی لەگەڵ ئەوانەدا بکرێ کە

ئەنجامدەرانی ئەو ڕووداوە بوون. بەهەرحاڵ ئەوە تا ئێستاشی لەگەڵ بێ، هەر دیزەبەدەرخۆنەی لێکراوە[7].

ڕووداوو کارەساتی دووەم، یان مەزڵومییەتی دووەم، مووشەکبارانیکردنمان بوو لە لایەن ئەمریکاوە، کە بووە هۆی کوژرانی چل و سێ کەس لەبرایانمان، خوا بەشەهیدی وەرگرتبن، هەروەها بریندارابوونی زیاتر لە پەنجا کەس و زەرەر و زیانێکی ماددیی زۆر بە ئێمە کەوت، جگە لە ئۆتۆمبێل و... هتد.

ئێمە پێمان سەیر بوو، کە ئێمە هیچ شتێکمان لەدژی ئەمریکا ڕانەگەیاندووە کەچی ئەمریکا ئێمەی مووشەکباران کرد. ڕاستە کە ئێمە پێمان ناخۆشبوو ئەمریکا بێتە عیراقەوە، وڵاتێکی کافر بێتە نێو خاکی ئیسلامەوە، پێمان خۆشبوو ڕژێمی بەعس بڕووخێ، بەڵام عەینی هاتنی ئەمریکا، ئێمە پێمان ناخۆشبوو، پێمان خۆشبوو ئەمریکاو هەرکەسێك، دژی ڕژێم پشتگیریی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی بکات، خەڵکی عیراق خۆیان ئەو ڕژێمە بڕووخێنن، بۆ ئەوەی لە گۆلکی نەسڵەمینەوە و بە سەر بەرازیدا نەکەوین، بەڵام بە هەرحاڵ، ئەوەی هاتە پێش هاتە پێش. ئێمە پێمان خۆش بوو ڕژێم بڕووخێ، بەڵام بەڕاستی پێمان خۆش نەبوو کە ئەمریکا بەناوی ڕووخاندنی ڕژێمەوە بێ‌و عیراق داگیر بکات، نەشمان شاردۆتەوە، من لە زیندانیش لێیان پرسیوم، گوتم بۆ داگیرکرانی عیراق لە لایەن ئەمریکاوە پێمان ناخۆشە، بەڵام پێمان خۆشە ڕژێم بڕووخێ، ڕەنگە بشگونجابا ڕژێم بڕووخێنرابا، بەبێئەوەی عیراقیش داگیرکرابا، کە ئێستا گیروگرفتێکی زۆر گەورەیە، ڕەنگە بۆ ئەمریکاش بووبێتە گرفتێکی گەورەو نازانێ چۆن چارەسەری بکا، هەم بۆ خەڵکی عیراقیش ئەوە کێشەو گرفتێکی گەورەی دروستکردووە.

بۆ ئێمە زۆر جێگەی سەرسامیی بوو، کە ڕەنگە خەڵك بەجۆرێك لەدڵسافیی سەرکردایەتیی کۆمەڵی ئیسلامیی لێکی دابێتەوە، کە بۆچی بنکەو بارەگاکانی خۆی چۆڵ نەکردووە، کە ڕەنگە پێشبینییان کردبێت مووشەکباران بکرێن. مەسەلەکە

---

[7] بەڵام دوایی لەبەر ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیی گشتی، کێشەکە بە صولْح کۆتایی پێهێنرا، لە لایەن سەرکردایەتیی کۆمەڵ و یەکێتییەوە.

ئەوەبوو ئێمە چاوەڕوانیمان نەدەکرد، چونکە هیچ شتێکمان ڕانەگەیاندبوو، شەڕ دژی ئەمریکا دەکەین یان نا، لەبەر ئەوە خۆمان بە تەرەفێك دژ بە ئەمریکا نەدەزانی، بەڵکو هەموو کەس دەزانێ کاتی خۆی ئێمە دژ بە ڕژێمی عیراق بووین، ئێمە زۆر پێمان خۆشبوو ڕژێم بڕووخێ، لە نێو بچێتو سەرنگوم ببێ، وەکو بووش، لەبەر ئەوە، ئێمە هیچ ئیحتیاتێکمان لەو بارەوە نەکردبوو.

ئەوجا، ئایا ئەمریکا خۆی ڕاستەوخۆ ئەو بنکەو بارەگایانەی ئێمەی دەستنیشانکردبوو کە مووشەکباران کران، یاخود یەکێتیی نیشتیمانی هاوکاریی کردبوون؟! وەکو هەندێك وا گومان دەبەن، بەڕاستی ئێمە تا ئێستا زانیارییەکی زۆر جێی دڵنیاییمان بەدەستەوە نییە، ئەمریکییەکانیش دوایی کەلێمان دەپرسین، دەیانگوت: "ئەوە هەڵەبووە، ئێمە نەمان زانیوە کە بنکەو بارەگای ئێوەیە". جا ئایا بەهەڵە بردرابن، یا خۆیان بە هەڵەدا بردبوو، گرنگ ئەوەیە ئەوەش هەر خرایە قاڵبی هەڵەوە، دیارە ئەوەش ستەمێکی تری گەورە بوو لە ئێمە کرا.

ئێمە پێشبینی ئەوەمان نەکردبوو ئاوامان لێبێت، ئەگینا هیچ کەس خۆی ناکاتە نیشانەی مووشەكو ساروخی ئەمریکا، ئەگەر بزانێ ساروخباران دەکرێ، جا شتی سەیر لێرەدا ئەوەبوو کە یەکێتیی لەگەڵ ئەنصارولئیسلامدا لەشەڕدا بوو، ئێمە، یان ڕۆڵی ناوبژیوانمان دەبینی یان بێلایەن بووین، کەچی پێش ئەنصار، بنکەکانی ئێمە بەر مووشەك دران، پێش ئەوان، خەڵکی ئێمە شەهیدو بریندار کران!!

ئەوەی بەپێویستی دەزانم لێرەدا بیڵێم، پێش ئەوەی ئەو بارودۆخانە دروست ببن، من خۆم چەند جارێك داوام لە مام جەلال کرد، داوامان لە مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی کرد کە ئێمە لەهەموو شتێکدا، لەشێوازی بیرکردنەوەدا، لەشێوازی کاری ئیسلامیمان لە ئەنصار جیاین، بەڵێ، ئەوانە هەر بە موسڵمان دەزانین، بەڵام لەشێوەی بیرکردنەوەمان بۆ کاری ئیسلامیی، ئامانجی کاری ئیسلامیی، شێوازەکانیو هەڵسوکەوتمان لەگەڵ خەڵكو هەڵسوکەوتمان لەگەڵ لایەنە سیاسییەکان زۆر جیاین، لەبەر ئەوە دەمانەوێ لەم ناوچەیە دوور بکەوینەوە، هەر چەندە ئەو ناوچەیە زیاتر هی ئێمەیە، هی ئێمەبووەو ئەوان (ئەنصارولئیسلام) لێرە هەڵتۆقیون، بەڵام دەمانەوێ دوور بکەوینەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر شتێك ببێ، با بەئاگری ئەوان نەسووتێین.

ئەوە وەکو ئینسافێك بگوترێ" لەسەرەتاوە مام جەلال - مەکتەبی سیاسیش قسەیان لەگەڵ ئەودا بوو - ڕازی بوو، بەڵام زۆربەی برایانی خۆمان، مەکتەبی سیاسییو سەرکردایەتی ڕازی نەبوون، من زۆرم لێتەئکید دەکردنەوە کە تازووە با لەم ناوچەیە نەمێنین، ئەوان (برایان)، ڕەنگە بەحوکمی ئەوەی هەندێکیان ماڵیان لەوێ بوو، یان بنکەکانمان لەوێبوون، یان پێیان قورسو زەحمەت بوو، یان پێیان وابوو ئەگەر بچین بۆ شوێنێکیتر، ڕەنگە هێزەکانمان ئاوا لەگەڵمان نەیەنو زەرەر بکەین، یاخود ڕەنگە ئەو مەترسیانەی کە من پێشبینیم دەکردن، ئەوان بەو شێوەیە پێشبینییان نەکردبێت، بەهەرحاڵ ڕەئییان نەبوو، بەڵام دوایی برایان زۆربەیان قەناعەتیان هاتە سەر قسەی من، ئەوجارە مام جەلالو بڕیاردەرەکانی یەکێتی ڕایان گۆڕی!

**+ بەڵێ ماموستا، ئەم پێشەکییەی بەڕێزتان کۆمەڵێك پرسیاری دیکە بە دوای خۆیدا دەهێنێت، یەك لەو پرسیارانە: بەدواداچوونی دۆسیەی تیرۆرکرانی ماموستا عەبدوڵڵا قەصری بە کوێ گەیشت؟**

ـ هەتا دەستگیرکرانی بەندە، ئەوەندەی من ئاگادارم یەکێتیی وەك پێویست لەگەڵمان نەهاتە پێش، چەندجارێ داوامان کرد با لیژنەیەکی هاوبەش پێکبهێنرێت، بزانین ئەوانەی کە تەقەیان لە ماموستا عەبدوڵڵای قەصری کرد لەو بازگەیە (کە لە فیلمەکەدا گیراوەو خەڵکێکی زۆر بوون، بەرپرسیشیان لەگەڵدایەو سیماشیان ناسراوە)، کێ ئەو ئەمرەی پێکردن؟ هەروەها چۆن لەپێشی پێشەوە تەقە لە ماموستا کرا؟ کە پێش ئەوەی بگاتە بازگەکە تەقەی لێکراوە، دوایی هەندێ لەبەرپرسانی یەکێتی ئەوەیان بەوە پینە دەکرد کە ماموستا لە بازگەکە ئۆتۆمبێلەکەی ڕانەگرتووە، کە ئەوە هیچ ئەساسێکی نییە، چونکە ئەو بەرلەوەی بگاتە بازگەکە، تەقەی لێکراوە، سەیارەکە پێش بازگەکەیە، هەر نەگەیشتووەتە بازگەکە، چ جای ئەوەی لێی تێپەڕیبێ، بەڵام بەڕاستی یەکێتی لەگەڵمان نەهاتۆتە پێش، پاساویان بەوە هێنایەوە گوایە "دەرفەت نییەو ئەمریکا هاتووەو شەڕی ڕژێمە"، بەبۆچوونی من، تا من گیرام ئاوابوو، دوایی نازانم چی لێهات، چەند جارێك نامەم دەنووسی بۆ مام جەلال، ئەو وەڵامی دەدایەوە، ئەو کاتەی کە لە (دارەشمانە) بووین، دووبارە مام جەلال نامەیەکی

(٣ ـ ٤) لاپەڕەیی دووردرێژی نووسیبوو، بۆ منی ناردبوو، زۆر تەئکیدی کردبوو کە ئەوشتە ئەنقەست نەبوو، هەڵەبووە، دڵنیا بن، ئامادەشین بۆ هەر شتێك، دوایی من نامەم بۆ نووسییەوە: باشە ئێوە دەڵێن ئەنقەست نەبووە، خەڵکێکی ئێمەش ڕەنگە بەو شێوەیە بیربکاتەوە کە ئەنقەست نەبووبێ و هەڵە بووە، بەڵام ڕەنگە خەڵکێکی کەش هەبێت بڵێ کە نەخێر، بە ئەنقەست بووە و هەڵە نەبووە، هەرچۆن بێت با لیژنەیەکی هاوبەش پێك بهێنین، لەو کێشەیە بکۆڵینەوە، کە ئایا هەڵە بووە یان هەڵە نەبووە، بە هەر لایەکیاندا بێت، خۆ دەبێ سزا و لێپێچانەوەو تۆڵەیەك دیار بێ، بەڵام ئەوە هەر دیزەبەدەرخۆنەی لێکرا!

ئێستاشی لەگەڵ بێ، من ئێستا کە هاتوومەتەوە، نازانم ئایا برایان دوای من لێیان پێچاوەتەوە یان لێیان نەپێچاوەتەوە، بەڵام تا من لێرە بووم، یەکێتی بە دەنگمانەوە نەهاتن، تا تەحقیق لەو کێشەیە بکەین.

**+ مامۆستا، کۆمەڵی ئیسلامیی دەزانێ کەسەکان کێبوون کە ئەو کارەیان ئەنجامدا، نەك ئەوانەی نەخشەیان بۆ داناوە؟**

ـ ئەوانەی کە لە فیلمەکەدا دەرکەوتوون، دیارن، ڕەنگە برایان زانیارییان کەوتبێتە بەر دەست، من بەوردی لێم نەپرسیون، بەڵام ڕەنگە زانیاری و بەڵگەنامەیان کەوتبێتە بەر دەست کە کێ و کێبوون.

**+ دۆکیومێنت هەیە؟**

- بەڵێ.

**+ مامۆستا، باسی مووشەکبارانەکەت کرد، بە ماوەیەك پێش دەستپێکردنی شەڕەکە، بەشێك لە سوپای ئەمریکا هاتە عیراق، ئەوکات سەرکردایەتیی کۆمەڵ هەڵوێستی چیبوو لە هاتنی ئەمریکاو ئەو گۆڕانکارییەی لە عیراق چاوەڕوانکراوبوو؟**

ـ من ئەوکاتە لە چاوپێکەوتندا گوتم: ئەمریکا نە بۆ شەڕی ئێمە هاتووە تا لەدژی بووەستین، نەمیوانی ئێمەشە تا بەخێری بێنین، میوانمان نییە تا بڵێین بەخێر بێتو پێمان خۆشبێ، بەقسەی ئێمەش نەهاتووە، هیچ هەماهەنگییەکی لەگەڵ ئێمە

نەکردووە، هیچ پرسێکی پێنەکردووین، بۆ خۆی هاتووەو دێ، کە بەقسەی ئێمە نەهاتووەو لەسەر داواو ڕەزامەندیی ئێمە نییە، ئێمە نالێین بەخێربێت‌و پێخۆشحالیش نین، بەڵام نەشی گوتووە بۆ شەڕی ئێوە دێم تاکو دژایەتی بکەین. ئەو دەڵێ: "دێم ڕژێمی بەعس دەڕووخێنم"، ئەو ڕژێمەش دوژمن‌و ملۆزمێکی لە مێژینەی میللەت‌و گەلانی عیراقە بەگشتی‌و میللەتی کوردە بەتایبەتی، لەبەر ئەوە پێمان خۆشە ڕژێم بڕووخێ، بەڵام نایشارینەوە کە پێمان خۆش نەبوو ئەمریکا بێ، ڕەنگە کەسانێکیش کە پێیان خۆش بووبێ ئەمریکا بێت‌و گوڵبارانیشیان کردووەو بەپێشوازیشیەوە چوون، دوایی بێنەوە سەر قسەکەی ئێمە، ڕەنگە ئێستا تاڕاددەیەك هاتبنە سەر ئەو قەناعەتە، پێموایە لەداهاتوودا زیاتر دێنە سەر ئەو قەناعەتە، کە بەڕاستی ئەمریکا بۆ کاری خۆی هاتووە، وەکو خۆیان دەڵێن، بەڵام بەداخەوە، ئێمە زۆرجار لەبەر زاڵبوونی عاتیفە، یاخود بەرژەوەندییەکی کاتی، هەڵەی گەورە دەکەین، ئێستا دەبینین بەسەر تێڕوانینی دوورماندا وەکو دەروێشەکەمان لێدێ، دەڵێن دەروێشێك هەبوو دەیگوت "شێخ فڕیوە"، دەیانگوت: شێخ چۆن فڕیوە؟! دەیگوت: "فڕیوە، باڵی گرتووەو فڕیوە"، لەشێخیان پرسی‌و گوتیان: "شێخ فڕیوە؟" گوتی: "نەوەڵڵا، فڕینی چی؟" گوتیان: "دەروێش فلان وادەڵێ"، گوتی: "نەخێر، ڕاست نییە"، بەدەروێشیان گوتەوە شێخ دەڵێ نەفڕیوم، گوتی: "شێخ سەهوی کرد، من دەزانم فڕیوە"!!

ئەمریکا دەڵێ من بۆ بەرژەوەندیی خۆم هاتووم، ئێمە خەڵکمان هەیە دەڵێ: "نەخێر، بەتایبەت بۆ ئێمە هاتووە"! بابە! ئەمریکا بۆ خۆی دەڵێ من بۆ بەرژەوەندیی خۆم هاتووم. ئنجا ئەمریکا ڕژێمی بەعس لەو کاتەدا دەڕووخێنێ کە ئەمریکا پێویستی پێیەتی و ئامانجی ئەمریکا دەپێکێ، ئەگەرنا بۆ لەساڵی نەوەتدا نەیڕووخاند کە هاتبووە گیانەڵڵا؟ سەد هەزار لە سوپای عیراق دەستگیرکرابوو ڕژێمی بەعس هاتبووە گیانەڵڵا، هەر ئەوەی مابوو کە بە یەکجاری بیڕووخێنن، بۆ ئەوکاتە لە بەینیان نەبرد؟ لەبەر ئەوەی ئەوکاتە بەرژەوەندیی ئەمریکای دابین نەدەکرد، ئەمریکا ئەوکاتە لەبەرژەوەندیی نەبوو کە ئەو ڕژێمە بڕووخێنێ، لەبەرژەوەندیدا بوو بمێنێتەوە، بۆچی لە (٢٠٠٣)دا ڕووخاندیان؟ لەبەر ئەوەی بەرژەوەندییان وابوو.

بەڵێ، ئێمەش پێمان خۆشبوو ڕژێم ڕووخا، بێگومان بەرژەوەندیی ئێمەشی تێدا بوو، بەڵام ئێمە نابێ واحاڵی ببین کە ئەمریکا بۆ بەرژەوەندیو قازانجی ئێمە ڕووخاندوویەتی، بەڵکو بەرژەوەندیی خۆی تێدابوو، لەگەڵ بەرژەوەندیی ئێمە یەکی گرتەوە، بەڵام ئایا دەبێ ئێمە لەسەر بوونی ئەمریکا لە عیراق و کوردستان قەرزار نەبینەوە؟! خوا بکەم قەرزار نەبینەوە، دوایی پەشیمان نەبینەوە. لەبەر ئەوە، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، من ناتوانم پێشێلی مەبادیئی خۆم بکەمو بڵێم وەڵڵا پێمخۆشە ئەمریکا بێ خاکی عیراق داگیر بکا، خاکی عیراق پارچەیەکە لە نیشتیمانی ئیسلامیی، بەڵێ ڕژێمی بەعس لەسەری فەرمانڕەوا بووەو صەددام دیکتاتۆر بووە، گۆڕبەگۆڕو ئاوەوئاو چێ، بەڵام ڕقم لە صەددام وام لێناکا ئەمریکام خۆش بوێ، ڕقم لە صەددام (کە میللەتی عیراق دەچەوسێنێتەوە) وام لێناکات ئەمریکام خۆش بوێ، کە هەموو موسڵمانان دەچەوسێنێتەوەو دەیەوێ خۆی بکا بە کەڵەگاو کوێخای هەموو دونیا، کە ناشیشارێتەوە.

ئەوەی کە باس دەکرێ، باس لە عەولەمە دەکرێ، لەڕاستیدا بەئەمریکاییکردنی جیهانە، ئینجا ئەمەش ڕاستییەکەو ئەمریکا خۆی نایشارێتەوە، دەڵێ من دەمەوێ هەژموون بکەم بە سەر دونیادا، ئینجا ڕەنگە خەڵك وا تەسەور بکا کە ئەمریکا دێ ئیشی بۆ ئەو خەڵکەیە کە لەسەر ئەرزی عیراقە، بەڵام هەموو خەڵکی شارەزاو توێژەرەوانی سیاسی دەڵێن: "نەخێر، لەڕاستیدا ئەمریکا بۆ ئەو شتە دێ کە لەبن خاکی عیراقە"، کە نەوتەو غازەو ئەو سەرچاوە سروشتیانەیە کە لەعیراقو لە غەیری عیراقیش هەن، هەموو توێژەرەوانی سیاسیی ئەوە چاك دەزانن، ئێمە پێویستە هەر نەبێ لەخەڵکی ترەوە بزانین.

**+ بەر لە دەستپێکردنی جەنگی ئەمریکا بۆ سەر عیراق، لە شاری لەندەن کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی ڕێکخرا، لەو کۆنگرەیەدا لایەنەکان هاوپەیمانیی خۆیان بۆ ئەمریکا سەبارەت بە جەنگی دژی بەعس ڕاگەیاند، ئایا کۆمەڵی ئیسلامیی دەعوەت کرابوو بۆ ئەو کۆنگرەیە، دیارە کە کۆمەڵ لێرەوە وەفدی بەڕێ نەکرد، ئایا ئەمە وای نەکرد گومانی ئەمریکا بەرانبەر کۆمەڵ خەست بێتەوەو ئەو ڕووداوو ستەمانەی بە دوادا بێت؟**

- ئێمه بۆ ئەو کۆنگرەیە دەعوەت کراین، من وام لێ حاڵی کرا کە بۆی دەعوەت کراین، جا ئایا دەعوەتەکە حەقیقەتی هەبوو، یان هەر خەڵکێك بەخێری خۆی جوابی بۆ ناردبووین؟ نازانم، چەند ناوێکیشیان دابوو کە ئەوان دەعوەتن، ئێمە چووین بۆ (تاران) کە لەوێوە بچین (خۆ ڕێگەیەکی ترمان نەبوو، هەر دەبوو لە ئێرانەوە بچین)، بەڵام زۆر هەوڵماندا، نە لەوێوە توانیمان موافەقەمان بۆ بکرێ‌و نەلە ئێرانیشەوە ئاسانکاریمان بۆ کرا، لە ڕاستیدا ئێمە هەم گلەییمان لە برادەرانی ئێران هەبوو، ئەوانیش دەیانگوت کە لەو جۆرە موافەقە ناکەن، هەم لە ئەوانەش کە لە بەریتانیا بوون، هەندێك دۆست‌و خەڵکمان هەبوون دەیانگوت کە لەئێرانەوە ئاسانکارییتان بۆ ناکەن. گرنگ ئەوەیە سەفەرەکەمان بۆ نەکراو هاتینەوە، بەڵام لەوەوە ئەمریکا بەرانبەر ئێمە ڕەشبین بووبێت، تەسەور ناکەم، چونکە ئەگەر ئێمە لێرەوە نەمانتوانی بچین، کە من خۆشم بەنیازبووم بچم، بەڵام لەوێ دووبرامان بەشدارییان کرد، کاك مەلا موشیر گەلاڵی‌و برایەکی ترمان لەوێ بەشدارییان کردو قسەشیان بوو بوو، کە ئێمە مەبدەئییەن لەگەڵ ئەوەداین ڕژێمی بەعس بڕووخێ، دوژمنی گەلانی عیراق‌و میللەتی کوردە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ پشتگیریی سیاسەتی ئەمریکا بکەین، ئەوکاتەش، دیارە ئەو کۆنگرەیە زیاتر بۆ ئەوەبوو کە چۆن تەدابیری ئەوە بکرێ ڕژێم بڕووخێنرێ‌و چی بۆ بکرێ‌و چی لێبکرێ؟ شتێکی وا ڕوون‌و ڕاشکاو نەبوو کە ئەوە بۆ پشتگیریی ئەمریکایە، باسی ئەوە دەکرا ڕژێم چۆن بەربەرەکانی بکرێ؟ ئەگەر ئەمریکا لێیداو ڕووخێنرا، چی بکرێ‌و چۆن بکرێ؟

مەبەستم ئەوەیە کە ئێمە لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی عیراقیدا بووین، لەو کۆنگرەیەو لە کۆنگرەکانی پێشووش، کە لە سەلاحەددین‌و نیویۆرك بەستران، بەڵام ئەوە کەنەمانتوانی بەشداریی بکەین، لەبەر ئەوەبوو کە دەعوەتیان نەرکردبووین، یان لەبەر ئەوەبوو کە ڕێمان بۆ هەموار نەکرا.

**+ واتە کۆمەڵی ئیسلامیی باوەڕی تەواوی بە بەشدارییکردن لەو کۆنگرەیەدا هەبوو؟**

- بەڵێ.

**+ مامۆستا، بێینەوە سەر مەسەلەی ئەنصار، سەبارەت بەو بیروبۆچوونەی ئەنصار هەڵگری بوو، لە ناو ئەو ڕەوتە ئیسلامییەدا مێژووەکەی بۆ کەی دەگەڕێتەوە؟**

ـ ڕەگو ڕیشەی دروستبوونی "جوندولئیسلام" قوڵترە، چونکە لەسەرەتاوە ئەوان بە ناوی "جوندولئیسلام"ەوە خۆیان ڕاگەیاند، لەدوای کۆنگرەوە نییە، بەڵکو لەوەو پێش ئەوانە وەکو ئەو فکرەیە هەبوون، زیاتر لە هێزی دووی سۆراندا بەرجەستە بوون، ئەوکاتەو ئەو کاتەش کەبوونە "جوندولئیسلام"، ئەوان زیاتر لە هێزی دووی سۆران پێکهاتبوون، فیکرەکەش لە ئەسڵدا لە هێزی دووی سۆراندا بوو، ئەوانەش دیارە کە زیاتر کێو کێ کاریگەریی لە سەریان هەبوو.

چۆن ئەو فیکرەیە پەیدا بوو؟ پێموایە شێوەی هەڵسوکەوتکردنی پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ خەڵکی ئیسلامیی، لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا، کاریگەریی زۆری هەبوو، کە وەکو کاردانەوەیەك کەسانێك بیر لە شێوازی توندوتیژیو ڕووبەڕووبوونەوە بکەنەوە، ئێستاشی لەگەڵدا بێت، پێموایە خەڵکێکی زۆری ئیسلامیی لەزیندانەکاندان لای پارتی، بەبێئەوەی کە پرسیاریان لێبکرێ، بەبێئەوەی لێکۆڵینەوەیان لێبکرێ، من نەفەر بۆی گێڕاومەتەوە، گوتوویەتی: "یەك ساڵ گیراوم، حەوت مانگ، شەش مانگ گیراوم، پرسیارم لێنەکراوە کە بۆچی گیراوم؟ یان تەحقیقم لێنەکراوە". هەر لەبەر ئەوەی کە سیمای ئیسلامیی هەبووە، یان زانیویانە کە نوێژکەرەو ئیسلامییە دەستگیرکراوە، بێگومان ئەو بارودۆخە توندوتیژییە کە دروستبوو، کاریگەریی هەبووە.

پاشانیشو بە بۆچوونی من، پەیوەندیی هەندێك لەوانەی کە لە هێزی دووی سۆرانی ئەوسا بوون، یاخود سەفەریان بۆ ئەفغانستان، یان پەیوەندییان بەهەندێ خەڵکی عەرەبەوە، ئەوانەش کاریگەریی تر بوون، فاکتەری دیکە بوون کە ئەو جۆرە فیکرەیە بخەملێت، بۆ نموونە" هەندێ کتێب و نامیلکەی فۆتۆکۆپیکراو. زۆر بە داخەوە، نووسەری موسڵمان هەیە بڕوای بەوە هەیە بۆ خۆی لە لەندەن، یان لە یەمەن، یان لە ئەفغانستان دانیشێ و کتێب و نامیلکە بۆ خەڵك بنێرێ، خەڵك لە وڵاتی خۆی پراکتیزەی بکا، لە شوێنی خۆی، بە بێئەوەی هەلومەرجی ئەو شوێنەی خوێندبێتەوە،

بە بێئەوەی ئەوە لە بەرچاو بگرێ هەر فەتوایەکی شەخصی کە دەردەکرێ، پێویستی بەدوو جۆر زانیاریی هەیە، وەکو (ئیبنولقەییمی جەوزی) لە (إعلام الموقعين)دا دەڵێ: یەکەم، عیلم بەحوکمە شەرعییەکە. دووەم، عیلم بەو واقیعەی کە حوکمە شەرعییەکەی دەربارە دەردەکرێ.

ئەو کتێبو نامیلکە فۆتۆکۆپیکراوانەش کاریگەرییان هەبوو لەسەر خەملاندنی ئەو فیکرەیە، بۆ ئەوەش، ئێمە وە نەبێ هەستمان پێ نەکردبێت، من چەندجار لەگەڵ مامۆستا مەلا عوسمان (بەرەحمەت بێ) باسمکردووە، لەسەردەمی ئەویشدا ئەو فیکرەیە هەبووە، دوایی لەگەڵ مامۆستا مەلا عەلی کە لەدوای مامۆستا مەلا عوسمان بوو بەڕابەری گشتی بزووتنەوەی ئیسلامیی‌و بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی، پێمان دەگوت، ئاگادارمان دەکردەوە کە هەندێ برا لەهێزی دووی سۆران یان هێزەکانی تر ئاوا بیر دەکەنەوە، ئەوە جۆری بیرکردنەوەیانە.

ئێمە (١ ـــ ٢) جاریش هێندێك لەوانەمان دەستگیرکرد، موحاسەبەمان کردن، ماوەیەك گرتمانن، قسەمان لەگەڵ کردن، ئامۆژگارییمان کردن، کە دوایی ناویان لەخۆیان نابوو "حەماس"، هەندێك لەوانە جیابوونەوەو چوون بۆ قەندیل، دوایی لەوێ پارتی هەندی خەڵکی کوشتن، یەکێتیی هێنانیەوە بۆ ناوچەی حزبی سۆشیالیست، لەوێش لەگەڵ حزبی سۆشیالیست تووشی دەمە قاڵێ هاتن، حزبی سۆشیالیستیش گلەییان لە یەکێتیی کرد کە بۆچی ئەوانەتان لە قەندیلەوە هێناوەتەوە بۆ ناوچەکەی ئێمە؟ ئەوەبوو کە دوایی بەهەموویان "ئەنصارولئیسلام"یان پێکهێنا.

وەکو گوتم، ئەو فیکرەیە پێشتر هەبوو، ئێمە دەمانزانی، بەتایبەت بەندە، چونکە من ئاگاداری فیکرەی ئەوانە بووم، ئەوانە هەموو پێشمەرگەی خۆمان بوون، هەندێکیان پێشمەرگەی من بوون لە بەرەی پشدەر، کاك ئاسۆ هەولێریی و ئەو برایانە، ئێمە دەمانناسین، چەند جارێك لەگەڵ مامۆستا مەلا عەلی باسمان کرد کە ئەوە پێویستە چارەسەر بکرێت، بەڵام بەڕاستی، مامۆستا کە دەوری خۆی چۆڵ دەبینی، خەڵکەکەی زیاتر بەنەیاری خۆی دەبینی، چونکە ئێمە گلەییمان لێی هەبوو، ڕەخنەمان لێی هەبوو، لەسەر شێوەی ڕابەرایەتییەکەی، لەسەر ئەوەی کە دەستی کوڕەکانی ئاوەڵا دەکرد بۆ زۆر شت کەئێمە پێمان پێچەوانەی شەرع بوون، پێچەوانەی بنەماکانی

ئیسلام بوون، مامۆستا کە دەوری خۆی چۆڵ دەبینی، ئەوانەی بەهێز دەکرد، هەر چەندە ئێمە پێمان دەگوت کە ئەوانە دوایی زەرەر دەدەن، بەپێچەوانەوە، مامۆستا زیاتر بەهێزی دەکردن، هەتا ئەوەبوو ئەوانە کە هەر پارەو ئیمکانیەتێکیان دەهاتە دەست، چ لەلایەن مامۆستاو ئەوانەوە کە بەتایبەتیش هاوکاریی دەکران و خەڵکی تریش پارەی بۆ کۆ دەکردنەوە، رەنگە لە دەرەوەش هەندێ خەڵك هاوکاریی کردبن، ئەوانە تەرتیباتێکی تایبەتیی خۆیان هەبوو، خەتی پەیوەندییان هەبوو بە دەرێ، خەڵکیان ناردبوو بۆ یەمەن، بۆ ئەفغانستان و بۆ ئەولاو بۆ ئەولا، تەرویجی ئەو فیکرەیەی خۆیان دەکرد، هەتا بەو لەفزە دەیانگوت کە وەکو بڵێی دەوڵەتێك لە نێو دەوڵەتێکدا دروست بکەن: "خۆمان پێبگەیەنین، دوایی خۆمان ئیعلان دەکەین". لەو بارەوە رەنگە لەگەڵ بەندەو غەیری بەندەش قسەیان کردبێ، لەگەڵ من کە قەناعەتم پێبکەن، لەگەڵ هەندێ خەڵکی تر کە "وەرە تۆ ببە برا گەورەمان، ئێمە شتێکی وامان هەیە".

دیارە من بەو برایانەم دەگوت کە پێیان بڵێن ئەوە شتێکی ناشەرعییە، ئێمە کە مامۆستا مەلا عەلی بە رابەر بزانین، دروست نییە شتێکی کە بکەین، پێویستە لە ڕوویدا هەموو شتێ بڵێین، بەڵام ژێر بەژێر شت بکەی، ئەمە بە شەرعی نازانم، تا من ڕۆژێکیان لەگەڵ هەندێکیان زۆر قسەم کرد، گوتم کاکە ئەوە شتێکی ناشەرعییە، چۆن لە ژێرەوە، ڕێکخستنێکی تر دروست دەکەی، لە سەرەوەش کابرا دەعوەت دەکەی؟ وەکو کە مەلا عەبدولغەنییان دەعوەت کرد بۆ بیارەو گایان بۆ سەر دەبڕی و مامۆستا مەلا عەلییان دەعوەت دەکردو دەستیان ماچ دەکردو دەیانگوت بەرابەرت دەزانین و لەژێرەوەش بەشتێکی تریان تەماشا دەکرد، لەلای من دەیانگوت: "نوێژی لەدوا دروست نییە"، من دەمگوت نوێژی لەدوا دروستە، نوێژیشی لەدوا دەکەم، بەهەڵەشی دەزانم و هەڵەکانیشی ڕووبەڕوو بەخۆی دەڵێم، ئەوە بەشەرعی دەزانم، نەك لەژێرەوە شتێك بکەم، هەرکاتێکیش قەناعەتمان هاتە سەر ئەوەی کە خوا حافیزی لە مامۆستا بکەین، تەرتیباتی کاری خۆمان دەکەین و بەئاشکرا دەڵێین: مامۆستا خوا حافیز.

جا ئەوان هەر لەسەرەتاوە ئەو جۆرە فیکرەیان هەبوو، کە من پێشم دەگوتن: "بناغەی کارەتاکەتان ناشەرعییە"، چونکە لەلایەکەوە کابرا بێئاگا دەکەی کە تۆ

بەڕابەری خۆتی دەزانی، کەچی ڕەنگە هەر بەموسڵمانیشی نەزانی، چونکە جاری وا هەبوو دەیانگوت نوێژی لەدوا دروست نییە، موناقەشەیان لەگەڵ من کردووە کە فڵانە کەس دروست نییە نوێژی لەدوا بکرێ، لەبەر ئەوەی فڵان شتەی گوتووەو کوفرە، منیش دەمگوت: باشە، ئەگەر گریمان کابرا کوفریشی گوتبێ، بەوەندە نابێتە ئەوەی کە نوێژی لەدوا دروست نەبێ، چونکە جاری وا هەیە کە کابرا قسەیەکی کوفر دەکا، بەڵام پێی کافر نابێ، دەبێ (اقامة الحجة)ی لەسەر بکرێ.

مەبەستم ئەوەیە کە ئێمە ئاوا ئاگامان لەهەستو نەستو هەڵوێستی ئەو جەماعەتە هەبوو، دوایش کە خۆیان ئیعلانکرد، هەر لەسەر ئەو ئەساسە کەپێشتر لەسەری بوون، خۆیان ئیعلان کرد، دوایی وردە وردە خۆیان فراوانکردو پەیوەندییان بە هەندێ خەڵکی عەرەبەوە کرد و کۆمەڵێ شتیان بۆ خۆیان کرد، کە من ئاگام لە وردەکارییەکەی نییە، بەڵام ئێمە کە هەموو جارێ یەکێتییمان دەبینی، تەئکیدیان دەکردەوە کە ئەوان پەیوەندییان بە کوێو کوێوە هەیە، من نازانم ئەوە تا چ ڕاددەیەك ڕاستە، بەڵام گرنگ ئەوەیە خەملآنی ئەو فیکرەیە ماوەیەك پێشتر بووە، پێش بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی.

**+ دەکرێت کەمێك باس لە لیژنەکەی هەڵوەشاندنەوەی حەماس بکەیت کە جەنابت سەرۆکی بوویت؟**

ـ دوای ئەوەی ئەوانە دروستبوون، من بەسەرۆکایەتیی وەفدێك چووم، لەگەڵیان دانیشتین، کاك حاجی قاسمو چەند برایەکی تریشم لەگەڵ بوون، چووین لەگەڵیان دانیشتین تا قەناعەتیان پێ بکەین کە واز لەو فیکرەیە بهێنن، ئەوانە بەڕاستی ئاستی ئەوەشیان نەبوو کە باش لە قسەکانی من تێبگەن، پێشتر هەر پێشمەرگە بوون، خۆی گرفتی ئەو برایانە ئەوەبوو کە خەڵکی سەرکردەیان تێدا نەبوو، هەموو پێشمەرگە بوون، جا پێشمەرگە تا دوێنێ پێشمەرگە بووەو ئێستا ناوی لێ بنێی ئەندامی سەرکردایەتیو ئەندامی شوورا، پێی شتێکی خۆشە! بەتایبەتیش کە لەلایەنی ئیمانو فەهمو تێگەیشتنو تەقواو تەزکیەوە قووڵ نەبێ، خۆشە تا دوێنێ پێشمەرگە بووە، هاوڕێو برا پێشمەرگەکە کە ئێستا هەر لە بنکەکەی من پاسەوانی دەکا، ئەویش لەوێ بووەتە ئەندامی سەرکردایەتی، ناوێکی گەورەی لەخۆی ناوە. ئێمە چووین لەگەڵیان

دانیشـتین: کاکـه ئـێوه ئەو فیکرەیەتان غەڵەتەو ئاکامەکەشی ئاوا دەبێ. گرنگ ئەوەیە ئێمە (لیژنەیەك) چووین لەگەڵیان دانیشتین، بۆمان ئیقناع نەکران، ئەوانە جەماعەتی "تەوحـید"بـوون، بـەڵام جەماعەتـی "حـەماس" گـرتمانن، دواتـر بـڕیاریاندا لەنـێو بزووتنەوەی ئیسلامیی نەمێنن، لە شوێنی خۆیان دابنیشن، ئێمەش دەرمان کردن، ئەو کاتە بەردران.

**+ بەڵام قەناعەتیان نەکرد؟**

ـ نەخێـر، هەیانـبوو ڕەنگە قەناعەتی کردبێ‌و هاتووەتەوە، بەڵام ئەو کۆمەڵانە هەر مان.

**+ بۆچـی ئـەو فیکـرەیە بەتایـبەت لـە نـێو بـزووتنەوەی ئیسـلامییدا سـەری هەڵدا؟ ئایـا لـە کێشـەکانی نێو بزووتنەوەوە دروست بوو؟ یاخود فیکرەیەکی دەرەکـی بـوو؟ بـاس لـەوە دەکـرێ کـە ڕەنگـە لـە شـارێکی وەکـو هەولێـر ئـەو بیروبۆچوونە زیاتر تەشـەنەی کردبێ، یاخود ئەو کەسانەی لەنێو ''ئەنصار''دا زیاتر ڕۆڵیان هەبوو، هەولێریـی بـوون. ئایا هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو فیکرەیە لە کوردستاندا چی بوو؟**

ـ ئـەمن پـێموایە ناتـوانین پەیدابوونـی ئـەو فیکـرەیە بـۆ یەك هۆکار بگێڕینەوە، من پـێموایە کۆمەڵـێك هـۆکاری هەبـوون، یەکـەم: ئـەو کەشـە سیاسییەی کە لێرە (هەولێر) لـەئارادا بـوو، کە پارتی مزگەوتەکانی داخست، هەر مەلایەك چوار قسەی هەقی بکردایە دەری دەکرد، زۆر بارودۆخـی لـە ئیسـلامییەکان سـەغڵەت کرد، شێوەی هەڵسوکەوتی پارتـی لـە ڕووی توندوتـیژی‌و خەفەکردنـی دەنگـی ئیسـلام‌و چـالاکیی ئیسـلامیی، لـە جیاتـی کـرانەوەی دەرگای وتووێژکردن، پەنابردنە بەر ئیقناع‌و لێکحاڵیبوون، پەنابردنە بـەر شـتی فیزیکـی و توندوتـیژی و زەبـروزەنگ کاریگەرییەکـی گـەورەی هەبـوو لـەو بارەوە، چونکە دیارە هەموو کارێك کاردانەوەیەکی دەبێت.

دوو، پـێموایە تەبیعەتـی هەنـدی گـەنج‌و خەڵکـی شـاری هەولێـرە کـە عاتـیفەو حەماسـەتیان بەسەردا زاڵ بووە، چونکە ئەو برایانە زۆربەیان خەڵکی کەمتەمەن بوون، حەسریش نەبوون لەسـەر خەڵکـی هەولێر، بەڵێ زۆربەیان خەڵکی هەولێر بوون، بەڵام

خەڵکی سلێمانیش‌و شارەزوورو گەرمیانیش‌و شوێنی دیکەشیان تێدابوو، خەڵکی هەورامانیشیان تێدابووە، کە ڕەنگە تەبیعەتی خەڵکی هەورامان نەرمتریش بێت، بەڵام زیاتر خەڵکی هەولێر بوون. وەکو گوتم، تەبیعەتی ئەو گەنج‌و لاوانە، کە زیاتر حەماسەت‌و دڵگەرمییان بە سەردا زاڵە تا قووڵبوونەوە، زیاتر ئەو جۆرە کەسانە دەکەونە ژێر کاریگەریی ئەو فیکرەیە.

سێیەمیش، فیعلەن هەوڵدان بۆ دووبارەکردنەوەی ئەزموونی خەڵکی تر، وەکو تالیبان‌و جەزائیر، لەڕێی ئەو کتێب‌و نامیلکە فۆتۆکۆپیکراوانەوە کە دەهێنران، سەفەرکردنی هەندێ لەوانەی کە ئەنصارولئیسلامیان پێکهێنا بۆ ئەفغانستان‌و یەمەن‌و ئەو شوێنانە، دیدارکردنیان لەگەڵ ئەو کەسانەی خاوەنی ئەو فیکرانەن، دیارە ئەوەش هۆکارێکی تربووە.

هەڵەو کەموکورتییەکانی سەرکردایەتیی ئەوکاتەی بزووتنەوەی ئیسلامیی، بێگومان ئەوەش کاریگەریی هەبووە. کەئێمە دەمانگوت ئاوا چارەسەر ناکرێ، چارەسەر ئەوەیە کە تۆ بەئاشکرا لەگەڵ ئەو سەرکردایەتییە قسە بکەی، پاشان ئەگەر لێی بێهیوا بووی، بە ئاشکرا خۆت بە شێوەیەکی تر ئیعلان بکەی، ئەوان دەیانگوت نەخێر، لە سەرەوە دەستی ماچ دەکەم‌و سەلامی لێدەکەم‌و بێئاگای دەکەم کە تۆ براگەورەو ڕابەری‌و لە بنەوە لاقی دەبڕمەوە، ئەمن پێم دەگوتن کەئێوە هەر لە بناغەوە کارەکەتان ناشەرعییە، ئەوانە هەمووی فاکتەرو هۆکار بوون.

**+ هەندێك جار باس لەوە دەکرێ کە بەشێك لەو ئەندامانەی هێزی دووی سۆران هەر لەسەرەتاوە بیریان توندو جیاواز بووە لەگەڵ بزووتنەوەو بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی، ئەمە تا چەندێك ڕاستە؟**

ـ ئەمن لە سەرەتاوە وام هەست نەکردووە، خەڵکی توند ڕەنگە لەهەموو شوێنێك هەبێ، ڕەنگە ئێمە ئەوسا خەڵکی توندمان زیاتر لەگەرمیان بووبێ، چونکە چەند بەگژاچوون‌و تەقوتۆقێك بوو، لەسەرەتاوە لەگەرمیانەوە دەستی پێکرد، پێموایە خەڵکی توند لەهەموو شوێنان دەبێت کاك هاوژین، واتە ئینسان لە کاتێکدا توند دەبێت کە باش هەلومەرجەکە ناخوێنێتەوە، کە پێویستە چی تێدا بکرێ؟ باشیش فەهمی قورئان‌و سوننەتی نەکردووە، پاشان باشیش پەروەردە نەبووە لەسەر

ئەساسی قورئانو سوننەت کە زەبتی خۆی بکات، لەنێو هاوەڵانیشدا (خوا لێیان ڕازی بێت)، ئەگەر پێغەمبەرﷺ ئەو پەروەردەیەی کە کردنی نەبوایە، خۆ هەر لە مەککە ئەو جۆرە شتانەی کە لێرە لەسەردەستی "جوندلئیسلام"و "ئەنصارولئیسلام"دروستبوون، وەکو پەنابردنە بەر ئەو توندوتیژییانەی کە هیچ ئەنجامێکیان نییە جگە لەسەر بەفەتارچوونو خەڵك سەغڵەتکردنو ئیسلام ناشیرینکردن، لەوێش دروست دەبوون، بەڵام پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: (صبراً)، ڕێگەی نەدەدان، سەرکردایەتییەك هەبوو، قیادەیەکی ڕەشیدی حەکیم، ئێمە بەداخەوە ئەو کاتە ئەو قیادە ڕەشیدە حەکیمەمان نەبوو. وەکو گوتم، ئێمە چەندجارێ ئاگادارمان دەکردنەوە کە شتێکی وا هەیە، حاڵەتێکی وا هەیە و دەبێ چارەسەر بکرێ، لەگەڵیان دانیشن، کەچی لە دژایەتی ئێمە بەهێز دەکران و هاوکاریی دەکران ! !

**+ بنەماکانی فیکری ئەنصار چیبوون؟ گرنگترین ئەو تێبینیانەی کۆمەڵی ئیسلامیی لەسەر فیکری ئەنصار هەیبوون، چیبوون؟ گرنگترین ئەو ئیشکالیەتە فیکرییانەی ئەنصار هەیبوون، چیبوون؟ ئایا وەڵامدانەوەی مەسەلە فیکرییەکانی ئەنصار کە ئەوسا وەڵامتان دابێتەوە، بە دۆکیومێنتکراوی هەن؟**

ــ لەوەی دووەمەوە دەست پێدەکەم، بەڵێ هەمووی هەیە، لە هەر قۆناغێکدا، هێزی پێشمەرگەی خۆمانم کۆدەکردەوە، سەرکردایەتیمان کۆدەکردەوە، هەمووشی بە تۆمارکراوی هەیە، لەسەر ڤیدیۆو لەسەر کاغەز، کۆرم بۆ برایان دەبەست، بۆ خەڵکی خۆمان. یەکەم، بۆ ئەوەی نەکەونە ژێر کاریگەریی ئەو بۆچوونە کاڵ و کرچانەی جوندولئیسلام و ئەنصارولئیسلام. دووەمیش، بۆ ئەوەی ئەوانیش ئەو قسانە ببیستنو لێیان بێتە سەر جادەی حەقو ڕاستی، فیعلەن خەڵکێکیان کە دەکەوتنە ژێر کاریگەریی وتارو کۆڕی ئێمەو بواریان دەبوو کە گوێ بیست بن، دەهاتنەوە، ڕەنگە زیاتر لە دووسەد کەس لەوانە دوایی هاتبنەوە نێو ڕیزەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی، لەدوای ئیعلانکردنی کۆمەڵی ئیسلامیی، ئەمما بنەما فیکرییەکانیان، دەتوانم لە چەند شتێکدا کۆیان بکەمەوە.

**+ ببووره مامۆستا، پێش ئەوەی بچینە سەر بنەما فیکرییەکانی ئەنصار، دیارە کۆمەڵێك نووسینو وتار لەسەر ئاستی ناوخۆو ڕیزەکانی کۆمەڵ، بۆ ئاگادارکردنەوەیان لە هەڵەی فیکری ئەنصار بڵاوکرانەوە، بەڵام بۆ ئەم نووسینو وتارانە زیاتر شێوەی جەماوەرییان وەرنەگرت؟**

ــ ئێمە زۆرجار کۆڕمان دەبەست بۆ خەڵکی خۆمانو پێشمەرگەو کادری خۆمانو ئاگادارمان دەکردنەوە، بەڵام بەپەسەند نەدەزانرا کە ئەوانە لە تەلەفزیۆن لێبدرێن، بۆ هەموو جەماوەر نیشان بدرێن، لەبەرئەوەی بەڕاستی لە عەقڵو تەبیعەتی ئەوانیان ڕانەدەبینی، دەیانگوت دەبینی کاردانەوەیەکیان ببێت، چونکە زۆر تەنگەپرێسکە و کەم حەوسەڵە و زۆر کورتبین بوون، ئێمە لەگەڵ ئەو خۆکۆنترۆڵکردن و شتقوتدانەوەو دەمی خۆگرتنەوەیەشدا، ئەوجار (٣ ــ ٤) جار تەقەیان لێکردین و خەڵکیان لێ بریندار کردین. ئێمە قەناعەتمان وابوو کە تەحەمول ناکەن، تەحەمول ناکەن ئەو ڕاستییانەی ئێمە دەربارەی ئەوان دەیزانین، ئەو هەڵەو کەمو کورتییانەی کە هەیانە، خەڵکیان لێ تێبگەیەنین، دوایی کاردانەوەیەکی خراپیان دەبێت، بەتەئکید ئەوکاتەش دەیانگوت ئەها ئیسلامییەکان یەکتریان کوشت، خۆ کەس نایەت بیخوێنێتەوەو بڵێ کاکە ئەوەیان ئامۆژگاریکار بووە، ئەوەشیان ئامۆژگاریکراو بووە، ئەوەیان لەسەر هەڵە بووەو ئەوەشیان لەسەر هەق بووە، ئەوکاتە وەکو چۆن لەشوێنەکانی تر، کەئێمە هەر دەبیستین لە ئەفغانستان (بۆ نموونە) ئیسلامییەکان شەڕیان کردووە، خۆ ئێمە لێرە نازانین کێ لەسەر حەقەو کێش لەسەر ناحەق، بەڵام گرنگ ئەوەیە ناوی ئیسلام ناشیرین دەکرێ، لەبەر ئەوە، من دەمگوت: برایان! هەر شتێك کە سەردەکێشێ بۆ گرژی لەوان، خۆتانی لێ بپارێزن، بەڵام کە غەیری قیادەمان دەبینین، یاخود خەڵکیان کە دەمانبینین، زۆرجار ئەو شتەمان پێدەگوتن، حاڵیمان دەکردن، خەڵکیشیان هەبوو لێیان ئیقناع دەبوو، دەهاتنە ڕیزەکانی کۆمەڵ، یان وازیان لەوان دەهێنا، بەلای کەمەوە دادەنیشتن، ئەوە هۆی بەجەماوەریی نەکردنی ئەو شتانە بوو.

**+ مامۆستا، با بێینەوە سەر بنەما فیکرییەکانی ئەنصار.**

ــ بنەما فیکرییەکانیان، یەکەم هەڵە کە ئەوان تێی کەوتبوون ئەوەبوو کە کۆمەڵگەی خۆیان نەدەناسی. کاری ئیسلامیو ئەوانەی کە کاری ئیسلامیی ئەنجام

دەدەن، پێش هەموو شتێك، پاش ئەوەی كە دەبێت باش لە قورئانو فەرموودە شارەزا بن، دەبێ ئەو واقیعە چاك بناسن، ئەوان بەڕاستی كۆمەڵگەی كوردەوارییان باش نەناسیبوو، پێیان وابوو هەرچی لەگەڵ ئەوان نەبێ، لەدەرەوەی بازنەی ئیسلامە، بەتایبەت ئەو لایەنە سیاسییانەیان هەموو لە دەرەوەی بازنەی ئیسلام لەقەڵەم دەدا. ئێمە دەمانگوت: تۆ دەتوانی بڵێی غەیری ئیسلام كوفرە، غەیری ئیسلام هەموو بەرنامەكانی تر بەتاڵو كوفرن، بەڵام ناتوانی بڵێی هەموو ئەوانەی شوێن بەرنامەی غەیری ئیسلام كەوتوون، بەبێ ئەوەی تەماشای بارودۆخیان بكەی و تێیان ڕا بمێنی و بزانی ئاخۆ بەچ پاڵنەرێك، لە چ هەلومەرجێكدا، بەچ شێوەیەك كەوتوونەتە شوێن ئەو بەرنامانە، یەك حوكمیان بە سەردا بدەی، چونكە ئەوە پێچەوانەی عەقڵو مەنتیقە، پێچەوانەی ئەوەشە كە ئەهلی سوننەو جەماعەو زانایانی ئیسلام لەسەری ڕێككەوتوون، كە دەڵێن: "قد يكون قول الرجل وفعله كفراً ولا يكون هو كافرا". لەبەر ئەوە مەوانیعی تەكفیر، پەرچەكانی كافركردن ڕێی لێدەگرن، یاخود مەرجەكانی نەهاتوونەتە دی، ئەوان ئەوەیان نەدەزانی، زۆرجار ئێمەشیان هەر بەموسڵمان نەدەزانی، دەشیانگوت، ئێمەشیان هەر بە موسڵمان نەدەزانی، چ جای خەڵكیتر كە لەگەڵیاندا نەبن.

دووەم، ئەوان بەڕاستی نەشارەزا بوون لە ئیسلام، شارەزایی واقیع نەبوون، نەیاندەزانی كۆمەڵگەی كوردەواری موسڵمانە، ئەگەر لادانێكی فیكریو سیاسی و تووشی هەڵەو پەڵەیەكیش بووە، لە چ هەلومەرجێكدا بووە، عوزر بۆ خەڵك بهێنیتەوە، كەسێك نەبووە وەكو پێویست لەژێر چەتری ئیسلامدا دیفاع لە مەزلومیەتی ئەو میللەتە بكات، ئەو میللەتە ناچار بووە بە دوای ڕێچكەی تر بكەوێ، خەڵكی موسڵمانو ئیسلامیی، پێشەوایانی ئیسلام لە مەیدانێدا نەبوون تا خەڵك شوێنیان بكەون، بۆ دیفاع لە مەزلومییەت، بۆ ڕێپیشاندان، بۆچی ئەو خەڵكە ناچاربوو دوای شتی تر بكەوێ؟ مەسەلە كوردییەكە دەڵێ: "ئینسان كە بەرووباردا چوو، دەست بۆ پووشیش دەبا".

پاشان وەكو گوتم، لە قورئانو سوننەت زۆر نەشارەزا بوون، زیاتر ئەوان ئیعتیمادیان لەسەر هەندێك كتێبو نامیلكەی فۆتۆكۆپیكراو بوو، شتی ئامادە، من قسەم لەگەڵدا دەكردنو دەمگوت (بۆ نموونە) ئەوە خوای پەروەردگار وا دە فەرموێ،

قـورئان يـان فەرمـوودە وا دەفەرمـوێ، ئـەوان بەڵگـەيان بـە قـورئان نەدەهێـنايەوە، دەيانگوت: "فـلان كـەس لـە فـلان نامـيلكەدا وا دەڵـێ، ئەبوبەسـير واى گوتووە، ئەبو قـەتادە وايگوتـووە، ئەبـو فـلان وايگوتـووە"، مـن دەمگـوت كاكـە گـيان! گڵـى دوور دەرمانـە، خـۆ ئێمەش وەكو ئەو برايانە تۆزێك لە قورئانو سوننەت شارەزاين، بۆ لەمن نابيسـتى؟ ئـەو برايە شارەزاى واقيعى ئێرە نييە، ئەگەر لێرە بايە، لەوانەبوو وەكو منى بگـوتايە، مـن ئێسـتا چيت پێدەڵـێم، دەڵێم بۆ كارى ئيسلاميى وا باشە، بۆ موسڵمانان واباشـە، بـۆ دينداريـى وا باشـە، ئـەويش ئەگـەر لێرەبوايە ڕەنگـە وەكو منى بگوتايە، پەنـدى "گڵـى دوور دەرمانـە" بەسـەر ئێوەدا دەچەسپێ، هەر لەبەر ئەوە كە ئەو لەوێ بـە عەرەبـىو بـە ئـيمەيلو فـاكس بۆت دەنێرێ، پێتوايە كـە هـى ئـەو زۆر شەرعييە. ئەوەبـوو مـن نامـيلكەيەكيشـم دەكـرد، ئەبوبەسـير نامەيەكـى ناردبوو، لەوێـوە ئـێمەى تاوانـبار كـردبوو بـە هەنـدێ شـت، ئيـنجا من نامـيلكەيەكم لەسەر بەرپەرچدانەوەى كاك ئەبو بەسـير نووسى، دوايى تـەرجەمە كرا بۆ عەرەبى بەناوى (القول البصير في الرد على فتاوى أبي بصير)، كەواتە نەشارەزايى لە قورئانو سوننەت هەڵەى دووەميان بوو.

سـێيەم، شارەزا نەبوون لەبەرنامەى پێغەمبەر ﷺ بۆ دروستكردنى قەوارەى ئيسلاميى، بـۆ بنياتنانـى كـۆمەڵگاى ئيسـلاميى، مـن پـێم دەگـوتن پێغەمـبەران (علـيهم الصـلاة والسـلام)، بەتايـبەت پێغەمـبەرى خاتـەم ﷺ لـە دەعـوەو بانگـەوازەوە دەسـتيان پێكردووە، نـەك لەتەقـەوە، دەبـێ تـۆ خەڵك بانگ بكەيت: "قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّـهِ عَلَـى بَصِـيرَةٍ أَنَـاْ وَمَـنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ" (يوسف : ١٠٨). تـۆ دەبـێ خـەڵك بـانگ بكەيت، خەڵك تێبگەيەنى كە تۆ چيت لێى دەوێت، پێش ئەوەى تەقـەيان لێ بكـەيت خـۆ دەبێت دەعوەتـيان بكـەيت، دەبينـى دەعـوەتت كـردن بـە دەمـتەوە دێـن، پێويسـت ناكـا تەقەيان لێبكەيت، واتە ئەوان بەڕاستى هەر لە ئەساسدا لـە ئەنجامـى ئـەوەى كـە لـە قـورئانو سـوننەت شـارەزا نەبـوون، شـارەزايى واقيعـى مـيللەتەكەيان نەبوون، لـە شـێوازى كارەكەشـياندا زياتـر بڕوايان بەتەقـە هەبوو، ئێمە چـەند محاولەيـەكمان لەگـەڵ كردن تا بێنە نێو كۆمەڵى ئيسلاميى، مەرجێكيان لەسەر دانـاين، گوتـيان بـەو مەرجەى ئەو ڕۆژەى كە ئيعلان دەكرێ، دەبێ يەكسەر لە يەكێتى بـدەين، گـوتمان ئـێمە ڕێككەوتـنمان لەگـەڵ يەكێتـى هەيـە، چـۆن ڕێككـەوتن

هەڵوەشێنینەوە، مەگەر یەکێتیی هەڵیبوەشێنێتەوە، ئەگینا ئێمە هەڵیناوەشێنینەوە، کردیان بەمەرج‌و گوتیان بەو مەرجە ئێمە دێینە نێو کۆمەڵی ئیسلامیی، ئەمڕۆ ئێمە دێین، سبەینێ یەکسەر لە یەکێتی بدەین، بەبێ پێشەکی. گوتمان ئێمە بە شەرعی نازانین، بەشەرعی نازانین وەکو هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامە، پاشان بە شەرعی نازانین لەو ڕووەوە کە ئەمڕۆ چەند بەرژەوەندییەك بۆ ئیسلام بەدیدێت، بەڵام ئایا ئەگەر ئێمە شەڕ لەگەڵ یەکێتی بکەین، چ بەرژەوەندییەك بەدیدێت؟ دەبێ تەماشای بکەین، لە ئیسلامدا تەقەکردن خۆی لەخۆیدا ئامانج نییە، بەڵکو وەسیلەیە، وەسیلەیەك لەکاتی تێکگیراویشدا، ئەگینا ئەگەر ناچار نەکرێی تەقە بکەی‌و پەنا بۆ چەك ببەی، چەك وەسیلەیە‌و ئامانج نییە، ئەوان پێیان وابوو گرنگ ئەوەبوو تەقە بکرێ، گرنگ ئەوەیە شەڕ بکرێت، گرنگ ئەوەیە بڵێی کاکە ئەوە تەقەکرا، ئەوە شەڕ کراو خەڵك کوژرا، ئێمە پێمان دەگوتن هەمیشە دەبێت چالاکیی سەربازیی لە خزمەتی ئامانجی سیاسییدا بێت، ئەتۆ شەڕێك دەکەیت، چالاکییەکی عەسکەری دەکەی، دەبێ بزانی داخۆ چ ئامانجێکی سیاسیی بەوە بەدیدێت، ئامانجی سیاسیی شەرعی، ئەگینا شەڕ خۆی لەخۆیدا ئامانج نییە، خەڵك کوشتن خۆی لەخۆیدا ئامانج نییە، ئیسلام حەزناکا خوێنی خەڵك بڕژێ، نەخوێنی شوێنکەوتوانی خۆی، نەخوێنی نەیارانیشی، مەگەر بەحیساب‌و کیتاب‌و بەتەرازووی شەرع بپێورێ‌و پێویست بێت بڕژێنرێ، ئەگینا نابێ بڕژێنرێ، خوای پەروەردگار ئەو خەڵکەی دروستکردووە بۆ تاقیکردنەوە، دەبێ فەزایەك‌و کەشو هەوایەك بڕەخسێنرێ کە هەموو کەس تیایدا تاقیبکرێتەوە، ئەوەی ئیمان دێنێ، ئەوەی کافر دەبێ، ئیسلام نەهاتووە بەزۆر بەسەر خەڵکدا فەرز بکرێ.

هەڵەیەکی دیکە ئەوەبوو کە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خەڵکیدا بە ئادابی ئیسلامییەوە نەبوو. کابرایەکی هەورامی خەڵکی تەوێڵە، بیارە، شارەزوور هیچ لە ئیسلام شارەزا نییە، تۆ بێنی لە سوونەتانەوە دەست پێبکەی، لەسەر خەڵکییان پێویست کردبوو کە دەبێ حەتمەن ڕیش بهێڵنەوە، نوێژەکان بەجەماعەت بکەن، ئافرەت دەبێ پەچە بکا نەك هەر سەرپۆش، کە زانایان دەڵێن: "پەچە وەکو ئیحتیات ئافرەت بۆی هەیە بیکا، یاخود وا پەسەندە"، مەگەر کەمێك لەزانایان، ئەگینا کەس بەفەرزی نەگرتووە، ئەوان پێش ئەوەی لە ئیمان‌و عەقیدەو تێگەیاندنی خەڵك‌و حەڵاڵ‌و حەرام‌و ئەساسیاتی

ئیسلامەوە دەست پێبکەن، دەهاتن لەو وردە بابەتانەوە دەستیان پێدەکرد، کە زۆریان مەسائیلی خیلافین، زۆریشیان لە ڕەئییە زۆر توندەکانەوە دەستیان پێدەکرد، هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خەڵك زۆر ناجۆر بوو، هەر بۆیە لەو کاتەی کە ئاوابوون لێیان درا، لەجیاتی خەڵك بۆیان بگریایە، خەڵك زۆر خۆشحاڵبوو کە بەو دەردە چوون. ئێمە کەبارمانکرد لە هەورامانو شارەزوور، خەڵك بۆمان دەگریا، خەڵك بەڕیز لەجادەکان ڕاوەستابوون، لەهەموو دێهاتەکانەوە بۆمان دەگریان، خۆمان دەمان بینی. ئینجا ئینسان لەنێو میللەتەکەی خۆیدا، لەنێو خەڵکەکەی خۆتدا جێگەی خۆت نەکەیەوەو وانەکەی کە خەڵك خۆشی بوێی، وانەکەی کە خەڵك باوەشت بۆ بگرێتەوە، چۆن کاری ئیسلامییت بۆ ئەنجام دەدرێ؟

پاشان مەسەلەیەکی تر، ئەوان لەگەڵ لایەنە سیاسییەکان باوەڕیان بەگفتوگۆ نەبوو، باوەڕیان بەدانیشتن نەبوو، ڕەخنەیان لە ئێمە هەبوو: "ئەوە چۆن فلان کەس لەگەڵ مام جەلال تەوقەی کردووەو لەگەڵ فلان کەس تەوقەی کردووە، ئەوە چۆن یەکتریان ماچکردووە؟! هەر دونیا کاول بووە"، هەتا نەك ئەوە، مامۆستا کرێکاری خۆیان کە چاکەتو پانتۆڵی لەبەر کردبوو، گوتوویانە تۆ کافر بووی، هەندێکیان لەسەر ئەوە وازیان لە ئەنصار هێنا، لەبیرمە پێیان گوتبوو: چۆن ئەتۆ چاکەتو پانتۆڵت لەبەر کردووە، کە ئەوە بەرگی کافرانە؟! جا ئەو شێوە تەنگنەزەرییە کە تۆ باوەڕت بەوە نەبێت لەگەڵ خەڵك دابنیشی، لەکاتێکدا پێغەمبەری ئێمەﷺ لەگەڵ هەموو بەشەکانی نەیارانیدا، لە جولەکەو نەصرانی، لە موشریكو مونافیق دانیشتووە، دەعوەتی کردوون، دەعوەتیان کردووە، هاتوون لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ شەڕە شیعریان کردووە، شاعیری موشریکەکان شیعری لەدژی ئیسلام گوتووەو پێغەمبەر ﷺ بە (حەسسانی کوڕی سابت)ی گوتووە ئەتۆش جوابیان بدەوە، جبریل پشتگیریت دەکات، هەروەها وەفدی (نەجران) هاتوون لە مزگەوتی پێغەمبەر موناقەشەیان کردووەو گوتوویانە عیسا (علیه السلام) کوڕی خوایە و حاڵ و حسابی وا، پێغەمبەر ﷺ ئایەتی بە سەردا خوێندوونەتەوە و موناقەشەی لەگەڵ کردوون، لە مزگەوتی پێغەمبەرﷺ، وەك لە (صەحیحی بوخاری)دا هاتووە. بەڵام ئەوان بڕوایان بەوە نەبوو کە گفتوگۆ بکرێو هیچ شتێك بکرێت، دەیانگوت دەبێ تەقە بکرێ.

ئەوانە کۆمەڵێك بوون لە بنەما فیکرییە هەڵەکانی ئەوان.

**+ تێڕوانینی ئەنصارولئیسلامو هەڵوێستیان سەبارەت بە کۆمەڵی ئیسلامیی، بەتایبەت هەڵوێستیان سەبارەت بە جەنابت دیارە، ئەوان زیاتر هەڵوێستەکانیان سەبارەت بە ئێوە بوو؟ ئەوان هەڵوێستو تێڕوانینیان چی بوو لەو بارەوە؟ نەك تەنها هەڵوێستی فیکری، هەڵوێستی کردەیی (عملي)، ئەوەندەی من بیستبێتم چەندجارێك هەوڵی تیرۆرکردنی ئێوەیان داوە، ئەگەر ئەوەمان بۆ روون بکەیتەوە.**

- من لەوەی کۆتاییەوە دەست پێدەکەم، من هیچ زانیارییەکم نییە کە ئەوان هەوڵی تیرۆرکردنی بەندەیان دابێت، ئەو "تی ئێن تی"یەی کە دانرابوو لە مزگەوتی گەورەی خورماڵ، بە بەڵگە بۆمان سەلما کە لایەنێکی سیاسیی غەیری ئیسلامیی لە پشتەوەی بوو، کە ئەوە ئەگەر چەند سەعاتێك پێشتر نەدۆزرابایەوە، منو مزگەوتەکە دەچووینە ئاسمانیێ. سەبارەت بە هەوڵی تیرۆرکردنی بەندە، من هیچ زانیارییەکم نییە، بەڵام ڕەنگە خەڵکیان هەبوو بێت قسەی نەزانانەو نەفامانەی کردبێ، وەك "فڵان کەس کافر بووە بەو شتە"، بەڵام نەمبیستووە هەوڵی تیرۆرکردنم درابێت، هیچ زانیاریم لەو بارەوە نییە، لە برایان هیچم نەبیستووە کە زانیارییەکیان هەبێت، زانیاریی ورد، ڕەنگە قسەی دەماودەم کرابێ، بەڵام دوایی کە بە دوایدا چووین، ساغ کراوەتەوەو هیچ نەبووە.

سەبارەت بە تێڕوانینیان، ئەوان تێڕوانینیان بۆ کۆمەڵی ئیسلامیی ئەوەبوو کە ئێمە لەبەر ئەوەی بە پێی نەهجی ئەوان کار ناکەین، چونکە ئەوان قەناعەتیان وابوو ئێمە هەمو شتی خۆمان تەرتیب بکەین، کامڵی بکەین، بەمامۆستا مەلا عەلی-ش بڵێین تۆ ڕابەری، ڕابەری تا خواحافیزی لێدەکەین، کە ڕەنگە شێوازی لابردنی دیکەشیان فکر لێکردبێتەوە، شێوازی توندوتیژی، ئێمە ئەوەمان لەلا مەرفوز بوو، دەمانگوت مامۆستا برای گەورەیەو بەیعەتمان پێداوە، دەبێ بەئاشکرا بەیعەتەکەی هەڵبووەشێنیتەوە، دوای ئەوەی ئیقامە حوججەی لەسەر دەکەین، هەر بۆیە ئێمە دوای دەرکەوتنی ئەنجامەکانی کۆنگرەی مانگی ئابی ٢٠٠٠، کۆنگرەی یەکەمی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی، (٩) مانگ ئاراممان گرت لەسەر مامۆستا مەلا عەلیو ئەوان، چەندجار من

خۆم چووم بۆ ماڵیان، چووین بۆ مقەڕیان، لەگەڵیان دانیشتین، تکامان لێکردن، ڕازیبووین مامۆستا مەلا عەلی (ئەوەی ئێستە بێتەوە یادم) (١٢) کەس لەوانەی کە دەرنەچوون، بێنێتەوە نێو سەرکردایەتی، هەر ڕازی بێت، هەر ڕازی نەبوو، ئێرانییەکان هاتنە بەینەوە، ئێرانییەکان هەموو جارێ دەهاتنە لای ئێمە، ئێمە پێمان دەگوتن: فەرموون بچنە لای ئەوان، ئێمە برای تەباین. برایانی یەکگرتوو هاتنە نێوانەوە، مامۆستا سەڵاحەددین‌و ئەوان، خەڵکی عەشایەرو عولەما، مامۆستایان، هەرچی دەهات بۆ لای ئێمە، بەمەمنوونی بەڕێمان دەکردەوە، بەس کە دەچوو بۆ لای مامۆستا، تووشی ئاستەنگ دەبوو. مەبەستم ئەوەیە جەماعەتی ئەنصار قەناعەتیان وابوو کە دەبێ تۆ هەموو شت بکەی‌و فێڵ لە مامۆستا بکەی‌و هەر وابزانێ کە بەڕابەری دەزانی، دوایی سەرنگونی بکەی، ئێمە بڕوامان بەوە نەبوو. جا ئاوا تەماشای ئێمەیان دەکرد کە شتێکمان کردووە پێچەوانەی حیکمەتە، بەحسابی ئەوان نابێ، دەبێ تۆ شتی خۆت بکەی‌و فێڵ لەکابرا بکەی، دەشیانگوت شەرعییەو فەتوامان بۆ دراوە، کاکە کێ فەتوای بۆ داون، ئەوە دروست نییە؟! ئەوە نیفاق‌و ئیزدیواجییەتە، دەیانگوت: "فەتوامان وەرگرتووە، دروستە تۆ هەموو شتی خۆت بکەی‌و کابراش وابزانێ کە تۆ هەر بەڕابەری دەزانی، بەڵام بەهیچیشی نەزانی، هەر بەموسڵمانیشی نەزانی، هەتا ئیشی خۆت تەواو دەکەی"، ئێمە دەمانگوت کە ئەوە بەشەرعی نازانین، هەر شێخێکیش ئەم فەتوایەی داوە، بە غەڵەتی داوە، ئەم فەتوایە ئێمە بەهەڵەی دەزانین.

سەبارەت بە بەندەش، دیارە کە برایانی کۆمەڵی ئیسلامیی منیان کرد بە برا گەورە، بەتەئکید کە بەرانبەر کۆمەڵی ئیسلامیی ئەوە هەڵوێستیان بێت، ئێمە بەبێ حیکمەت بزانن لەو ڕووەوە، بەپێی ئەوەی کە بەنەخشەو بەرنامەی ئەوان کارمان نەکردووە، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی نێو بزووتنەوەی ئیسلامیی‌و بزووتنەوەی یەکبوون، ئەوە دیارە بەرانبەر بە بەندەش هەر ئاوا بوون، بەڵام پڕوپاگەندەشیان زۆر لە دژی بەندە دەکرد، لەبەر ئەوەی کە من وتارم دەدا، چالاکیی‌و شتمان هەبوو، خەڵکیمان کۆدەکردەوە، ئەو شتانەی کە من دەمگوت، کاریگەرییان هەبوو لەسەر خەڵکی ئەوان، وەکو گوتم (٢٠٠) کەسێکیان لێهاتەوە نێو ڕیزەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی، زۆر قەڵس دەبوون بەقسەکانی من‌و زۆر پێی نارەحەت دەبوون. جا ڕەنگە ئەو

فیکرەی کە بڵاو بۆتەوە کە گوایە بەنیاز بوون بەندە تیرۆر بکەن، لەوەوە سەرچاوەی گرتبێ، چونکە بەوجوودی من زۆر قەڵس بوون، ڕەنگە باسیان کردبێ ئەگەر فلان کەس نەبوایە، ئەوا هیچ گرفتمان نەبوو، ئەو خەڵکە هەموو دەبوون بە ئەنصار، هەتا کە "جوندولئیسلام" خۆیان ئیعلان کردبوو، گوتبوویان پێشمەرگەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی هەموو دێن بۆ لای ئێمە، بەو خەیاڵەوە خۆیان ئیعلان کردبوو، چونکە ئەوان دوای کۆمەڵی ئیسلامیی خۆیان ئیعلانکرد، گوتبوویان ئەگەر ئێمە خۆمان ئیعلانکرد، هەموو دێن بۆ لای ئێمە، نەیانزانی کە ئێمە خەڵکمان تێگەیاندووەو پەروەردەمان کردووە، خەڵکی ئێمە هۆشیارەو ئەوە نییە بە چوار قسەی عاتفیی سەرکێڵ هەڵخەڵەتێ، بە کورتی ئەوە تێبینیو سەرنجیانبوو لەسەر ئێمە.

**+ ئەوان شتێکیان لەناو ئیسلامییەکاندا بڵاو کردەوە، گوایە "مامۆستا عەلی باپیر پیاوی ئێرانە، کۆمەڵیش ئێران لەپشتییەوەیەتی"، ڕەنگە سەبارەت بە کۆمەڵی ئیسلامیی قسەی تر هەبووبێت، خەڵکێکی تر وتبێتی کە "ئەمە دەستی یەکێتییە"، ئەوەندەی من بزانم ئەنصار لەسەر ئەو ڕەوتە ئیشی دەکرد، ئایا من لەم بارەوە پێکاومە؟**

- بەڵێ، بەڵێ، ئەوان لە هەرشوێنەو لە هەر کاتە شتێکیان دەگوت کە بۆ ئێمە خراپ بێو بۆ خۆیان باش بێت، ئیدی بێئەوەی بزانن کە درۆیە یان ڕاستە، ئەمن لەبرایانی خۆمانو لەوانیشم بیستووە کە گوتوویانە "دروستە درۆ بکەی مادام مەسلەحەتێکی شەرعی پێ بەدیبێت". بە داخەوە، من پێم سەیر بوو، چونکە بەڕاستی خەڵکی بەتەقواو خەڵکی دڵسۆزیشیان تێدابوو، بەس پێم سەیربوو چۆن خۆیان ئیقناع کردبوو؟! کێ وای هەڵخەڵەتاندبوون کە دروستە هەندێ درۆ بکەی، یان دروستە هەندێ بوختانو درۆ بۆ من بکرێ بۆ ئەوەی ناشیرینیم بکەن، تا خەڵك قسەم لێ وەرنەگرن، ئەوە لەبەر ئەوەی فلان کەس ئەگەر هەبێ، ئیشی ئێمە پەکی دەکەوێ.

کۆمەڵی ئیسلامیی پڕوپاگەندەی زۆر بۆکراوە، هەم بەتایبەت لە سەرەتای خۆئیعلانکردنو سەرهەڵدانیەوە، هەم لەلایەنی ئەنصارەوە، هەم لەلایەنی خەڵکی دیکەشەوە، چ ئیسلامییو چ غەیرە ئیسلامیی.

یەکێك لەو پڕوپاگەندانەی کە کراوەو زۆر پێچەوانەی واقیعەو درۆیەکی زۆر ڕوون‌و ئاشکرایە، ئەوەیە کە کۆمەڵی ئیسلامیی ئێران لەپشتییەوە بووە، بەڵام من پێتان دەڵێم، دوای ئەوەی کە کۆمەڵی ئیسلامیی خۆی ئیعلانکرد، برادەرانی ئێران منیان بەڕەسمی دەعوەت کرد بۆ ئەوەی پێم ڕابگەیەنن کە ئەوان زۆر ناڕازین لە خۆ ئیعلانکردنی کۆمەڵی ئیسلامیی، بێئەوەی پرسیان پێ بکرێت، ئەوان لەنێوانماندا بوون وەك وەساتە، بۆ ئەوەی پێکمان بێننەوە، دوایین جارو پێش ئیعلانکردنی کۆمەڵی ئیسلامیی، من لە تاران پێم گوتن، گوتم: من ئەوە ئاگادارتان دەکەمەوە، ئێوە چەندجار مەرجتان دانا لەسەر ئێمەو مامۆستا مەلا عەلی، ئێمە پابەندبووین بەمەرجەکانەوە، مامۆستا پابەندنەبوو، هەمیشە ئێمە تەنازولمان بۆ ئەو کردووەو ئەو نایکا، ئەوە کۆتاجارەو ئێمە چیتر ڕاناوەستین، خەڵکەکەمان بەڕاستی تووشی نائومێدی‌و بێهیوایی بوون، لەبەر ئەوە من ئاگادارتان دەکەمەوە، هەر کاتێك بیستتان کۆمەڵی ئیسلامیی ئیعلانکرا، ئەوە لاتان سەیر نەبێت.

ئەوان گوتیان: "نا، چۆن شتی وا دەبێ‌و نابێ‌و..؟"، گوتم ئەوە من ئاگادارم کردنەوە، (وقد أعذر من أنذر)، تەنانەت ئەوەشم پێگوتن، دوایی ئەوەبوو کە ئێمە کۆمەڵی ئیسلامییمان ئیعلانکرد، ئەوان زۆر تووڕەبوون‌و قەڵس بوون، هەڕەشەیان لەمن کرد، گوتیان: "ئێمە سنوورەکان دەبەستین‌و هیچ مامەڵەیەکتان لەگەڵ ناکەین، بەڕەسمی ناتانناسین"، دوایی لەوێوە وەفدێکی پایەبەرزیان هات، یەك داوایان لەمن هەبوو، گوتیان: "بەس ناوی کۆمەڵی ئیسلامیی بگۆڕەو بیکەنەوە بە بزووتنەوەی ئیسلامیی، مامۆستا مەلا عەلی–ش ئیقناع دەکەین بێتەوە ناوتان، یا لەماڵی خۆی دانیشێ"، گوتم: ئەمڕۆ ناوم پێ بگۆڕن، سبەینێ نێوەڕۆکیشم پێ دەگۆڕن، ڕازی نابین، هەندێ لەبرایان بۆچوونیشیان وابوو دەیانگوت: "جا مامۆستا قەیچێکا، مادام ئەوان دەڵێن ئێمە مامۆستا مەلا عەلی ناچار دەکەین یان لە ماڵی خۆی دابنیشێ، یان هیچ پەیوەندیی پێتانەوە نابێ، ناشهێڵین بە ناوی بزووتنەوەشەوە کار بکات". ئەو وەعدەشیان پێداین، من گوتم: داوای لێبوردنم هەیە و ناتوانم، گوتیان: "ئاخر دوایی ئێمە بەنوقتە لەسەرتان حساب دەکەین، ڕاوێژتان پێنەکردووین، پاشان ئەو تەکلیفەشمان قبوڵ ناکەن کە بۆ خۆشتان باشە، چونکە بزووتنەوە ناوێکە ناوی

ڕۆشتووەو ناوی کۆمەڵی ئیسلامیی ناوێکی تازەیە"، گوتم بەهەرحاڵ، لەبەر ئەوەی لەژێر ناوی بزووتنەوەی ئیسلامیی پێشوودا کۆمەڵێك سلبیاتو کەموکوڕی کراوە، ئێمە دەمانەوێ لەوەش ڕزگارمان ببێ، ناوەکەش ناگۆڕین، بەعاجزی هەستانو ناوەکەشمان نەگۆڕی، مەبەستم ئەوەبوو ئەو پڕوپاگەندانەی کە کراون، ئەوە واقیعەکەی بووە.

سەبارەت بەیەکێتیی‌و غەیری یەکێتیی، ئەوە خۆ ئێستا دیارە چۆنین، ئێستا چۆنین کاتی خۆیشی هەر وابووین، بەڵام ئێمە بڕوامان بەوە هەبووە کە لەگەڵ خەڵك هەڵسوکەوت بکەین، مامەڵە بکەین، مودارا بکەین، هاوکاریی یەکتر بکەین لەسەر ئەو شتانەی کە بە قازانجی میللەتەکەمان تەواو دەبن، لەگەڵ یەکێتیش‌و لەگەڵ پارتیش‌و لەگەڵ حزبی سۆشیالیستیش، لەگەڵ هەموو ئەو لایەنانەی کە لەسەر گۆڕەپانەکە لەگەڵمان بوون، چ ئیسلامیی‌و چ غەیرە ئیسلامیی، هاوکاریی بکەین لەسەر ئەو شتانەی کە بە قازانجی میللەتەکەمان تەواو دەبن، لە چوارچێوەی شەرعیشدا جێگەیان دەبێتەوە، ئەوە ستراتیژی کارمان بووە، سیاسەتمان بەو شێوەیە بووە، ئیدی کە دوایی یەکێتیی لەگەڵ ئێمە ڕێککەوتنی کرد، ئەوە مانای وانییە کە بەدەست لەپشتدانی ئەوان بووە، نا، من کەڕازی نەبم بەکۆمارێکی ئیسلامیی، بە دەوڵەتێکی گەورەی ئیسلامیی کە هێزێکی گەورەی وایەو کاریگەریی هەیە لەسەر یەکێتیش‌و پارتیش‌و هەموو ئەولایەنانەی کە لە کوردستاندا بوون، ئێستاش کاریگەریی لەسەر ڕووداوەکان‌و گۆڕانکارییەکانی عیراق هەیە، ئەگەر ئامادە نەبم ڕاوێژ بەوان بکەم، هەر ڕاوێژکردن‌و پرسپێکردن بۆ پاراستنی سەربەخۆیی خۆم، چۆن لەژێر کاریگەریی لایەنێکی سیاسیی لائیکدا دەبم، بێگومان ئەوە شتێکی زۆر نابەجێیە.

**+ ئەو کەسانەی ڕێکخراوی ئەنصاریان پێکهێنا، لە ناو جیهانی عەرەبی بەگشتی‌و بەتایبەتیش لە دەوڵەتانی کەنداو فیکرەکەیان ڕەواجێکی هەبوو، خەڵکێك زیاتر ئەوانی بڕووز پێدەکرد، ئەنصار لەو ڕووەوە تا چەندێك کاریگەریی لەسەر شێواندنی وێنەی کۆمەڵی ئیسلامیی هەبوو؟**

ــ لە ڕاستیدا کاریگەریی سەلبییان هەبوو، بە داخەوە، ئێمە لە ڕووی پەیوەندییەکانی دەرەوەمان، پەیوەندیمان وەك پێویست کۆنترۆڵ نەبوو، تەنها مەکتەبێکی پەیوەندییەکان کە هەمان بوو، ئەوەبوو کە لە تاران بوو، هەوڵماندا لە

توركیاو لە سوریا مەكتەب بكەینەوە، سەركەوتوو نەبووین، بۆمان نەكرا، بەڕاستی وەك پێویست خەڵكو دۆستمان لە وڵاتانی كەنداوو لە وڵاتانی تر نەبوو تاكو دەنگی ئێمە وەكو خۆی بگەیەنن، دەنگو ڕەنگی ئێمە وەكو خۆی پیشان بدەن، ئەوانیش پێشتر كاریان بۆ ئەوە كردبوو، خەڵكیان هەبوو، لەبەر ئەوە پڕوپاگەندەو چەواشەكارییەكانی ئەوان جێگەی خۆی دەگرت، دەنگە حەقەكەی ئێمە، ڕەنگە حەقەكەی ئێمە وەك پێویست نەدەكەوتە بەرگوێو چاوی خەڵك، ئەوە كاریگەریی سەلبی هەبوو، ئێستاشی لەگەڵدا بێ شوێنەواری هەر ماوە، ئەوان بە ئینتەرنێت زۆر شتیان لەسەر ئێمە بڵاو كردەوە، وەكو گوتم، كاك ئەبوبەسیر كە لە (لەندەن) دادەنیشت، چەندجارێك فەتوای نارد بەبێئەوەی ئێمە بناسێ، هەر لەبەر ئەوەی كە ئێمە لەگەڵ یەكێتیی دانیشتووین، یان لەگەڵ پارتی، یان ئەو لایەنە سیاسییە كوردستانییانە، ئەوەیان خستبووە گوێیەوە كە ئەوە لەدژی خەڵكە، ئێمە گوتمان "جوندولئیسلام" كە پێشتر بوون، خۆ ئەوە نەبوو ئێمە لەدژیان بووەستین، یان هیچ شتێكیان لەدژ بكەین، ئێمە بەزەییمان بەعەقڵو بەو چارەنووسەیاندا هاتەوە كە دوایی تووشی بوون، ئەگینا بەڕاستی ئەوە نەبوو كەئێمە دژایەتییان بكەین، خۆ ئێمە ئەوەندە بێئیش نەبووین دژایەتی لایەنێكی ئیسلامیی بكەین، ئەوان وایانخستبووە گوێیان كە ئێمە چی دانیشتنو كۆبوونەوەو ڕێككەوتن كە لەگەڵ یەكێتیو لەگەڵ پارتیو ئەملاو ئەولا كردوومانە، هەمووی لە دژی ئەوانە، كە ئەوە هەمووی زۆر پێچەوانەی حەقیقەت بوون، هەر بۆیەش من شتێكم نووسی، ئەوكاتە لە دوای ئەوەبوو كە ئێمە بارەگاكانمان گواستەوە بۆ ناوچەی (دارەشمانە)، لە ژێر ناونیشانی (أنصار، أم أغمار؟)، كە حەقیقەتی ئەو تاقمو پێڕەم بەڕاستی ڕوون كردەوە، كە ئەوە حەقیقەتو حاڵیانەو یەكێك لە خاڵە سلبییەكانیان ئەوەبوو كە سەركردەكانیان دوای ئەوەی بارەگاكانیان مووشەكبارانكران، هەمووی دەرچوونو پێشمەرگەكانیان بە كوشت دان، بەتایبەت ئەوانە كە میوانیان بوونو غەریب بوون، ئەوان ڕێیان پێ نەدەزانی، هەموو تەرمەكانیان لەو شاخو داخەدا كەوتنو بەرپرسەكانیشیان هەموو وەكو بەرزەكی بانان بۆی دەرچوون، ئەوەش زۆر پێچەوانەی شەرعە، چونكە (الإمام جنّة)، وەكو عەرەب دەڵێ: "إنّما جعلتك إمامي لتكون أمامي"، دەبێت هەردەم لە

پێشـەوە بـیت. هەڵبـەت خـوای پـەروەردگار منـی کردە بەڵاگێڕی کۆمەڵی ئیسلامیی بە هـۆی گیرانمـەوە، مـن پـێموایە ئەوە واجبی شەرعی خۆم بوو، تۆ دەبێ بەڵا لەو خەڵکە بگێڕییەوە، نەك ئەوان بەربەڵاکەی و بۆ خۆشت بۆی دەرچی.

**+ مامۆستا، باسـی عەرەبەکانت کرد، لە هەندێ کەناڵی ئاسمانییەوە باس لەوە دەکرا کە "دوای جەنگی ئەفغانستان، ڕێکخـراوی ئەلقاعیدە پەرتـەوازە بـوون، کۆمەڵـێك لـەوان، کۆمەڵـێك لـە عەرەبـەکان لەوانـەی کـە لـە ڕێکخـراوی ئەلقاعیدەدا بـوون، گەیشتنە چیاکانی سنووری ئەنصارولئیسلام". هێندەی ئێوە ئاگادار بن، تا چەندێك ئەوە ئەسڵی هەبوو؟ ئایا ئەو عەرەبانە پاشماوەی ئەلقاعیدە بوون، یا خەڵکی دەوروبەری عیراق بوون؟**

ـ لەکاتـی لێکۆڵیـنەوەدا لەزیـندان زۆر ئـەو پرسـیارەیان لێدەکـردم، وەڵامـی مـن ئەوەبـوو، بەڕاسـتی مـن بەبەڵگـەوە هـیچ شـتێکم بەدەسـتەوە نەبـوو، چـونکە ئـێمە تێکەڵیمان لەگـەڵ ئەنصـار بایـی ئەوەنـدە بـوو کـە قەناعەتـیان پـێ بکەین، تا واز لەو فیکـرەیە بهێـنن، ئەوەنـدە بـووە کـە ئامۆژگارییـان بکـەین، هـیچ پەیوەندییەکی کەمان لەگەڵـیان نەبـووە تاوەکو لە نهێنییەکانیان ئاگادار بین، ئەوانیش ئەو عەرەبانەی کە لە گەڵـیاندا بـوون، زیاتـر لـە دوورەوە دایـان دەنـان، لە سەربازگەیەك، کەمتر دەیانهێشت تـێکەڵ بـەو شـوێنانە بـبن کـە بنکەو بارەگاکانی ئێمەی لێبوون، بۆ ئەوەی نەکەونە ژێر کاریگەریـی لـێدوان‌و بیروبۆچـوونەکانی ئـێمە، بـەڵام ئەوەنـدەی کـە ئـێمە لـە یەکێتیـی دەمـان بیسـت کـە خەڵکی قاعیدەیان لەناودایەو ئەبو موسعەبی زەرقاوی لەوێیەو لەوێ بـووەو خەڵکـی تـر، بەڕاسـتی ئـەوە قسـەی ئـەوان بوو، من وەکو خۆم‌و ئەوەی کە من ئاگـادارم، هـیچ بەڵگەیـەکم بەدەستەوە نەبوو کە خەڵکی قاعیدەی لێ بوو‌بێت‌و هاتبێت، ڕەنگـە هاتبێتیشـن، نـازانم، بـەس مـن وەکـو خۆم هیچ شارەزاییەکم لەو بارەوە نەبوو، زانیارییەکی وا کە پشتی پێ ببەسترێ.

**+ واتە ناتوانین بڵێین ئەوانە پاشماوەی قاعیدە بوون؟**

ـ هـیچ زانیارییـەکم لـەو بـارەوە نییە، ڕەنگە هاتبیشن، من نازانم، مام جەلال چەند جـار باسـیدەکرد کـە مـن تەئکیدم‌و بەڵگـە هەیـەو دەلـیل هەیـەو شـتیان هەموو تۆمار

کراوە، پەیوەندییەکانیانو ئەوانە، ئیدی خۆ ئەوە هیچ شتێکی پێشانی من نەداوە، کەسێك کەلایەتی، دەبێ ئەو شتانە دەرخا، من کە هیچمم لا نییە، دەڵێم نازانم.

**+ مامۆستا، بێینە سەر شێوەی پەیوەندیی ئەنصار لەگەڵ کۆمەڵی ئیسلامیی. لە ڕووی مەیدانییەوە، ئەو پەیوەندییە چی بوو کە گرووپی ئەنصارولئیسلامی بە کۆمەڵی ئیسلامیی دەبەستەوە؟**

- هیچ پەیوەندییەکی مەیدانیمان نەبوو، بنکەکانی ئەوان جیابوون، بنکەکانی ئێمە جیابوون.

**+ مەبەستم لە ڕووی مەیدانی، لە ڕووی جوگرافییەوەیە، نەك ئەوەی لە مەیدانی شەڕدا بە یەکەوە بووبن.**

- نا، لەڕووی جوگرافییەوە بنکەکانمان لێك نزیکبوون، بەڵام ئەو نزیکییە نا کە هی ئێمە پێش هی ئەوان مووشەکباران کرا، لێك نزیکبووین بەو مەعنایە، کە دیارە ئەوان هەوڵیان دەدا لە خورماڵ بنکەیان هەبێت، گوتمان هەر شوێنێك لەژێر کۆنترۆڵی ئێمەدا بێ، نابێ ئێوە بنکەتان لێی هەبێت، بەڵامماڵیان لەوێ بوو، ماڵەکانمان پێ دەرنەکرا، لەگەڵ یەکێتیش باسمان کرد، گوتمان ئێمە ئیمکانیەتمان نییە لەشوێنی تر خانوویان بۆ دروست بکەین، بەڕاستی وەکو لایەنێکی ئینسانیش، ماڵو خێزانیان بۆ کوێیان بەرین، خانووبەرەشیان نییە، جا ئەوان ماڵو منداڵیان لەناو ئێمەدا هەبوو، ئەگینا بنکەو بارەگایان نەبوو، دوور بوون لەئێمە، بەڵام جارجار کە خەڵکی ئێمەو ئەوان یەکتریان دەبینی، تەبعەن پێشمەرگە لە بازاڕی خورماڵ هەر یەکتر دەبینن، یان ئێمە ئەگەر جارێك خەڵکێکمان چووبێتە بیارە، یاخود ئەوان ئەگەر وەفدێکیان دەهات، کێشەیەك دەبوو، یان ئێمە بانگمان دەکردن بۆ ئەوەی کە ئامۆژگارییان بکەین، چەند جارێك ئەوەبوو، هەموو هەوڵو ماندووبوونێکی ئێمە بۆ ئەوەبوو کە ئامۆژگارییان بکەین تا دەستبەرداری ئەو فیکرەیەو ئەو بۆچوونانەی خۆیان بن، کە خۆیان زیانی لێ دەکەن، موسڵمانانیش زیانی لێدەکەن، زیان بەئێمەش دەگەیەنن.

**+ گرووپی ئەنصار زۆر کاری نادروستیان بەناوی ئیسلامەوە دەکرد، زۆر گرفتیان بۆ کاری ئیسلامیی لەکوردستان، بەتایبەت بۆ کاری کۆمەڵی**

**ئیسلامیی دروست دەکرد، لە بەرانبەردا، زۆرجار کۆمەڵ بە چاوپۆشین لەو کارانەی ئەنصار تاوانبار دەکرا، ئەوەی گوایە لەژێر باڵی (کۆمەڵ)دا ئەو کارانەیان دەکرد، بەتایبەت هێرشکردنە سەر هێزەکانی یەکێتیی نیشتیمانی. ئەوە تا چەندێك ڕاستە؟**

- سەبارەت بە یەکترکوشتنی ئەنصارو یەکێتیی، پێمان وابوو ئەوە شەڕ بووە، من لەو بارەوە عەدل دەڕۆم، قسەی حەق بۆ هەرکەسێ بوو دەیکەم، یانی یەکێتیی ناوی تیرۆرو تیرۆرست لەوان دەنێ، لەبەر ئەوەی ئەوانیان کوشتووە، من پێموابوو ئەوە شەڕ بوو، لەشەڕدا کێ دەرفەت لەکێ ببینێ شەڕ دەکا، ئەنصار دەیانگوت یەکێتیی دەستپێشخەر بووە، یەکێتیی دەیانگوت ئەوان دەستپێشخەر بوون، یەکێتیی جاری وا هەبووە بە ناشێیی بە ناو ئەڵغامدا کەوتوون و خەڵکێکی زۆریان لێ کوژراوە، جاری وا هەیە ئەنصار شەبەیخونیان کردۆتە سەر ئەوان، بەنیسبەت ئەو یەکتر کوشتنەوە ئاوابووە، ئەوەی من تێبینیم لەسەری هەبووبێت، لەسەر دیل کوشتنەکە بووەو پێشم گوتن: من بەقسەی خۆتان دەتانگرم، ئێوە دەڵێن یەکێتی بەموسڵمان نازانین، هەرچی لە ڕیزی یەکێتیش بێت بەموسڵمانی نازانین، تۆ ئەگەر بەموسڵمانی نازانی، وەختێ کە بەدیلی دەگری، دەبێ داوای موسڵمانبوونی لێبکەی، ئەگەر موسڵمان نەبوو، ئەوجار بیکوژی، بەڵام ئێوە ئەو دیلانەتان کوشت بەبێئەوەی داوای موسڵمان بوونیان لێبکەن، من بە (ئەبو وائیل)م گوت کە (قازی)یان بوو، گوتی: "وەڵڵاهی شێخ ڕاست دەکەی، وەڵامیشم پێ نییە، بۆ ئاگادارییت، پرسی منیشیان نەکردووە کە کوشتوویانن"، گوتم: ئەی تۆ چ قازییەکی؟ گوتی: "ڕاستییەکەی پێش ئەوەی بیانهێننە لای من کوشتوویانن"، گوتم، چونکە ئەوانە مادام تۆ بە موسڵمانیان نازانی، دەبێ داوای موسڵمانبوونیان لێبکەی، وەرە موسڵمان بە، ئەگەر موسڵمان نەبوو، ئەو جا بیانکوژی[8]. بیستوومە کابرا گوتوویەتی کاکە مەمکوژن بەخوا بەڕۆژووم، یا نوێژی بەیانیم کردووە ! !

---

[8] لێرەدا قسە بەپێی عەقڵییەتی ئەوان دەکەم و دەمەوێ بە قسەی خۆیان بیانگرم، نەك خۆم ئەوەم پێ ڕاست و ڕەوا بێ.

بۆیه پێموایه ئەو یەکترکوشتنانەی ئەوان و یەکێتیی زەرەری بۆ هەردوولایان بووە، بەڵام پێشموایه یەکێتیش هەندێك شەڕ دەیتوانی خۆی لێ لابدا، تۆ ئەوە ئەنصار بۆت لە مەیدانێ ڕاوەستاوەو موشتەری شەڕییە، یەکێتیی دەیتوانی خۆی لێ دوور بگرێ، بەڵام ئەوانیش جاری وا هەبوو نەخشەو پیلانیان دادەنا کە پێیان وابوو گورزی چاك لە ئەنصار دەدەن، دوایی بەسەر خۆشیاندا دەشکایەوە، چەندین جار شتی وابووە، من بیستوومە خۆشیان لە نێو خۆیاندا گلەییان لەخۆیان کردووە.

سەبارەت بە شتی دیکە، ئەوەی من زۆر تێبینیم لەسەری هەبوو، مامەڵەیان بوو لەگەڵ خەڵك، خەڵکیان سەغڵەت دەکرد، من بیستوومە لۆریە سابوون هاتووەو لەبەر ئەوەی وێنەی ئافرەتی تێدابووە، لەسەر کابرایان پێویست کردووە کە هەموو وێنەی ئافرەتەکان بەمووس لێبکاتەوە، لەبەر ئەوەی ناشەرعییە !! جا ئەوە ئەزیەتدانێکی زۆری خەڵکە بە بێ هیچ بەڵگە و پاساوێك، یان ئافرەت دەبێ بەپەچەوە بێت، ئینجا حەتمەن دەبێ پیاوان هەموو بێن بۆ نوێژی جەماعەتو ڕیش بهێڵنەوە، یان هەندێك کەس ئەگەر هەڵەی شەرعی کرد باجیان لێ سەندووە، پارەیان لێسەندووە، دیارە ڕەنگە هەندێ زیادەڕەوی خەڵکیش هەبووبێ، بەڵام ئاوا چارەسەر ناکرێ و ڕەنگە هەندێ شتی خراپتریش لەوانەیان هەبووبێت کە لەگەڵ خەڵکی کردوویانە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە بەڕاستی بیروبۆچوونەکانیان زۆر کاڵو کرچ بوون، سەبارەت بە تێگەیشتن لە ئیسلام و کاری ئیسلامیی و مامەڵە لەگەڵ خەڵك، من بیستوومە کە دوو پێشمەرگەیان نەبووە لەخەڵکی بیارە، لەکاتێکدا کە مەڵبەندو مەرکەزیان لەبیارە بووە، مانای وایە کە تۆ فاشلی، تۆ نەتوانی لەدێیەکی (٥٠٠ ــ ٦٠٠)ماڵی چوار پێشمەرگە بۆ خۆت ڕاکێشی، قەناعەتیان پێ بکەی، مانای وایە کە تۆ مامەڵەت لەگەڵ خەڵکدا مامەڵەیەکی سەقەتە، ئەوەی کە من تێبینیم هەبووبێ، زیاتر لە بواری مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا بووە.

**+ جاری وا هەبووە هەندێ ڕۆژنامە، یان کەسایەتی لێدوانیداوە کە "ئەنصار لە ژێر باڵی کۆمەڵەوە ئەو چالاکییە سەربازییانەیان کردووە"؟**

ــ ئەوە ڕاست نییە، ئێمە ڕێککەوتننامەمان لەگەڵ یەکێتیی هەبووە، بە ئەنصاریشمان دەگوت، ڕێککەوتن لەگەڵ یەکێتی دەپارێزینو بەشەرعیشی دەزانین،

ڕێگە نادەین بەئێوە لەبن باڵی ئێمەوە بێن لە یەکێتیی بدەن، ڕێگەش نادەین بەیەکێتیی لەبن باڵی ئێمەوە بێن لە ئێوە بدەن، هەموو لامان ئاگادار کردبوون، تا کۆتا چرکەش پارێزگاریمان لەو بەڵێنو پەیمانە کردبوو، لەگەڵ هەردووکیان، نەڕێگەی یەکێتیماندداو نە ڕێگەی ئەنصاریشمان دا، هەموو لاش دەزانن، هەرچی گوترابێت لەو بارەوە هەمووی درۆو دەلەسەیە، بەس یەکێتیی جاری وا هەبوو کە تێك دەشکا، تێکشکانەکەی خۆیان بەوە پینە دەکرد، وەڵڵا کۆمەڵ یارمەتی داون، ئاخر بەڵگەتان هەیە؟ سەرکردە سەربازییەکانیان وایان دەگوت، سیاسییەکانیان خۆیان ئیقناع دەکرد کە شکستەکەی خۆیان بەوە بشارنەوە کە ئێمە بۆیە شکستمان هێناوە، چونکە کۆمەڵی ئیسلامیی یارمەتی داون؟ ئەوە ئەصڵو ئەساسی نییە، لە خەڵکی شارەزوورو هەورامان بپرسن، ئەرێ کۆمەڵی ئیسلامیی یارمەتی داون، من قسەم لەوە نییە پێشمەرگەیەك بەبێ ئاگاداریی ئێمە چووبێت، ئەوە شتێکی دیکەیە، ئەوە هەردەبێ، ڕەنگە لەیەکێتیشدا ئەنصار ڕێکخستنی هەبووبێو هاوکاریی کردبن، وانییە، لەناو پارتیشدا خەڵك هەیە هاوکاریی لایەنێکی تر دەکات، بەڵام وەکو کۆمەڵی ئیسلامیی، ئێمە بڕیاریشماندابوو کە هەر یەکێك لە ئێمە پێچەوانەی سیاسەتی کۆمەڵی ئیسلامیی بجووڵێتەوە، بەتایبەت لەهاوکاریکردنی ئەنصار، ئێمە فەسڵی دەکەین، من بەڕاشکاوی پێم دەگوتن: برایانی پێشمەرگە، کێ عەقڵی بە عەقڵی ئەنصار دەخواو ئەو نەهجەی ئەوانی پێ ڕاستە، ئەو شێوەکارەی ئەوانی پێ ڕاستە، کە ئێمە پێمان هەڵەیەو پێمان وایە کە ئیسلامی پێ ناشیرین دەبێ، لەسەری قەرزار دەبنەوە، خواحافیزی بێت، بەسەیارەکەی خۆشمان دەیبەین، خوای لەگەڵ بێ!! بەڵام با لێرەدا نەبێ، بە ڕواڵەت لەگەڵ ئێمە بێت و وەکی تریش ئیش بۆ ئەوان بکات، ئێمە بخاتە حەرەجەوە لە بەردەم خەڵکی تر، بە ڕاشکاوی پێمان دەگوتن، ڕێمان لە کەس نەدەگرت، ئێمە هیچ فشارێکمان لەکەس نەدەکرد، خەڵکێك کە قەناعەتی بەوان بێت بڵێین نەخێر، دەمانگوت فەرموو خوات لەگەڵ، فەسڵمان دەکرد.

**+ وەك ئێمە هەستمان پێدەکرد، ئەنصار ئیزدیواجیەتێك هەبوو لە هەڵوێستەکانیاندا، ڕێککەوتنی کۆمەڵیان لەگەڵ لایەنە سیاسییەکان، بەتایبەتی لەگەڵ یەکێتیی بەشتێکی ناشەرعی دەزانی، بەڵام خۆیان (وەك**

**ئاگادارین) دانیشتنیان هەبووە لەگەڵ سەرکردایەتیی یەکێتی. بە ڕای تۆ، ئایا ئەمە جیاوازیی و دووڕوویی هەڵوێستی ئەنصار دەرناخا؟**

ـ کاک عەبدوڕڕەحمان عەبدوڕڕەحیم کە لەنێوانیاندا بوو (نێوانی یەکێتیو ئەنصار)، لە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ڕۆژنامەی "هاولاتی" دەڵێ: "تا ئێستا نۆ جار کۆبوونەوە لەگەڵ یەکێتیی کراوە". زۆربەی کۆبوونەوەکانیش مامۆستا کرێکار و ئەنصار دەچوون بۆ لای یەکێتیی، لەگەڵ ئەوان دادەنیشتن، جا بانێکەو دوو هەوا، شتێکی ناڕەوایە، ئەوەی بۆ تۆ ڕەوایە، بۆ چی بۆ من ڕەوا نەبێ؟! خەڵکی ئێمە پێیان گوتبوون، برایانی مەکتەبی فەتوای ئێمە وتووێژێکی سێ سەعاتییان لەگەڵدا کردن، یەکێ لەوان ئەوەیان پێ گوتبوون کە بۆچی؟ ئەوان گوتبوویان: "چونکە ئێوە کۆمەڵێکی ناشەرعین"، بەئێمەیان گوتبوو، لەبەر ئەوەی کۆمەڵی ئیسلامیی ناشەرعییە، بۆیە دەڵێین دروست نییە لەگەڵ خەڵك دابنیشێ، بەڵام ئێمە لەبەر ئەوەی کۆمەڵێکی شەرعین، قەیناکا ئەگەر دابنیشین. بێگومان ئەوە شتێکی بێجێیە، لەو گفتوگۆ فیکرییانەدا ئەو شتانە زۆرن، باسکراون، ئەوە ئێستا هەن، پارێزراون، ئەوان بەڕاستی هیچ بەڵگەیەکی وایان بەدەستەوە نەبوو بۆ قسەکانی خۆیان.

**+ مامۆستا، لەو قۆناغەدا بەتایبەت، کە من پێی دەڵێم قۆناغی بەر لەدەستگیرکردنی جەنابتو تیایدا ئەو ستەمانە لەکۆمەڵ کرا، هەندێك دەزگاو لایەن، هەندێك کەسایەتی، ئیتر شتی ڕەسمی بێت یان پڕوپاگەندە، وایان بڵاو کردەوەو بەرپرسیارێتی ئەو ڕووداوانەیان دەخستە ئەستۆی سەرکردایەتیی کۆمەڵ، ڕووداوی مووشەکبارانەکە، بەوەی نەیانویستووە ئەو سنوورە بەجێ بهێڵن، ئەمە تا چەندێك ڕاستە؟ بە ڕای بەڕێزتان کێ بە پلەی یەکەم لەو ڕووداوانە بەرپرسیارە؟**

ـ باسم کرد کە ئێمە چەند جارێك داوامان لە سەرکردایەتیی یەکێتیی کرد کە هاوکاریمان بکەن تا ئەو ناوچەیە چۆڵ بکەین، باسم کرد کە لە سەرەتاوە برایانی خۆمان ئەو ڕایەیان لا پەسەند نەبوو، بەڵام دوای ئەوەی خەڵکی خۆمان قەناعەتیان هات، ئینجا یەکێتیی ئامادە نەبوو، مام جەلال گوتی: "پرس بە مەکتەبی سیاسیمان دەکەم"، ئیتر دوایی شتەکەیان هەر خەواند، خەواندیان تا نەتیجە ئەو مووشەکبارانەی

بـە سـەردا هـات، واتە دوای ئەوە برایانی خۆمان قەناعەتیان هاتبوو، منیش مام جەلالم بینـی، ئـەوان ئامـادە نەبـوون. جارێـك مـام جـەلال ئامادەبـوو، شـوێنێكی بـۆ پێشـنیاز كردین، (بـەری مەرگـە)، گـوتم: مـام جـەلال، (بـەری مەرگـە) دەبـێ بـە كەڵـەكو بەلەم بپەڕینـەوە، عاسی دەبین، ئەگەر هاوكاریمان دەكەن با بچینە ناوچەی پشدەر. ئەوە بۆ ئـێمە شـوێنێكی باش بوو، ئەو بۆ ئەوێ ڕازی نەبوو، یان جارێكی دی مام جەلال گوتـی: "بچن بۆ چـەمی ڕێزان یـا بـۆ قـەرەداغ"، ئـێمە گوتمان: مام جەلال، بۆ خۆت دەزانی بەكـەڵك نایەن، دیارە مەبەستتان ئەوەیە كە هەر لێرە بین، ئەوە مەرجێكی تەعجیزییە. نەگونجا. ئـیدی دوایـی هـەتا بۆ (بەری مەرگە)و شوێنی تریش ئەوەشیان هەر خەواند، دیـارە مەبەستیان هەر ئەوەبوو كە ئێمە لەوێ بمێنینەوە، وام دێتە بەرچاو، بەس مەرج نییە ئـەوە ڕەئـی مام جەلال خۆی بووبێ، بەڕاستی لەناو سەركردایەتیی یەكێتییدا مام جـەلال، دوای ئەویش كاك كۆسرەت ڕەسوڵ لە هەموویان زیاتر بۆ ئێمە بە پـەرۆش و لە ئـێمە تێگەیشـتوو دەهاتـنە بەرچـاو، بەڵام دیارە ئەوانیتر ڕەئییان وا نەبوو، مام جەلال خۆی جارجـاریش بـۆ منـی بـاس دەكرد و دەیگوت: "ڕەئی هەموو یەكێتیش وەكو هی مـن نیـیە"، ڕەنگـە نـەك هـەر لەگەڵ ئێمە، مام جەلال لەگەڵ خەڵكی تریش زیاتر بەلای نەرمـیو لێكتێگەیشـتندا بشكێتەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە بەنیسبەت ئێمەوە وەكو یەكە، ڕەئـی یەكێكیان بووبێت یان هی هەموویان بووبێت، گرنگ ئەوەیە كە نەگونجا، یاخود هاوكارییـان نەكـردین كە ئێمە ئەو ناوچەیە بەجێ بهێڵین، لەگەڵ داواكردنو سووربوونی زۆریشـمان، ئـێمە پێشـبینیی ئەوەمان دەكرد كە بەئاگری ئەوان بسووتێینو پریشكمان بەركـەوێ، پێشـبینیمان كـردبوو بەڕاسـتی، بـەس خـۆ چـارمان نەبـوو، بـۆ كوێ بچین، شوێنێك نەبوو بۆی بچین.

**+ ئەو وتەیە تا چەندێك ڕاستە كە دەڵێ: "سەركردایەتیی كۆمەڵ ئەوكات نەیانتوانـی واقیعەكە بخوێننەوە؟ یان نەیانتوانـی هەست بەو مەترسییە بكەن كـە خەڵكانـیتر لـەدەرەوەی كـۆمەڵ هەسـتیان پێدەكـرد، كـە ئەمـریكا جدیـیە لەشەڕی عیراقو شەڕی ئەنصاریش"؟**

ـ نـا، ئـەوە ڕاسـت نییە، چونكە مـام جـەلال هـەر خـۆی پێی گوتم، گوتـی: "فڵان كـەس، بە ئەنصار بڵێ ئەگەر واز نەهێنن، سوڵحمان لەگەڵ نەكەن، واز نەهێنن لە شەڕو

تەقـە، من ناچار دەبم، ئەگەر بۆم بكرێ ئێران دێنم، ئێران بەقسەم نەكا، ئەمریكا دێنم، قیروسیا دەكەم، ڕەنگە عەیبەمان بێتە سەر، بەڵام من ناچارم".

مـن دوایی ئەوەم بەئەنصار گوت، گوتم حاڵو حسابێكی وا هەیە، پێمان گوتن، ئیتر نـازانم ڕاسـتەوخۆ پـێمگوتن یاخـود برایەكم نـارد، گـوتم پێیان بڵێن كە مام جەلال ئاوا دەڵـێ، "ئەگـەر ناچـارم كەن، كێم بەردەست كەوێ دەیهێنم كە شەڕی ئەوانی پێبكەم، تـا لـەم ناوچـەیە دەریان كەم"، ئەوان ئەو قسەیان نەچووە گوێ، كەواتە ئێمە زۆرچاك دەمانزانـی، لەبەرچـاوم بـووەو دەمزانـی، ئەمریكا پێویستی بەیەكێتیی هەیە، پێویستی بەلایەنـە سیاسـییەكان هەیـە كـە شەڕی بۆ بكەن، هاوكاریی بكەن بۆ شەڕی دژی ڕژێم، یەكێتـیش ناتـوانێ هاوكـاری ئەمریكا بكا هەتاوەكو كێشەی ئەنصاری لەكۆڵ نەبێتەوە، مـن زۆر لـە بەرچـاوم ڕوون بـوو، بـە برایانـی خـۆمانم دەگوت كە ئەوانە لێ دەدرێن، بۆ ئـەوەی یەكێتـی پشتی ئەمین بێت، ئەمریكا پێویستی بە یەكێتیی‌و لایەنە سیاسییەكان هەیـە كە هاوكاریی بكەن، لەبەر ئەوە، ئەگەر گوترابێ پێشبینی نەكراوەو نەزانراوە، نا، ئـێمە دەمانزانـی، بـەڵام نـەمان دەزانـی كـە لەخـۆمان دەدەن، ئـەوەمان نەدەزانـی، دەمانزانـی لـە ئەنصـار دەدەن، بـەڵام نەماندەزانـی كـە لـە خـۆمان دەدەن، چـونكە هیچمان لـە خۆماندا شك نەدەبرد، ناڵێن ئەوەی پاكە بێباكە، ئێمە بەڕاستی هیچمان لە خۆماندا شـك نەدەبرد، نەماندەزانـی كـە لەخـۆمانەوە دەسـت پێدەكات، بەڵام زۆرجار دەمانزانـی كـە ئـەو ناوچـەیە شـەڕی لـێدەبێ، هەوڵیشـمانداوە كـە ئـەو ناوچـەیە چـۆڵ بكـەین، نـەك لەبەر ئەوەی لە خۆمان دەدرێ، لەبەر ئەوەی دەمانگوت ئەگەر لێرە شەڕ ببێ، هـەر شـتێكی ناخۆشـە لـە پەناتـەوە خـەڵك بكوژرێ، تێوە ڕابمێنی، هیچیشت لە دەسـت نەیـەت. لەبـەر ئـەوە، گـوتمان لـەم ناوچـەیە دوور بكەوینەوە، كـە ئـەوان بـە قسەمان ناكەن هەر دوور كەوینەوە چاكە.

**+ ئایا ئەو كات ئاسان نەبوو كە چەك دابنرێت؟ قۆناغی پێش چوون بۆ دارەشمانەو مووشەكیاران كە چەك دابنێن‌و بێنە نێو شارەكان؟**

ـ نا، بۆمان نە دەكرا.

+ **یان بۆ نموونه بێنه نێو شارەکان بە بێئەوەی ناوچەیەکی تایبەتتان هەبێت؟**

ـ ئەوە بە ڕێککەوتن لەگەڵ یەکێتیی نەبوایە نە دەکرا، سەبارەت بە هێزی چەکدارییشمان، ئێمە ئەو کاتە لەگەڵ یەکێتی قسەو وتووێژمان هەبوو، چونکە مەسەلەکە هەروا نەبوو کە ئەمریکا لە ڕژێم دەدات، ڕژێم دەڕووخێ‌و خاپوور دەبێ، قسە لەوەش دەکرا کە ڕژێم دژە هێرش بکا، قسە لەوە دەکرا کە ڕژێم بەرەو کوردستان هێرش بهێنێ، ئێمە لە تەدابیری ئەوەدا بووین‌و قسەش لەوە دەکرا کە ئێمە چۆن بەرگری لەکوردستان بکەین، واتە هیچ مەعقول نەبوو کە ئێمە چەکەکانمان دابنێین کە هێشتا هیچ نەقەوماوە، خەڵك هەر ئەوکاتە تانەشیان لێدەداین، زۆر تانەیان لێدەداین کە هیچ نەبووە ئەوانە لەخۆوە چەکەکانیان دانا، بەرگری لە کوردستان ناکەن، چونکە ئەوکاتە ئەوەی کە دوایی ڕوویدا، خەڵك بەو شێوەیە پێشبینی نەدەکرد، قسە لەوە دەکرا کە ڕژێم هێرش دێنێ، سلێمانی لەمەترسیدایە، کوێ لەمەترسیدایە، قسە لەوە دەکرا کە چۆن دیفاع بکەین، هەتا یەکێتیی داوای لێکردین کە هێندێ هێزەکانمان بهێنینە پێشێ، بۆ چەمچەماڵ، کفری، ئێمە داوامان لێکردن باشە هاوکاریمان بکەن، هێندێ چەکی زیادەمان بدەنێ‌و ئیمکانییەتمان بدەنێ، لەبەر ئەوە، ئەوکاتە چەکدانان شتێکی بێجێبوو، هەر سڵی لێدەکرایەوە، دوای گواستنەوەش بۆ (دارەشمانە)، دوای ئەوەش کە گواستمانەوە بۆ دارەشمانەو مووشەکبارانەکە، ئەگەر دەتەوێ قسەی لێدەکەین.

+ **فەرموو.**

ـ ئەوە دوای ئەوە کە ئێمە ئەو برایانەمان بە زوڵم لە خورماڵ‌و ئەحمەدئاوا شەهیدو بریندار کران، خوای گەورە بە شەهیدی وەرگرتبن، باروودۆخێکی ناخۆشمان بە سەردا هات بە بێئەوەی چاوەڕوانی ئەوە بکەین، (١ ـ ٢) نوێنەری کۆماری ئیسلامیی هاتن بۆ لام، ئەوکاتە ئێمە لە شاخەکانی پشتی ئەحمەدئاوا بووین، گوتیان: "ئێمە هاتووین، ئاغای موحەممەد جەعفەری هاتووە کە دۆستایەتی لەگەڵ مام جەلال هەیە، (کاتی خۆی بەرپرسی قەرارگای ڕەمەزان بوو)، گوتیان ئەو لە سلێمانیەو ئێمەی ناردووە بۆ لای تۆ کە تۆ بێی لە (گوڵەخانە) مستەفای سەید قادرو ئەوان لەوێ دەبن، لەوێ یەکتر

ببینن‌و بە یەکەوە بچن بۆ سلێمانی‌و لەوێ ڕێککەوتن لەگەڵ یەکێتی بکەن بۆ ئەوەی بارەگاکانتان بگوازنەوە، چیتر زەرەر نەکەن، چیتر خەڵکتان نەکوژرێ، مام جەلال‌و ئەوانیش زۆر نارەحەتییان دەربڕیوە، زۆر پێیان ناخۆش بووە". ئەوان وایانگوت، دیارە ئێمەش گوتمان هەرچەندە پاش بارانە کەپەنەکە، بەڵام هەر چاکە، هەر نەبێ خەڵکێکی زۆرمان هەیە، با زیاتر تووشی زەرەر نەبین، بەڕاستی ئێمە چ گامان لەو گێرەدا نەبوو، پێشتریش داوامان کردبوو، بە داخەوە یەکێتیی بە قسەی نەکردووین، بەڵام ئێستاش زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە باشە، ئەوەبوو من لە گوڵەخانەوە چوومە سلێمانی، لە بارەگای کاك موحەممەدی حاجی مەحمود سکرتێری حزبی سۆسیالیست، کە کاك عەبدوڵڵای برای لەوێ بوو، بەڕاستی زۆر خزمەتیان کردین، ڕێزیان لێگرتین، هاوکارییان کردین، ئێمە چووین بۆ سلێمانی، لەوێ لەگەڵ ئەو برادەرانە دانیشتین، لەگەڵ مەکتەبی سیاسیی یەکێتی، ڕێککەوتن لەسەر ئەوە کرا کە بنکەو بارەگاکان بگوازینەوەو ئەوان هاوکاریمان بکەن، هەم پارەمان کە لە لایان بوو، بەشێك لەپارەکەمان بۆ بگێڕنەوە، قەرزی خۆمان لایان بوو، قەرزی چەند مانگێك، هەم سەیارەمان بۆ بگرن، ئاسانکاریی ئەمنی‌و ئەوانەمان بۆ بکەن، لەوێش هاوکاریی بکرێین، لە دارەشمانە چادرو شتمان بدەنێ، هەرچەندە هاوکارییەکی وا نەکراین، بەس هەر کە چووین، خەڵکی ناوچەکە هاوکارییان کردین، بەڕاستی خەڵك دەرگای ماڵەکانیان بۆ کردینەوەو زۆر هاوکارییان کردین، خەڵکی بتوێن - پشدەر. چۆنیەتی گواستنەوەکە بەو شێوەیە بوو، بە ڕێککەوتنێك کە لە نێوان ئێمەو یەکێتی کرا، بە چاودێریی نوێنەری کۆماری ئیسلامیی ئێران.

**+ مامۆستا، لە دوای قۆناغی دارەشمانەوە، پێموابێ لە دانیشتنەکانی شووورادا باس لە هەڵوەشاندنەوەی مەکتەبی عەسکەری کرا، ئەوە کەی بوو؟ چۆن تاووتوێی ئەوە کرا؟**

- ئەوە بەو شێوەیە بڕیاردرا، ئێمە گوتمان کاتی خۆی چەکمان هەڵگرتووە، بە پلەی یەکەم لە دژی ڕژێم، بەپلەی دووەم بۆ بەرگریی لە قەوارەو بوونی خۆمان، وەکو چۆن هەرلایەنێکی دیکەی بچووك‌و گەورە چەکی پێبووە، میلیشیای هەبووە بۆ ئەوەی بەرگریی لە بوونی خۆی بکا، بەڵام بەڕاستی بەپلەی یەکەم بۆ بەرگریی لە کوردستان‌و

لە وڵاتو میللەتی خۆمان، لە سەرەتاوە بۆ ڕزگارکردنی کوردستان، ئێمە چەکمان دوای ڕاپەرینی (١٩٩١) هەڵنەگرتووە، پێش ئەوە پێشمەرگەمان هەبووە، شەهیدمان هەبووە، لە زیندانەکانی ڕژێمدا خەڵکی ڕێکخستنەکانمان بە ئەشکەنجە شەهید کران، لە بەرەکانی شەڕدا خەڵکمان شەهید بوون لە دژی ڕژێم، ئینجا دوای ئەوە کە ڕژێم ڕووخا، پاساوی چەکپێبوون بە پلەی یەکەم نەما، ئەوەیەك، دوو، بەڕاستی گوتیشمان با بیانووشمان پێ نەگیرێ، ئەمریکا هەر لە بیانوو دەگەڕێ، با بیانوومان پێنەگرێ، بارودۆخەکەشمان وابینی کە بەڵێ لەمەو دوا ئەوا دیموکراسی دەبێو خەڵك بواری دەبێ قسەی خۆی بکاو چالاکی خۆی ئەنجام بدا، ئەوە ڕژێم نەما هەڕەشە لە کوردستان بکا، باقی لایەنە سیاسییەکان پێکەوە ڕێك دەبن، تەبا دەبن، واشنا کە یەکجاری هەموو چەکیش دابنێین، بەس گوتمان چەکە گەورەکانو قورسەکان، غەیری ئەوەی بۆ بنکەو بارەگاکانمان ئەوە هێڵدرانەوە، لەسەر ئەو ئەساسە ئەو بڕیارە درا، کە پاساوی هەڵگرتنی چەكو شانی خۆگرانکردن بەچەکەوە بەو شێوەیە نەماوە، چەکیش خۆی لەخۆیدا ئامانج نییە تا قیامەتێ پێت بێت، چەك وەسیلەیە بۆ بەدیهێنانی ئامانج، ئامانجێك کە بەبێ چەك بۆت تەحقیق دەبێ، پێویست ناکات چەکی بۆ بەکاربهێنی، چەکەکانیش هێندە زۆر نەبوون، پێشمەرگەکانی خۆشمان زۆربەی نەدارو قەرزداربوون، پێمان گوتن چەکەکان بفرۆشن، هەندێکی تریشمان بۆ پاسەوانی بنکەو بارەگاکانمان پاراستبوو.

**+ کەس هەبوو لە ناو کۆمەڵدا ئەو واقیعەی پێ قبوڵ نەبێت؟**

ـ زۆربەیان لەسەر دڵیان قورس بوو، بەتایبەت پێشمەرگە، لەخوا بەزیاد بێ کە ئێمە وەکو سەرکردایەتیی کۆمەڵی ئیسلامیی، هەمیشە هەوڵماندوە خەڵکی خۆمان بەتێگەیاندنو بە بەرچاوو ڕوونکردنەوە ڕابهێنین، متمانەشیان هەبووە بە سەرکردایەتی خۆیان، لەبەر ئەوە کەزانییان ئێمە وەکو سەرکردایەتی ئەو بڕیارەمان داوەو بۆشمان ڕوونکردوونەتەوە، بەڵێ لەسەر دڵیان قورس بوو، بەڵام کەسم پێ شك نایە لە قسەمان دەرچووبێت، یا بیری لە شتێکی دیکە کردبێتەوە.

**+ هەڵوەشـاندنەوەی مەکتەبـی عەسـکەری، دواتـر چـۆڵکردنی ناوچـەکەی لێکەوتەوە؟**

ــ ئێمە بەشێوەیەکی کاتـی چووینە دارەشمانـەو پشـدەر، چونکە تـۆ ئـەو هێزو خەڵکـەت هەیە، تا چارەسەری دەکەی، خۆ دەبێ بیگوازیەوە بۆ شوێنێکی دیکە، بەڵام دوایـی کـە بڕیاردرا هێـزی عەسـکەری نەمێنێ، ئەو بڕیارە هەر بۆ ئێمە نەدرا، بەڵکو بۆ خەڵکی دیکـەش، بەڵام خەڵکی دیکە تا چەندێك پێیەوە پابەندبوون، یان دوایی هێندێك وردە فێڵـی تـیا کردووەو ناوی لێگۆڕیون، میلیشیاکەی هەرماوەو ناوی لێگۆڕیوە، ئەوە بابەتێکـی تـرە، ئـێمە هـیچ فـێڵو مـێڵمان نەکـرد، بەئاشـکرا گـوتمان ئـەوە هێـزی پێشـمەرگەمان بـەو شـێوەیە نـەما، ئینجا بەڵێ، دوای ئەوە کە مانگێك یان زیاتر لەوێ مایـنەوە، دوای ئـەوە کـە پێشـمەرگەکانمان ئیـزن دایـەوە، بـنکەو بارەگاکانـیش پێچرانەوەو هاتینەوە نێو شارەکان.

**+ لەسـەر ئـەو هەڵانـەی لـەو قـۆناغەدا ڕوویانـدا، دوو پرسـیارمان هەیـە، پرسیاری یەکەم: ئەو هەڵانە چیبوون، کە ئەو کات کۆمەڵ تێیان کەوت، یان ئەنجامیدان؟ پرسیاری دووەم: ئەی ئەو هەڵانە چیبوون کە ئەوکات ئەمریکا لەو بارەیەوە تێیان کەوت؟**

ــ سـەبارەت بـە هەڵەکانـی ئـێمە، ئـەوەی کـە من ئێستا بێتە یادم، دوو شت بوون: **یەکـەم:** وەخراندنـی هاتـنە قەناعەت بۆ چۆڵکردنی ئەو ناوچەیە، من هەڵەم زۆرە، بەڵام لـەو هەڵەیـە بەشـدار نەبووم، چونکە هـەر لەسـەرەتاوە قەناعـەتم وابوو کە دەبێ ئەو ناوچـەیە چۆڵ بکـەین، ئـەوە زیاتـر برایانـی تـر دەگرێتەوە، چونکە (وەکو گوتم) لە قۆناغێکدا یەکێتیـی ئامـادە بـوو، بـەس برایانـی خۆمان قەناعەتـیان نە دەکرد، دوایی خۆمان قەناعەتمان کرد، جا ئەوجا ئەوان ئامادە نەبوون.

**هەڵـەی دووەم:** ئـێمە کاتێکـی زۆرمـان کوشـت بـە قسـەکردن لەگـەڵ ئەنصـار بـۆ ئیقناعکردنیان، بـۆ ئـەوەی بێـنە نـێو کۆمەڵـی ئیسلامیی، کە خەڵکی تر ئەوەی وا لێك دەدایـەوە ئـێمە کـەینو بەیـنمان لەگەڵـیاندا هەیـە، لەڕاسـتیدا هەمـووی بـریتیبوو لـە هەوڵدان بۆ ئیقناعکردنیان، بۆ بەرچـاو ڕوونکردنەوەیان، بـۆ تێگەیاندنیان کە لەسەر ڕێچکەو ڕێبازێکـی هەڵـەن، لەسـەر فیکرەیەکـی هەڵـەن، چارەنووسێکی خراپیان هەیە،

ئەمن پێموایە کە لەوەدا زیادەڕۆییمان کرد، نە دەبوو ئەوەندە کاتی خۆمان بەوانەوە بکوشتایە، کە بخرێینە جۆرێك لە قەفەسی ئیتیهامەوە، چونکە بە ئەو هەموو کۆبوونەوەو دانیشتنانە وایان دەزانی کە زەمینەسازی بۆ شتێك دەکرێ، نەیان دەزانی کە ئەوە هەمووی هەوڵە بۆ ئیقناعکردنی ئەوان‌و دەست پێهەڵگرتنیان لەو فیکرەیەی خۆیان، مەرج نییە لەوەشدا هەموومان بەشدار بین، بەڵام هەندێ لە برایانمان کە زۆر دڵگەرم بوون، زۆر سوور بوون، پێموایە باش لە فیکری ئەنصارو لە پاشینەی فیکری ئەوان حاڵی نەبوون، کە ئەوانە ڕەگو ڕیشەیان هەیە، جۆرێك لە پەیوەندییان هەیە، من پێموایە زۆر ڕەئییان بەدەست خۆیان نییە، پێموابوو ڕەئییان لەدەست خەڵکی تردایە، لەڕووی فیکریشەوە وابەستەی خەڵکی ترن، هەندێك شێخ‌و موشایەخ لەولاولا فەتواشیان بۆ دەردەکەن، جا کەسێك خاوەنی قسەی خۆی نەبێت، بڕیاری بەدەست خۆی نەبێت، فیکرەکەی فیکرێکی ڕەسەن‌و هەڵقوڵاوی واقیعی خۆی نەبێت، پێویست ناکا زۆر خۆتی پێوە ماندووکەی، بەڵکو دەبێت ئەو شێخەی فەتوای بۆ دەداو لەژێر کاریگەریدایە، ئەو ئیقناع بکەی، دەستیشمان نەدەگەشتە ئەوان، لەبەر ئەوە، پێموابوو کاتێکی زۆر بەوەوە خەرج کرا، ئەوە (وەکو گوتم) بووبە هۆی ئەوەی کە خەڵکی گومانی ناحەقمان پێبەرێ، بەناحەق، زۆرجار وایان دەزانی کە ئەوە نەخشە دادەڕێژین بۆ شەڕی هاوبەش‌و بۆ چی‌و چی، کە هیچیشی وانەبوو، دواییش دەرکەوت، هەمووی دەرکەوت کە لەڕاستیدا ئەو شتانە هەموو هەوڵبوون بۆ ئیقناعکردن.

+ ئەی هەڵەکانی ئەمریکا؟

ـ ئەمن پێموایە کە سیاسەتی ئەمریکا لە شەڕکردن دژی ڕژێم‌و ڕووخاندنی ڕژێم بەبێ ڕەزامەندیی نەتەوە یەکگرتووەکان، هەڵەیەکی کوشندە بوو بۆ ئەمریکا، پێموایە ئێستاش باجی دەداو لە داهاتووشدا هەر باجی ئەو هەڵەیە دەدا، چونکە دەوڵەتێك بانگەشەی دیموکراسی‌و مافی مرۆڤو پابەندیی بە ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکانەوە بکا، نابی شتێ بکا پێچەوانەی نەتەوە یەکگرتووەکان‌و مەبادیئی خۆی بێ، ئەوە هەڵەیەکی کوشندە بوو، پاشان ئەمریکا بیری لەوە کردبووەوە چۆنی بڕووخێنێ، بەڵام چاك بیری لەوە نەکردبووەوە کە دوایی چۆنی دروست بکاتەوە، هەموو شتێکی هەڵوەشاندەوە، لەکاتێکدا کە لە ئێران کاتی خۆی کودەتا کرا، شۆڕش کرا، بەڵێ ئەو

هەرەمە سیاسییە کە حاکم بوو لاچوو، بەڵام دامودەزگاکانی دەوڵەت مانەوە، ئێستا ئەمریکا خەڵکێکی زۆری لەخۆی کردۆتە دوژمن، مەرج نییە ئەوانە بەعسیش بن، ئەو هەموو دەزگایەی دەوڵەتی هەڵوەشاندەوە، بە ڕاگەیاندنو بە ئەمنو بە موخابەراتیو عەسکەریو غەیرە عەسکەریو مەدەنی هەمووی هەڵوەشاندەوە، هەموو ئەو خەڵکە کەوتنە گۆڕی بێکاریو کەسابەت، ئەوە بێگومان بیر لەوە دەکاتەوە چۆن دژایەتی ئەوە بکات کە قووتی بڕیوە، کە نانی بڕیوە، مەرجیش نییە بە پاڵنەری ئیسلامیی، بە پاڵنەری دیفاع لە ژینو ژیان.

هەڵەیەکی تر ئەوەبوو کە بەڕاستی لەگەڵ ئەوەی ئێمە دەمان بیست ئەمریکا موخابەراتیان وایەو ساڵی چەند ملیار دۆلای بۆ خەرج دەکەن، بەڵام من پێم سەیر بوو کۆڵن پاوڵ کاتی خۆی ڕایگەیاند "لە خورماڵو سەرگەت کارگەی دروستکردنی چەکی کیمیایی هەیە، ئەنصار کارگەی دروستکردنی چەکی کیمیاییان هەیە"، ئەوەبوو ئێمە زۆر لەڕۆژنامەکانمان بانگکرد، زۆر لە کەناڵە ڕاگەیاندنەکانی بیانییمان بانگکرد، بۆمان ڕوونکردنەوەو قسەمان لەگەڵ کردنو بردمانن، وتمان وەرن شوێنەکان بپشکنن، خەریکبوو لەگەڵ ئەنصاریش تووشی کێشە بین، دوایی تێمانگەیاندن کە ئەوە بەقازانجی خۆشتانە، تۆمەتێکە لەسەر خۆشتان لادەچێ، چونکە ئێمە دەزانین ئێوە نیتانە، ئەوەبوو کە شوێنەکانیان پشکنیو هیچی لێ نەبوو، بەڵام ئەوێ کرابوو بە ئامانجێك بۆ لێدان، بەبیانووی ئەوەی کارگەی چەکی کیمیایی لێیە، کە من پێموایە ئەوانەی کە خۆیان زۆر بە دۆستی ئەمریکا دەزانی، ئەمریکایان زۆر بە خراپ بە سەهوو برد، ئەوەبوو بیستوومە کە دوایی کۆڵن پاوڵیش گوتوویەتی "بە هەڵەدا چووین"، ئینجا ئەمریکا دەوڵەتێکی وا زلو زەبەلاحو خاوەن ئیمکانییەت، نەدەبوو بینای هەڵوێستێك، هەڵوێستێکی ئاوا لەسەر بنەمای زانیارییەکی هەڵە بکات.

**+ دوای مووشەکبارانەکە، گومانێکی زۆر خرایە سەر ڕۆژنامەنووسە بیانییەکان. ئایا پێشوازییکردن لەو ڕۆژنامەنووسانە هەڵەیەکی تر نەبوو؟ یانی هەندێ گومانیان بۆ ئەوە دەچوو کە ئەوانە ڕۆژنامەنووس نەبوون، لە ئەسڵدا ڕاهێنراوی دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمریکا بوون..**

ـ ڕەنگە هەندی لەو ڕۆژنامەنووسانە سەر بە دەزگای هەواڵگریی ئەمریکاو غەیری ئەمریکاش بووبن، بەڵام، من پێموایە ئەمریکا پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتووە لەڕێی ئەوانەوە شوێنەکان دەستنیشان بکا، ئەمریکا تەکنۆلۆجیای عەسکەریی زۆر بەهێزەو دەتوانێ بەشێوەی تریش ئەو شوێنەی کە دەیەوێ مووشەکبارانی بکا، دەستنیشانی بکا، جا خەڵکی تریش هەبووە لە خزمەتی ئەمریکادا بێت، مەرج نییە هەرکەناڵی ڕاگەیاندن کە موخابەراتی تێخزاندبن، لەبەر ئەوە من پێموا نییە، چونکە ئێمە ئەگەر وابلێین‌و لەهەر ڕۆژنامەنووسێك بسەڵمێنەوە کە نەوەکو موخابەرات بێت، بەڵێ بۆی هەیە موخابەراتیش بێت، ئەمن پێموایە سوودمان زیاتر لێی بینی، بەلای کەمەوە خەڵك بۆی دەرکەوت ئێمە کە مووشەکباران کراین، زوڵم بوو، بەلای کەمەوە دەرکەوت کە کۆڵن پاوڵ بەهەڵەدا چووبوو، ئەمریکا بەهەڵەدا چووبوو کە وای زانی خورماڵ (کە لەبەردەستی ئێمەبوو) کارگەی چەکی کیمیایی لێیە، واتە ئەوە بۆ ئێمە دەستکەوتێکی گەورەبوو، ئەگەر خەڵك لە گەڵماندا بەئینساف بوایە، باشە ئەی ئەمریکا دوایی نەدەبوو لەخۆی بپرسێ، وەکو من لە زیندان پێم دەگوتن، پاساو چیبوو بۆ لێدانی ئێمە، پاشان لەسەر چ ئەساسێ؟ دەوڵەتی زل‌و زەبەلاح چۆن دەبێ لەسەر ئەساسی زانیاریی هەڵە، چۆن دەبێ خەڵك بە غەڵەتیدا بەرێ، ئەوان دەیانگوت: "خەڵك بە سەهوویدا بردووین"، باشە چۆن دەبێ خەڵك بەسەهووتدا بەرێ، باشە ڕیشی خۆت چۆن لەمست خەڵکی دەنێی کە تۆ خۆت بەکوێخای دنیا دەزانی؟! لەبەر ئەوە، من پێم وانییە مەترسی هەبوونی موخابەرات لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا وامان لێبکات کە لێیان بسەڵمینەوە، چونکە من پێموایە ئەمریکا کەشوێنێك مووشەکباران بکا، مەرج نییە لەو ڕێیەوە بیکا، لە ڕێی مانگە دەستکردەکانیەوە دەیکا، لە ڕێی زۆر هۆکاری ترەوە کە ئەوان لە ڕووی تەکنۆلۆجیای سەربازییەوە لەپێشەوەن، دەتوانن بەشێوازو لە ڕێی ترەوە دەستنیشانی بکەن.

**+ سەبارەت بە پەیوەندی و دانیشتنەکانی کۆمەڵ لەگەڵ ئەمریکا، ئەو هەلانەی کە ئەمریکا هەیبوون، یان ئەو زانیارییە هەڵانەی کە لایبوون، لەسەر ناوچەکە، یان لەسەر کۆمەڵی ئیسلامیی، ئێوە هیچ هەوڵێکتان نەدا لە هیچ**

**ڕێگەیەکەوە ئەمریکییەکان ببینن، کۆبوونەوەیان لەگەڵ بکەن تا لەزاری خۆتانەوە واقیعەکە ببیستن، یان پەیامێکیان بۆ بنێرن، یان نامەیەك؟**

ـ با، ئێمە زۆرمان هەوڵدا، لە هەولێر برایان کردوویانە، لە کەرکووك بینیویانن، لە سلێمانی دووجار بۆ جارێکی دیکە کە گرتنەکەی منی بە سەردا هات، بە حساب مەوعیدمان هەبوو لەگەڵیان کە بۆ جاری سێیەم بیان بینین، زۆر شتمان بۆ ڕوونکردنەوە، بە حساب زۆر موقتەنیع بوون، ئێمە چووین ئاوا خۆمان پێناساندن، ئێمە ئاواین، بەو شێوەیەین، جا من داوام لێکردن کە قەرەبووی خوێنی ئەو برایانەمان بۆ بکەنەوە کە شەهیدیان کردن، بریندارایان کردن، چونکە ئێوە بانگەشەی مافی مرۆڤ دەکەن، ئێوە ئەو ڕووداوەی لۆکەربیی لیبیا، یەکی دە ملیۆن دۆلار خوێنیان بۆ وەرگرتن، من پێمگوتن ئێمەش مرۆڤین، کوردیش مرۆڤە وەکو مرۆڤی ئەمریکی، ئەگەر یەکی دە ملیۆن دۆلارتان بۆ هی خۆتان وەرگرتووە، ئەوەش بدەن بەئێمە، یان لانیکەم بە هەموویان دە ملیۆن دۆلارمان بدەنێ، کە پێتانوایە خوێنی کورد هەرزانترە لە خوێنی خەڵکی ئەمریکی، کە نەدەبوو واش بێت، واتە شتێکمان بۆ قەرەبوو بکەنەوە، (ولیام ئیگلتن) کە من قسەم لەگەڵ کرد، گوتی: "من ئەوە دەگەیەنم بەسەرووی خۆم، بە بریمەرو ئەوان، ئەوە لە دەسەڵاتی مندا نییە، دەبێ لەگەڵ ئەواندا قسە بکرێ". گوتم ئێستا بۆتان دەرکەوتووە کە بەهەڵە لەئێمەتان داوە، بە بەڵگەی ئەوەی یەکێتی، کە هاوپەیمانی ئێوەیە، ڕێککەوتنی لەگەڵ ئێمە کردووەو ئێمە بەڕێککەوتن بنکەکانمان گواستۆتەوە، پاشان زۆر تەئەسوفو نارەحەتییان دەربڕی، گوتیان زۆر بەداخەوە، ئێوە تەرەفێکی شەڕ نەبوونو بە زوڵم لێتان دراوە، دەی ئەوەمان بۆ قەرەبوو بکەنەوە، ئیدی ئێمە بە نیازبووین بۆمان قەرەبوو بکەنەوە، ئەوەبوو کە زوڵمێکی دیکەشیان لێکردین!!

**+ واتە ئەمریکا نەیدەویست بە دوای ڕاستییەکاندا بگەڕێ؟ یان لە زاری ئێوەوە ببیستێت، بەڵکو ئەجێندای خۆی هەبوو..؟**

ـ وەڵلاهی وا پێدەچێت، چونکە زۆر جوان بۆمان ڕوونکردنەوە، ئینجا من ئەو دوو برادەرە کە لە گەڵیان دانیشتین لە سلێمانی (بیل ستیوارتو ولیام ئیگلتن)، لە بارەگای پارتی پارێزگاران دانیشتین و، تێمان گەیاندن کە ڕاست نییە ئەو شێوەیەی

بۆ ئێمە گوتراوە، چونکە ئەگەر وابوایە، یەکێتی مانگی دوو ملیۆن دیناری سویسری نەدەدا بەئێمە، ڕێککەوتنمان لەگەڵیدا هەیە، بەشدارییەکی جوزئیمان لە حکومەتدا هەیە، لەگەڵ برادەرانی پارتی هەر تەبایی‌و هاوکاریمان تاڕاددەیەك هەیە، چەند جارێك داوامان لێکردوون کە ڕێککەوتنمان لەگەڵ بکەن، بەڵام ئەوان تا ئێستا وەکو پێویست لەگەڵمان نەهاتوونە پێش، لەگەڵ لایەنە سیاسییەکانی دیکەدا تەبایی‌و برایەتی‌و هاموشۆو پێکەوە دانیشتن‌و ئەوانەمان هەیە، زۆر شتم بۆ ڕوونکردنەوە، زۆریش وایان پیشاندا کەموقتەنیع بوون، پێشم وابوو، چونکە بیستم دوایی (ولیام ئیگلتن) زۆر عوزرخوایی کردبوو، کە دوایی بەو شێوەیە مەوعید دانرابوو بەناوی ئەوەوەو منی تێدا دەستگیرکرام‌و وتبووی هیچ ئاگام لێیان نییەو زۆر داوای لێبوردنی کردبوو[9]، لەبەر ئەوە، من پێموایە ڕەنگە ئەو پیاوە موقتەنیع بووبێ، وەکو پیشانی منی دەدا موقتەنیع بووە، من بەتەمابووم دوایی دیدارمان بۆ پێك بهێنن لەبەغداو لەگەڵ بریمەر دانیشین‌و وەزعی خۆمانیان پێ بڵێین، نەك هەر لەڕووی ئەوەی قەرەبووی ئەوانەمان بۆ بکەنەوە، بەڵکو وەکو لایەنێکی سیاسیی کە ئێمە ئاواین، لەڕێی خۆمانەوەو وەکو خۆمان بمانناسن، بەڵام واپێدەچێت ئەمریکا پێشتر نییەتێکی هێنا بێت، یان خەڵکێك ئەمریکای بەجۆرێك ئیقناع کردبێ کە ئێمە (کۆمەڵ) ئاواین‌و نەیان ویستبێت کە ئێمە وەکو خۆمان هەین، ئاوا بمانناسن.

**+ مامۆستا، پێمان وابێ بەڕەسمی نامەشتان نووسیوە؟**

ـ ئەمن لەو کاتەی لێرە بووم نایەتە یادم نامەمان نووسیبێ، بەس من نامەیەکم بۆ کۆڵن پاوڵ نووسی سەبارەت بەو زانیارییانەی خورماڵ کە ئەوە زانیارییەکی هەڵەیە، نامەیەکم نووسی کە ئەوە ئەسڵ‌و ئەساسی نییەو ئێمە ڕۆژنامەوانەکانمان بانگ کردووەو کەناڵەکانی ڕاگەیاندنیش، ئێوە چاو بەو زانیارییەی خۆتاندا بگێڕنەوە، نامەی ترم پێ شك نایە، ڕەنگە برایانی تر نووسیبێتیان، من ئاگام لێی نییە.

[9] کاك جەوهەر سورچی و کاك نەجات سورچی ئەوەیان پێڕاگەیاندم.

**+ مامۆستا، بە شێوەیەکی گشتی، ئەو ئەزموونە چییە کە بۆ قۆناغەکانی ئایندە، دەبێت لەو قۆناغەی ڕابردوو سوودی لێوەربگرین؟**

ـ یانی مەبەستت ئەوەیە چ پەندێکیان لێ وەردەگیرێ؟

**+ دوای بینین و ژیان لەگەڵ ئەو واقیعە ناهەموارەدا، هەروەها دووساڵی ڕابردووش کە کۆمەڵی ئیسلامیی پێدا تێپەڕبوو، چ پەندێك هەبووە تا بۆ داهاتوو ئەزموونی لێوەربگرین؟**

ـ دوو شت، بە بۆچوونی من دووشتی سەرەکی:

**یەکەم:** ئەو سیاسەتو ستراتیجە شەرعییەی کە لەسەری بووین، لەسەری بڕۆین، ئەویش ئەوەبوو کەئێمە لە قورئانو سوونەتەوە ئینتیلاق بکەین بە واقیعبینییەوە، واتە ستراتیجو سیاسەتەکە لەوەدا کورت دەکەمەوە، لە قورئانو سوننەتەوە بڕیارەکانمان سەرچاوە بگرنو لەبەر ڕۆشنایی ناسینی واقیع وەکو خۆی، واقیعی ئەو کۆمەڵگەو میللەتە کە تێیدا دەژین، ئەوە ئێمە لەسەری بەردەوام بین، چونکە بەڕاستی ئێمە زۆر قازانجمان لەوە کرد، بەڵێ خەڵك زۆر هەوڵیدا کە سومعەی ئێمە لەکەدار کاو پڕوپاگەندەمان بۆ بکا، هەوڵدرا کە ئێمە بەشێوەیەکی تر وێنا بکا، بەڵام سەرەنجام دەرکەوت ئەو ڕێبازە ڕاستەی کەئێمە لەسەری بووین، کۆمەڵی ئیسلامیی لەسەری بنیاتنراوە، لەسەری دەڕۆشت، هەرچەندە باجماندا، هەرچەندە زوڵممان لێکرا، هەرچەندە ناڕەحەت کراین، بەڵام دوایی لەڕێپێوانە جەماوەرییەکان، لەدەنگدان، لە ئیمزاکۆکردنەوەو لەباوەشکردنەوەی جەماوەری موسڵمانی کوردستان بۆمان دەرکەوت، کە ئەنجام حەق ئەگەر ماوەیەکیش بگونجێ دیزەبەدەرخۆنەی لێبکرێو پەردەپۆش بکرێ، دوایی هەر دەردەکەوێ، بەڕاستی ئەوە شایەتدانێکی زۆر چاك بوو لەلایەنی جەماوەری موسڵمانی کوردستانەوە، شایەتدانێکی زۆر چاك بوو بۆ ئێمە، کە کۆمەڵی ئیسلامیی سیاسەتو ستراتیجیەتێکی ڕاستو ڕێكو شەرعی هەبووە، هەڵسوکەوتێکی شەرعیانەی هەبووە لەگەڵ خەڵك، لەگەڵ دەوروبەر، هەروەها قیادەی سیاسیی کوردیش ئەوشایەتییەی بۆ داوین، ئەوە یەك، پەندێك کە وەری دەگرین ئەوەیە کە لەسەر ئەوە بەردەوام بین، ئەوەش مانای ئەوە نییە لە جوزئیاتدا، لە هیچ موفرەدەیەکدا هەڵەو کەموکورتیمان نەبێ، بەڵام لەهێڵە سەرەکییەکانو هێڵە

گشتییەکانی کارماندا دڵنیابین کە بەشێوەیەکی ڕاست دەستمان داوەتێو دەستمان پێکردووە، چونکە لەقورئانو سوننەتەوە ئینتیلاقمان کردووە، لە تێگەیشتنێکی ڕاستو دروست لە قورئانو سووننەتو لە واقیعبینییەکی ڕاستو ڕێکەوە.

**دووەم:** ئەوەیە کە لەو لایەنانەی لاوازیمان بووە، لاوازییەکەش زەمینە خۆشبووە بۆ پڕوپاگەندە کە لە دژمان بکرێ، وەکو لاوازیی پەیوەندییەکان لەگەڵ خەڵك، بەتایبەت لەگەڵ دەرێ، لاوازیی ڕاگەیاندنمان، کە ئێمە واقیعێکی زۆر باشمان بووە، بەلام دەنگێکی زوڵاڵو ڕەنگێکی زۆر جوانو گەشو ئەوەی کە تەعبیر لە واقیعی ئێمە بکا، ڕەنگە نەمان بووبێ، بەو شێوەیە پەند وەربگرین، ئەو کەموکوڕیو لاوازییانە کە لە ڕابردوودا بوونە هۆی ئەوەی کە زەمینەخۆش بن بۆ ناحەزان، جا چ ئیسلامییو چ غەیری ئیسلامیی کە بەناحەق ناشیرینمان کەن، ناوو ناتۆرەمان بەدواوە بکەن، چ لە نێوان کوردستانو عیراقو چ لە دەرەوەی عیراقیش، ئەو لاوازیو کەموکورتیانە پڕ بکەینەوە، بۆ ئەوەی جارێکی دی دەرفەتو بوار نەبێ خەڵکی ناحەزو نەیار بەناحەق ناشیرینمان بکەنو ئەتۆش دەنگێکت نەبێو ڕەنگێکت نەبێو توانایەکت نەبێ کە تۆ وەکو خۆت هەی، ئاوا بیخەیە ڕوو، بۆ ئەوە کە ڕێگە لە پڕوپاگەندەی خەڵك بگری.

ئەمن یەك تێبینم مابوو سەبارەت بە هەڵسوکەوتی ئەنصار لەگەڵ خەڵك، پێموایە ئاماژە بەوە بکەین کە هەڵدرانەوەی گۆڕەکانی شێخانی تەریقەتی نەقشبەندیش هەر موفرەدەیەکی دیکە بوو لە مامەڵە و هەڵسوکەوتی هەڵە و ناشەرعیانەی ئەنصار لەگەڵ خەڵکدا، کە بەوەندە وازیان نەهێنا زیندووان ناڕەحەت کەن، پەڕینەوە بۆ مردووانیش، کە بەداخەوە هەندێ خەڵکی نەزانو بێئاگاش بەتایبەتی لە کوردستانی ئەودیو کە جارێك هاتن، لە "سلێمانی پالاس" لەگەڵیان دانیشتین، وایان دەزانی کە ئەوە ئێمەش پێمان چاکبووە، یان بوارمان داون، گلەییان لەئێمە کرد، گوتم ئێوە زۆر ناحاڵین لە واقیعەکە، ئێمە زۆر ناڕەحەتین بەوە، ئێمە وتارمان داوە لە میمبەری مزگەوتی جیهادەوە، بەشتێکی ناشەرعی دەزانین، بەشتێکی ناشەرعیمان زانیوە، ئەوەش بەڕاستی موفرەدەیەکی دیکەبوو لەو موفرەدانەی هەڵسوکەوتی ناشەرعییانەو هەڵەو پەڵەو زیانبەخش بۆ ئیسلامو بۆ موسڵمانان، هەر مردوویەکی موسڵمان دەبێ ڕێزی لێ بگیرێ، ڕێزی لێبگیرێ وەکو مردوو، نەك هەر مردووی موسڵمان، بەڵکو لە (صەحیحی

بوخاری)دا هاتووه كه ڕۆژێك تەرمی جولەكەیەكیان هێنا، پێغەمبەر ﷺ لە بەری هەستا، وتیان: "یا رسول الله ﷺ انه یهودي"، فەرمووی: "أو لیست نفساً؟". ئەوە ڕێوشوێنی پێغەمبەر ﷺ، جا چ جای كەسانێك كە ئامۆژگاریی خەڵكیان دەكرد، شێخێكە، مامۆستایەكە، ئەوە دەبێ زیاتر ڕێزی لێبگرین، هەموو موسڵمانێك دەبێ ڕێزی لێبگیرێت، بەڵكو هەموو مرۆڤێك بە زیندوویی‌و بە مردوویی دەبێ ڕێزی لێبگیرێ، (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ..) (الإسراء : ٧٠). خوای گەورە بەڕەهایی فەرموویەتی بۆ هەر مرۆڤێك، چ كافرو چ موسڵمان دەبێ ڕێزی لێبگرین بە زیندوویی، بە مردوویی، لەبەر ئەوە، مرۆڤێك كە خوا دروستی كردووە، بەڕێزەوە دروستی كردووە. وەكو گوتم، بەڕاستی ئەوەش شتێكی ناخۆش بوو، كە ڕەنگە خەڵكیش ئێمەشی تێوە گلاندبێ بەناحەق، ئێمە زۆر پێمان شتێكی خراپ بوو، هەست‌و نەستی ئێمەو خەڵكێكی زۆر لە موسڵمانانی بریندار كرد، چونكە شێخانی بیارەو تەوێڵە ماوەیەكی زۆر خزمەتیان بە خەڵك كرد، لەڕووی فیكری، لە ڕووی لایەنی كۆمەڵایەتی، خزمەتێكیان هەبووە بۆ خەڵكی كوردستان، كوردستان بەگشتی‌و خەڵكی غەیری كوردستانیش، لەبەر ئەوە پێویستبوو ڕێزیان لێ بگیرێ، دیارە ئەوەش، من پاساو بۆ ئەوە ناهێنمەوە كە سۆفییەك، دەروێشێك دەچێ تووشی شیرك دەبێ، تووشی بیدعە دەبێ لەمامەڵەیدا لەگەڵ مردوویەكدا، لەگەڵ شێخێكیدا، بەڵام ئامۆژگاریی خەڵك بۆ ئەوەی تووشی شیرك‌و بیدعە نەبن شتێكەو حەقكردنەوەی زیندووان لە مردووان شتێكی دیكەیە.

**+ تێگەیشتنی ئەنصار بۆ جێبەجێكردنی حوكمی شەرعی، تەنها گرنگیدانبوو بەسزاكان‌و لەسزاكانەوە دەستیان پێدەكرد.**

- ڕاستە، ئەوەش لایەنێكی دیكەی بیروبۆچوونی هەڵەی ئەوان بوو، كە من پێم دەگوتن جارێ ئەسڵەن ئێوە ئێستا قەوارەیەكی ئیسلامیی نین، دەوڵەتی ئیسلامیی، قەوارەی ئیسلامیی، واجبیەتی‌و حەقیەتی حدودی شەرعی جێبەجێ بكات، بەڵام جارێ ئێوە قەوارەی ئیسلامیی نین، ئەمە یەك، دوو، دەوڵەتی ئیسلامیش لە سزا شەرعییەكانەوە دەست پێناكات بەرەو ئەحكامی شەرعی، ئەحكامی شەرعی بەشێكیان سزا شەرعییەكانن، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری بریتییە لە تێگەیاندنی خەڵك لە ئیمان‌و عەقیدە، لە عیبادەتەكان، لە حەڵاڵ‌و حەرام، لە چاكەو خراپە، لەئاداب‌و

ڕەوشت، پاشان بریتییە لە پەروەردەکردنی خەڵك، دوایی بریتییە لە دابینکردنی پێداویستییەکانی خەڵك، من دەمگوت ئێوە هیچ پێداویستییەکتان بۆ خەڵك پێ دابین ناکرێت، نە جادەیەکتان پێ خۆش دەکرێ، نە پردێکتان پێ دروست دەکرێ، نە نەخۆشێکتان پێ چارەسەر دەکرێ، نە نەزانێکتان پێ فێر دەکرێ، هیچ شتێکتان پێ ناکرێ، هیچ خزمەتێکتان پێ پێشکەش ناکرێ بە خەڵك، چۆن دەبێ سزایان بدەن، ئەتۆ بۆت هەیە سزای خەڵکێك بدەی کە خزمەتت کردبێ و مافەکانیت بۆ جێبەجێ کردبێ، جا ئەوجا تۆ بۆت هەیە لە واجبەکان بپێچیەوە، بێگومان ئەوەش ناتێگەیشتووییەکی دیکەبوو، ناحاڵییەکی دیکەی ئەوان بوو لە مەسەلەی جێبەجێکردنی ئەحکامی شەرع، کە ئەوان لە سزا شەرعییەکاندا دەیانبینینەوە، سزا شەرعییەکان و فەرمان بەچاکەو نەهی لە خراپەشیان تێکەڵ دەکرد، هەتا لەناو خۆشیاندا ئەو کێشانەیان هەبوو.

جارێکیان مامۆستا کرێکار بۆ خۆی بۆی گێڕامەوە، کە جارێك لەبەر ئەوەی زللەی لە یەکێکیان داوە، چونکە ئەو کەسە هەڵسوکەوتێکی نارێکی بووە لەگەڵ ڕێبوارێك، لەگەڵ نەفەرێکی خەڵکی بیارە، یاخود خەڵکی غەیرە بیارە، گوتوویانە دەبێ سزات بدەین، ئەویش گوتوویەتی باشە ئەمن ئامادەم سزام بدەن بەڵام لە ژووریّ، گوتوویانە نەخێر ئیللا دەبێ لە بەرچاوی خەڵك سزات بدەین. مەبەستم ئەوەیە فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە شتێکە، کابرا بۆی هەیە کە ئەوکاتە مامۆستا کرێکار برا گەورەیان بوو، بۆی هەیە بە خەڵك بڵێ وا مەکە و زللەیەکی لێ بدا و خۆی لێ تووڕە بکات، یان سزایەکی بدات، ئنجا سزادانی شەرعی، حدودی شەرعی پێویستی بە سەلماندن هەیە، بەشاهید هەیە، بەقازی هەیە، بەدادگا هەیە، ئەوجا سزا شەرعییەکە بدرێ، ئەویش دەبێ دەوڵەتی ئیسلامیی پێی هەستێ، نەك هەرچی ڕاست بووەوە، بەڵام مەسەلەی فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپەکە مافی هەموو کەسێکە و هەقی هەموو کەسێکە، چونکە هەقی هەموو کەسێکە کە نەهێڵی ناشەرعی بکا، نەهێڵی زوڵم بکا، ئەوە هەقتە، بەڵام سزای شەرعی بە سەرداچەسپاندن ئەوە تەنیا هەقی قەوارەیەکی ئیسلامییە، یان دەسەڵاتی شەرعییە کە موسڵمانان لەسەری پێکهاتبن، لەکاتێکدا کە دەوڵەتی ئیسلامیی نەبێ و موسڵمانان لەسەر دەستەڵاتێك پێك بێن، ئەو سوڵتە شەرعییە بۆی

هەیـە، بـەڵام هەرکەسـێك ڕاسـت بووەوەو داری حەدد لە خەڵك بدات و سزای بدا، وەکو بیسـتمان داری حـەدیان لە خەڵك دابوو، هەروەها بە تەمای شتی تریش بوون، بێگومان ئـەوە بـە هەڵەداچوونە لـە ئەسـڵی چەسـپاندنی ئەحکامـی شـەرعیدا، لـەوەدا بەهەڵەدا چووبوون، خـۆیان کـە پێیان وابوو بوونەتە دەوڵەتو قەوارەی ئیسلامیی، هەژموونیان هەیـە بـە سەر ناوچەکەدا، بەتەنها بەهەژموون‌و دەسەڵات بەسەر ناوچەیەکدا مرۆڤ نابێ بەدەوڵەتی ئیسلامیی، دەوڵەتی ئیسلامیی (مقوّمات)ی خۆی هەیەو..

**+ مامۆسـتا، دووسـێ حاڵـەت هەیـە چـۆن وێـنایان دەکـەی؟ یـەکێ لەوانـە شـەهیدکردنی مامۆستا عەبـدوڵڵای قەصـری، کـە مامۆسـتا هـاوڕێ‌و دۆسـتی نزیکـی تـۆ بـوو؟ ڕووداوی شـەهیدبوونی ئـەو چ هەسـت‌و سـۆزێکی لای تـۆ دروست کرد؟**

ـ چ مامۆسـتا عەبـدوڵڵای قەصـری، کـە بەڕاستی ڕووداوی شەهیدکرانی ئەو شتێکی زۆر تایبەتیـیە، غـەدرێك‌و زوڵمێکـی زۆر ئاشـکرابوو، زۆر بێپاسـاو بـوو، هـیچ تەئوـلـێك هەڵناگرێ بەبۆچوونی من، جا بە هەرشێوەیەکیان بووبێت، بەئەنقەست بووبێ، یان بە هەڵـە بـووبێ، شـتێکی زۆر بێپاسـاو بـوو، چونکە مامۆستا عەبدوڵڵا دەناسرێ‌و دەزانرا کێیە، دیاربـوو، سیمای، پاشان سەیارەیەك دەبێ چ بکا بەبازگەیەکدا بڕوا، لەبەر ئەوە زوڵمێکـی زۆر تایبەت بـوو، ئەگـەرنا شـەهیدکرانی هەمـوو برایانمان لـە دڵمانـدا ئێش‌و ناسـۆری هەیـە، بـەڵام ئـەوەی مامۆسـتا عەبدوڵڵا ئێش و ناسۆرێکی تایبەتی هەبوو، بە تایبەتـیش کـە ئـێمە بارودۆخمـان ئەوەنـدە نالـەبار بـوو، ناهەمـوار بـوو، وەك پێویست نەمانتوانـی تەعبیر لە مەزڵومیەتی خۆشمان بکەین، کابرا جاری وا هەیە ئازارێك دەدرێ هاوارێك دەکـا، ئـێمە بواری هاوارەکەشمان نەبوو، ئەوە زیاتر ئێش‌و ژان‌و ناسۆرەکەی لـە ئـێمە خەسـتتر کـردەوە، لـەدوای ئەوەش، تەرەفی بەرانبەریشمان هەر شتێك لێمان نەهاتـنە پـێش. بـەڵێ" نامـە نووسـراو عـوزر هێنـرایەوە، بـەڵام دوایـی هـیچ شـتێکمان نەبینـی، ئـەوەش زیاتـر ئـازاری خستە دڵمانەوە، کەڵەپیاوێکی وا، مامۆستایەکی ئاوها، ئەندامێکـی مەکتەبـی سیاسـیی ئـێمە، پـیاوێکە لـە هەرشـوێنێك بـووبێ خـەڵك خۆشـی ویسـتووە، مەعقـول نییە ئاوا بڕوات‌و دوایی ئاوا دیزەبەدەرخۆنەی لێ بکرێت‌و بێدەنگی لێ بکرێت.

**+ کە هەواڵەکەت بیست، گریای؟**

ـ جا ئەوە هەر لای خۆم بێ چاکە کە گریام یان نا، بەڵام من کەمتر وایە لەبەر خاتری غەیری خوا بگریم، زیاتر کە گریانم دێ لەکاتی قورئان خوێندن، یان دوعاو پاڕانەوەدایە، بۆ شتی تر، جاری وا هەیە مرۆڤ لەبەر ئەوەی کە زۆر ناڕەحەتە، گریانی نایە.

**+ مامۆستا، تۆڵەی هەموو ئەو غەدرانە لە چیدا دەبینی؟**

ـ هەندێك کەس وا تەصەور دەکەن کە مامۆستا عەبدوڵلامان شەهید بوو، چلو سێ کەسمان بە مووشەکباران شەهید بوون، من زیندانیی کرام، وا تەصەور دەکەن کە دەبێ فلان کەس بە تەمای چی بێت؟ چونکە من ئەو پرسیارەم لێکراوە، ڕەنگە لە مێشکی خەڵکدا هەبێ، خەڵکی خۆمانو غەیری خۆمان، دەبێ فلان کەس بە تەمای چی بێو چۆن بیر لە تۆڵەو ئەوانە بکاتەوە؟ من بە یەك دێڕ دەڵێم: من تۆڵەی زوڵمێك کە لەبرایانمان کراوە، بەتایبەت لە مامۆستا عەبدوڵلای قەصریو شەهیدەکانی ترمانو لەخۆم، لە کۆمەڵی ئیسلامیی، خۆ کە من گیراوم زوڵم لە کۆمەڵی ئیسلامیی کراوەو لەو برایانەی کە لەگەڵ من گیراون، حەقوەرگرتنەوەی خۆمان لەوەدا دەبینمەوە" ئەو ئامانجەی کۆمەڵی ئیسلامیی بۆ دروستبووە، منیش ژیانو مردنی خۆمی لە پێناو دا دەنێم، کە بریتییە لەوەی ئەم میللەتە موسڵمانە لە کوردستان و عیراقیشدا بە موسڵمانانە بژی، ئەو ئامانجە بێتەدی، وەختێك کە من دیم خەڵك بە موسڵمانی ژیا، وەکو تاك، وەکو خێزان، وەکو شار و لادێ، وەکو وڵات شەریعەتی خوای لەسەر پیادە بوو، حەقی ئێمە هەمووی وەرگیراوە. تۆڵەی خۆمان لەوەدا دەبینم، تۆڵەی خۆمان لەوەدا دەبینین کە ئەو ئامانجەی هەمانە بێتە دی، ئامانجیشمان بریتییە لە بەختەوەرکردنی خەڵك لە دونیاو دواڕۆژدا، بۆ ئەوەی لەسایەی شەریعەتی خوادا بژین، بەپێی دینەکەی خۆیان بەڕێوە بچن، ناڵێن دینی ڕەسمی دەوڵەت ئیسلامە؟ دینە ڕەسمییەکە؟ دین واتە مەنهەج، بەرنامەی ژیان، بۆ ئەوەی بەڕاستی ئەو دینە ببێتە بەرنامەی ژیانی ئەو خەڵکە، مانای وایە ئامانجی منێکی ئیسلامییو موسڵمان هاتۆتە دی، ئەمما وەڵلا فلان کەس وابوو بکوژرێ، ئەوە واکراو غەدر کرا، ئەوانە شتی بچووکن، ئێمە ڕقی شەخسیمان لەگەڵ هیچ کەسێك نییە، ئەوەش کە زوڵمان

لێدەکات، ئەگەر بۆمان بکرێ دەڵێین خوایە هیدایەتی بدەی کە جارێکی دی زوڵم نەکات تا گوناهبار نەبێ، ئەوەش کە خوێنی بەناهەق دەڕێژێ، دەڵێین خوا هیدایەتی بدەی خوێنی بەناهەق نەڕێژێ، پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرمویێ: خوای پەروەردگار هەندێك کەس دەباتە بەهەشت بە زنجیرکراوی. ڕاڤەکارانی فەرموودە دەڵێن: ئەو کەسانەن لەشەڕدا بەدیل دەگیرێن‌و کافرن، دوایی لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا تۆبە دەکەن‌و موسڵمان دەبن، بەدیلی هاتوونە نێو ئیسلام، بەڵام دوایی موسڵمان ئەبن. بەڕاستی ئامانجی ئیسلام بریتییە لەزیندووکردنەوەی خەڵك نەك مراندنیان.

ئێمە ئامانجێکمان نییە بە کوشتنی خەڵك، ئەوەش کە دەیڵێم، مەبەستم پێی ئەوەیە کە وەکو حەقیقەتی ڕێبازی پێغەمبەران ڕوونی بکەمەوە، پێغەمبەران (علهیم الصلاة والسلام) بەدرێژایی مێژوو هەڕەشەیان لێکراوە، دەرکراون، گیراون، هەوڵدراوە کە تیرۆر بکرێن، بکوژرێن، بەڵام پێغەمبەران (علهیم الصلاة والسلام) لە یەك ئایەتی قورئانیشدا نییە هەڕەشەیان لە بەرانبەرەکانیان کردبێت، یان دەتکوژین، یان دەتگرین، یا وادەکەین، هەر سەبریان گرتووەو گوتوویانە پشت بەخوا دەبەستین، پەنا بەخوا دەگرین، نەیارەکان گوتوویانە ئێوە درۆ دەکەن، گوتوویانە: نەخێر درۆزن نین، نەیگوتووە تۆش درۆزنی، کە گوتوویانە ئێوە هاتوون بارودۆخ تێکبدەن، ئەمان گوتوویانە نەخێر، نەهاتووین بارودۆخ تێك بدەین، لەبەر ئەوە، هەر کەسەو لە هەمبانەی خۆیەوە گوێز دەژمێرێ.

ئێمە بەڕاستی دینەکەمان هیچ شتێکی تێدا نییە غەیری بەختەوەرکردنی خەڵك، بەڵام ئەوە کە ڕێت لێدەگرێ‌و شەڕت پێدەفرۆشێ، ئەو کات شەرعی خوای پەروەردگارو هەموو عەقڵ‌و ویژدانێکیش دەڵێ دەبێ بەرگری لەخۆت بکەی، کە دەوڵەتی ئیسلامیی فتوحاتی کردووە، ئەوە بەڕاستی بۆ دیفاعکردن‌و لەسەر کردنەوەی مەزڵومان بووە، گەیاندنی پەیامی خوای پەروەردگار بووە، نەك بۆ ئەوەی دین بەسەر خەڵکدا فەرز بکرێ، بەڵکو بۆ ئەوەی کە ڕێگەی گەیاندنی دینی خوا بکرێتەوە.

**+ مامۆستا، ئەو کاتەی موشەکبارانەکە کرا، بەڕێزت لە بارەگا بووی؟ سەرقاڵی چیبووی؟**

ـ من ئەوكاتە لەماڵی خۆم بووم، لەسەر جێگەم بووم، تەبعەن ماڵو مقەڕ چەند مەتریكیان نێوان بوو، كاك حاجی قاسم هات، گوتی: "مامۆستا بۆ لێرەی؟ لێرە مەخەوە، با لێرە نەبین و بچینە شوێنێكی تر"، منیش گوتم: كاك حاجی، ئەو برایانەش هەمووی لە مقەڕەكانن. زۆر جەختی كرد، گوتم وەڵڵا كاك حاجی لێرە ناجووڵێم، هەر لێرە دەبم، بەس جەنابت ئەگەر حەز دەكەی، بچۆ، گوتی: "نەوەڵڵا، تۆ لێرە نەجوڵێی، منیش هەر لێرە دەبم، لە (مقەڕ)". ئەو لە مقەڕەكە خەوت، منیش لەماڵێ، لەسەر پشت ڕاكشابووم، چاوم چووبووە خەوو نەچووبوو، زۆر ماندوو بووم، ڕۆژی پێشتر لەسەفەر هاتبوومەوە، ئیدی وەكو بڵێی بڵێسەیەكم بیستو گرمەو ناڵەیەكم بیست، دوابەدوای یەكدا، منیش بەڕاستی پێم شتێكی زۆر سەیر بوو، دەنگێكی زۆر نەبیستراو، هەر ئەو شەوەش (هەر بۆ زانیارییتان)، هەر ئەو شەوە بوو كە مام جەلال نامەیەكی بۆ ناردبووم، نامەكە وەكو بڵێی بە ڕاسپاردە بە من گەیشت، بە بروسكە، باسی ئەوەی تیانەبوو كە ئێمە لێدەدرێین و ئەوانە، بەڵام هەندێ گلەییو شتی تێدا كردبوو، ئیدی من یەكسەر گوتم دەبێ هەر ئەمشەو جوابەكە بگەیەننە مام جەلال، نووسیم: مام جەلال، كاتی خۆی من زۆر داوام كردبوو، ئێوە ڕازی نەبوون، ئێستا گلەیی چیمان لێدەكەن؟ من وەكو بڵێی بۆنێكم كرد، گوتم ئەوە ڕەنگە بەرنامەیەك هەبێت، ئەوە وەكو بیانووبڕینێك یا دەفعی گلەییەك، شتێكی وا بێت، من گوتم هەر ئەو شەوە نامەكەم بگەیەننەوە، بەڵام بەڕاستی پێشبینیم نەكرد ئەو شەوە بەو شێوەیە بێت، بەڵام دیارە ئاوا جۆرێك لەڕاڕاییو دڵەڕاوكێ هەبوو، چونكە بەگشتی ئەو كاتە خەڵك لە حاڵەتی ڕاڕاییدا دەژیان، پێشبینی شتێكیان دەكرد، شتێك ڕوودەدات، بەڵام دەمانگوت بەنیسبەت ئەنصارەوە ڕوو دەدات.

**+ كە دەنگەكەت بیست، كاردانەوەت چیبوو؟**

ـ وەڵڵا من یەكسەر هاتمە دەر، ماڵو منداڵ دەستیانكرد بەهاتو هاوارو قیژە، منداڵەكان خەبەریان بووەوە، برایانی پاسەوان هەندێكیان هاتن، دیارە مووشەك دەرفەتی نەدەدا، لەوێی دەدا، دوایی لەشوێنێكی تر. هەر بەردەوام بوو، دیارە وامانزانی فڕۆكەیە، چونكە مووشەكەكان كە دەهاتن، لامان وابوو بە فڕۆكە دەچوون، دوایی برایان باسیان لەوە كرد كە ئێمە تۆزێك بچینە سەرووتر، با بزانین

داخۆ چی قەوماوە، ئەوەی کە بێتەوە یادم، مووشەکەکان لەمیانەی پێنج دەقیقەدا، یان شتێك کەمتر لە دە دەقیقە لە بارەگاکانمان کەوتن، ئیتر دوایی ئێمە چووینە مقەڕەکەی پشتەوەمان، لای زەلم، لەوێ لەگەڵ کاك حاجی قاسم و حاجی دڵشاد و برایان کە هاتن قسەمان لێکرد، وتیان لە مەکتەبی عەسکەری دراوە، هەروەها لە بارەگاکانی هێزی ڕاپەڕین‌و سەفین‌و لە بارەگاکەی سەر (سێداران) دراوە، من هەندێك برام نارد وتم بزانن چییە، ئێمە ترسی ئەوەمان هەبوو لە بنکەو بارەگاکانی تریشمان بدرێت، لەبەر ئەوە وتمان با برایان بارەگاکان چۆڵ بکەن.

ئاوا بەو شێوەیە ئێمە کەوتینە ناو ئەو مەسەلەیەوە، بەهەرحاڵ بۆ ئێمە ڕووداوێکی زۆر ناخۆشبوو، کە دواتر دەرکەوت ئەو برایانەمان شەهیدو بریندار بوون، پاشان لێژنەیەکمان دروستکرد بۆ ئەوەی بچن تەرمەکان دەربهێننەوە.

**+ مامۆستا، ئەوکات تۆ بە تەنها چووی بۆ بەستنی ڕێککەوتننامەکە لەگەڵ یەکێتیی، لەولاشەوە برایان لەو حاڵەدا بوون‌و شەهیدو بریندارێ زۆر هەبوون، ئێرانیش سنوورەکانی داخست. چۆن ڕێگەت بە خۆت دا بچی؟**

ـ وەڵڵا ئەوە موجازەفەیەك بوو، چونکە برایان زۆریان ڕەئیان نەبوو، ئیحتیمالی شت دەکرا، بەڵام بڵێین چی، بارودۆخەکە وایە، کە دەبوو ئەو خەڵکەی مابوو دەرباز بکرێت، ئیحتیمال دانرابوو کە کەمین هەبێ‌و لێمان بدرێ، بەڵام ئەو کاتە دوان لە برادەرانی کۆماری ئیسلامیی ئێرانمان لەگەڵدا بوو، ئاغای حورمەت‌و ئاغای قوربانی، یەکی سوپاو یەکی ئیتلاعات، موستەفای سەید قادریش هەر لەگەڵدا بوو، چونکە بارودۆخەکە وابوو، لە برایانی خۆشمان مامۆستا ناصح‌و کاك جەمال ئەشرەف قارەمانیم لەگەڵ بوو، برایانی تر هەموو سەرقاڵ بوون.

**+ دڵنیا بووی لەوەی کە ئەمین دەبی یان نا؟**

ـ نەوەڵڵا، نا، بەس گوتم خۆ ئەگەر بچین‌و بگەینە ڕێککەوتنێ، هیچ نەبێ ئەو خەڵکەمان دەرباز دەکەین، ئەگەر تێشدا چووین، ئێمەش وەکو ئەو برایانەی تر کە تێدا چوون خوا لێمان خۆش بێ، لەو حاڵەتانەدا دڵنیایی نییە، نازانی چ دەقەومێ، هەتا برایان زۆریان نارازی بوون، نارەحەت بوون، "چۆن دەچی؟ بەکەڵك نایەت، با

هەندێك سـەیارەت لەگەڵ بێ"، لە دڵی خۆمدا گوتم ئەگەر خوا نەخواستە شتێکیش بوو
بـا هــەر بۆ خـۆم بـێ، مـرۆڤ ئەگـەر بچێتە قوڵایـی وەزعـێکەوە، چـەندت لەگەڵـدا بـێ
بێسـوودە، لەو حاڵەتەدا کە تۆ کەوتبییە ئینزارەوە، ئنجا ئەمریکا بە فڕۆکەو مووشەکو
هەموو شتێکەوە ئامادەیەو هاتۆتە مەیدان ! !




# تەوەرەی دووەم:
# چۆنێتیی دەستگیرکردنەکە

**٢٠٠٥/٦/١٣**
**ستۆدیۆی کەناڵی هەولێری تەلەفزیۆنی کۆمەڵ**

**+ مامۆستا، پێمان باشە بەو پرسیارە دەست پێبکەین؟ چۆن دەستگیرکران؟ بە چ شێوەو شێوازێك دەستگیرکران؟**

- بسم الله الرحمن الرحيم، بە پێوستی دەزانم کە لە سەرەتاو دەستپێکی قسەوباس دەربارەی زیندانییکران و ئەشکەنجەدرانم لە لایەن ئەمریکاییەکانەوە خەون (رۆیا)یێك بگێڕمەوە کە دەوری (١٠) ڕۆژ بەر لە گیرانم بینیبووم و پاشان لە میانەی مانەوەم لە زینداناو ڕزگاربوونم، وەك خۆی و بێ کەم و زیاد هاتە دی و یەکێك بوو لە خەونە ڕاستەکان (الرؤى الصادقة).

خەونەکەش بەمشێوەیە بوو:

"لە خەونمدا بینیم خوای پەروەردگار (عزّ وجلّ) لە ئاسمانەوە هاتەخوارو بێئەوەی هیچ قسەو فەرمانێکیش بفەرموێ، لەگەڵ خۆیدا بردمی و بە پێنج شوێندا گێڕامی، کە لە شێوەی ژووری ئاساییدا بوون و یەك بەیەك بەو پێنج ژوورەدا لەگەڵ خۆیدا گێڕامی و پاشان هەر خۆیشی لەگەڵ خۆیدا هێنامیە دەرێ و لەو کاتەدا بێداربوومەوەو خەونەکەم کۆتایی پێهات".

شایانی باسیشە کە من لە ماوەی ئەو (٢٢) مانگە زیندانییەمدا بردمیان بۆ پێنج ژوورو هەر کاتێکیش دەیانبردم بۆ یەکێك لەو پێنج ژوورانەو ژوورەکەم دەبینی، یەکسەرو کتومت ئەو ژوورانەم دەهاتەوە بیرو بەرچاو کە لە خەونەکەمداو لە خزمەت خوای بەرزو مەزن (عزّ وجلّ)دا پێیاندا گەڕابووم!

دیسان پێویستە ئەوەش بڵێم کە لە خەونەکەمدا گەڕانم بە نێو ئەو ژوورانەدا پێناخۆش بوو و لە هەرکام لە ژوورەکاندا هەستم بە دڵتەنگیی و ناڕەحەتیی دەکرد!

جا دیارە من ئەو حاڵەتە نەفسییەی خۆمم کە لە خەونەکەمدا هەمبوو، پێ سەیر بوو! چۆن دەبێ ئینسان لە خزمەت خوای بێهاوتادا بێ و هەستیش بە دڵتەنگیی بکات؟! بەڵام لە زینداندا لە نهێنیی ئەوەش حاڵی بووم:

هەرچەندە لە درێژەی ماوەی زینداندا بە تاعەت و قورئان خوێندن و لێوردبوونەوەی لە خزمەت خوای بە بەزەیی و بەخشەردا بووم، بەڵام بێگومان دیلیی و زیندانییشم هەر لەسەر دڵ قورس و ناڕەحەت بوو.

ئـنجا وەك چـۆن گـیرانم بـە ویسـتی خـوای كاربـەجێ بـوو، دیـارە دەربازبـوونو ڕزگاربوونیشـم هـەر بـە لوتفی بێوێنەی ئەو بوو، هەر ئەو كۆمەڵێك هۆكاری جۆراوجۆری ڕەخساندنو كردنیە مایەی ڕزگاربوونم.

شـایانی باسیشە كە لە زیندان خەونێكم بینی كە بریتیبوو لەوەی لە كاتی هاتنەوەم لـە زینداندا، بـە دڵخۆشییەوە ئەم ئایەتەم دەخوێندەوە: (هَـٰذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا) (يوسف: ١٠٠).

ئەم خەونەشم نزیكەی ساڵێك بەر لە ڕزگاربوونم بینی.

بـێمەوە سـەر وەڵامـی پرسـیارەكەت. پـێش دەسـتگیركرانەكە هەنـدێك هـەواڵم پێگەیشـت، بەتایبەت برای بەڕێزمان مامۆسـتا ناصیح مەلا صالح لە دەمی (...)ـەوە پێـی ڕاگەیانـدم كـە گوتوویەتـی: "ئەمریكییەكان بەنیازن بیگرن، لـە خۆی وریا بێ". هـەروەها لـە (١ ـ٢) ڕێـی دیكەشـەوە ئـەو جۆرە هـەواڵو زانیارییـەم پێدەگەشـت كـە ئەمریكییەكان بەنیازن بەنـدە بگرن، واتـە شـتێكی وا پێشبینی دەكرا، لەبەر ئەوە كە هـەم خۆم دووجار لە سلێمانی لەگەڵیان دانیشتووم، هەم برایان لە كەركوكو لە هەولێر دانیشـتنیان لەگەڵدا كرا، دوای ئەو دانیشتنەی سلێمانی، بڕیار وابوو كە مەوعیدێكم بۆ ساز بكەن، جارێكی تر بیانبینمو دوایی پۆڵ بریمەر ببینم لە بەغداد.

بەڕاسـتی هەرچـەندە مەترسـی گرتنو شتم هەبوو، بەڵام پێم شتێكی مەعقول نەبوو كـە خـۆم بشـارمەوە، هەرچـەندە جـار جـار تەحەفـوزو ئیحتیاتیشـم دەكـرد، چـونكە ناخۆشە لەمقەڕ یان لەشوێنێكی تر دەستگیرمان بكەن، یان هەڵكوتنە سەرمان.

ڕۆژی ٢٠٠٣/٧/٩ برایانـــی ڕۆژنامـــەی (كـــۆمەڵ) تەلەفۆنـــیان كـــردو گوتـــیان ئەمریكییەكان تەلفۆنیان بۆ كـردووینو لەسەر ئەو مەوعیدەی پێشتر كە لەلایەن ولیام ئیگلتـنەوە وەعـد درابـوو، دەیانەوێت كۆبوونەوەتان لەگەڵدا بكەن، لە ئوتێل ئاشوور لە دوكـان، سـەعات چـواری هاوینە، دیارە من لەگەڵ برایان كە چاوەڕێی ئەوەبووین، ئێمە پـێمان شـتێكی باشبوو، گوتمان ئەوە دیارە وەعدەكەی خۆیان جێبەجێ دەكەن، لەبەر ئـەوە، بەندەو كاك تۆفیق كەریمو كاك حاجی عەبدوڕڕەحمانو مامۆستا دارا موحەممەد ئـەمین لەگـەڵ ١٠ ـ ١٥ لـە برایانـی شـۆفێرو دەسـتەی پارێـزگاری بەڕێكـەوتین بـەرەو شـوێنی دیاریكـراو، مـاوەی چـەند كیلۆمەتـرێك بـەر لـەوەی بگەینە ئەو شوێنەی دیاری

كرابوو، بە زەمەن نزیكەی پێنج دەقیقەیەكی مابوو، لە ئەودیو (قەمچوغە)، تەماشامان كرد لەسەر جادە درِكەزیو ئەوانە دانراوەو هەندێ مودەرِرەعە وەستابوون لە قەراغو بەسەر بەرزاییەكانەوە، بەراستی پێشبینیم نەكرد بۆ ئێمە بێت، چونكە ئێمە مەوعیدمان هەبوو، گوتمان رەنگە لێرە شتێك رِوویدابێ، یاخود چاوەرێی شتێكی تر، یان كەسێك بكەن كە لێیان قاچاغ بێ.

ئێمە سێ سەیارە بووین، هیچ ئیحتیاتێكمان نەكردبوو، چونكە گوتمان بەمیوانی دەچین، ئەوانیش بە چەكو شت قەڵسن، با دیاردەی چەكداریمان پێوە دیار نەبێ، سەیارەی یەكەممان رۆیی، سەیارەی دووەم كە خۆمی تێدابوومو لە ناوەراستدا دانیشتبووم، دەستیان لێ راگرتینو گوتیان رابوەستن، من ئیشارەتم بۆ شۆفێرەكە كرد، وتم رابووەستە، با كێشەیەكمان بۆ دروست نەبێو لەم مەوعیدەمان دوا نەكەوین، گوتیان دابەزن، ئێمە دابەزین، گوتم كێتان لەگەڵە عەرەبی بزانێ، یەكێكیان هاتە پێشو گوتی: "بەڵێ"، گوتم: "ئێمە مەوعیدمان لەگەڵ خۆتان هەیە، ئێوە ئەمریكین؟" گوتی: "بەڵێ"، گوتم: "ئێمە مەوعیدمان هەیە لەگەڵ خۆتان". تەلەفۆنیان بۆكردووینو لە ئوتێل ئاشوور چاوەرێمانن، دوامان مەخەن بابچین، گوتی: "بەڵێ، ئەوە هەر هەندێ پرسیارو ئەوانەیە، بۆ ئێوە نییە"، دوایی وردە وردە گوتیان با چەكەكانتان لەنێو سەیارەكانتاندا بێ، ئیدی هەروا بەو شێوەیە تا دوایی گوتیان دابنیشن، گوتم بۆ؟ خۆ ئاخر ئێمە مەوعیدمان هەیە، ئەوجار زانیم، حاڵیبووم كە حاڵەكە چۆنە، ئیتر كەلەپچەیان كردین، ئینجا چاویان بەستینو گوێنییان بەسەردا كردین، لەو كاتەدا دوو كۆپتەریان هێنا، دیارە جلوبەرگو ئەو شتانەی كە زیاد بوون، وەك پشتێنو ئەوانە، هەریەكەی خستنیانە عەلاگەیەكەوە و ناوی ئەو كەسەیان لەسەر دەنووسی كە كەلوپەلەكان هی ئەوە، ئیدی ئێمەیان سواری دوو كۆپتەر كردو بردینیان، من نەمزانی كوێ بوو بەراستی، دوایی بۆم دەركەوت كە موسڵ بووە، ماوەیەك لەوێ ماینەوە، پاشان بۆ فرۆكەخانەی بەغدادیان بردین.

**+ لە كاتی دەستگیركردنەكەدا، سەربازە ئەمریكییەكان چۆن رەفتاریان لەگەڵ كردن؟**

ـ لێدان و سووکایەتیی و ئەوانەی تێدانەبوو، مرۆڤ دەبێ بە ئینساف بێ، بەس ئەوەندە هەیە دەستیان بەستینەوە، دەست بەستنەوەکە ئەزیەتی داین، شتێکبوو هەتا خۆت دەجوولاند توندتر دەبوو، تا ئێستاش دەستم شوێنی برینەکەی پێوەیە، بەلام بلێی قسەمان پێ بلێن یان پالمان پێوە بنێن، من سەبارەت بەخۆم ئەوەم نەدی، منیش لە برایان خەتەر تر بووم، پێموایە ئەگەر بۆ منیان نەکردبێ، بۆ ئەوانیشیان نەکردووە، یان قسەگوتن، بەس ئەوەندە هەیە، ئەگەر کەسێك سەری بەرزکردبایەوەو تەماشای ئەملاو ئەولای بکردایە، لێی تووڕە دەبوون لەناو کۆپتەرەکەدا، کە هەلیش دەستای، لەبەر ئەوەی کە تۆ دەستت بەستراوە، ئەوان دەستیان دەدایە تۆو هەلیان دەستاندی، چونکە بەزەحمەت دەتوانی هەستی، هەستم نەکرد کە قسەو سووکایەتی هەبێ، هەرچەندە ئەو گیرانە خۆی لە خۆیدا سووکایەتیی بوو، بەلام بلێی لێدانێك یان پالپێوەنانێك، یان زللە لێدانێك هەبێت، ئەوانەم هەست پێنەکرد، هەلبەت بۆ خۆم هەستم پێ نەکرد، جا نازانم برایانیتر شتی وایان لەگەل کرابێ.

**+ مامۆستا، لەو کاتەدا ڕێگاکەیان گرت؟**

ـ ئۆتۆمبێل زۆر وەستابوون، ئۆتۆمبێلی خەلك، هەم لەوسەر و هەم لەمسەر، خەلکێکی زۆر وەستابوون، ڕەنگە هەندێ خەلك ئێمەشیان ناسیبێ، دەگونجێ، بەس دوایی کە ئەو گوێنیەمان بە سەردا کرا، نەمانزانی ئەوە کێیەو کێ نییە.

**+ کاتێك دوو کۆپتەرەکەیان هێنا، هەر لەویا جیایان کردنەوە؟**

ـ نەخێر، ئێمە، من و مامۆستا داراو کاك تۆفیق و کاك حاجی عەبدوڕڕەحمان، نازانم کێی تریشمان لەگەلدا بوو، (٤ ـ ٥)ێك لە یەکێکیاندا بووین، ئەوانی تریش لەئەوی تر.

**+ ئێمە لێرە ڕێمان کەوتە دەزگایەك، باسی لەوەکرد کە ئۆتۆمبێلێك بەهەلە کەوتووەتە نێو کاروانی ئۆتۆمبێلەکانی مامۆستا عەلی باپیرو ئەوان، مامۆستا لەو حالە ناخۆشەدا هەولی ئەوەیدا کە بەوان بلێ ئەو ئۆتۆمبێلە تەنها لەو ڕێگەیەوە ڕۆشتووەو هی ئێمە نییە، ئەو کەسە وتی: "مامۆستا لەو حالە**

**ناخۆشەشدا بیری لەوە بوو کە ئەو برایەی ئێمە لەگەڵ ئەوان نییە، بۆیە گوتبووی: پەیوەندی بە ئێمەوە نییە و لەگەڵ سەفەرەکەی ئێمە نییە".**

ـ بەڵێ، گوتم ئەوە لەگەڵ ئێمە نییە، گوتم ئەوە گوناهەو لەگەڵ ئێمە نییە، کابرا وتی: "لەگەڵ ئەوان نیم". گوتم ڕاست دەکاو لەگەڵ ئێمە نییە، گرتبووشیان، گوتبووی لەگەڵ ئەوان نیم، دوایی بەریاندا.

**+ ئەو کەسانە کێبوون کە بڕیاربوو ئێوە لە ئوتێل ئاشوور لەگەڵیان دابنیشن؟**

ـ ئەو دوانە کە ئێمە پێشتر لە سلێمانی لەگەڵیان دانیشتین، باڵیۆز ولیام ئیگلتن‌و بیل ستیوارت، وتیان کە ئێمە هەندێك مەوعیدتان بۆ سازدەکەین، پێشتر لەگەڵ هەندێ لە ئەفسەران، پاشانیش لە بەغداد دیدار سازدەکەین. من وام دەزانی کە ئەو دانیشتنەمان لەگەڵ ئەو ئەفسەرانەیە، وەکو ئامادەباشییەك بۆ کۆبوونەوەکەی بەغداد، بەڵام ناوی کەسیان پێ نەوتین. کاتێك ئەو ئەمریکییانە پەیوەندییان بە برایانی ڕۆژنامەی (کۆمەڵ)ـەوە کردبوو مەوعیدەکەیان پێوتبوون، وتبوویان ئێمە لەلایەن ولیام ئیگلتنەوە تەلەفۆن دەکەین‌و دیاریکراوین لەگەڵتان دابنیشین.

**+ پێشتر ئەمریکییەکان‌و کۆمەڵی ئیسلامیی چەند دانیشتنێکیان کردبوو، بەپێی ئەو دانیشتنانە، ئایا پەیوەندییەکانی کۆمەڵ‌و ئەمریکا لەچ ئاستێکدا بوو؟**

ـ ناتوانم دیاری بکەم کە لە چ ئاستێکدا بوو، بەڵام گرنگ ئەوەیە، ئەو برایانەی لەگەڵم بوون، هەموو مۆڵەتی چەکهەڵگرتنیان لەلایەن ئەوانەوە بۆ کرابوو، هەروەها دەمانچەکەی خۆشم مۆڵەتی هەبوو، ئێمە ئەوەمان لەبەرچاو گرتبوو کە ئەوان بەچەك قەڵسن، ناشزانین ئەوان چۆن ئەو پەیوەندییەیان لێکداوەتەوە، بەڵام داوامان دەکرد با پێکەوە دابنیشین‌و لێك حاڵی ببین‌و وەکو خۆمان بماننناسن، ئەمەش نەك وەکو تەمەللوق، دەمانەوێت وەکو خۆمان بماننناسن، چونکە لەسەر ئەو جۆرە تێگەیشتنەی کە بۆ خۆم قەناعەتم پێیەتی، بێباکم هەرچیم لێبێ، بەڵام پێم ناخۆشە لەسەر قەناعەتێك باج بدەم کە قەناعەتم پێی نییە و بە تۆمەت بۆمکراوە بە قەناعەت، یان

لەسەر هەڵوێستێك كە هی من نییەو بە زۆر وەكو تۆمەتێك بۆم سازكراوە، بەڕاستی دەمان ویست وەكو خۆمان بمانناسن، ئەو دووجارەش كە من لەگەڵیان دانیشتم، برایان كە لە كەركووك و شوێنیتر لەگەڵیان دانیشتبوون، بۆمان ڕوونكردنەوە كە كۆمەڵی ئیسلامیی ئاوایە، ئێمە سیاسەتمان ئاوایە، بەرنامەمان ئاوایە، پەیوەندییەكانمان بەو شێوەیە، وا ئاواش تەماشای ئەمریكا دەكەین، بەڕوونیو بە ڕاشكاوی، ئێمە بەچاوی دوژمن تەماشاتان ناكەین، بەڵام پێمان خۆش نییە هاتوون، پێمان خۆش نییە عیراقتان داگیركردووە، بەڵام بەدوژمنی خۆمانتان تەماشا ناكەین، چونكە نەهاتوون دژایەتیمان بكەن، پێمان خۆشە ڕژێم ڕووخاوە، ئاوەو ئاو بچێ، ئەوە قازانجی خۆمانەو نیعمەتێكی خوای پەروەردگارە، بەڵام بڵێی پێمان خۆشە ئێوەش هاتوون، ئەوەش وا نییە، پێمان خۆش نییە هاتوون، بەڵام كە ئێوەش هاتوون، بەقسەی ئێمە نەهاتوون، ڕاوێژتان پێنەكردووین، هاتوون وڵاتەكەتان داگیركردووە، ئێوە بە قسەی نەتەوە یەكگرتووەكانتان نەكردووە، گوێتان نەداوەتە ڕای نێودەوڵەتی، ئێستا گوێ دەدەنە ڕای ئێمە؟!

**+ مامۆستا، لە كاتی ئەو ڕووداوەدا ورەتان چۆن بوو؟ بەتایبەت جەنابتو پاشانیش برایانیتر؟**

- پیاو عەیبە باسی خۆی بكا!! لەبرایەكی ترمان بپرسن، لە خوا بەزیادبێ من زۆر پێم ئاسایی بوو، هەرچەندە من زیندانم زۆر پێ ناخۆشبوو، لەژیانمدا زیندانم نەدیبوو، لە خوا بەزیادبێ هەر بە سەربەرزی ژیاوم، ژیانی دیلیم نەدیبوو بەڕاستی، لەبەر ئەوە، بۆ من زۆر زۆر ناخۆش بوو، یەكەم ئەزموونم بوو، زۆر پێناڕەحەتبووم، بەڵام زۆر پێناڕەحەتییەكەم مانای وانییە كە لە زیندان ترساوم، من نەك هەر ئەوكاتە (كە زۆر ناخۆشبوو)، بەڵام دواتریش كە ئازارو ئەشكەنجەش هەبوو، هەر قورئانم دەخوێندو دوعام دەكرد، ئەوەی كە زۆری لێ بێمنەتبووم، مردن بوو، جا مرۆڤ كە لە مردنێ بێمنەتبوو، لەشتی دیكە بێمنەتترە.

ئەو زەمەنە كە بردیانین، تەسەورم دەكرد كە دەستی منیان لە هەموان توندتر بەستبێ، چونكە بە (٣ - ٤) كەسیان تەماشای منیان دەكرد، پێیان گوتبوون ئەوە بەرپرسیانە، زۆریش ناڕەحەتبووم، بەڵام نەمهێشت لەو ماوەی زیندانو ناڕەحەتییە

نوێژێکم بچێت، هیچ قسەیەکی لاوازمان نەگوت (لەخوا بەزیاد بێ)، هەر دەمگوت ئێوە بەهەڵە ئێمەتان گرتووە، بەهەڵەدا براون، جار جار دەیانگوت: "ها وەزعت چۆنە؟". ئەوان لە سلکی موخابەرات بوون، وام هەست دەکرد.

**+ لە ناو فڕۆکەکەدا؟**

ـ نا، دوایی کە لە فڕۆکەخانە دایان بەزاندین، یەکێك هاتو گوتی: "ها وەزعت چۆنە؟" گوتم هیچم نییەو باشم. گوتی: "تۆ فلان کەسی؟". گوتم بەڵێ، ئاوا سەیری کردمو زەردەخەنەیەکی کرد. گوتم: ئێوە بە هەڵەدا چوون، پەشیمان دەبنەوە. گوتی: "بۆ؟" گوتم پەشیمان دەبنەوە، چونکە ئێوە بەهەڵەدا چوون.

**+ لە موسڵ یان لە بەغدا؟**

ـ لە فڕۆکەخانەی موسڵ، دایان بەزاندین، یەکسەر هات، لە برایانی تری نەپرسی، هات گوێنییەکەی لەسەر من لابردو گوتی: "تۆ فلان کەسی؟" گوتم: بەڵێ. گوتی "وەزعت چۆنە؟". گوتم: باشم، بۆ؟ گوتی "نا، هەروا". گوتم باشم، بەڵام بەهەڵەدا چوون، دوایش پەشیمان دەبنەوە. گوتی: "بێدەنگ بە".

**+ هەستت دەکرد کە ئەو عەرەبە، عیراقییە؟**

ـ حاڵەتێکی کوتوپڕ بوو، نەمتوانی تەشخیصی بکەم، بەس دیارە وێنەو شتی منی بینیبوو، ئەگەر لەنزیکەوە منیشی ئاوا نەدیبێ.

**+ لە کاتی دەستگیرکردنتان تا ئەو شوێنەی بردیانن، کە دەرکەوت موسڵ بوو، ئایا تورەکە هەر لە سەرتان بوو؟**

ـ بەڵێ، دەستیشمان هەر بەستراوەبوو.

**+ ماوەکەی چەندبوو؟**

ـ بڕوا بکە بە مەزەندەی من ئەوە لە پێش سەعات چواری ئێوارەوە بوو تا پێش بەرەبەیان، تا نیوەشەو، چونکە لە موسڵ دایاننناین شەو درەنگ بوو، چونکە لەوێ من نوێژی مەغریبو عیشام بەیەکەوەو بە دەستبەستراوی کرد، هیچ جووڵەو شتم بۆ نەدەکرا، ئینجا لەوێماینەوە تا درەنگ، پاشان فڕۆکەیەکیان بۆ هێنایەو گواستیانینەوە، گوتم ڕەنگە بۆ "گوانتانامۆ" بێ، دوایی لە شوێنێکی دیکە دایان

بەزاندین، سەرەتا نەمزانی کوێیە، چاومان بەسترابوو، دوایی بۆمان دەرکەوت کە ئەوە فڕۆکەخانەی بەغدادە، لەوێش هەر ماوەیەك هێشتیانینەوە، هێندێك لەبرایانمان وەك بڵێی تارەتو شتیان گرتبوو، چونکە دەبوو خۆیان (ئەمریکییەکان) بەنەخوێن و پشتێنت بۆ بکەنەوە، من بۆ خۆم گوتم ئەگەر دەستم دەکەنەوە تا بۆ خۆم دەستنوێژ بگرم، ئەوە باشە، ئەگەر نا، بەپێچەوانەوە. گوتیان نەخێر ناتکەینەوە، منیش نەمهێشت، من زۆر سەغڵەت بووم، پێموابێ (٨ - ١٠) سەعاتێك دەبوو بە تەسەوری خۆم، بەتەقدیراتی خۆم، چونکە لە فڕۆکەکەشدا زۆرمان پێچوو، دوایش کە دایانگرتین، هەر ماوەیەکمان پێچوو، هەر نەیان بردین، دوایش ماوەیەك دایاننایین، گوتم باشە هەر لانیکەم دەستمان بکەنەوە، نوێژ دەکەین و تارەت دەگرین، گوتیان: "بۆ لەوێ تارەتتان نەگرتووە؟"، گوتم، نا، من تارەتم نەگرتووە، ئینجا دەستیان کردینەوە، لەوێوە دەستیان بە لێکۆڵینەوە کرد، کە گەیشتینە جێ، (٥ - ٦) موحەقیقمان لێئاڵان، بەجیا لێکۆڵینەوەیان لێدەکردین.

**+ ئەو کەسانەی کە بۆ دەستگیرکردنتان دانیشتبوون، کەسی ناسراویان تێدابوو؟ بە واتایەکی تر" کوردیان لەگەڵ بوو؟**

ــ ئەمن کەسم نەبینین، چونکە ئەوانەی ڕاوەستابوون، هەموو جلوبەرگی ئەمریکییان لەبەردابوو، کەسم لێ تەشخیص نەکردن، من لەناوەڕاستی سەیارەکەشدا بووم، بەڵام هەستم کرد کە منیان ناسیو یەکێك پێی گوتن، چونکە سەیارەکەی پێش ئێمە ڕەتبوو وایان زانی لەگەڵ ئێمە نییە، چونکە منی تیا نەبووم، سەیارەکەی منی تێدابووم کە گەیشتە ئەوێ، هەستم کرد یەکسەر ئیشارەتیان دایەو گوتیان فڵان کەس لەوێدایە، سەیارەکەیان ڕاگرت، بیستوومە دوایی هەندێك سیخوڕیان تێدابووەو لەگەڵ بووە، بەڵام بەوردی نازانم.

**+ لەو کاتەدا کەس ناوی تۆی برد؟**

- بەڵێ، هەر ناویشیان نووسیم.

**+ بەر لەوەی دەستگیر بکرێن، جەنابت باست لەوە کرد کە پێشبینی ئەو ڕووداوەت دەکرد؟**

ـ پێشبینیم دەکرد، نەك ئاوا، بۆیە من پێشتر کە لە سلێمانی بووم، هەندێك جار لە ماڵی خۆماندا نەدەخەوتم، دەچوومە شوێنێکی تر، بەڵام پێشبینیم نەدەکرد بچم دەعوەتیان بم و بمگرن.

**+ مامۆستا، باست لەوە کرد کە لەماڵی خۆتان نەدەخەوتیت، من پرسیارەکەم ئەوەیە، کە ئەو زانیارییەتان بیستبوو کە دەستگیر دەکرێن، ئایا رێوشوێنێکتان گرتبووە بەر بۆ پارێزگاریی لە خۆتان؟ ئایا بیرتان لەوە نەکردبووەوە کە بچنە دەرەوەی وڵات؟**

ـ نا، من بیرم لەوە نەکردبووەوە، چونکە چۆن مرۆڤ خەڵکی خۆی بەجێدێڵێ، کاتێك دەبوو بیر لەوە بکەمەوە، کە بە خەڵکی خۆشم بڵێم خۆتان شوێن ونکەن، مقەڕەکان هەموو داخەین، ئەگەری ئەوەشم دانابوو کە ئەو هەواڵانە درۆبن، بۆ لەخۆوە کارێکی وا بکەین، لەبەر ئەوە، بەڵێ" چاوەڕێی ئەوەم دەکرد کە بگیرێم، بەڵام بەمەعقولم نەزانی خۆم پەنهان کەم، خۆپەنهانکردنەکەم دەبوو دوای ئەوە بێت کە خەڵکی خۆمان پەنهان کەین، ئەگەرنا، مەعقول نییە ئیمام خۆی بشارێتەوەو ئوممەت لە گۆڕێ بێ، پێم شتێکی نابەجێیە.

**+ ئەو کاتەی دەستگیرکران، پاسەوانەکانتان چەکیان پێبوو، ئایا خۆت پێت وتن کەس هیچ نەکات؟**

ـ ئەمن گوتم کاکە لەگەڵ ئێمەیان نییە، چونکە ئەوان خۆیان گوتوویانە "بۆ ئێوە نییە"، خۆتان ئەوە نەکەن، هیچ کەس خۆ نەجوڵێنێ، بۆ ئێمە نییە، لەگەڵ ئێمە نییە، دوایی هاتنە پێشێ و گوتیان: "تۆ بەرپرسیانی؟"، گوتم: بەڵێ من بەرپرسیانم، مەوعیدمان هەیە لەگەڵتان، مەحتەلمان مەکەن. ئیدی تا دوایی وتیان: "چەکەکان لە ناو سەیارەکان دابنێن، تۆزێك تەحقیقتان لێدەکەین، ئێمە بە دوای کەسێکدا دەگەڕێین". ئەو کەسە ئاوا هەندێك قسەی بە عەرەبی کرد، بەڕاستی هەمووشم لە یاد نەماوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو وای ئێمە حاڵی کرد کە ئەوە بۆ ئێمە نییە، لەخەڵکێکی تر دەگەڕێن، لەبەر ئەوە خۆتان مەشڵەژێنن، بێگومان بیرکردنەوە لەتەقەو

شت، شتێکی بێجێش بوو، چونکە مودەڕڕەعەو دەبابە لە هەر چوار دەور دامەزرابوون، تۆ کەوتبوویە ناویان، خۆ ئێمە بۆ شەڕ نەچووین.

**+ تۆ لە کوردستان و لە سنووری حکومەتی هەرێمدا بۆ سەعات بۆ دانراو دەستگیرکرای، چۆن لەو ڕووداوە دەڕوانی؟ بەرپرسیاریەتیی ئەو ڕووداوەو بۆسەدانانەکەش بۆ کێ دەگێڕییەوە؟ پێتوابوو کەس دەستی لە پشت ئەو ڕووداوەوە هەبێ؟ ئایا ئەمریکییەکان باوەڕیان بە پاراستنی سیادەی کوردستان هەبوو؟**

ـ من ئەگەر زانیبام ئەمریکا هەندێ ڕێز لە ئیدارە کوردییەکان دەگرێ، بڕوای بەوە هەیە کە سیادەتیان بەسەر خاکی خۆیاندا هەیە، بەسەر خەڵکی خۆیاندا، دەمگوت ئەوە مادام لەژێر سایەی ئیدارەی یەکێتیدا من گیراوم، ئۆباڵەکەم بەئەستۆی ئەوانە، بەس لەبەر ئەوە کە ئەمریکا هیچ کەس بەهیچ نازانێ، شتەکەی خۆم هەر لە ئەمریکا دەزانم، چونکە من دەزانم ئەمریکا ڕێز بۆ کەس دانانێ، غەیری سیاسەت و بەرژەوەندی خۆی، پێشم بێئینسافییە کە گلەیی لەکەسێك بکەم کە (مغلوب علی أمره)یە، هیچی بەدەست نییە، دەستەپاچەیە، من ئەوەم لەبەرپرسان و سەرکردایەتی سیاسیی کوردیش بیستووە (کە هاتوون بۆ دڵدانەوەی من)، گوتوویانە: "ئەگەر ئێمەشیان گرتبا، هەر وەك تۆ دەبووین". دوایش دەرکەوت دکتۆر موحسین عەبدولحەمید کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لەجێی سەرۆك کۆمار دانیشتبوو، گرتیان.

لەبەر ئەوە، من کە بارودۆخەکە وادەبینم، دەزانم کە ئەمریکا ڕێز بۆ کەس دانانێ، سەربازێکی ئەمریکی حوکم بەسەر هەرکەسێکدا دەکا کە بیانەوێ، شتەکەی خۆم هەر لە ئەمریکا دەزانم، ئیدی پێم بێئینسافییە گلەیی لە خەڵکێك بکەم کە هیچی بەدەست نەبووە، بەڵێ" ڕەنگە کەسانێکی نەفسنزم وەکو هەڵسوکەوتی شەخصیی خۆیان هاوکاریی ئەمریکایان کردبێ، بەڵام من وەکو لە کۆنگرە ڕۆژنامەنووسییەکەشدا کە دوای ڕزگاربوونم بەستم، گوتم: ئەمریکا گرتوومی و ئەمریکاش بەریداوم، لە کاتی گرتنمەوە تا کاتی ئەشکەنجەدان و تا کاتی مانەوە، ئەو بیست و دوو مانگە کە لە زینداندا بووم، غەیری ئەمریکی کەسم نەدیوە، ئیدی کەس بە تەرەفی خۆم نازانم.

**+ تا ئێستا لەو بارەیەوە هیچ بەڵگەنامەیەك نەهاتووەتە بەردەستت، كە بۆت بسەلمێ ئەمریكییەكان غەیری خۆشیان لەگەڵ بووە؟**

ـ نەخێر، بەڵام ئەمریكییەكان خۆیان باسی هەندێ كەسیان دەكرد، دەیانگوت: "فلان لایەنی سیاسیی هاوكاریی كردووین، ڕاپۆرتیان لەسەر داوی، ئەوان زانیارییان داینێ بۆ چۆنییەتی دەستگیركردنی تۆو هاوكارییان كردین". بەڵام من بەوانیشم دەگوت كە هەر ئێوە بەتەرەفی بەرانبەری خۆم دەناسم، ئەوە قسەی خۆتانەو كەسانێكیش ئەگەر شتی وایان كردبێ، دیارە لە بەرانبەر هەندێك پوولو پارەو بەرژەوەندیی كەسیی خۆیان كردوویانە.

**+ مامۆستا، دوای دەستگیركرانی ئێوە، ئێمە زۆر گفتوگۆمان لەگەڵ بەرپرسانی ئەمریكا لە كوردستان كردووە، كە ئەو كات كۆلۆنێل هاری شووت بەرپرسیی دەكردن، جێگرەكەشی ناوی مێجەر بولیەن بوو، ئێمە گفتوگۆمان لەگەڵ دەكردن، ئەوان دەیانگوت: ''ئێمە بە هیچ شێوەیەك ئاگامان لەو ڕووداوە نییە، بەئێمەش نەسپێردراوەو هێزی ئێمەی تیانەبووە''. ئەو هێزەی بۆتان دانیشتبوون، ئایا هەر هێزی سەربازیی بوون، یان هێزی ئەمنیشیان لەگەڵ بوو؟ هەروەها بەچەند كەس مەزەندە دەكران؟**

ـ هێزەكە بەچەند مەزەندە دەكرا من نازانم، بەس ئەوەندە دەزانم چەند مودەڕڕەعەو سەربازو شت ڕاوەستابوون، دوایی لەماوەی دەستبەستنی ئێمەدا، گوێم لە دەنگی كۆپتەرەكانیش بوو هاتن، دوو بۆ ئێمە هاتن، دوایی ئیبراهیمی برامو ئەوانیش كە هاتنەوە، گوتی: "ئێمەشیان بە دوو كۆپتەر برد". ئەوە بەنیسبەت ئەندازەی هێزەكان، ناتوانم بڵێم چەند بوون، ڕەنگە برایانی تر ئەگەر چاویان گێڕابێ زیاتر بزانن، سەبارەت بە جۆری هێزەكان" ئێمە بەس هێزی سەربازیمان بینی، بەس كە لە فڕۆكەخانەی موسڵ دایان بەزاندین، كابرای كە بەرگی مەدەنی لەبەردابوو، زانیم موخابەراتە، جا (CIA)یە یان شتێكی تر، نازانم، بەس لەگەڵ ئەواندابوون، دوایش ئەوانەی تەحقیقیان لەگەڵ مندا دەكرد، هەموویان مەدەنیبوون، بەڵام خۆیان بەمنیان نەدەگوت كە ئێمە چین، بەس دیاربوو موخابەرات بوون، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەمریكی بوون، خۆ بەمنیان نەدەگوت كە ئەوە ئێمە هێزی فلان شوێنو فلان نووسینگەین، هەر

ئەمریکی بوون، بەڵام هی کوێبوون، هی کوێ نەبوون، نازانم. بەڵام ئەی چۆن ئەوان هێزێکیان لەبەغداوە دێتو نەفەرێك لە کوردستان دەگرێت، بێئەوەی هێزەکەی کوردستانیان ئاگادار بێت، شتی وا دەبێت؟!

**+ جا ئەوە لێدوانەکانیان بوو..**

ـ ئەوە مانای وایە زۆر بێسەرەو بەرەن، مادام کابرا هێزێکی لە کوردستان داناوە، دەبێ هەمەکارەبێ، شتێکی بەدەست بێ، یان ئەگەر شتێکی کرد، ئەوەی لەبەغدایان داناوە کە بێ لەکوردستان شتێك بکا، خۆ دەبێ ئەوی تر ئاگاداربکاتەوە، ئەگەرنا، ئەوە دیارە زۆر بێسەرەو بەرەن، من نازانم، گرنگ ئەوەیە من ئەمریکی گرتیانم.

**+ مامۆستا، تۆ وەکو سەرکردەی حزبێکی ئیسلامیی خەباتکار، لێکدانەوەت چیبوو بۆ ئەو زیندانییکردنە؟ هەستت بەچی دەکرد؟**

ـ یەکەم" هەستم بەوە دەکردو پێم سەیربوو ئەمریکا (وەکو لەوێش پێم دەگوتن، لەکاتی لێکۆڵینەوەدا) زلهێزێکی واو دەوڵەتێکی وا کە بانگەشەی مافی مرۆڤ و بانگەشەی دونیا کردنەیەكو بڵاوکردنەوەی بەهاکانی خۆیو ئەوانە دەکا، پێم سەیر بوو ئاوا بەو شێوە ناشارستانییەو بەو شێوازە نامەعقولییە من بگرێ، ئەگەر قسەکانی کە لەگەڵ ولیام ئیگلتن کردوومە، لەگەڵ ئەو قسانەی لە کاتی لێدانو دوای لێدانیش بەراوردیان بکەی، هەر یەکن، چیم گوتووە هەر ئەوەیە، لەبەر ئەوە، بەڕاستی پێم سەیربوو، پێم شتێکی چاوەڕواننەکراو بوو، تەسەور نەدەکرا دیموکراسییەتی ئەمەریکا هەر ئاوابێ!!

پاشان بەڕاستی بەزەییم زۆر بە میللەتی کورددا هاتەوە، ئەمڕۆ بە حساب چەند ساڵە هەڵبژاردن کراوە و پەرلەمان هەیە و دەوڵەت هەیە و ئیدارە هەیە، کەچی من بە لای کەمەوە کوردێکم، هەر کوردێکم و هیچ ناونیشانێکی سیاسیم نییە، کوردێکم لەم وڵاتە دەژیم، ئەوەتا هێزێکی بێگانە دێ، بە بێ هیچ پاساوێك بۆسە بۆ من دادەنێو بەبێئەوەی حساب بۆ هیچ کەسێك بکا، بۆ؟ چونکە ئەو خەڵکە یان لەگەڵیان موتەواتیئە یان بێئاگایە، وەکو عەرەب دەڵێ: "فان كنت تدري فتلك مصيبة، وان كنت لا تدري فالمصيبة أعظم". یان ئاگایان لێبووە، ئەگەر ئاگایان لێبووە، چۆن دەبێ

هاوسەنگەرێکی خۆیان، کە ڕێککەوتنیان لەگەڵی هەیەو دانیشتنمان پێکەوە هەیە، پێکەوە شەڕی دژی بەعسمان کردووە، پێکەوە شەهیدمان داوە، چۆن دەبێ نەرمکێش بن لە پلانێکی وادا، ئەگەر ئاگاشیان لێی نەبێ، مانای وایە ئەم میللەتە زۆر جێگەی بەزەییە، بە سەرکردایەتیی سیاسیشیەوە جێگەی بەزەییو جێی شەفەقەتە، کە هیچ حساباتێکی بۆ ناکرێ، چونکە کۆمەڵێ جەندرمەی ئەمریکی دێنو یەکێ، بەلای کەم یەکێ لە کوردەکان، یەکێ لە ڕموزی سیاسیی دەگرن، گوتاربێژێکە، نووسەرێکە، مامۆستایەکە، پێشمەرگەیەکە، دەیگرن بەبێئەوەی هیچ شتێکیان بەدەستەوە بێ، چونکە دوایی دەرکەوتو گوتیان "ئێمە هەموو زانیارییەکەمان هەڵە بووەو داوای لێبوردنمان هەیە".

ئەمجا بەڕاست بەزەییشم بە کۆمەڵی ئیسلامییدا دەهاتەوە، کە کۆمەڵی ئیسلامیی ئەو ستەمانەی لێکراوە، بێدەنگ بووە، لەبەر هەر هۆیەك بووە، خەڵك ڕەنگە بە بێدەسەڵاتی تێبگەن، بەس من پێموایە بەقەد چەند ئەنصارێكو خەڵکێکی ترمان لەدەست دەهات، دەمانتوانی شت بکەین ئەگەر بەرژەوەندی میللەتو دووربینیمان ڕەچاو نەکردایە، بەرژەوەندی میللەتمان لەبەرچاو نەگرتبایە، شتیشمان لێدەهات، وەکو خەڵك شتیشمان دەزانی، کاتی خۆی شەڕیشمان کردووە. بەزەییم بە کۆمەڵی ئیسلامییدا دەهاتەوە کە بۆ دەبێ ئاوا وێنا کرابێ بۆ ئەمریکییەکان، بۆچی ئەو خەڵکە، ئەو سەرکردایەتییە سیاسییە دیفاع لە کۆمەڵی ئیسلامیی نەکا، کە درێژەپێدەری ئەو کاروانی خەباتو سەروەرییانەی بزووتنەوەی ئیسلامییەو شەهیدمان داوە لە زیندانەکانی بەعسدا، لە بەرەکانی جەنگدا، بۆ دەبێ دیفاعی لێنەکرێ؟

ئەمجا بەڕاستی بۆ خۆشم، چونکە لە ژیانمدا (لە خوا بەزیاد بێ) بێعیززەتیم نەبینیوە، ژێر دەستەییم نەبینیوە، بەڕاستی بۆ منیش بەلایەکی زۆر گەورە بوو، زۆر لەسەر دڵم قورس بوو، جا ئەوە هەروەکو بڵێی خوای پەروەردگار دڵی هەر بەقووەت کردووم، چونکە دەبوایە دڵم ڕابووەستایە، واتە پێم خۆشبوو سەدجار بمرم، بەلام بەڕاستی جارێك کەلەپچە نەکرێم، وترا ئایا ئیهانە کران؟ ئەوە گەورەترین ئیهانەیە، بەلام ئەوەندە هەیە بڵێم زللەو شتی تیا نەبوو، بەلام بەئیهانەیەکی زۆر گەورەم زانی، بۆ منیش زۆر شتێکی قورس بوو، پێموابوو کە لەژیانمدا تاقیکردنەوەو سەختی زۆر

هاتووەتە ڕێم، بەڵام ئەوەم لەهەموو پێ سەختتر بوو، بەتایبەت کاتی گرتنەکە، هەر ئەوەندە بوو ڕوحم دەرنەچوو لە خەفەتان، من لە مردن زۆر بێمنەت بووم، پێم خۆشبوو سەد جار دەستڕێژییان لێکردبایین، لەوێ تەرمم بکەوتایە، بەڵام ئاوام نەبینایە.

**+ بەتایبەت تۆ وەك کەسێك کە لەسەرەتای تەمەنی لاویتییەوە ژیانی سەربەرزانەو ئەوانەت هەڵبژاردبوو؟**

ـ ئەمن یەك شتتان بۆ بگێڕمەوە، من لە کۆلێجی فیقە بووم لە نەجەف، لە ساڵی دووەمی کۆلێجدا بووم کە داوایان لێکردم بۆ "جیش الشعبي"، گوتم نایکەم، بڕواتان بێ، ئەو هاوڕێیانەی لەگەڵم بوون‌و سەر بەڕێکخستنەکانی یەکێتیی‌و پارتی‌و ئەحزابی تر بوون، هەموویان بوون بە "جیش الشعبي"، ئەمنیان پێ شێت بوو دەیانگوت: "چۆن؟ ئاخر لەخوێندنەکەت مەحروم دەبی"، دەمگوت کاکە ناتوانم ببم بە "جیش الشعبي"، یان "اتحاد الطلبة"، نەك هەر ئەوە، لە تاقیکردنەوەکانی شەشی ئامادەیی لە پەیمانگای ئیسلامیی لە سلێمانی، ئێستاش لە یادمە کە تەعبیرمان بۆ هاتبوو، دوو تەعبیر، یەکێکیان" زەمی خومەینی بکەن. دووەمیان" مەدحی صەددام بکەن. منیش وتم: من قەناعەتم بەو دوو تەعبیرە بەهیچیان نییە، نەزەمی ئەوێم پێ ڕەوایە، نە مەدحی صەددامیشم پێ ڕەوایە، سی نمرەی لەسەر بوو، خوا ئاگادارە پیتێکم نەنووسی، سی نمرەم لە دەستچوو، لام وابێ شەست و شتێکم هێنابوو، (٦٨) بوو ، دوایی هاوڕێکانم دەیانگوت: "ئاخۆ بۆ؟"، چۆن وەڵامت نەداوەتەوە ؟"، گوتم: من شتێك قەناعەتم پێی نەبێ، بۆم نانووسرێ. پێیان مایەی سەرسامی بوو، جا لە خوا بەزیاد بێ، لە ژیانمدا هەر وا بووم، چی قەناعەتم پێی بووە وام گوتووە، وام کردووە، وام نووسیوەو وام مومارەسە کردووە.

ئەمجا خوای گەورەش بارەکەی بۆ من وا هەڵخستووە، هەر کە گچکەش بووم، منداڵیش بووم، لە گەڕەکێ کە تیپی تۆپێنەیان پێکدەهێنا، منیان دەکردە براگەورە، هەرکە پێشڕا گەشتووم، ئەوە برای وەکو مامۆستا حەسەن بابەکر کە بەتەمەن لەمن گەورەتر بووە، لەگەڵیاندا بووم، خوای گەورە بارەکەی بۆ من وا هەڵخستووە، کە من ئەوان ئاڕاستە کەم‌و ئەوانە، ئەو برایانە کە لەمن گەورەتر بوون، ڕەنگە لەمنیش

شـارەزاتر بووبن، بەڵام بە هەرحاڵ خوای بەرز بارەکەی وا بۆ من هەڵخستبوو، واتە هەر لـە سـەرەتاوە وەزعەکـەم وابووە، زیاتر ڕۆڵی براگەورەیی‌و ئاڕاستەکار و ئەوانە ببینم، جا ئـەوجا قـەد دیلی‌و ژێردەستەیی‌و کەلەپچەیی‌و ئەو بەزم‌و ڕەزمەم نەبینیبوو، لەبەر ئـەوە، بۆ مـن شـتێکی زۆر ناخۆشـبوو، ئـەوە لـە ژیانمدا لە ڕژێمی بەعس قاچاغبووم، لـەوێ بـە ئەمریکییەکانم دەگـوت، دەیانگـوت: "ئـەوە یـەکێ لـە پرسـیارەکانیان بـوو: پەیوەندی لەگـەڵ ڕژێم"، دەمگوت: بابە من لە ژیانمدا قاچاغبووم لە ڕژێم، ئێستا ئێوە بەدیلـی هێناوتانم بۆ ئێرە، ئەگەرنا بەغدام هەر نەدیوە، من بیست و یەك ساڵە بەغدام نەدیوە، "گوتیان یەعنی چۆن؟" گوتم بچن لە هەموو خەڵکی کوردستان بپرسن، من لە ڕژێـم قاچـاغبووم، ئیـنجا دیـارە بـۆ حاڵەتێکـی وا، مرۆڤێکـی وا، بـێگومان بـۆ بـاری دەروونیی زۆر ناخۆشە.

**+ دوای ئەوەی ئازاد بوویت، بە هەمان ڕێگەدا (قەمچوغە) تێپەڕیت، چیت بیر کەوتەوە؟**

ـ وەڵڵا هـەرجار کەدەبینم، زۆر دڵـم پـێـی قـەڵس دەبێ، زۆر نارەحەت دەبم، ئەو شـتانەی کـە باسم کردن بەرانبەر بەئەمریکاو میسداقییەتی دیموکراسییەت‌و مافی مرۆڤ و دروشمەکانـی تـریان، بێئیرادەیـی مـیللەتەکەی خـۆمان، مەزلومییەتـی کۆمەڵـی ئیسـلامیی‌و حاڵەتـە دەروونیـیەکەی خـۆم دێـتەوە یـاد، هەمـوو جـارێ، خـوا ئاگـادارە هەنـدێجار پێمخۆشە ڕوو بکەمە ئەولا، هەر برایانیش جار جار نازانن‌و دەڵێن: "مامۆستا ئێرە بوو؟!".




# تەوەرەی سێیەم:

# زیندان و زیندانییەکان، مامەڵە و یەکترناسین

٢٠٠٥/٦/١٣

ستۆدیۆی کەناڵی هەولێری تەلەفزیۆنی کۆمەڵ

**+ مامۆستا، پاش ئەوەی دەستگیرکران، ڕەوانەی چ زیندانێکیان کردن؟ دوای چەند ڕۆژو چەند زیندانی تر بردنیاننە زیندانی "کرۆپەر" لە فڕۆکەخانەی بەغداد؟**

- بسم الله الرحمن الرحيم، پاش ئەوەی لەلای گوندی قەمچوخە کەلەپچەیان کردین‌و سواری کۆپتەریان کردین بۆ سجنێك لە موصڵ، دوایی بردیانین هەتا نوێژی خەوتنان‌و دوای نوێژی خەوتنان لەوێ ماینەوە، لەوێش لە شوێنێك لەبەر خۆرەتاو دایان نابن، من هەر لەوێ نوێژی خەوتنان‌و شێوانم بە قەسرو جەمع کرد، تا دواساتیش کە دوای شەو گواستینیانەوە لەوێ، سواری فڕۆکەیەکی تریان کردین، نەمزانی چ جۆرە فڕۆکەیەك بوو، بە چاوبەستراوی خۆیان دەستیان کێشاین‌و بردیانین بۆ شوێنێك کە دوایی دەرکەوت بەغداد بوو، لەوێش شوێنێك بوو هەر لە نزیك زیندانی "کرۆپەر"، کە دوایی بردیانین بۆ ئەوێ، بەڵام نەمدەزانی کوێیە، لەوێ دایان بەزاندین، لەوێ نۆ ڕۆژ مامەوە، ئەو نۆ ڕۆژە لەوێ تەحقیق‌و ئەزیەتدان‌و شتیشی تێدا بوو، دوای ئەو نۆ ڕۆژە سواری ئۆتۆمبێلێکیان کردین، بەتەنها لەو برایانەیان جیا کردمەوە، پێشتریش ئەوانیان لە من جیاکردەوە، بەڵام جار جار دەمبینین، ئەوانیش هەر لەو چەند ژوورەدا بوون، دوایی منیان بە ئۆتۆمبێلێك برد کە بەمەزندە بیست دەقیقە ڕێبوو، نیو سەعاتێك ڕۆیشتین ئەوسا گەیشتینە زیندانی "کرۆپەر"، ئەوێش دیارە هەر لە دەوروپشتی فڕۆکەخانەکە بوو، دوای ئەوەی شەو گەیاندینیانە ئەوێ، دوای ئەو زیندانەی نۆ ڕۆژ بوو لەوێ بووم، ئەو برایانەم لەگەڵ بوون: (مامۆستا تۆفیق‌و مامۆستا داراو حاجی عەبدوڕڕەحمان)، ژمارەیەك لە پێشمەرگەکانیشمان لەگەڵ بوون، یەکسەر کە دایان بەزاندین، دیارە دەست‌و پێشمان زۆر سەغڵەت بوون، گوتمان دەستمان بکەنەوە، جا دوای ئەوە دەستیان کردینەوە، دەستنوێژێکم گرت‌و یەکسەر لەگەڵ مندا کەوتنە تەحقیق، دیارە بە جیا، ئیدی لەو کاتەوە تەحقیقات‌و پرسیارو وەڵام بەردەوام بوو.

لەوێ نزیکەی نۆ ڕۆژ مامەوە، شوێنەکەی وابوو من شەوو ڕۆژم بۆ لە یەك جیا نەدەکرایەوە، چونکە هەمیشە گڵۆپەکان دەئایسان، کارەبای لێبوو، لە هیچ شوێنێکیشەوە کون نەبوو تا بزانی لە دەرەوە شەوە یان ڕۆژە، لە ژوورێش هەموو کات ڕووناك بوو، لێشم دەپرسین لە کاتی نوێژەکان، بەڵام پێیان نەدەگوتین، ئیدی من بە

تەقدیریی نوێژەکانم دەکرد، بە مەزندەی خۆم دەمگوت ڕەنگە ئێستا نوێژی بەیانی بێت، یان ئێستا نوێژی خەوتنان بێت، خوای پەروەردگار بۆ خۆی دەزانێ: (..وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ..) (المزمّل: ٢٠). گرنگ ئەوەیە هەموو شەوو ڕۆژێك، کە دەمزانی شەوو ڕۆژە، پێنج نوێژم تێدا دەکرد، نوێژە فەرزەکان.

دوای ئەو نۆ ڕۆژە منیان گواستەوە، بە تەنیا سواری ئوتومبێلێکیان کردم، بردیانم بۆ شوێنێك، لەوێ ئەڵقەیەکیان خستە دەستم کە ناوونیشانو ژمارەکەی لەسەر بوو، ژمارە (١١٧) بوو، ئەوانەیان لەسەر نووسیبوو: ناوی خۆمو، ژمارەکەم. ئینجا بردیانم بۆ قاعەیەك، کە چووم لە پێش نوێژی بەیانی بوو، زۆر ماندوو بووم، زۆر تینووم بوو، سەلامم کرد لە قاعەکە، نەمزانی کێی لێیەو کێی لێ نییە، هەندێکیان هەڵسان پێش نوێژی بەیانی بوو، وتیان تۆ کێی؟ وتم من حاڵو حسابم وایە، ئەی ئێوە کێن؟ تەماشام کرد وەزیرو ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش "مجلس قيادة الثورة"و وەزیری ئەوقافی ڕژێمی بەعس، لەوێ بوون، دوو سێ وەزیری دیکە لەوێ بوون، من تا ئێوارە لەوێ مامەوە، دیاربوو ئەوان لە مێژ بوو لەو قاعەیە بوون، دوای ئەوە (کە دەکاتە ئێوارەی ڕۆژی دەیەم) منیان برد بۆ ژووری تاکی، ئینجا من هەر لەژووری تاکی بووم هەتا هاتوومەتەوە، بەڵام ئەو کاتە لە قاتعێك بووم کە نەوەد ڕۆژ مامەوە، دوایی بردیانم بۆ ژوورێکی دی، ئەوەی پێشیان ژمارە چلو دوو بوو لە قاتعی حەوت، دوایی هێنایانم بۆ قاتعی ژمارە پێنج ژووری ژمارە چلو دوو، چل ڕۆژ لەوێ مامەوە، دوای چل ڕۆژ گواستمیانەوە بۆ ژووری ژمارە چل هەر لە قاتعی ژمارە پێنج، باقیەکەی کە دەکاتە پێنجسەدو نۆزدە ڕۆژ، بە هەمووی من شەشسەدو پەنجاو نۆ ڕۆژ مامەوە، هەموو کاتی گیرانم تا ئازاد بوونم: نۆ ڕۆژی لە شوێنێك، یەك ڕۆژی لە شوێنێك، ئەوە دە ڕۆژ، نەوەد ڕۆژ لە شوێنێکی تر، ئەوە سەد ڕۆژ، چلیش لە شوێنێك، ئەوە سەدو چل، سەدو چل لە شەشسەدو پەنجاو نۆ دەرکەی، پێنجسەدو نۆزدە دەکات، پێنجسەدو نۆزدە ڕۆژ لە ژوورێکا بووم، ئەوی تریشی، چلیان لە ژوورێكو نەوەد ڕۆژیشی لە ژوورێکی تاکی، واتە جگە لە دە ڕۆژ، ئەو شەشسەدو پەنجاو نۆ ڕۆژە جگە لە دە ڕۆژی سەرەتای، هەمووی لە ژووری تاکیدا بووم.

**+ بەر لەوەی بچینەوە نێو درێژەی باسی زیندانەکە، ناوی "کرۆپەر" لە چییەوە هاتووە؟**

ـ بە ڕاستی من نەمدەزانی، بەڵام لەوێ هەندێك لە زیندانییەکان، لەوانەی کە خەڵکی بەرپرسی ڕابردوو بوون لەڕژێمدا وتیان: "کرۆپەر ناوی یەکێکە لەو ئەمریکییە ناودارانەی کە لە نیویۆرك، لە یانزەی سێپتەمبەر لە بەین چوو بوو"، یەکێك بوو لە پیاوە ناودارەکانیان، بەناوی ئەوەوە ئەو سەربازگەیە ناو نرابوو.

**+ ئەو زیندانەی کە تۆی تیابووی، ژوورە تاکییەکانی چۆن بوون؟**

ـ ژوورە ئینفرادییەکان، هەر سێکیان یەك مواسەفاتیان هەبوو، هەر یەکەیان (٢,٥م X ٢,٥م) بوو، بەرز بوو، بۆ ئەوەی هیچ کەس بەهیچ شێوەیەکی نەگاتە سەرێ، ئینجا دیوارەکانیان کۆنکرێتی بوو یان گەچکاری بوو، یان بۆیەیان کردبوو، پێشێ ژوورەکان تاریك بوون، بەڵام دوایی بۆیەیان کردن، بۆ ئەوەی تیشکی ڕۆژ لە شوێنێکەوە کە هاتە ژوورێ یان کە گلۆپێکیان هەڵکرد، تۆزێ ڕووناك بێ، ئەوی کە نەوەد ڕۆژ تێیدا مامەوەو ژوورەکەی تریش کە چل ڕۆژ تیایدا مامەوە، نەوەد ڕۆژییەکە سەرئاوو شتی تیا نەبوو، ڕۆژی دوو جار یان جارێك (جاری واش هەبوو سێ جار) دەریان دەکردین بۆ سەرئاو، جاری واش هەبوو جارێك، دەبوایە خەڵك لەناو ژوورەکەدا ئیشی خۆی جێبەجێ بکات، سەرئاوو شتی خۆی جێبەجێ بکات، میزیان لە بتڵ دەکرد، شتی تریش لە سەتڵ، من زۆر بەوە قەڵس بووم، هەتا ئەو کاتانەی کە دەچوومە سەرئاو، پێداویستی سەرئاوم جێبەجێ دەکرد، بەڵام دوایی کە گواستمیانەوە بۆ قاتعی پێنج، لەوێ ژوورەکە ئاودەستی تێدابوو، لەوێ مرۆڤ دەیتوانی جلوبەرگی خۆی بشوا، دەنا پێشێ جلوبەرگشۆرین زۆر زەحمەت بوو، چونکە لە پێشدا لە حەمامیش نەیان دەهێشت، یان زۆر پەلەپەلیان دەکرد، دیارە ئەوە مەسەلەی چوونە سەرئاوو خواردنو خواردنەوەی پاکوخاوێنو ئەو شتانە هەمووی بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕی.

**+ زیندانی "کرۆپەر" مواسەفاتەکانی چیبوون؟ تایبەت بوو بە چ زیندانییەك؟**

ـ ئـەو زیندانـی "کـرۆپەر"ە، بـە مەزەنـدەی مـن نـزیکەی (١٠٠ ـ ١٥٠) کەسـێکی تـێدابوو، نـزیکەی سـەد ژووری تاکـی تـێدا بـوو، هەروەها دوو قاعەی دە نەفەریی تێدا بـوو، ئەوانـەی کـە لـەو زینـدانە بـوون، خەڵکـی پلەیـەكو دووی ڕژێمـی پێشـوو بـوون، بەرپرسـە ئیداری و سیاسییەکان، ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش (مجلس قـیادة الـثورة)، ئەندامانـی مەجلیسـی قـیادەی قوتـریو وەزیـرەکانو سـەرکردە سەربازییەکانو موخابەراتو ئەوانە لەگەڵ خزمەکانی صەددام.

شـێوەی زیـندانەکە وا هەڵکەوتـووە، هـەر چـواردەوری گـیراوە، بـە چـوار دەوریـدا بورجـیان دانـاوە، پاسـەوان لەسـەر بـورجەکان بـە تفەنگـەوە دامـەزراوە، ئیـنجا هـەر چواردەوریشـی تەلـبەند کـراوە، بـە تەلبەندنـێك کـە دوو مەتـر بـەرزە، دوایـی (٤ ـ ٥) خەندەقـیان لـێداوە، بـە گونـیەو ئیـنجا دوایـی تەلـیان لـێداوە، پاشـان چواردەوریشـی هەمـووی سـەربازگەیە، بـە پێـی زانیاریـی مـن، دەیانگوت کە ئێرە زیاتر لە چەند هەزار سـەربازی لێـیە، ئـەمجا ئـەو شـوێنە هەمووی لم بوو، کە بای هەڵدەکرد، ژوورەکانی پڕ دەبـوون لـە تـۆزو خـۆڵ و لم، کـە هـیچ کـەس پاکوخاوێنـی بـۆ نەدەکرا، دوایی هاتنو چـەویان لێرۆکرد، دیارە کە هاوینانیش تیشکی ڕۆژیش لێیدەدا، چەوەکەش وەکو ئاگر، وەکـو پشـکۆ گـەرم دەبـوو، زۆر گەرما بوو، بۆمان نەبوو بچینە نێو ساحەکەوە جگە لە کاتـی وەرزش، دەنـا هـەر لـە ژوورەکانـی خـۆماندا بووین، چـوار دەوریشی ئەو بورجو تەلدڕووە بوو، کە هەمیشە پاسەوان و ئێشکچییان لەسەر بوو.

**+ ئایـا ئـەو بیـنایە پێشـتریش‌و لەسـەردەمی ڕژێمـی بەعسـدا هـەر زیـندان بووە؟**

ـ نەخێـر، مـن لەوێ لە بەعسییەکانم پرسی، وتیان: "ئەو بینایە کاتی خۆی شوێنی پاسـەوانەکانی صـەددام حسێن بووە". بەڵام دوایی ئەمریکییەکان ئەو ژوورە تاکانەیان بۆ دروست کردووە، ئێمە لەوێ بووین کە کرێکاریان بۆ دەهێناو دروستیان دەکردن.

**+ ئێمە ڕۆژانە دەمانبیست کە بنکەی هێزەکانی ئەمریکا لە فڕۆکەخانەی بەغـداد ڕووبـەڕووی هێـرش‌و پەلامارێکـی زۆر دەبـنەوە. ئـێوە هەسـتتان بـەو هێرش‌و پەلاماردانە دەکرد؟**

- بەڵێ، بەڵێ، زۆرجار ئەو هێرش‌و پەلامارانە دەهاتنە نزیك ئێمە، ڕۆژێك هەموومان لە ساحەکە بووین، مۆڵەتیان دابووین بۆ وەرزش‌و گەڕان و ئەوانە، ئەوەندەمان زانی بوو بە تەقەیەکی زۆر، بە ئاربیجی‌و تەقەی وردیش پەلامار ڕوویدا، تا فیشەکێك لەسەر دەرگاکەی منی دا، ئینجا کە بوو بە تەقە، ئەوان زاراوەیەکیان هەبوو دەیانگوت (Lock Down)، یانی بچنە ناو ژوورەکانەوە، ئیدی خەڵك هەرکەسەو چووە ناو ژووری خۆی، بەڵام دیاربوو لەنزیك ئێمەوە شەڕە ئاربیجی بوو، ئەوانەی سەر بورجەکان (ئێشکچییەکان) هەموویان دابەزین، لەترسی فیشەك‌و قەناس‌و ئەوانە، ئەو شەڕو تەقوتۆقە نزیکەی نیو سەعاتێکی خایاند، زۆر نزیك بوو، دوایی ئەوانەی کە هێرشەکەیان کردبوو پاشەکشەیان کردبوو، هەندێك کەس پرسییان لە پاسەوانەکان، گوتیان کە کەسیان لێنەکوژراوە، گوتیان ئێمەش کەسمان لێنەکوژراوە، بەس ئیدی نازانم ڕاستبوو یان درۆ، بەس گوتوویانە کە جەنازەیان لێ بەجێ نەمابوو، شوێنەواری خوێن‌و شتیش نەبوو، ڕۆژی واش هەبوو کە تۆپ لەنزیك ئێمەی دەدا، لەنزیك ئەو سەربازگەیەی ئێمەو تۆزو خۆڵ‌و بارووت‌و ئەو شتانە بەسەرماندا دەهات، ئینجا کە ئەوە دەبوو، لەقۆناغی دواییدا لە سەر ئێمەیان پێویست دەکرد کە (خودە) لەسەر کەین، خودەی ئاسن، وەك ئەوەی خۆیان، هەروەها زرێش لەبەر کەین، جگە لەوەی کە لەناو ژوورەکەشداین، دەبوو ئەوەش لەبەر بکەین، ئەگەر لەحاڵەتی ئینزاردا باینایە، یا لە فەللوجە شەڕبوایە، یان لە ئەبوغرێب، یان لەشوێنێك تەقوتۆق بایە، لەسەر ئێمەیان پێویست دەکرد کە ئەو زرێ‌و خودەو شتانە لەبەر بکەین، دەیانگوت لەبەر سەلامەتی خۆتان، ئەوە دیارە بەشێك بوو لە ڕەچاوکردنی مافی مرۆڤ!

**+ نەبووە ڕۆژێك زیندانییەك بمرێ، یان بریندار ببێ؟**

- لای ئێمە نا، بەڵام دیارە برایانمان کە لە ئەبوغرێب‌و شوێنەکانی تر بوون، دەیانگوت کە جار هەبووە بەدەیانمان لێکوژراوە، بەس لای ئێمەنا، جا ئێمە کەمبووین، ئەگەرنا هەر چوار تۆپمان بەرکەوتبا نیوە دەبووین، بینایەکانیش وابوون، خەڵکەکەمان زۆر دەترسان‌و دەیانگوت کە ئەو بینایانە ئەگەر تۆپێك یان سەدو بیستێکی تێبکەوێت، ڕەنگە زۆری بەسەر یەکدا بڕووخێ، ترسی ئەوەیان هەبوو.

**+ ئەو کاتەی لە زیندانی ئینفرادیدا بووی، ڕێگەیان بە چ هەڵسوکەوتێك پێدەدان؟ چ هەڵسوکەوتێکتان لێ قەدەغە بوو؟ بەواتایەکی تر، ئایا ڕێگەیان پێدەدان بچنە دەرەوەی زیندانەکە بۆ وەرزشکردن، یان بۆیەکتر ببینن؟**

ـ ئەوە پێویستە جوان بۆت ڕوون بکەمەوە..

**+ بەڵێ..**

ـ ئێمە لە قۆناغی یەکەمدا، ئەوەی کە من بینیم، ئیدی لە پێش مندا چۆن بووە نازانم، بەس ئەوەی کە من بینیم لە قۆناغی یەکەمدا، واتە ئەو سێ مانگە، ئەو نەوەد ڕۆژەی کە وەکو گوتم، ئەو ژوورەی نەوەد ڕۆژ لێیبووم، هەروەها چوار مانگیش دواتر، ماوەی چوونە دەرمان بۆ وەرزش دوو نیو سەعاتی بوو، شەو نیو سەعات، ڕۆژیش نیو سەعات، یاخود پێش نیوەڕۆ نیو سەعات، دوانیوەڕۆش نیو سەعات، بیستو سێ سەعات لەژووری، دوو نیو سەعاتییش لەدەری، ئەو دوو نیو سەعاتە بۆت نەبوو سەلام لە هاوڕێکانت بکەی، هەڵبەتە ئەوەش (بۆ ئەوەی وەکو ئینساف بگوترێ) دەگەڕایەوە بۆ میزاجی پاسەوانەکان، پاسەوانی وا هەبوو چاوپۆشی دەکرد، دەیگوت قەیناکا بۆ خۆتان قسە بکەن، هی واش هەبوو دەیگوت هەرکەسێك سەلام لەوی تر بکات لە وەرزش مەحرومی دەکەمو دەیکردەوە ژووری، یەك نەفەر سەرپێچی بکردایە لە قاتعێك (کە قاتعی حەوت نەفەربوو) هەموو قاتعەکەیان سزا دەدا، هەموویان دەرکردنەوە ژووری، لەو نیو سەعاتەش بێبەش دەبووین، ئەوە سەبارەت بە وەرزش، تا نزیکەی (٤ ـ ٥) مانگێك دوو نیو سەعاتی بوو، دوایی بۆ ماوەی (٥ ـ ٦) مانگیتر کردیان بە دوو سەعات، یەك سەعات شەوو یەك سەعات ڕۆژ، یاخود یەك سەعات ئێوارەو یەك سەعات بەیانی، لە ئەو ماوانەدا کە دوو نیو سەعاتی یان دوو یەك سەعاتی بوو، بواری قسەو شت نەبوو، بەڵکو زۆرجار بواری سەلام لەیەکترکردنیشیان نەدەداین، ئەوە سەبارەت بە هاتنەدەر و وەرزش و ئەوانە.

سەبارەت بە چوونە سەرئاو، ڕۆژی دوو جار یان سێ جار، لای زۆرییەکەی سێ جارو لای کەمییەکەی یەك جار، جار جار دوو جار بوو دەریان دەکردین بۆ سەرئاو، کابرا ئەگەر میزی کردبا، دەنا بوتڵەکەی خۆی بەتاڵ دەکردو دەیشۆردو دەیهێنایەوە،

ئەگەر كاری گەورە (قضاء الحاجة)ی هەبايە، جێبەجێی دەكرد، يان سەتڵەكەيان دەشۆرد.

سەبارەت بە چوونە حەماميش، هەفتەی دووجار بوو، بەڵام لەماوەی دە دەقيقەدا دەبوو خۆشت بشۆی‌و جليشت بشۆی. دوو وشەيان فێركردبوون، (أسرع، أسكت)، خێراكەو بێدەنگبە، كەس بۆی نەبوو قسە بكا، دەبوو بە دە دەقيقەش تەواو بێ، ئەوەی بە دە دەقيقە لێنەبووبايەوە، دەركەكەيان لێدەكردەوە، بەكەفەوەشبا دەبوايە بهاتبايە دەر، بەكەف‌و هەموو شتێكەوە دەبوو بهاتبايە دەرێ، "تازە كاتەكە تەواو"، ئەو ماوەيەی ئەوەڵێ بەو شێوەيە سەختگير بوون، ئيدی لەدوايیدا ماوەی خۆشۆردنيان هەفتانە كرد بە سێ جار، لە دە دەقيقەشەوە بوو بە چارەكێك، جاری وا هەبوو بيست دەقيقەش، جاری واهەبوو پاسەوانەكە (ئەگەر پياوێكی بە خولق‌و خۆ بوايە) دەيگوت بەكەيفی خۆت لەوێدا بە، تا جوان خۆت بشۆی، نيو سەعات، بيست دەقيقە، دە دەقيقە.

**+ جلوبەرگی تايبەتيتان نەبوو؟ يان چەند ڕۆژ جارێ جلو بەرگيان بۆ دەگۆڕين؟ جلەكان چۆن بوون؟**

ـ لە سەرەتاوە من حاڵم بەنيسبەت جلوبەرگەوە زۆر شپرز بوو، يەك بيجامەی تەنكم پێبوو، بەرگە كوردييەكە چونكە هاوين بوو، بێگومان گەرم بوو، دوايی بەرگە كوردييەكەشيان هەر لێ وەرگرتمەوەو گوتيان يان (تەمغەی) لێدەدەين (CI)، واتە تۆ زيندانی مەدەنيت، يان ئەوەتا دەيبەينە مەخزەن، منيش گوتم جا من هەر كاتێك بەردرام، هەر ئەو جلە كوردييانەم پێيە، ئەويش تەمغەی پێوەبێ‌و بەنێو بازاڕدا بڕۆم، گونجاو نييە، گوتم بيبەنە مەخزەن، ئيدی بيجامەيەكی تەنكم پێبوو، زۆرم سەرمابوو، ئەوێ بيابانە، جاری واهەبوو شەوەكەی ساردبوو ڕۆژەكەی گەرم بوو، كەشی بيابان وايە، جا كراسێكيشم پێبوو لەبەرمدا تۆزێك لەكاتی ئەزيەتدان‌و ئەو شتانە دڕابوو، فانيلەيەكيشم پێبوو، ئەويش دڕابوو، ئەويشم فڕێدا، هەر ئەو كراسەم پێبوو، جلو بەرگی ديكەم پێنەبوو، هيچيشيان نەداينێ، دوايی فانيلەيەكيان دامێ، لەگەڵ شۆرتێك، لفكەم پێنەبوو شۆرتەكەم كرد بە لفكە، فانيلەكەشم لەبەر دەكرد تا دڕا، برادەرێك لەوانەی هاوڕێی زيندانم، دياربوو عەتفی جوڵاو گوتی: "من جزداشەيەكی

زیادم هەیەو دەیدەم بەتۆ"، ئیدی ئەو جزداشەیەی دامێ، بەدەردی کابرا دەڵێ، بۆ خۆم خەنیبووم، ئیدی ئەوجار کە بیجامەکەم چڵکن دەبوو، دەنا پێشێ دەبوو بەتەڕی لەبەرم بکردایەوە، هەر دەچوومە حەمام تۆزێك دەمشۆردو لەبەرم دەکردەوە، کراسەکەش هەر بە تەڕی لەبەرم دەکردەوە، هەر ئەوەبوو، دوایی کە ئەو جزداشەیەی دامێ، هەر حەسامەوە، ئەوەیان چڵکن دەبوو بە لەباری دەمشۆردن‌و جزداشەکەم لەبەر دەکرد، دوایی جزداشەکەم چڵکن دەبوو، ئەوەم دەشۆردو ئەوانم لەبەر دەکرد.

**+ ئەو کەسەی جزداشەکەی پێدای، کێبوو؟**

ـ ئەوە سەمیر عومەر ئەلنەجم بوو، ئەوە یەکەم کەسبووە کە کاتی خۆی هاتووە لەگەڵ مەلا موستەفای بارزانی دانوستانی کردووەو سەرۆکی وەفدی (موفاوین) بووە، سەرەتای (١٩٧٠)، پێش (١٩٧٠)، بۆ کاك مەسعودیشم باسکرد، ئەویش گوتی: "بەڵێ وایە"، هاتوون پێکەوە وتوویژیان کردووە. دوای ساڵێك یا کەمتر لە ساڵێك، تەواو لە یادم نەماوە، بەدلەیان داینێ، ئەوان (جام سوود)ی پێدەڵێن، بەدلەیەکی زەردە وەك ئەوانەی گوانتانامۆ، بەدلەیەکیان داینێ، پێشێ بەدلەیەکی شین، دوایی بەدلە شینەکەیان لێوەرگرتینەوەو گوتیان ئەوە بەو شێوەیە دیار نابێ گەر ڕا بکەن، بەدلەیەکی زەردیان داینێ بۆ ئەوەی لە دوور ڕا دیار بێ، دوایی بەدلەیەکی دیکەشیان داینێ‌و گوتیان ئەگەر ئەوە چڵکن بوو، ئەویکە لەبەر کەن، ئیدی مانای وایە ئەوجا دەوڵەمەند بووین لە جلوبەرگدا!! دوایی خاولیشیان داینێ، هەرکەس دەچوو لە سەرەتادا خاولییەکیان پێدەدا، سابوونێکیان دەدایە، فڵچەو مەعجونێکیان دەدایە، یەکەم ڕۆژ فڵچەو مەعجونێکیان دامێ، خاولییەکیان دامێ، فانیلەکیان دامێ، هەروەها تاقمە تراش و شتی خۆپاکڕاگرتن و ئەوانەیان دامێ، بەس ئیدی نزیکەی دوای ساڵێك ئەوجا جارێکی تر ئەوانەیان پێدداینەوە، سەرو فانیلە و ئەو شتانەی باسمکردن.

**+ شتنی ئەو جلانە لەسەر خۆتان بوو؟ یان بۆیان دەشۆردن؟**

ـ نا، نا لەوێ کەس ئاغا نییە! دەبێ هەرکەسەو بۆ خۆی خۆی بشواو جلی خۆی بشواو هەموو شتێکی خۆی بۆ خۆی جێبەجێ بکا، ژوورەکەت دەشۆری‌و پاکی دەکەیەوە، چۆن دەکەی، چ دەکەی‌و چ ناکەی هەموو شتێکی لەسەر خۆتە، نەك هەر

ئـەوە، بەڵكـو ساحەكەشـيان پـێ پـاك دەكـردينەوە، قونچـكە جگـەرە، ئەگـەر پاسـەوانەكانيش جگـەرەيان كێشـابا، دەبـوايە ئێمە هەڵمان بگرتايەتەوە، ئەوەی هەڵی نەگرتايەوە، پێيان دەيانگوت ديـارە تـۆ پێويسـتت بـە وەرزش نيـيە، بچۆوە ژووری، لـەوەرزش مەحـروميان دەكرد، ئـيدی كابـرا بەناچـاری بـۆ ئـەوەی تـۆزێ بێـتە دەرێو هەناسە بدا، دەهات كون بە كون بە دوای قونچكە جگەرەدا دەگەڕا!!

+ وەرزش بەكۆمەڵ بوو؟

ـ نەخێـر، پـێكەوە دەريـان دەكـردينە قاعەيەك، بەڵام بۆت نەبوو قسە لەگەڵ كەس بكـەی، دەبـوو هەريەكـەی نـزيكەی دە مەتـر يـان پێـنج مەتری بەين بێ، نەدەبوو قسە بكـەی، پاسەوانيش لەولاو لا وەستابوون، لە دووری دە مەتر دوو پاسەوان وەستابوون، لـەو ديويش دوو پاسـەوان، هەريەكـەيان بـە دەوری بيـنايەكدا دەخولايەوە، بە دەوری بيـنايەكەدا دەخـولايەوە و بـە هـەر چوارتەنيشـتدا پاسـەوان وەستابوو، كەسێك دەنگی لێدەهات تێيەوە دەخـوڕی، جارێك، دووجـار، دوايـی دەيگوت يەڵڵا بچۆوە ژوورەكەی خۆت.

+ ئەو خواردنو خواردنەوانە چيبوون كە لە زيندان بۆيان دەهێنان؟

ـ خـواردنمان هـەر خواردنـی كيسـە بـوو، خواردنـی مـوعەللەبات، خواردنی خۆيان، بـەڵام ئـەوان بـۆ خـۆيان لـەو خواردنەيان كەمتر دەخوارد، خواردنی تازەيان بۆ دروست دەكرا، ئـێمەش دەبوو تەماشايان بكەين، خواردنی كيسەشيان دەدا بە ئێمە، تا دوايی زيندانيـيەكان زۆر ڕەخـنـەيان گـرتو گوتـيان بابـە مـردين بـەو خـواردنانە، هەمـووی مـوعەللەباتەو ڕەنگـە هەمـووی بەسەرچـووبێ، بەسەرچـوو بـوو، هـەر لانـيكەم ژەمـی خواردنێكـی تازەمان بدەنێ، جا هەبوو گۆشتی بەرازی تێدابوو، شەرابو شتی تێدابوو، دوايی بۆيان كردينە ڕۆژی ژەمێ خواردنی تازە، دوايی بۆيان كردينە دوو ژەم، ژەمێكی خواردنی ئەو كيسەيە هەر بەردەوام بوو.

+ جۆری خواردنەكان چيبوون؟

ـ جۆری خواردنەکان گۆشتی حەیوان بوو، گۆشتی مریشك بوو هەر لە ناو کیسەدا، فاسۆلیا بوو، شتی تر وەکو سەوزەو ئەوانە هەر تێکەڵ بوو، هەمووی کوڵێنرا بوو، ئەو جۆرە خواردنانە بوون، ئەو خواردنانەی کە هەڵ دەگیرێن‌و لەقوتوو دەکرێن.

**+ لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا مامەڵەی تایبەتییان لەگەڵ دەکردن؟ وەکو بەربانگی باش‌و پارشێوی باش؟ ئایا بۆتان هەبوو خواردنی تایبەت داوا بکەن؟**

ـ خواردنی تایبەت‌و مایبەت نەبوو، هیچ، چییان بۆ دەهێنای هەر ئەوە دەبوو، کەس بۆی نەبوو بڵێ ئەوە دەخۆم‌و ئەوە ناخۆم، ئەوە دەخۆی بخۆ، نایخۆی کەیفی خۆتە.

سەبارەت بە مانگی ڕەمەزان، ڕەمەزانی یەکەم هیچ موڕاعاتیان نەکردین، بەس دوایی خەڵك، ئێمە زۆر ڕەخنەمان گرت، خاچی سوور هات‌و پێمان گوتن ئەوە ڕەمەزانەو حورمەتی مانگی ڕەمەزان ناگرن، پارشێو خواردنی سارد دەخۆین، بەربانگ هەر خواردنی ساردە، کابرا لەژووری هەڵدەلەرزێ‌و خواردنی ساردیش بخواو خواردنەوەی سارد بخواتەوە، هیچ نەبێ هەر لانیکەم خواردنێك، خواردنێکی گەرم بێ، یا لانیکەم ڕێگەمان بدەن خواردنەکە بۆ خۆمان بکوڵێنین، چونکە هیتەریان لەنێودا بوو، بەڵام هیتەرەکەیان نەدەهێشت، هیتەرەکەیان لێ دەردەهێنا، خواردنەکە بەساردی دەبوو، ئیدی ئەوجا بواریاندا هەم هیتەرەکەیان لەگەڵ دەداینێ‌و ئەو خواردنە موعەللەباتەمان پێ گەرم دەکردەوە، هەم جار جارە خواردنی پارشێوو بەربانگیان بۆ دەهێنایین، هێلکەیان دەکوڵاند، هێلکەو ڕۆنیان دەکرد، شتێکی ئاوا لەو بابەتە، ئەوە بۆ پارشێو، بۆ بەربانگیش مریشك با، هەر شتێك با، برنج‌و شلەیەك با، دیارە ئەوان زیاتر بەدەستووری خۆیان سازیان دەکرد، بەدەستووری ئەمریکی، بەس باشبوو، مادام خواردنەکە گەرم بوو زۆر باشبوو، جیاوازی زۆری لەگەڵ ئەو خواردنە ساردو سڕەی ناو قووتوو کیسەو میسە هەبوو.

**+ لە ڕووی چەندێتییەوە، خواردنەکە ئەوەندە هەبوو کە نەفەرێك تێری پێ بخوا؟**

- پێموایە ئەوە بەشەخس دەگۆڕا، من لەبارەی خۆم لێم زیاد بوو، ئەمن ژەمێکم زایە دەکرد، چونکە من نیوەی ڕۆژەکان (کە لەوێ بووم) زیاتری بەڕۆژوو بووم، بەڵام هەبوو بەشی نەدەکرد، هەیان بوو من کە خواردنم دەدایە زۆری پێخۆشبوو، چونکە خواردنەکەی خۆی بەشی نەدەکرد.

**+ مەسەلەی ڕێنەدان بەقسەکردن لەگەڵ یەکتری‌و سەلام لە یەکترکردن، تا ڕۆژی ئازادکردنت هەر بەردەوام بوو؟**

- نا، نزیکەی ساڵێك بەر لە ڕزگاربوونم، من ناڵێم ئازادبوونم، دەڵێم ڕزگاربوونم، چونکە من لەوێش خۆم بە کۆیلە نەدەزانی، خۆم بەئازاد دەزانی..

**+ ئەوەش لە تەوەرەیەکی تردا قسەو باسی لەسەر دەکەین..**

- ساڵێك پێش ڕزگاربوونم بوارياندا حەوت نەفەر (واتە قاتعێك) بەيەكەوە دابنيشن، قسە بکەن، کورسییان بۆ هێنایین، مێزیان بۆ هێنایین، گوتیان لەو کاتەی کە بۆ وەرزش دەرتان دەکەین، بەیەکەوە دابنیشن، نزیکەی چەند مانگێکیش پێش هاتنەوەم، دوو مانگ، بواریان داین کە سێ قاتع، واتە بیست و یەك نەفەر پێکەوە دابنیشین، ئیدی لەو کاتەوە کە بوارياندا، ئێمە (ئەو قاتعە) بەيەكەوە دابنیشین، لەوکاتەوە نوێژی بەجەماعەتم دامەزراند، دیارە هەر لە سەرەتای زیندانیمەوە بانگم دەدا لە ژوورەکەی خۆمدا، یا ئەگەر لە دەرێ باین، دەچوومە سەر شوێنێکی بەرزو بانگێکم دەدا بۆ هەموو سەربازگەکە، ئەگەر لەژووری بوومایە، پەنجەرەکەم دەکردەوەو بانگم دەدا.

**+ یەکەمجار کە بانگت دا، چۆنبوو؟ چ رووی دا؟**

- وەڵڵا هەر لە زووەوە بانگم دەدا، پێشێ بەئەسپایی هەر بۆ ئەوانەی خۆمان بانگم دەدا، بەڕاستی وتم نەوەکو یەکێ بێ‌و قسەیەکی ناشیرین بکا، دوایی دیاربوو هیچ کاردانەوەیان نەبوو، جار جار پێیان سەیر بوو، بۆ نموونە" جارێك بانگم دا ئافرەتێك هات، ئافرەتێکی پاسەوان، بەهەڵەداوان هات، من بەدەنگی بەرز (الله أكبر)م کردو وتی: "What do you do?"، واتە چی دەکەی؟ چیت لێقەوماوە؟ دیارە ئەمنیش بانگەکەم نەبڕی، بانگم تەواو کرد، بانگی یەکێکی دیکەی کردو گوتی: "ئەوە شتێکی لێقەوماوە وا هەر هاوار دەکات؟"، ئەوان هاتن و گوتیان چیت دەوێ؟ منیش

زەردەخەنەیەکم کردو گوتیان دیارە هیچی نییە، دوایی بەئیشارەت گوتم ئەوە چ گرفتێکم نییە، خەڵکی بۆ لای خوا بانگ دەکەم، بەڵام دیاربوو پێیان سەیربوو، یەکەمجار بوو گوێیان لە بانگ بوو، جا هەر لە سەرەتاوە من بانگم دەدا، بەڵام مەسەلەی جەماعەت، ئەو کاتەی کە بوارییاندا بەیەکەوە دابنیشین، نوێژی جەماعەتمان دامەزراند، ئەو کاتەش کە بوارییاندا سێ قاتع بە یەکەوە نوێژ کەین، جومعەشم بۆ دانان.

**+ لە ماوەی ئەو بیستو دوو مانگەی زیندانییتدا، بەتایبەت لە قۆناغی کۆتاییدا، کۆمەڵێ نامە لە ڕێگەی ڕێکخراوی خاچی سووری نێودەوڵەتییەوە دەگەیشتنە خێزانو کەسوکارت، ڕۆڵی ئەوان چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**

ـ جارێ با ئەوەت پێ بڵێم، تا حەوت مانگ، حەوت مانگی سەرەتا هیچ نامەیەکیماڵەوەیان نەدامێ، نامەکانیان هەموو لای خۆیان بەند کردبوو، هەر دەمگوت باشە ئەو خەڵکە هەمووی نامەی بۆ دێ، بۆ من نامەم بۆ نایە؟ وەڵامیان نەبوو، لەئیدارەی زیندانەکە تەحقیقم دەکرد، هەتا ساڵێکیش من بواری تەلەفۆنیان نەدام، ئەوان بواری تەلەفۆنی منیان نەدا، بواری چاوپێکەوتنیشیان هەر نەدام، تاوەکو ماڵەوەمان بێن، بەس ئەوان – واتە سەرانی ڕژێم– هەندێکیان بواری ئەوەشیان دەدان، ئەوە هەر بۆ زانیارییتان.

سەبارەت بە نامەهێنانو بردنەکان، ئێمە تەنها وەسیلەمان ڕێکخراوی خاچی سوور بوو، لەبەر ئەوە من زۆر سوپاسم دەکردن، هەموو جارێ کە دەهاتن بۆ ئەوێ، کە هاتمەوە سەردانیشم کردن، دەعوەتیشم کردن بۆ ماڵەوە، وتم: سوپاسیشم بگەیەنن بە هەمووتان، چونکە ئەوان تاکە وەسیلەمان بوون، ئێستاش لەیادمە کە دوای حەوت مانگ، ڕۆژێك لە ئیدارەی زیندان تووڕە بووم، گوتم بۆ ئەوانە هەموویان نامەیان بۆ دێ، ئایا کەسوکاری من هیچی نەماوە؟! ئەو نامانە دەنێرم، ناردووتانە، بۆ هیچ وەڵامیان نییە، هەتا وام لێهات ( ٢ ـ ٣) مانگ نامەم هەر نەنووسی، هاوڕێکانی زیندانم هەر دەیانگوت: بۆ نانووسی؟ دەمگوت نانووسم، چونکە هیچ وەڵامم بۆ نایەتەوە، کە هیچ وەڵامم بۆ نەیەتەوە بۆ بنووسم، وادیارە نامەکانی منیش ناگەن، شتی ئەوانیش هەر ناگات، چیدیکە نامە نانووسم، ئیدی (٢ ـ ٣) مانگ نامەم نەنووسی.

ڕۆژێك لە تەحقیقدا تۆزێك لە موحەقیقەكە تووڕە بووم، گوتم ئێوە بانگەشەی دیموكراسییەتو مافی مرۆڤ و ئەوانە دەكەن، باشە بۆ من مافی ئەوەم نییە بزانم ئاخۆ كەسوكارم، ماڵو مندالّم، ئەو خەڵكو ئاشنایانەم چییان لێهاتووە؟ چییان لێنەهاتووە، ئاگام لە هیچ شتێك نییە، نامەیەك چی تێدایە، گوتیان تۆ بچۆوە ژوورەكەت بزانین داخۆ تەگبیرێكی لێ ناكەین، گوتم باش، وەڵڵا من گەڕامەوە بۆ ژوورەكەی خۆم، بردیانمەوەو هەموو دەمێ پاسەوانێكم لەگەڵ بوو، یەكێك یان دووان، ئیدی من لە ژوورەوە بووم، دیاربوو موحەقیقەكە هاتو گوتی ئەوە نامەكانتە، دە نامەی لێكرا بۆ هێنام، زۆری هی پێشێ بوون، مەفعولیان بەسەرچوو بوو، بەڵام هەرباش بوو، گوتم ئەوە بۆ وا حەپستان كردوون؟ گوتی: "ئەوە ئەوانەی پێش من حەپسیان كردووە، بەس ئەوە من بۆم ئازاد كردی"، گوتم باش، ئیدی لەوكاتە بەدواوە، جاری وا هەبوو دیسانەوە (٣ ـ ٤) نامە هەر نەدەهات، بەڵام جار جار نامەكانیان كەڵەكە دەكردە سەر یەك و بە یەكەوە دەیاندامێ.

بەڕاستی خاچی سوور ڕۆڵیان زۆرباش بوو، خەڵك هەبوو زۆر لێیان بەگلەیی بوون، بەڵام هەموو جارێ تەقدریم دەكردن، سوپاسم دەكردن، عوزریشم بۆ دەهێنانەوە، دەمگوت دیارە ئەوەندەتان دەسەڵات هەیە، خۆشیان دەیانگوت: "ئێمە قسە لەگەڵ ئەمریكییەكان دەكەین، بەدەلیلو بە بەڵگە، بەڵام خۆ ئەوان دەسەڵاتدارنو ئێمە بێدەسەڵات، قسەمان ناڕوات"، ئێمە پێمان دەگوتن كە ئەوە بەپێی ڕێككەوتننامەی (جنێڤ)، ئەو كەسەی دەگیرێ (زیندانی مەدەنی بێت یان سەربازی) ئەوە مافی خۆی هەیە، كوا ئەو مافانەمان؟ دەیانگوت: "ڕاستە، ئێمە هەموو ئەوشتانە بە ئەمریكییەكان دەڵێین، بەڵام خۆ قسەی وان وەردەگیرێو قسەی ئێمە وەرناگیرێ"، هەتا ڕۆژێك من زۆر ئیحراجم كردن، جەماعەتی خاچی سوور، گوتم باشە بەپێی ڕێككەوتننامەكان، ساڵێك تێپەڕ بووە بە سەر داگیركردنی عیراقدا، دەبێ ئێمە تەكلیفمان ڕۆشن بێ، دوای ئەوە كە حكومەت تەشكیل كرا، یان دەبێ تەسلیم بە حكومەتی عیراقیی بكرێین، یان دەبێ بەرمان بدەن، گوتیان ئاخر ئەمریكییەكان بەنەوعێكی تر ئەو ڕێككەوتنە تەفسیر دەكەن، گوتم باشە تەفسیری ئێوە وەردەگیرێ یان هی ئەوان؟ گوتیان هی ئەوان، گوتم خۆ ئەوە پێچەوانەی مەنتیقە، گوتیان بۆ؟ گوتم، چونكە ئێوە خاوەنی

ڕێککەوتننامەی (جنێڤ) نین؟ گوتیان با، دەی گوتم، دەبێ ئەو کەسە کە خاوەنی ڕێککەوتننامەکەیە تەفسیری ئەو وەربگیرێ نەك تەفسیری یەکێکی دیکە، ئەگەرنا ئەمریکا بەنەوعێك تەفسیری بکاو بەریتانیا بەنەوعێكو یەکێکی دی بەنەوعێك، ئەمە هیچ مەفعولی نامێنێ، گوتیان وەڵڵا ڕاستە، بەڵام چی بکەین؟! دەی گوتم کەواتە تەفسیری ئێوە تەفسیری تەرەفێکی لاوازە، تەفسیری ئەمریکا تەفسیری تەرەفێکی بەهێزە، کەواتە لێرەدا مەنتیقی قووەت حاکمە نەك قووەتی مەنتیق، گوتیان حەقیقەتەکەی وایە، بەڵام ئێمە ئەوەش ناوێرین بڵێین، گوتیان چونکە لەوەندەش کە ئێستا نامەتان بۆ دێنین، لەوەش مەحرومتان دەکەن، ئەگەر قسە بکەین، ئینجا زۆریش لێمان دەپرسین، چییە؟ دەنگوباس چییە؟ دنیا چی لێهاتووە؟ دەیانگوت: "یەك وشە بڵێینو پێیان بگاتەوە، ڕێگەی ئەو نامەو تۆزە شتەشمان لێ دەگرن، بۆیە هیچ ناڵێین".

**+ ئەندامەکانی خاچی سوور عەرەب بوون یان بیانی؟**

- بیانی بوون، دیارە عەرەبیشیان لەگەڵ بوو، لوبنانیو میسریو مەغریبیو ئەوانەشیان لەگەڵ بوون، زۆریشیان لەگەڵ من دەبوونە برادەر، چونکە هەرجار دەهاتن، (قسەی خۆمان بێ) لەگەڵیان سەرو ڕووخۆش بووم، ڕێزم دەگرتنو شەربەتم بۆ دەکردن، ئاوم دەدانێ، چام دەدانێ، ڕێزم دەگرتن وەکو میوان، جا دەیانگوت: "ئەوانەی دیکە هەمووی مۆنو مرچنو دەڵێی باوکمان کوشتوون، وەکو بڵێی ئێمە زیندانییمان کردوون، هی وا هەیە دەڵێت هەر قسەتان لەگەڵ ناکەین، بابە خۆ ئێمە بێدەسەڵاتین، بەڵام تۆ لەگەڵمان سەرو ڕووخۆشیتو قسەی خۆشمان بۆ دەکەی"، هەر ورەی ئەوانیشم بەرز دەکردەوە، دەیانگوت: "وەزعت چۆنە؟" دەمگوت حاڵم زۆر زۆر باشەو هیچم نییە، دڵم خۆش دەکردن، ئایەتم بۆ دەخوێندنەوە، جا ئیدی پێیان خۆش بوو، دەهاتن بۆ لای منو دەیانگوت هەست بە ئیرتیاحێك دەکەین، ئەوانە هەمووی تووشی خەمۆکیو دڵەڕاوکێو ئەوانە بوو بوون، منیش دەمگوت ئەوان زۆریان نەخۆشن، ئینجا هەندێکیان بێهیوان، هەندێکیان هەست بە پەشیمانی دەکەن، حاڵی من جیایە، یەك، من هیچ لەخۆمدا شك نابەم. دوو، من ئەوە تازە دەست بەئیش دەکەم، ئەوان تازە کۆتاییان پێهێناوە، من ئەوە تازە دەست پێدەکەم، ئەمن بە

هیوایەکەوە دەژیم، ئینجا من حاڵەتی روحیم جیایە، ئیدی زۆریان هەتا بیانییەکانیش، واتە ئەوانەی کە نەصرانیش بوون، کە من باسی ئیسلامەتی و مەنهەجی پێغەمبەرانم (علیهم الصلاة السلام) بۆ دەکردن، باسی شتێك کە هاوبەش بێت لە نێوان هەموو شەریعەتە ئاسمانییەکان و پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)دا، پێی دڵخۆش دەبوون، دەمگوت با هەر تەقدیرێکیان بکەین. بەپێی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە دەفەرمویّ: (من أحسن الیکم فکافئوه، فان لم تکافئوه فأثنوا علیهم خیراً). واتە: هەرکەسێك چاکەی لەگەڵ کردن، ئێوەش چاکەی لەگەڵ بکەن، واتە لانیکەم تەقدیری بکەن‌و سوپاسی بکەن‌و باسی بکەن، ئەوە واجبێکی شەرعییە.

بە ڕاستی خاچی سوور وەکو ڕێکخراوێك ڕۆڵیان زۆر بووە، خۆشیان ماندوو دەکەن، من ئاگادارم سەری خۆشیان زۆر دەهێشان لەگەڵ ئەمریکییەکان، مشتومڕیان لەگەڵ دەکردن، هەرجاریّ ئەوان دەهاتن، (جا ئەوە زۆر دڵیان پێخۆشبوو کە ئەو ڕۆژە لە مقەڕی هەولێریشیان باسم کرد) گوتم هەر جاریّ کە ئێوە دەهاتن، بەوە دەمانزانی کە ئەمریکییەکان مامەڵەی خۆیان باش دەکرد، چێشتەکەیان چاك دەکرد، یا پارچە جلێك، شتێکیان دەداینیّ، دەمانگوت ئەوە ڕەنگە خاچی سوور بەڕێوە بیّ، یان ئێوە کە دەڕۆشتن مامەڵەیان دەگۆڕا بە باری چاکیدا، یان ماوەیەك وەرزشیان زیاد دەکرد، یان ماوەیەك حەمامیان زیاد دەکرد، یا پۆشاکی زیادەیان بۆ دەهێنایْن، زۆرجار پێش ئەوان‌و دوای ئەوان چاکسازییان دەکرد. لەوەوە دەمانزانی کە ئەوان مشتومڕیان لەگەڵ دەکردن، هانیان دەدان، سەرشاخیان دەگرتن، ئیدی من هەموو جاریّ زۆر سوپاسم دەکردن، خەڵکی تریش هەبوو تەقدیری دەکردن، خەڵکی تریش هەبوو دەیوت "ئەسڵەن هەرنامەویّ بتان بینم"، قسەی لەگەڵدا نەدەکردن، تووڕە دەبوون، هەڵبەتە من هەڵوێستی ئەوانەم پیّ ناڕاست بوو، کابرا ئەوەندەی لەتوانادایە، دەڵیّ کاکە من بێدەسەڵاتم، ئەویش ڕێکخراوێکی مرۆڤدۆستەو هەر ئەوەندەی لەتوانادایە، زۆر زمان درێژی بکەن، ئەمریکا ڕێی ئەوەشیان لێدەگریّ‌و هیچ کەسیش دەسەڵاتی بەسەریدا ناشکیّ.

زۆرجار کە دەهاتن، سەعاتێك لەگەڵم دادەنیشتن، هەبوو جارێك لای دادەنیشتن، هەبوو بیست دەقیقە، هەبوو نیو سەعات، هەبوو سەعاتێکیش زیاتر لەگەڵی

دادەنیشـتن، چـونکە کەشـی قسەکردنەکانو کەشە نەفسییەکەش کە ساز دەبوو، ڕۆڵی هەبوو، کەسـێك کـە هەرگلەیـی لێکـردبان، ئـەویش بلـێ چی، ئەویش بێتاقەت دەبوو، جـاری واش هەبـوو ئەوانـیش جـۆرێك لـە ئینشـراحیان بـۆ دروسـت دەبـوو، کەشـەکە وادەبوو، دوایـی کـردیان بـە کۆمەڵـیش، لـە هـەر قاتعێك لەگەڵ هەموویان دادەنیشتن، پێشـێ یـەك یـەك لەگەڵیان دادەنیشـتن، چونکە ئەمریکییەکان ڕێیان نەدەدا، دوایی کە بـواردرا ئـێمە بەیەکـەوە دابنیشـین، ئەوانیش دەهاتن لەگەڵ هەمووومان دادەنیشتن، بۆ ئەوانیش ماوەکـە کـورت دەبوو، ئەگەر (٣ ـ ٤) سەعاتیش دانیشتبان بۆ ئێمەش باشتر بوو.

**+ مامۆسـتا، لـە ڕوانگەیەکـی شـەرعییانەوە، ڕۆڵـی ئـەو ڕێکخـراوە مرۆڤدۆستانە (وەکو خاچی سوور) چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟**

ـ مـن بەوانیشـم دەگوت، دەمگوت ئێوە خزمەتێکی ئینسانی دەکەن، ئێوە هەقتان بەسـەر ڕەوتـی سیاسیی‌و فیکرییەوە نـییە، هـەر کەسـێك مـرۆڤ بـێ‌و زینـدان کـرابێ‌و ستەمی لێکرابێ‌و لێـی قـەومابێ، هەوڵـدەدەن پـردێك دروسـت بکـەن، لەنێوان خۆی‌و کەسوکاری، ئـەوە پێویسـتە هەموو کەس سوپاستان بکا، دەمگوت بەتایبەت من وەکو موسـڵمانێك، کـە ئایـنـی ئیسـلام بـۆ ئـەوە هاتووە مرۆڤ ڕێزی لێبگیرێ، چاوپۆشی لەوە بکـە داخـۆ دینـی چییەو فیکرەی چییە وەکو مرۆڤ، خوای پەروەردگار ڕێزی لە مرۆڤ گـرتووە، (وَلَقَـدْ كَـرَّمْنَا بَنِـي آدَمَ وَحَمَلْـنَاهُمْ فِـي الْبَـرِّ وَالْبَحْـرِ وَرَزَقْـنَاهُم مِّـنَ الطَّيِّـبَاتِ وَفَضَّـلْنَاهُمْ عَلَـى كَـثِيرٍ مِّمَّـنْ خَلَقْـنَا تَفْضِـيلاً) (الإسـراء: ٧٠)، مـن ئـەو ئایەتـەم بـۆ دەخوێـندنەوە، گـوتم ئـەو نـیعمەتانە کەخـوا باسـیان لـێدەکا (جـلّ شـأنه)، هەمـوو پەیوەندییان بـە مـرۆڤەوە هەیـە وەکـو مـرۆڤ، پەیـوەندی بـە موسـڵمانانەوە نییـە بـە تایبەت، ١ـ (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ) وەچەی ئادەممان ڕێز لێ گرتووە، ٢ـ (..وَحَمَلْنَاهُمْ فِـي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ..) لە وشکانی و دەریا هەڵمانگرتوون، واتە وەسائیلی وامان بۆ دروست کـردوون کـە سـواری بن لە وشکانی و لە دەریا، ٣ـ (..وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ..) ڕزق و ڕۆزی بـە لـەزەت و بـە تـام و بـە چێژمان بۆ ڕەخساندوون. ٤ـ (..وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً) (الإسراء: ٧٠)، ئـەوە ئـەو چوار شتانە هەموو مرۆڤایەتی تیایاندا بەشـدارە، کەواتـە ئەوانـە هەمـوو پەیوەندییان بەهەمـوو مـرۆڤایەتییەوە هەیـە، ئینجا

ئایەتی تر کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ (لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيم) (التین: ٤). جا من پێم دەگوتن، کەواتە هەرشتێك ببێتە مایەی ڕێزلێگرتنی مرۆڤ، بۆ دابینکردنی مافەکانی، ڕێزلێگرتنی، پاراستنی کەرامەتی، شەخسییەتی، ئەوە هەمووی فەحواو موحتەوای ئەو ئایەتانەیە، من وەکو موسڵمانێك زۆر سوپاستان دەکەم، ئەو ئەرك و وەزیفەی ئێوە بەشتێکی شەرعی و پێویست دەزانم، بەپێویستی دەزانم سوپاستان بکەم، کە نامەکانم جار جار بۆ ماڵێ دەنووسی، دەمگوت بە برایانی خۆمان بڵێن ڕێزیان لێبگرن، کارئاسانییان بۆ بکەن، ئەوانەی کە مەکتەب و شتیان لێرە – واتە لە هەولێر یان سلێمانی– هەیە دەستباریان بۆ بگرن، چونکە ئەوان خزمەتێکی ئینسانی دەکەن، پێویستە ئێمەش دەستباریان لەگەڵ بگرین، سوپاسیان بکەین، هاوکارییان بکەین، دوایش کە هاتمەوە زۆریان پێخۆش بوو، لەوێش جارێك هاتن سوپاسیان کردم، گوتیان زۆر سوپاست دەکەین، تەوجیهاتت داوەتە کۆمەڵەکەی خۆت کە هاوکاریمان بکەن. ئەوان لەخۆیان دەترسان بۆ هەندێ شت، گوتیان هەڵیان کوتاوەتە سەرمان، زۆر لەخۆیان دەترسان، من هەروا بە ئیشارەت تەوجیهم دابوو کە ئاگاتان لێیان بێ، بەدەمیانەوە بچن، سوپاسیان بکەن و تەقدیریان بکەن و ئەوانە.

**+ شێوازی مامەڵەتان لەگەڵ پاسەوانانی زیندانەکەتان چۆن بوو؟ بۆ نموونە" ئەگەر پێداویستییەکتان هەبوایە، یان داوایەکتان هەبوایە، چۆن ئەم کارەتان لەگەڵ پاسەوانەکاندا ڕایی دەکرد؟**

– زۆرجار شێوەی ڕەفتارو مامەڵەی پاسەوانەکان بەپێی میزاجیان دەگۆڕا، هەندێکیان پەیوەست بوون بەتەوجیهاتی مەرکەزیانەوە، کە لە ئیدارەی زیندانەکەوە تەوجیهاتیان بۆ دەهات کە لەگەڵیان باش بن، باشدەبوون، بەڵام هەندێکیان وەکو میزاجی شەخصی قینلەدڵ بوون، ئەوان - واتە بەرپرسەکانی ڕژێم– دەیانپرسی فلان کەس کێیە؟ دەیانگوت ئەوە جولەکەیە، چونکە ئەوان شتی خۆیان ناشارنەوە، یان دەیانگوت فلان کەس نە بابی هەیەو نەدایك، یان دەیانگوت فلان کەس دوێنێ هەواڵی بۆ هاتووە کە ژنەکەی تەڵاقی داوە، لە ئەمریکاوە وەڵامی بۆ هاتووەو تەڵاقی داوە! یەکێك ڕۆژێك (لەگەڵ ئێمەش باشبوو) دۆشدامابوو، منیش گوتم ئەوە بۆ وا دۆش داماوی؟ یەکێك تەرجەمەی کرد، وتی ئەوە ژنەکەی نامەی بۆناردووەو تەڵاقی داوە!

ئەوانە کە میزاجیان تێکدەچوو، یان ژنیان تەڵاقی دەدان، یان کابرا نەبابی هەبوو نە دایك، هەبوو دەیگوت نەبابم هەیە نەدایك، هیچ کەسم نییە، حکومەت بەخێوی کردبوو، سەربازی حکومەت بوو، ئەوانە زۆرجار باری دەروونییان ناتەواو بوو، هەندێکیان جوولەکەو هەندێکی تریشیان نەصرانیی قینلەدڵ بوون، ئەوانە قینلەدڵ بوون‌و حەزیان دەکرد ئەزیەتی خەڵك بدەن. بۆ نموونە" من کە لەوەرزشکردندا چالاك‌و گورج‌و گۆڵ بووم، ڕۆژێکیان کە لەوەرزشدا خێراو چالاکانە دەڕۆشتم، یەکێکیان گوتی: "ئەوە بۆ وا خێرا دەڕۆی؟"، وتم: ئەوە وەرزشە، خۆ نەتان گوتووە خێرا ڕۆشتن قەدەغەیە. گوتی نا، دەبێ بچییەوە ژووری. گوتم باشە گرفت نییە، چوومەوە ژووری‌و کورسییەکەم لەبەردەمی پەنجەرەکە دانا، لەبەردەمی دەرگاکە. وتی نابێ لەوێ قورئان بخوێنی، گوتم ئەی لەکوێ؟ گوتی دەبێ دەرگاکە پێوەدەی. گوتم باشە، ئەوە بێدەسەڵاتییە، دەرگاکەشی پێوەدا، وتی: "ئەگەر دەنگت بێ پەنجەرەکەش دادەخەم"، پەنجەرەکەشی داخستبا، کارەبا نەبوو تاریك دادەهات، گوتی نابێ بەدەنگی بەرزیش قورئان بخوێنی، ئەوە ڕقێکی شەخصی خۆی بوو، بە تەوجیهاتی مەرکەزی نەبوو، هەشیانبوو کە دەیان بردین بۆ حەمام یان دەیان بردین بۆ سەرئاو، دەیگوت: "دە توزێ ڕاوەستەو بۆ خۆتان هەوایەك هەڵمژن، بۆ ئەوەندە پەلەتانە؟"، دەمانگوت بابە خوادەکا توزێ ڕامان دەگریت لێرە، کابرا شوکربوو لای ئاودەسیش نیو سەعات ڕابووەستێ‌و نەچێتەوە ژوورەکەی، چونکە لەو ژوورانە ئینسان دڵی ناڕەحەت دەبێ، بەڕاستی من زۆر باکم نەبوو، بەڵام هەبوو زۆر تووشی خەمۆکی‌و ناڕەحەتی‌و شت دەبوو، هەیان بوو بۆ خۆی دەیگوت: "توزێ ڕاوەستن، چۆن لەو ژوورانە بێزار نابن؟" دەمانگوت بابە خەڵك زۆر بێزارە، بەڵام خەڵك چاری نییە، هەبوو ئاوا جۆرێك لەپیاوەتی‌و شەهامەتی هەبوو، جۆرێك لە ڕەحم‌و شەفەقەت، جا وا پێدەچوو بەپێی دەستوورو یاساکانیان، بواری ئیجتیهادی شەخصی هەبوو، چ بە باری سەلبی و چ بە باری ئیجابیدا.

**+ پاسەوانەکان ئافرەت بوون یان پیاو؟**

- بەزۆریی پیاو بوون، بەس ئافرەتیشیان تێدابوو.

**+ ئەتوانین بڵێین ئەو ئافرەتانە بە بەزەییتر بوون؟**

ـ با، ئافرەتەکان بەزۆری بەبەزەییتر بوون، هەندێکیشیان وەك بڵێی ئەخلاقو شتیشیان هەر نییە، لەگەڵ یەکتر، لەگەڵ پاسەوانەکان، یان لەگەڵ هاوڕێ سجنەکان ئەوەی کە بۆی کرابێ، لە قسەی سوعبەتو بەعزێ ئیشاراتو هەراو هوریاشیان دەبوو، ئەمن پێم سەیر بوو، دەمگوت ئەوە بۆ وان؟ زۆرم پێ سەیر بوو، هیچ ناموسو شەرم نییە، هەستم دەکرد ئافرەتەکان، پیاوەکانیشیان لایەنی جنسیو پەیوەندیی نێوان ئافرەتو پیاویان زۆر بە ئاسایی وەردەگرت، هەموشیان لەگەڵ یەکتر وابەستە بوون، هیچ شەرمو شتیان نەدەکرد.

**+ مامۆستا، سەربازی موسڵمانیان تێدا هەبوو؟**

ـ نەمبیستووە، ئەگەر هەشبێ نەیوێراوە خۆی ئاشکرا بکا.

**+ جار هەبووە لەسەر خواردن کێشە دروست بێت، یان کە جەنابت لەسەر ئەو خواردنانە ڕانەهاتبووی؟**

ـ من تا نزیکەی مانگێگ، ئەگەر کێکێك یان شتێکم بخواردایە، خواردنەکەم بۆ نەدەخورا، دوایی وردە وردە هاوڕێیەکی زیندانیم گوتی: "فلان کەس، تۆ هەر لاواز دەبی". گوتم وەڵڵا دەزانم، ئەو شتانەم بۆ ناخورێ. گوتی: بۆ؟ گوتم ئاخر ئیشتیهام بۆیان ناچێ. گوتی: "جا تۆ وا دەزانی ئێمە زۆرمان حەز لێیەتی، (شێخ) تۆ پێت وایە پێمان خۆشە، ئێمەش هەر ورگی خۆمانی پێدەئاخنین، بۆ ئەوەی نەمرین". گوتم ئاوا؟ گوتی: "ئەرێ وەڵڵا، ئێمەش پێمان خۆش نییە، بەڵام ورگی خۆمانی پێدەئاخنین، بۆ ئەوەی نەمرین". قسەکەی کاری تێکردم، گوتم، دەڵێی ڕاست دەکا، با تەجرەبەیان بکەم، داخۆ هیچیان ناخورێن؟ چونکە لە سەرەتاوە کیسەکەم نەدەکردەوە و یەکسەر فڕێم دەدا، ئەگەر کێکێکی تێدا بایە، دەرم دێنا، شەربەتو شتی تێدابایە دەمخواردنو ئەوی کەم فڕێدەدا، بەڵام دوای ئەوە وتم با تەجرەبەیان بکەم، ناڵێن پیاوی برسی لە پێخۆرێ ناپرسێ؟! دوایی کە تەجرەبەم کردن، تەماشام کرد هەندێکیان باشنو دەخورێن، وردە وردە ڕاهاتم.

**+ مامۆستا، هیچ کاتێك هەبووە سزایان دابن لەسەر سەرپێچییەك، بەجێ نەگەیاندنی فەرمانێك؟**

- من زۆر بە کەمی، ئیدارەی زیندان ئەوان دەهاتن، هەموو جارێ دەیانگوت: "You are a good man"، واتە تۆ پیاوێکی باشی، یان دەیانگوت ژوورەکەی تۆ پاکترین ژوورە.

من سێ جار سزایان دام، ئەویش هەر سێ جارەکە بە زوڵم بوو، یەکێکیان لەبەر ئەوەی سەلامم کرد، ئەویش هەر من نا، ئەوانی کەشیان سزادا، جارێکی کەش لەبەر ئەوەی من بە خێرایی ڕۆشتم، پاسەوانەکە گوتی: تۆ زۆر خێرای، گوتم خۆنەتان گوتووە بەخێرایی وەرزش قەدەغەیە، ئەویش هەر زوڵم بوو، جارێکی دیکەش لەبەر ئەوەی دەستم بەسابوون شۆرد، پاسەوانەکە دەیگوت دەبێ دەست بەسابوون نەشۆن، گوتم بابە ئێمە تارەتمان گرتووەو دەبێ بە سابوون بیشۆین، گوتی نەیشۆن، دەنا سزاتان دەدەین، من لێی حاڵی نەبووم، ئەوانەی کە زیاتر ئینگلیزییان دەزانی، حاڵیبوون، من ئینگلیزییەکەم بایی ئەوەندە نەبوو لە هەموو شتێك حاڵی ببم، ئەوان دەستیان نەشۆرد بەسابوون، من وردە وردە دەستی خۆم شۆرد، دیاربوو تووڕە بوو خۆی سوور کردەوە، گوتی ئەوە چییە؟ ئەوانیش گوتیان شێخ ئەوە دەڵێ دەستتان بەسابوون مەشۆن. گوتم وەڵڵا ئەوە تازە شۆردم، تازە تا لێش نەبمەوە گوێی نادەمێ، دوایی گوتی بچۆ ژوورێ، ئەو سێ جارە من سزام خواردووە، بەڵام لەسەر شتی دیکە نا، خەڵك هەبوو دەنگە دەنگی دەکرد، یان دەیگوت ئەو خواردنە ناخۆم، یان قسەیەکی تووڕەی لەگەڵدا دەکردن، لەسەر ئەو شتانە سزا دەدرا، من ئەوانەم نەدەکرد، دەمگوت ئەو شتانە مەکەن، ئینسان ڕێزی خۆی ڕابگرێ باشە، لەو شتانەدا گلەییم نەدەهاتە سەر.

**+ لەو زیندانە، بێجگە لە تۆ، کوردی تری لێبوو؟**

- پێم شك نایە، ماوەیەك (عومەر بارزانی)یان هێنا، نازانم دوایی بۆ کوێیان برد، دوای ماوەیەك ونبوو، گوتم بۆ کوێیان بردی ئەو ماوەیە؟ گوتی: "بردیانمەوە بۆ سلێمانی". گوتم ئەزیەتیان داوی؟ گوتی: "نەخێر، بەس پێشێ ئەزیەتیان داوم".

بەڵام دوایی لای هاوڕێیەکی زیندانی گوتبووی هەرچیم کردووەو نەمکردووە، ئیعترافم لەسەر هەموو شتێك کردووە.

**+ چۆن بە یەکتان زانی؟**

- ئەو منی ناسی، من بانگم دەدا، جار جار بەرگی کوردیشم لەبەر دەکرد، ئەو منی ناسی، ئەو بە هاوڕێکانی گوتبوو کە بڵێن ئەوە عومەر بازیانییە، من نەم ناسی، بەرگی ئەوانی لەبەردابوو، ئەوجا دیاربوو کە سەلامی کرد، بەس ئەو لەقاتعی ئەوبەربوو، دەنگمان نەدەگەیشتە یەك.

**+ سەبارەت بەشێوازی قاتعەکان، دەکرێت بۆمان وەسف بکەی؟**

- ئێستا جوان جوان بۆت وەسف دەکەم، گەڕەکێك ئاوا، بیستو یەك ژوور بەم ڕووکارەیدا، بیستو یەك ژوور بەو ڕووکارەی پشتیدا، ژووری تاکی ئەوە چلو دوو، لەوێش چلو دوو دەکاتە هەشتاو چوار ژوور، ئەوجار بەو دیویشەوە قاتعێکی کەش بوو یەك ڕووکاری هەبوو، ئەوەیش بیستو یەك ژوور بوو، ئەوە سەد ژوور زیاتر، سێ قاعەشی لێبوون یەکی دە کەسی دەگرت، هەمووشیان لەناو یەك ساحەدا بوونو بە (٣ - ٤) ساترو تەلبەند دەورە درابوونو بورجی لێبوو پاسەوانیان لەسەر بوو بە چەکەوە.

**+ ئێوە کە دەهاتنە دەرەوە، هەموو زیندانییەکانتان دەبینی؟**

- نەخێر، ئێمە کە دەیانبردین بۆ لای پزیشك بۆ چارەسەر، ئەوانەی قاتعەکەی ئەودیومان دەبینی، سەلامیمان لێدەکردن، کە دەیانبردین بۆ حەمام، قاتعەکانی ترمان دەبینی، یان ئەگەر ئەوانیان لەولاوە هێنابایە بۆ تەحقیق، دەمانبینین، ئەگەرنا، ئێمە بەس ئەو دوو قاتعەی کە بەرانبەری یەکین، یەکترمان دەبینی، تەبعەن پێشێ لەگەڵ قاتعەکانی تریش لە کاتی وەرزشدا یەکترمان دەبینی، چونکە داڵان داڵانی تیابوو، دوایی داڵانەکانیان هەموو گرت، لەبەر تەقەو شت لێك دابڕاین، ئەگەرنا، پێشێ هەموو خەڵکەکە یەکترییان دەبینی، لەکاتی وەرزشدا دەهاتنە داڵانەکەو یەکترییان دەبینی، دوایی ئەوەشیان گرت.

**+ کەواتە ئێوە زۆربەی کات بیستو یەك بە بیستو یەك بوون؟**

- بەڵێ.

**+ هەوڵت نەدا فێری زمانی ئینگلیزی بیت؟**

ـ هەوڵمدا، بایی ئەوەندە فێربووم کە هەندێ ئیشوکاری خۆمی پێ جێبەجێ بکەمو لێك حاڵی ببین، ئەوەندەم بەپێویستزانی، نووسینی واشم لەلا نەبوو، پێم گوتن فەرهەنگێکی ئینگلیزیم بۆ بهێنن، بۆیان نەهێنام، کەسی وای لێ نەبوو بواری هەبێت ئینگلیزیم فێر بکات، ئینسان بە تەنیا بۆ خۆشی هەر ئەوەندە فێر دەبێت.

**+ مامۆستا، لەو زیندانەدا هیچ پێداویستییەکی پزیشکییان بۆ دابین دەکردن؟ ئەگەر یەکێك باری تەندروستی تێکچووبایە، چۆنو بەچ شێوازێك چارەسەر دەکرا؟**

ـ لە ڕووی تەندروستییەوە، لە هەندێك ڕووەوە باشبوو، ئەوانەی کە نەخۆشیی پەستانی خوێنو شەکرەو ئەوانەیان هەبووایە، ڕۆژانە بە سەریاندا دەگەڕان، بەس بۆ هەندێك نەخۆشیو حاڵەتی تر خراپ بوون، بۆ وێنە" من سێ جار تووشی ئازاری گورچیلە بووم، یەکەمجار کە تووشبووم، وامزانی ئازاری ڕیخۆڵە کوێرەیە، لای ڕاستم بوو، ئازارێکی زۆر زۆرم هەبوو، شەو نزیکەی سەعات دوو خەبەرم بووەوە، بەئازاری کەلەکەمدا وامزانی ڕیخۆڵە کوێرەیە، نزیکەی دوو سەعات خۆم ڕاگرت کە چاك بێ، بەڵام هەر زیادی کرد، پاشان هەموو لەشم ئارەقی کرد، ئاوا حاڵەتێکی ناهەموارم بۆ دروستبوو، ئازارەکەم زۆر زۆر بوو، لە دەرگاکەمدا، پاسەوانەکە هات، گوتم کەلەکەم زۆر دێشێ، ئیشارەتم بۆ کرد، دراوسێیەکم ئینگلیزی باشی دەزانی، بانگم کردو هات تەرجەمەی کرد، گوتی: "کاکە ئەوە زۆر شپرزە، ڕەنگە ڕیخۆڵە کوێرەی بێ". گوتی: "نا، پێموانییە ڕیخۆڵە کوێرەی بێ، باسەبر بگرێ، تا سەعات هەشت، تا دکتۆر دێ". گوتم واتە نەفەرێك، موزەمیدێکی لێ نییە؟! جا بە دەردی کابرا دەڵێ: "کەلەکەی خۆت ڕاگوشە"، لە سەعات دووەوە تا سەعات هەشتی بەیانی، تا ئەو کاتەی دکتۆر دێ، ئیدی من لەوکاتەدا زۆر سەغڵەت بووم. ئەوان هەر لەلای دەرگاکەبوون، ئەو هاوڕێیەی دراوسێم گوتی: "باشە، من با لەلای بمێنمەوە، لەوانەیە بمرێ". ڕەنگم چرژا بوو، ئارەقم کردبوو، گوتی: "ڕەنگە ڕیخۆڵە کوێرەی بێ، نیشانەکانی وا دیارە". پاسەوانەکە گوتی: "نا، ناکرێ"، وتم خۆ ئەگەر بشمرم گرفت نییە بۆ ئەوان!!

ئەوان خەریکی دەرگا پێوەدانێ بوون، گوتم خوایە بێ منەتم کە لەوانە، لەخوا بەزیادبێ ئەوان هەر لەبەر دەرگا بوون، وەکو بڵێی ئاوێ بە ئاگریدا کەی، ئازارم نەما.

ئینجا (١ ـ ٢) جارێکی کە هەر تووشم بوو، ئێ دەمگوت باشە پشکنینێ، شتێ، تا بزانم داخۆ ڕیخۆڵە کوێرەیە؟ دەیانگوت: "نا، گورچیلەیە"، ئێ دەمگوت باشە چارەسەرێ؟ گوتیان: "نەوەڵڵا، دەبێ تۆ ئاوی زۆر بخۆیەوە"، ئینجا کۆمەڵی خاچی سوور هاتن، باسی ئەوەیان کرد: "لەگەڵ تۆ چۆنن لەڕووی پزیشکییەوە؟"، گوتم من لە هەندێ ڕووەوە باشم، بەڵام لە هەندێ ڕووەوە نا، بۆ نموونە" من ئازاری گورچیلەم هەبووە، گوتوویانە ئاوی زۆر بخۆرەوە. ئەوەی خاچی سوور ئافرەتێك بوو زۆر پێکەنی: "چۆن؟ هەر ئەوە عیلاجیان بووە؟"، گوتم: بەڵێ، گوتم لە ڕاستیدا ئاوم زۆر خواردەوە، تا بەردێکم فڕێ داو بڕۆ بەخێرهاتی!

هەبوو بە عەرەبانە دەیان برد، بە دەست دەیان برد، دوایی گرنگیشیان پێنەدەدا، دەیانگوت "بۆ خۆت چاك بە"، جاری واش هەبوو گرنگییان پێدەدای، پێم سەیر بوو، جاری وا هەبوو دەستەی پزیشکی باشتر بوون، هەندێکیان لە هەندێکیان باشتر بوون، هەندێکیان ئیدارەی زیندان کارئاسانییان بۆ دەکردن، بۆنموونە" هەبووە بە کۆپتەر دەیانبرد، جاری واش هەبوو هەر بە نەخۆشی دەیانهێنایەوەو دەیانگوت "ئیسراحەت بکە چاك دەبی".

**+ ئەو نەخۆشی گورچیلەیە لە دەرەوە تووشت بوو، یان لەوێ؟**

- لەوێ.

**+ پێشتر نەتبوو؟**

- پێشتر هەم بوو، یەکەمجار لە تاران تووشم بوو، بەس تووشم نەبووەوە تا ئەوێ.

**+ مامۆستا، لە زینداندا ئاگاداری گۆڕانکارییەکانی دەرەوە بوون؟ هۆکارەکانی ڕاگەیاندنیان بۆ دابین کردبوون؟**

ـ هیچ دەنگوباسێکمان نەدەزانی، هیچ، کەمو زۆر، تەنها ئەوەی کە بە دەماو دەمو دەمان بیست، جاری واهەبوو یەکێك کەسوکاری دەهاتو سەردانیان دەکرد، لە بوارێکدا قسەیەکیان پێدەگوت، ئەگەر پاسەوانێك قسەیەکی بە کەسێك گوتبایە، ئەگەر

موحەقیقێك، جار جار موحەقیقەكان قسەیان دەكرد، دەیانگوت ئەوە قەوماوە، ئەوە بووە، هەڵبژاردن بووە، یان فلان كەس كوژراوە، ئەو شتانە ئەگەر بمانزانیایە، ئەگەرنا هیچمان لانەبوو، نەڕادیۆ، نە تەلەفزیۆن، هەتا (٢ ـ ٣) مانگ پێش هاتنەوەمان، ئنجا لەوەدوا بواریان دەدا، هەفتانە ڕۆژنامەی ڕۆژێكیان بۆ دەهێنایین، ڕۆژنامەی (الصباح)، ئەوكات تۆزێ دەمانزانی دەنگوباسی دنیا چییە.

**+ مامۆستا، لەماوەی مانەوەتان لەزیندان، جەماوەری مسوڵمانی كوردو كۆمەڵی ئیسلامیی چەندین چالاكیی مەدەنییانەیان لەدژی دەستگیركران و مانەوەی ئێوە لەزینداندا ئەنجامدا، لەوانە: هەردوو ڕێپێوانە جەماوەرییەكەی هەولێرو سلێمانی، ڕێپێوانی شاری لەندەن، كۆنگرەی پشتیوانی لە ئازادبوونی بەڕێزتان و .. هتد، ئێوە هەواڵی هیچ یەكێك لەمانەتان بیست لە زینداندا؟**

ـ من نزیكەی مانگێك یان زیاتر بوو لەو ژوورە تاكییە بووم، ڕۆژێك گوتیان ئەوە عەلی حەسەن مەجیدە، ئیدی ئەویش نەیزانیوە من لەوێم، هەر كەسەو لەژووری خۆی بوو، دیارە كە زانیبووی من فلان كەسم و ئەوانە، ڕۆژێك بە بەردەرگامدا ڕەتبوو گوتی: "شێخ!" گوتم: بەڵێ. گوتی: "ئەوە مژدەت لێبێ، یەك ڕێپێوانی گەورە كرا لە دژی گیرانی تۆ"، گوتم لەكوێ؟ گوتی: "نازانم، لە هەولێر بوو یان لەسلێمانی، بەس ڕێپێوانێكی زۆر گەورە بوو، چەند هەزار كەس دەبوو".

**+ ئەو خۆی بینیبووی؟**

ـ بەڵێ، گوتی: "من خۆم بینیم"، گوتم لەكوێ بینیت؟ گوتی: "لەكەناڵەكان بینیم، لە ڕۆژنامەكان بینیم، لە (٣ ـ ٤) كەناڵ بینیم، شتێكی گەورە بوو"، ئیدی من زۆر دڵم پێی خۆشبوو، ئەو یەكەم كەسبوو ئەو هەواڵەی دامێ، دوایی خزمێكی هات كە ناوی (بارزان) بوو، بارزانی برای صەددام نا، (بارزان)ێكی تر كە ئامۆزایەتی، ئەویش هەر گوتی منیش بینیم.

**+ نەیان وت لە ڕێپێوانەكەدا هوتافەكان چیبوون؟**

- باسی هوتافیان نەکرد، بەڵام وتیان دیاربوو هەمووی دژی ئەوەبووە کە تۆ گیراوی، خەڵکێکی زۆر بەشدار بووەو لافیتەو شتیان هەڵگرتووە، گوتیان کە قسەیان کردووە بە عەرەبی، ئەو ڕێپێوانە دژی ئەوەیە کە فلان بە ناهەق گیراوە، ئەمریکا بانگهێشتی کردووەو دوایی گیراوە، ئیدی بەوە زۆر دڵخۆش بووم.

**+ ئەوە یەکەم هەواڵ بوو بیستت؟**

- بەڵێ، بەڵێ، گوتم (الحمدلله)، لە دوای خۆمان پیاومان بەجێ هێشتوون، دنیا نەبۆتە ئاشی ئاولێبڕاو!

**+ دوای چەند مانگ ئەو هەواڵەت بیست؟**

- ڕەنگە مانگو نیوێکی پێچووبێ.

**+ وەك ئەوەی لە ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییەکاندا خوێندوومانەتەوە، زیندانییە ئیسلامییەکان دوای ئازادبوونیان لە زیندانەکانی ئەفغانستانو هەروەها زیندانی "گوانتانامۆ" گێڕاویانەتەوە کە ئەمریکییەکان زۆرجار سەرو ڕیشو سمێڵیان تاشیون، هیچ یەکێك لەئێوە ڕووبەڕووی ئەو حاڵەتەوە بوونەتەوە؟**

- من هەر ئاگام لە خۆم بووە، کەسم لەگەڵ نەبووە، من نەخێر، بەس هەر تەعلیقیان دەداو دەیانگوت کە ڕیشت بۆ چییە، لەوکاتەی کە ئازاریان دەدام، بە ڕیش هەڵیان دەساندمەوە، نەیان دەگوت دەبێ بیتاشی یان ئەوشتانە، بەڵام بەکاریان دەهێنا بۆ ئەزیەتدان.

**+ تا چەندێك هەستو سۆزت بەرانبەر ماڵو منداڵەکانت، کەسوکارت، ئاشنایانت کاریگەرییان لەسەرت هەبوو؟**

- بێگومان زۆر، بەس کە دڵ گەورەبوو جێی هەمووشتێکی تێدا دەبێتەوە، دەنا زۆر پەرۆشم بوون، دوایی نامەیەکم بۆ ماڵێ نارد، گوتم ڕەسمێکی منداڵەکانم بۆ بنێرن، تا بزانم داخۆ ماون یان نەماون؟ خۆ سەبارەت بە ئێوەو برایانەوە هەر بوار نەبوو بشپرسم، چونکە ئێمە لەوێ لە ژێر فشاردا بووین، دەیانگوت نابێ دەنگوباسی غەیری ماڵێ لە کاتی نامەنووسین و تەلەفۆندا بپرسی، بە هیچ شێوەیەك، دەنا ڕەفزت دەدرێتێ، نامەکانیشمان کە ئێستا تەماشام کردوون، هەندێ شتیان لێ کوژاندوونەوە،

نامەکانی مالێش کە دەهاتن، هەندێ شتیان لێ دەکوژاندنەوە، بێگومان زۆریان دەکوژاندەوە، بەڵام خوای پەروەردگار وایکردبوو کێ زۆر دڵم بۆی بە تاسە بووایە، چ هی مالێمان، چ لە ئێوە، دۆستو برایانی سەرکردایەتی و غەیری ئەوانیش، کە کەمتان هەیە، ئەوانەی کە زیاتر لەگەڵیان تێکەڵ بووم، کەمیان هەیە نەك جارێك، چەند جارێك خەوم پێوە نەدیبێ، ئەوەی کە زۆر بۆیان تامەزرۆ بوومایە، خوای بە بەزەیی وەکو شتێك دەیخستە بەرچاوم، هەتا ئەو مەسەلەی ئیمزاکۆکردنەوە، من نەمدەزانی چ هەیەو چ نییە، دووجار پیشانیان دام کە عەشایەرو خەڵكو ئەوانە ئیمزایان کۆدەکردەوە، دیاربوو دەیانگوت کە ئەوە ئیمزایە، دەنگوباسم هەر نەش بیستبوو، واتە هەندێ شت خوای پەروەردگار پیشانی دەدام، بەپێی پێویست.

بۆنموونە" سەبارەت بە بابم، من زۆر پەرۆشی بابم بووم، چونکە کەوتۆتە تەمەنەوە، ئینجا قسەی خۆمان بێ، ئەگەر من یارمەتیم نەدابێ هیچی نەبوو، زۆر پەرۆشی ئەو بووم، کە زۆر دڵم بۆی بە پەرۆش دەبوو، خوای پەروەردگار دەیهێنایە بەر چاوم، بەشێوەیەکی رێکوپێك، من دەمگوت رەنگە نەیبینمەوە، چوزانم داخۆ دوای دوو ساڵ، دوای دە ساڵ کەی بەر دەبم، هیوام هەبوو، بەڵام نەمدەزانی چەندی پێدەچێت، دەمگوت دەبێ ببینمەوە؟ نەیبینمەوە؟ بابم بەتەمەنە و رەنگە کەس نەبێ هاوکاریی بکا، خوای گەورە پیشانی دام، هاوسەرم و منداڵەکانی پیشان دەدام، برایان، خوشکان، زۆرجاران وەکو چۆن ئاوا ئێستا دادەنیشین، دەمبینینەوە، ئاوا تەماشام دەکردن، هەندێك لەوبرایانەی پەیوەندی تایبەتییان لەگەڵ من هەبوو، زیاتر دەمبینین.

**+ با بێینە سەر جەنگی دەروونی، ئایا جەنگی دەروونییان لەگەڵ دەکردن؟ ئەگەر دەیانکرد، چییان دەگوت؟**

ـ وەڵڵا بێگومان، جەنگو فشاری دەروونی هەبوو، منیان بەزۆری بەوە سەغڵەت دەکرد، دەیانگوت: "تۆ بۆ هەمووشتێك نالێی؟ هەرچی نهێنیو راستیی کۆمەڵی ئیسلامیی‌و پەیوەندیی لەگەڵ خەڵکی ترو ئەو شتانە هەمووی بڵێ، چونکە تۆ لەسەرشتێك خۆت نارەحەت دەکەی، خۆت بەنارەحەتکردن دەبەی کە بوونی نەماوە، کۆمەڵی ئیسلامیی داری بەسەر بەردەوە نەماوە، تۆ هەر لەخۆڕا خۆت ماندوو دەکەی،

ئێمەش ماندوو دەکەی‌و خۆشت سەغڵەت دەکەی، هەمووشتێك بڵێ". منیش دەمگوت هەمووشتێك، ئەوەی کە پێویستە گوتوومە، ئەوەی ئێوەش دەیڵێن وانییە، دەیانگوت: "چۆن وانییە؟ ئاخر ئێمە پێت دەڵێین، خۆ تۆ هیچ هەواڵت نییە، کۆمەڵی ئیسلامیی نەماوە، نە بارەگاتان ماوە، نەکەس ماوە، هەمووی گیراوە". گوتم وەڵڵا نازانم هەمووکەس ماوە یان نا، بەڵام کۆمەڵی ئیسلامیی دەمێنێ، دەیانگوت: چۆن دەزانی؟ دەمگوت دەزانم، کۆمەڵی ئیسلامیی خوا خاوەنیەتی، شتێك بەناوی خواوە کۆ ببێتەوە، ئێوە پێتان بڵاو نابێتەوە و پێتان پەرتەوازە ناکرێ.

بەڵێ، نارەحەت دەبووین، یان هەڕەشەیان دەکرد، زۆر دەیانگوت کە دەتبەین بۆ گوانتانامۆ، یان هەڕەشەیان دەکردو دەیانگوت کە ماڵ‌و منداڵەکەت دەهێنین بۆ ئێرە، هەریەکەو لە ژوورێکی دادەنێین، وەکو فلان (یەکێکی لێبوو ژن‌و مێردێك هێنابوویانن). ئەو شتانەیان دەگوت، یان دەیانگوت: "تا ئێستا هەندێك شێوازی سزادان هەیە بەکارمان نەهێناون، لەمەودوا بەکاریان دەهێنین"، ئەو شتانەیان دەگوت.

بەڵام من لە هەموو شتێك بێمنەت بووم، گوتم: چی دەکەن‌و چی ناکەن، ئەوە من لێرەم، چی گوتوومە هەر ئەوەیە، بڕوات بێ ئەو ڕۆژەی کە گرتیانم‌و لەگەڵ ئەو ڕۆژەی کە هاتمەوە، هەریەك قسەم بوو، کۆمەڵی ئیسلامیی ئاوایە‌و حاڵی منیش ئەوەیە، هەرچی دەربارەی من گوتراوە، درۆیە، ئەو تۆمەتانە هەمووی درۆو دەلەسەن.

جا بەڵێ، ئەوان هەموو جۆرە شتێك بەکار دێنن. بۆ نموونە" یەکێ لەوانەی کە فشاریان پێ لە من دەکرد: نەخۆشبووم، هەرکە گیرام نەخۆش بووم، ئیلتیهابی سنگم هەبوو، چارەسەرو شتم دەخوارد، نزیکەی دوومانگێك بوو لە پشدەر، لە دارەشمانە، لە خێوەتەکاندا تەڕ بووبووم، چونکە باران دەباری و چادرەکانمان شێداربوون، منیش هەر لەگەڵ پێشمەرگەکان بووم‌و لێیان جیا نەبوومەوە، چونکە بۆ ورەیان خۆش بوو، لە سلێمانی سۆنەریان بۆ کردم، گوتیان ئیلتیهابی سینگت هەیە، کە گیرام، لەوێ ئەوە هیچ ئەزیەتیان دام‌و ئەوانە، نەخۆشییەکەم زۆر زیادیکرد، دەمگوت هەر لانی کەم دکتۆرێ، چارەسەرێ، شتێ، دوای ئەو نۆ ڕۆژەی کە بردیانم بۆ ئەوێ، وەکو بێتەوە یادم، بیست ڕۆژ، مانگێك نەیان دەهێشت دکتۆر بە لامدا بێ، لێکۆڵینەوەکانیش هەر بەردەوام بوون، هەموو ڕۆژێ پێمدەگوتن باشە ئێوە بانگەشەی مافی مرۆڤ و ئەوە

دەکەن، بۆ خۆتان دەزانن من نەخۆشم، دکتۆرێ، شتێ، حەبێکم بدەنێ، پێدەکەنین، ئینجا جارێ ئافرەتێکیان لەگەڵدا بوو، هەستم پێدەکرد عاتیفەی جولا، تیلەچاوێکی کرد، وەکو فشارێکی دەروونی یەکێکی دیکەیان وتی: "با ئەوە بەدەردی خۆیەوە بتلێتەوە"، دوایی کە تەماشایان کرد من هەریەك بابەتم، ساغبم، نەخۆشبم، برسیبم، تینووبم، هەریەك قسەیە، ئیدی دیاربوو دوای ئەوە وردە وردە گۆران، ڕۆژێك موزەمیدێك هاتو گوتی وەرە بۆ لای دکتۆر، ئەوە دوای نۆ ڕۆژی یەکەم، دوای ئەوە ڕۆژێك موزەمیدێك هاتو گوتی تۆ فلان کەسی؟ گوتم بەڵێ، گوتی وەرە لەگەڵمدا بۆ لای دکتۆر، وەرگێڕێکم لەگەڵ هات، پشکنینی بۆ کردمو شوێنەواری لێدانو ئەوانەم هەر پێوە مابوو، ئنجا پاش نزیکەی (٣٠-٤٠) ڕۆژ دوای گیرانم حەب و شتیان دامێ، ئیلتیهابی سنگەکەم چاك بوو، ئەوجا حاڵم باشبوو.

**+ تاکەی جەنگی دەروونی بەردەوام بوو؟**

- لێکۆڵینەوەکان ٦ - ٧ مانگێك بەردەوام بوون، ئینجا لەگەڵ لێکۆڵینەوەشدا، ئەو جەنگە دەروونییەشیان لەگەڵ دەکردی، بۆ نموونە" زۆرێك منیان ڕاگرت، نەخۆشیش بووم، چوار سەعات لە بەرانبەر خۆر ڕایان گرتم، بەحساب ئەوە ئەشکەنجەو شت نەماوە، لە بەرانبەر ڕۆژێ ڕایان گرتم، زۆریشم تینوو بوو، لای تەل دڕکێك ڕایان گرتم، ئەگەر بکەوتمایە، بەسەر تەلە دڕکاویەکەدا دەکەوتم، ئیدی منیش ڕاوەستام، هەروا وەستام.

**+ بە پێوە؟**

- بە پێوە، بەرانبەر ڕۆژیش، ئیدی دیاربوو یەکێکیان بە یەکێکی دیکەی گوت تا کەنگێ ڕایگرین، بۆ خۆشیان ماندوو بوو بوون، گوتی تا دەکەوێ، منیش دوعام دەخوێند، لە ڕاستیدا بێتاقەت بووم، تینووم بوو، دیاربوو گوتیان ئەوجار دەتبەینە ژوورێ، بەس چی دەزانی بیلێ، دەنا دەتهێنینەوە ئێرەو زیاتریش دەتهێڵینەوە، گوتم جا ئەگەر وابێ هەر ناچمەوە ژوورێ، چیم گوتووە هەر ئەوەیە، گوتیان زۆر کەللەڕەقی، گوتم کەللە ڕەقو شتی وا نییە، هەر ئەوەیە، گوتیان ئاخر کاکە تۆ دەمری، گوتم وەڵڵا جا بمرم هەر ئەوەیە، پێتان وایە بەو شتانە من قسەیەکی کەمو

زیاد دەکەم، هەر لێرە دەبم، جار جار کەلیمە کەلیمەیەك حاڵی دەبووم، گوتیان کە وادیارە چی دەڵێ هەر وایە، باچی دیکە ئەزیەتی نەدەین، ئەوجا بردیانمەوە ژوورێش، گوتیان دەی قسە بکە، منیش قورگم وشك بوو بوو، گوتم قسەم بۆ ناکرێ، گوتیان دەتبەینەوە دەرێ، گوتم با بچین!! گوتیان بۆ قسە ناکەی؟ گوتم ئاخر قسەم بۆ ناکرێ، گوتیان: ئەوەنییە بۆت دەکرێ؟ گوتم دوو کەلیمەم هەر بۆ دەکرێ، بەڵام ئەتۆ بتەوێ حەکایەتت بۆ بکەم تۆزێکم ئاو دەوێ، ئەوجا بەناچاری تۆزێکیان ئاو دامێ، گوتیان: باشە، ها تۆزێك دەمی پێ تەڕکە، ئینجا دوایی گوتم باپێتان بڵێم کە سەری خۆتان بەمنەوە نەهێشێنن، چونکە ئەوەی ئێستا هەڕەشەی پێ لەمن دەکەن مردن نییە؟ گوتیان: با، گوتم: وەڵڵاهی وەبیللاهی، مردنم زۆر زۆر پێ ئاسانترە لە قسەیەك کەپێم دەگوترێ، جاری وا هەبوو پێیان دەگوتم "تۆ درۆزنی"، گوتم لە ژیانمدا پێم نەگوتراوە درۆ دەکەی لێرە نەبێ، قەت کەس وای نەگوتووە، گوتم ئێوە پێتان وانەبێ من ئازاری بەدەنم بەلاوە شت بێ، پێتان دەڵێم بچن بەدواداچوون بکەن، هەموو جارێ پێم دەگوتن کە بچن بەدواداچوون بکەن، هەموو جارێ پێم دەگوتن بچن لەخەڵك بپرسن، چیتان پێ دەڵێم ئەوەیە، ئەگەر وشەیەکی جیاوازی تێدا هەبوو، بۆتان هەیە چی بکەن، مەبەستم ئەوەیە ئەو فشارانە هەبوون تا ڕۆژانی تەحقیق، بەڵام وردە وردە کەم دەبوون.

**+ هیچ کات هەبووە لەگەڵ سەربازەکان بواری گفتوگۆ بکەیتەوە، باسی ئیسلامیان بۆ بکەی؟**

- هەر زۆریش، بەزۆری لەگەڵ موحەقیقەکان، زۆر موناقەشەمان دەبوو.

**+ گفتوگۆکان هیچ کاریگەرییان لەسەر بەجێ دەهێشتن؟**

- بەڵێ، زۆر کاریگەریی لەسەریان بەجێ دەهێشت، بەڵام ئەوە پێویست بەوە دەکا بەتایبەت قسەی لەسەر بکەین.

**+ پشت بە خوا پاشتر بە درێژی لێی دەدوێین.**

- بەڵێ، بریتییە لە چەند موفرەدەیەك، دەربارەی عەلمانییەت، سیستمی سیاسیی لە ئیسلامدا، کۆمەڵی ئیسلامیی بۆ دەیەوێ دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەبێت لەعیراقدا،

ئینجا هەڵوێستمان دەربارەی خۆرئاوا، دەربارەی ئەمریکا، دەربارەی ئەو فەلسەفە و بیردۆزانەی لە ڕۆژئاوا هەن.

مەبەستم ئەوەیە، لەگەڵ پاسەوانەکانیش گفتوگۆمان دەکرد، پاسەوانەکانیش زیاتر خەڵکی بە موستەوا نەبوون، پرسیاریان هەبوو، دەکەوتنە ژێر کاریگەریی هەندێ هەڵسوکەوت، دەیانپرسی لە ئیسلامدا ئەوە چۆنە؟ ئەوە چۆن نییە؟ پێموایە خەڵکی وایان هەیە دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەوەوە کە دوایی بیر بکاتەوە، چونکە هەیان بوو پرسیارەکەی وا دەکرد، بۆ نموونە: "ئەگەر مرۆڤ بێتە نێو ئیسلامەوە، دەبێ چی بڵێت؟ چۆن بکات؟ پەیوەندیی نێوان ئافرەتو پیاو چۆنە؟ خێزان لە ئیسلامدا چۆنە؟" هەستم دەکرد هێندێکیان دەپرسن، هەبوو نەیدەوێرا لای کەس باسی بکات، چونکە (بەپێی زانیاری من) یەك کەس لەوێ موسڵمان بوو دەریان کرد، فەسڵیان کرد، لەوێ نەما، ئەوەش پێش ئەوەی من بچم، ئیدی کەس لەوێ نەیدەوێرا باسی ئیسلامو ڕاگەیاندنی موسڵمانێتیو ئەو شتانە بکات، بەس هەندێ لەپاسەوانەکان هەستمان دەکرد عەتفیان لەگەڵماندا دەجووڵا، بەڵام داوایان دەکرد کە کەس نەیبیستێتەوە، هەیانبوو عەتفی دەجوڵاو شتێکی دەهێنا، بەڵام دەیانگوت باکەس نەزانێ، چونکە بزانن ئەوە سزامان دەدەن، هی وایان هەبوو دەیگوت کە سزایان داوم لەسەر ئەوەی لەگەڵ ئێوە پێدەکەنم، هی وا هەبوو دەیگوت کە سزایان داومو گوتوویانە بۆ لەگەڵ ئەوانە قسەت خۆشە؟ یان بۆ لەگەڵیان پێدەکەنی؟ ئەوانەش هەبوون.

**+ مامەڵەی تۆ لەگەڵ پاسەوانەکان چۆن بوو؟**

ـ مامەڵەی من وەکو ئیسلام دەڵێ، ئیجابییانە مامەڵەم لەگەڵ دەکردن، لەگەڵ هەمووان قسەم کردووەو ڕێزی خۆشم دەگرت، ڕێزی خەڵکیشم دەگرت، چونکە دەشمزانی پێچەوانە کردن، یان هەندێ شتی سووکەڵە خراپن، ئەوانە پێم شتێکی پەسەند نەبوون، یا دەنگە دەنگو ئاڵۆزیو ئەوانەم نەدەکرد، لەڕاستییدا ئەوانیش شەرمیان لەمن دەکرد، هەتا هەندێك لەدراوسێ سجنەکانمان ئەگەر شتێکیان هەبا، بۆنموونە" قسەیەك بگەیەنم بە قاتعی ئەوبەر، دەیانگوت: (شێخ) تۆ لە گەڵمان وەرە، پیاسەت لەگەڵ دەکەین، ئەگەر تۆمان لەگەڵ بی شەرمت لێ دەکەن، پاسەوانەکان تێمان ناخوڕن، چونکە تۆ قورسایی خۆت ڕاگرتووە، (لەخوا بەزیاد بێت)،

هەبوو دەیزانی ئەوە شتێکەو بەموخالەفەی دەزانی، بەڵام دەهاتو دەیگوت کە پێم عەیبە پێت بڵێم (بەئەسپایی)، بەڵام با جارێکیکە ئاوا نەبێ، ئەگەر شتێك زانیبای موخالەفەیە، منیش بەڕاستی مامەڵەی وام نەکرد کە بەڕاستی دەمیان لە خۆم بکەمەوە، بە زۆری لە ژوورەکەی خۆم بووم، هەروەها لە خواردنو شت بڕوبیانووم نەبوو.

هەبوو لەسەر ئاوی گەرم، لەسەر جگەرە، لەسەر دەرمان گرفتی دروست دەکرد، من ئەو شتانەم نەبوو، هەندێکی هەر نەمبوو، وەك جگەرەکێشان، لەسەر خواردنو خواردنەوە بیانووشم نەبوو، سەرئێشەو سەرقاڵکردنی خەڵکم نەبوو، پاشان دەنگە دەنگو شتم پێ عەیب بوو، ئەوان بانگی یەکتریان دەکرد لەو ژوورێوە بۆ ئەو ژووری، جار جار دەیانگوت کە "شێخ، تۆ بۆ هیچ دەنگت نایە؟" دەمگوت من قورئان دەخوێنمو موتالەعە دەکەمو دوعا دەخوێنم، ئەو دەنگە دەنگە چییە؟ پاسەوانەکان دەیانگوت تۆ زۆر لامان بەڕێزی، نە دەنگە دەنگێ دەکەی، نە هەرا هەرایە دەکەی، دەیانگوت کە ئەوانە دەیکەنە گاڵە گاڵ، جاری وا هەبوو پەنجەرەکەیان لەسەر دادەخستنو دەیانگوت کە زۆر قیرە قیڕ دەکەن، ئاوا ئیدی، دیارە مرۆڤ بەهەڵسوکەوتی خۆی شەخسییەتی دیاری دەکات لای خەڵکی.

**+ نموونەت لا هەیە کە ڕۆژێك پاسەوانێك دیاری بۆ هێنابێتی؟**

ـ ئەمن ئەوکاتەی دەستم بەنووسین کرد، دوای ئەوەی کە لەئیدارەی زیندان ڕەزامەندیی نووسینو ئەوە کە قەڵەمو کاغەزم لابێ، وەرگرت، یەکێك لە پاسەوانەکان ناوی جۆزێف بوو، هەر (یوسف)ی خۆمانە، دەیگوت کە من یوسفی ئێوەم بەڵام پێم دەڵێن جۆزێف، ئەوە پیاوێکی بەتەمەنیش بوو، پەنجا ساڵێك دەبوو، بەپارەی خۆی دەچوو دەفتەری بۆ دەکڕیم، قەڵەمی بۆ دەکڕیم، (٣ ـ ٤) قەڵەم بەجارێ، خەڵك قەڵەمێکی دەست نەدەکەوت، لاپەڕەیەکی دەست نەدەکەوت، ئەو دوو دەفتەری بەجارێ بۆ دەهێنام، جا نەك هەر یەك، لەهەموو وەجبەکان (١ ـ ٢)یێك دەبوونە برادەرم، من زمانیشم نەدەزانی تا قسەیان لەگەڵ بکەم، بەڵام کە دەیان بینی من ئیمامەتیان بۆ دەکەم، بانگیان بۆ دەدەم، دەیانپرسی کە ئەوە بۆ هەر ئەو دەچێتە پێشەوەو بانگ دەداو کوتان دەکاتەوە؟ یان ئەوە بۆ فلان کەس وا بێدەنگە؟ ئەوانەیتر

دادەنیشتن دۆمینەیان دەکرد، شەترەنجیان دەکرد، سێ سەعاتان شەترەنجیان دەکرد، ئەگەر بواریان هەبووایە دۆمینەیان دەکرد، دامەیان دەکرد، جار جار دەنگیان لەیەك بەرز دەبووەوە، ئەمن ئەو بەزمو ڕەزمانەم نەبوون، ئیدی ئەوە دەیانگوت کە ئەوە حاڵەتێکی تایبەتی خۆی هەیە، جا هەبوو لەخۆوە دەهاتو دەیویست خۆیم لێ نزیك خاتەوە، دەیگوت کە من تۆم خۆشدەوێ، ئەگەر خزمەتێکت هەیە، ئامادەم.

جارێك کیسە خواردنەکە فستقی تێدابوو، شتێکی کەمبوو، من ئەوا بەڕێوە لەگەڵ هاوڕێکانم فستقم دەخوارد، پاسەوانێکی لێبوو، وتم دەست بگرەوە با تۆزێکت بدەمێ، ئەویش گوتی نا ئێمە ناخۆین، گوتم نا دەبێ وەریبگری، هەر وەکو ئەدەبێك کە کابرا چاوی لێیەتی، گوتی: دوایی من فستقتان دەدەمێ، گوتم نا، خۆ ئەوە لێیەتی، گوتی نا، دوایی بۆت دێنم، یەك کیلۆ فستقی سوورەکراوەی بۆ هێنام، منیش ئیدی دابەشم کرد بەسەر قاتعەکەدا، گوتیان: "شێخ، وەڵڵا بەبۆنەی تۆوە ئێمەیش خەنی بووین"، جاری دیکە میوەیان هێنا، یان شیرینی زیادەیان دەهێنا، بۆ منیان دەهێنا، یان بۆ ئەوانەی دیکەیان دەهێنا، یان بۆ هەموو قاتعەکەیان دەهێنا.

**+ یەکترناسینیان دەکرد؟ بڵێین من ناوم ئەوەیە؟**

- لەسەر سنگیان نووسیوە، هەر دەشیان گوت کە من ناوم فلان کەسە، خەڵکی فڵانە شوێنم، ئەوەندە منداڵم هەیە.

**+ دەکەوتنە باسی تایبەتەوە؟**

- بەڵێ، بەڵێ، بۆنموونە" هەبوو دەیگوت من حاڵم ئاوایە، هەبوو دەیگوت من ژنم هێناوە، بابمو دایکم نییە، هەبوو دەیگوت من دەستگیرانم هەیە، بەس نەمگواستۆتەوە، باسی هەموو حاڵەتی کۆمەڵایەتی خۆیان دەکرد، ئەوانە زۆر بەلایانەوە ئاساییە ژن مێردی تەڵاقدا، مێرد ژنی تەڵاقدا، من نەشدەچوومە نێو ئەو قسانە، بەڵام هاوڕێکانم جار جار بۆیان باس دەکردم، دەیانگوت کە ئەوە دەڵێ من دەستگیرانێکم هەیە، بەڵام ئێستا هاوڕێیەکم هەیە، ئەو لە جیاتی من لایەتی تا دەچمەوە، دەمگوت باشە عەیبە، ئەو شتانە چۆن دەڵێن؟ ئەسڵەن زۆریش ئاساییە

بەلایانـەوە، پێغەمـبەر ﷺ دەفەرمـوێت: (اذا لم تستح فاصنع ما شئت)، ئەگەر غیرەت نەما، هەموو شتێ دەکرێت، ئەوان پێکهاتەی کۆمەڵایەتیو خێزانیو شتیان زۆر وێرانە.

**+ لە نەبوونی وەرگێڕدا، کێ ئەو گفتوگۆیانەی بۆ وەردەگێڕایت؟**

ـ وەڵڵا زۆریـان، ئەوانـەی کـە لـەوێ بـوون، ئـەو دوو سـێ قاتعـە کـە دوایی تێکەڵ بـووین، زۆرێـك ئینگلیـزییان دەزانی، بەتایبەت دوویان، دکتۆر سەتتام ئەلگەعود، ئەوە کـە هـەر بەعسـیش نەبـوو، (رجـل أعمـال) بـوو، زۆر دۆستیشم بوو پیاوێکی بەڕێز بوو، یەکێکـی دیکەشـیان ئەصیل تەبرە بوو، ئەوە کە کاتی خۆی جێگری عودەی بوو، ئەوە زۆر ئیسـتیفادەی لـە مـن کـرد، ئـەو دوانـە وەکـو بڵێـی هاوڕێـی نـزیکترم بـوون، بـەس هیتریش زۆر هەبوون خۆیان بە هاوڕێو نزیکی من دەزانی، ڕێزیشیان دەگرتم.

**+ شوێنی خەوتنتان چۆن بوو؟**

ـ شتێکیان بـۆ هێنابووین، وەکو قەرەوێڵەش نییە، تەختەیەکم لەسەر ڕادەخەست، دۆشــەكو مۆشــەکیش نەبـوو، دوایـی دۆشــەکیان بـۆ هێـنـاین، دوای (٦ ـ ٧) مانگـێك دۆشــەکیان بـۆ هێـنـاین، بەتانیـیەك بـوو، ســەرینێك بـوو، کـە نـزیکەی دوای ســاڵێك سەرینیان بۆ هێنـاین، لەوێ بە هەموو شێوەیەك ڕادێی.

**+ ژوورەکـە بێجگە لـە دەرگایـەكو پەنجەرەیـەكو ئـەو ڕەفەیـە، هیچـی تـری تیانەبوو؟**

ـ بـەڵێ، مـن بەتانیـیەکەم بۆیان کـردم بـەدوو بەتانـی، بەسـێ بەتانی، بەتانییەکم ڕاخسـت، هـەروەها نوێژیشـم لەسـەر دەکـرد، ژوورەکـەم پاکبوو، هەفـتەی یـان دوو هەفـتەی جارێـك ژوورەکـەم دەشـۆرد، شـتێك بوو وەك قەرەوێڵە بوو، قەرەوێڵەی تەواو نەبوو، تەختەیەکـی لەسەر بوو دۆشەکەکەی لەسەر بوو، بەتانییەکم لەسەر ڕاخستبوو، بـەڵام مـن بـەزۆری دادەنیشتم لەسەر بەتانییەکەو لەسەر کارتۆنێك دەمنووسی، چونکە ســاڵێك زیاتـر، نـزیکەی چوارسـەدو پـەنجا ڕۆژ خەریکـی ئـەو کتێبە بووم[10]، خەریکی نووسـین بـووم، لەسـەر کارتـۆن، ئەگـەر ویستباشـم بجووڵـێم، بـەڵام هەمـوو بەیانیـیەك

[10] واتە کتێبی: (الاسلام یتجلّی في کتاب الله) ئیسلام لە کتێبی خوادا دەدرەوشێتەوە.

وەرزشـم دەکـرد، نـزیکەی نیو سەعات، بیست دەقیقەیەك، قورئانیشم کە دەخوێند، بە پـێوە دەمخوێـند، لـە گۆشـەوە بۆ گۆشـە، ئەگـەر دەریشیان کردباین، لە دەریش هەر دەمخوێـند، لـەناو سـاحەکە، دەنا لە گۆشەیەکەوە بۆ گۆشەیەکی تر، شتەکانی خۆم وا ڕێکخستبوو، بۆ ئەوەی بتوانم بجوڵێم، بۆ ئەوەی مرۆڤ ماسولکەکانی نەمرن.

**+ مامۆستا، دەرگاکان ئاسن بوون؟**

- نا، دەرگاکان تەختە بوون، دەرگای ئەستوور بوو.

**+ ئەی پەنجەرەکان شووشە بوون؟**

- پەنجـەرەکان شووشـە نەبـوون، پەنجـەرەش هـەر تەختە بوو، پەنجەرەکە (٢٥ X ٢٥سـم) بـوون، زۆر گلەیـیمان کـرد کـە ژوورەکـان زۆر تـاریکن، چاومان کزبووە، خەڵك شتی بۆ ناخوێنـرێتەوە، جـاری واش بـووە کارەبا نەبووە، ئەوجار بەشێوەی گۆشەیی لایەکیان کـرد بـە دوو پارچـەوە، ماددەیەکـی پلاستیکی وەکو شووشە بوو، تەقریبەن ژوورەکـەی ڕووناك کـردەوە، ئـەوە لەدوایـیدا، نـزیکەی دوای سـاڵێك ئـەو چاکسازییانە کران، یان هەندێکی شەش مانگ پێش هاتنەوەم.

**+ ئەی لە ڕووی پاکوخاوێنییەوە حاڵتان چۆنبوو؟**

- سـەبارەت بـە پاکوخاوێنی، بۆ نموونە" بەلایەنی کەمەوە هەفتەی دووجار بواریان دەدایـن خـۆ بشـۆین، ئەگـەر دە دەقـە دە دەقـەش بـووایە، بـەڵام هەر چاك بوو، بەس بیسـتبووم کـە برایانـی تـر دەیانگوت حاڵمان لەڕووی پاکوخاوێنییەوە زۆر خراپ بووە، لـە بیابان بووین، ئێمەش بەڵێ شوێنەکەمان بیابان بوو با هەڵی دەکرد، خۆڵبارانو شت دەهاتـە ژووریٚ، بـەڵام هـەر بـاش بـوو، واتـە نیسـبەتەن، بـەڵێ لـە ژووریٚ موقەییەدی، بەنیسـبەت پاکوخاوێنـی وا پێدەچـیٚ لـەڕووی خـواردنو شـتەوە هەروەکو یەك بووبین، بەڵام لەڕووی پاکوخاوێنییەوە حاڵمان باشتر بوو.

**+ ساردیو گەرمی ناو سجنەکە چۆنبوو؟**

- لـە قۆناغـی یەکەمـدا، ڕۆژانە دەبوو هەر خەریکی مێش دەرکردن بووینایە، ڕۆژانە ڕەنگـە دوو سـەعات خەریکی مێش دەرکردن بووینایە، دادەنیشتی مێش تێت دەوروکا، دەوەرە ئـەوجار مێشـان دەرکە، ئینجا یەکێکت دەردەکرد دوایی دەهاتەوە، شەوانەش

لەبەر مێشوولە خەوتن نەبوو، نزیکەی (٢ ـ ٣) مانگان هەروا بوو، لەدوایی ڕا ئەیرکۆندیشنیان هێنا، تۆزێ حاڵمان باش بوو، دوایی دەرمانێکیان داینێ بۆ دژی مێشوولە، دەرمانێکیان داینێ لە پێش دەرگا دامان دەناو مێشەکانی دەکوشت، مێش یان دەبێ بیانکوژی یان دەبێ دەریان کەی، سیسرکە زۆر بوون، قالۆنچەش، جا ئەمن زۆریشم بەزەیی بەو جۆرو جانەوەرەیدا دەهاتەوە، نەمدەکوشتن، بەڕاستی هەر دەرم دەکردن، هاوڕێکانم دەیانگوت شێخ با بیانکوژین، گوتم وەڵڵا من نایانکوژم.

ئەوە بیابانە، کوللەو شت دەهاتنە ژوورێ، بەردەوام کە خواردنم دادەنا پڕ دەبوو لەمێروولە، کێکو شتێکم دادەنا مێروولە دەچووە ناوی، دوایی فێربوو بووم بزمارێکم لە قەدی دیوارەکە دادەنا، خواردنێك شتێکم هەبایە لە عەلاگەیەکی نایلۆنم دەهاویشتو بە بزمارەکەم هەڵدەواسی، ئەوە کۆتا هەوڵ بوو، پێش هاتنەوەم فیکری ئەوەم کرد، دەنا زۆر جار خواردنەکەم پڕ دەبوو لە مێروولە، شتی شیرینو ئەوانە و بە ناچاری دەبوو فڕێم دابایە.

**+ سەبارەت بە خواردنەکە، ئەو خواردنانە بە لای تۆوە ئاسایی بووە، بەڵام بۆ ئەوانی تر کە بەرپرسی گەورە بوون، چۆن بوو؟**

ـ ئەوانە حاڵیان سەغڵەت بوو، هەمیشە نازو گلەییان هەبووە، پرتەو بۆڵەیان هەبووە، نەخۆشیش بوون، حەقیشیان بوو، منیش پێم دەگوتن لەبەر ئەوەی ئێمەتان لەو شاخو داخە زۆر چەوساندۆتەوە، ڕاهاتووین، بۆیە بە هەموو شتێك ڕازیم، بەس بۆ خۆتان ئەوەندە لە ڕابواردنو عەیشو نۆشو کەیفدا بوون، بۆیە بە هیچ شتێك قەناعەت ناکەن، پێدەکەنینو دەیانگوت: "شێخ، وەڵڵاهی ئێمە نەخۆشین". هەبوو زەختی بوو، هەبوو شەکرەی بوو، هەبوو فەقەراتی بوو، هەبوو نەخۆشی گەدەی بوو، هەبوو غوددەی بوو، هەبوو نەخۆشی دوازدە گرێی هەبوو، بەڕاستی خوا ڕەحمی پێ کردبووم ئەو نەخۆشیو شتانەم نەبوو، ئەوجار زۆریش بەڕۆژوو دەبووم، پێشم دەگوتن بابە بەڕۆژوو بن، دەیانگوت ئەگەر بەڕۆژوو بین هەر دەمرین، دەمگوت بەڕۆژوو بن، ئەوجا ئەوەندە مەخەون، هەروەها ئەوەندە دۆمینەو شەترەنج مەکەن، تۆزێ قورئان بخوێنن، دەیانگوت کە ئەگەر ئەوانە نەکەین، هەر ڕۆژەکەمان لێ ناڕوات. بەڵێ ئەوان بۆ خواردنو شت زۆر سەغڵەتبوون.

**+ ئایا جگەرەو شتیان دەست دەکەوت؟**

- بەڵێ، پێشێ ڕۆژی شەش جگەرە بوو، ئیدی ئەوەی نەیدەکێشا، دەیدا بەوانی دیکە، من پێشێ وەرم نەدەگرت، دەمگوت حەرامە، دوای ئەوە وەزیری ئەوقافم لە تەنیشتەوە بوو، گوتی: "شێخ، ئۆباڵت بە ئەستۆی من، لێرە وەزعەکە ئاوایە، ئەوانە بۆ جگەرەیەك شێت دەبن، جگەرەکەیان بدەیەو ئۆباڵەکەشت بە ئەستۆی من، چونکە ئێرە وەزعی سجنە، دیارە لە ڕووی شەرعیشەوە تۆزێك ڕێی تێدەچێ"، چونکە من لە نێوان دوو مەفسەدەدا قەرارم دەگرت، مەفسەدەی ئەوە کە لە خۆمیانی نیگەران کەم وەکو هاوڕێی زیندان، مەفسەدەی دووەم ئەو خڵتەو دووکەڵەیان بدەمێ، ئیدی منیش تۆزێ لێکم دایەوە، گوتم بیاندەمێ باشە، وەزیری وات دەبینی، بەرپرسی گەورەی وات دەبینی کە دوو جگەرەت دەدایە، دنیایەك مەمنوون دەبوو.

**+ ئایا خواردنەوەی سەرخۆشکەریان دەست دەکەوت؟**

- نەخێر.

**+ بەختیار ئەمینی وەزیری مافی مرۆڤ، سەردانی زیندانی "کرۆپەر"ی کرد و هەندێك لە بەرپرسەکانی بەعسی بەسەر کردەوە، ئایا تۆ ئاگاداری هاتنەکەی نەبوویت؟**

- من نەمزانیوە، بەڵام ڕۆژێك گوتیان کە ئەوە بەختیار ئەمینە، وەزیری مافی مرۆڤ، گوتیان کە هاتووەتە لای دکتۆرە ریحاب، گوتیان کە هاتووە دوو نەفەری بینیوە، بەس وادیارە نەیوێرابوو بێت بۆ لای من! ڕەنگە گوتبێتی نەوەکو تۆمەتبار بکرێم بە کوردایەتی!! چونکە تەنها من وەکو کورد لەوێ بووم، ئەگەر جورئەتی نەکردبێ بێ سەلامێکم لێبکات!!

**+ ئەیتوانی بێ؟**

- نازانم، جا ئەگەر وەزیرێك بێو نەتوانێ بێ سەلام لە زیندانێکی بکا، ئەوە یانی چی؟ بەڵام من زۆری دەربەست نەبووم، داخۆ دەیبینم یان نایبینم، قسەی خۆمان بێ، لە دنیا و ئەهلی دنیا بێمنەت بووم، لە سایەی ڕەحم و بەزەیی خواوە.




# تەوەرەی چوارەم:
# تۆمەت و لێكۆڵینەوەكان

**٢٠٠٥/٧/٣**

**ستۆدیۆی كەناڵی سلێمانیی تەلەفزیۆنی كۆمەڵ**

+ **مامۆستا عەلی باپیر، دوای چەند ڕۆژ لە زیندانییکردن‌و لە کام زیندان دەستکرا بە لێکۆڵینەوە لەگەڵتاندا؟**

ـ هەر ئەو شەوە کە گەیاندینیانە بەغدا، دەستیانکرد بە لێکۆڵینەوە، دوای ئەوەی دەستیان کردینەوە، گونییەکەیان لەسەر دەموچاومان لابرد، یەکسەر دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لەگەڵماندا، دوای ئەوەی کە پشوویەکماندا، دەستنوێژمان شۆری‌و نوێژمان کرد، یەکسەر لەگەڵم دانیشتن، بەڵام بەجیا، بەتەنیا لەگەڵم دانیشتن‌و دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە، هەر ئەو شەوە کە گەیشتمە ئەوێ.

+ **شەوی ١٠|٢٠٠٣/٧/١١؟**

ـ شەوی ٧/١١ دەستیانکرد بە لێکۆڵینەوە لەگەڵمان.

+ **بیست‌و دوو مانگەکە، چەند جار لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ کرا؟**

ـ دەتوانم قۆناغەکانی لێکۆڵینەوە بۆ سێ قۆناغی سەرەکی دابەش بکەم: قۆناغی یەکەمیان ئەو نۆ ڕۆژەی ئەشکەنجەشی لەگەڵدا بوو. قۆناغی دووەمیان، دوای ئەوەی کە برام بۆ ژووری تاکی، دە ڕۆژ لێیان نەپرسیمەوە، واتە دوای ئەوەی کە بیست ڕۆژ بەسەر گیرانمدا تێپەڕی، ڕۆژی بیستویەکەمین قۆناغی دووەم دەستی پێکرد، ئەوە نزیکەی بیست ڕۆژ بەردەوام بوو، دوای ئەوەی چل ڕۆژ تێپەڕی بەسەر گیرانمدا، منیان دادگایی کرد، ڕۆژی چلهەمینی گیرانم بوو دادگایەکیان پێکهێنا، وتیان: "بۆئەوە داخۆ بە دیلی جەنگیت لەقەڵم بدەین، یا خود بەدەستبەسەرێکی مەدەنی؟"، چەند حاکمێك بوون‌و سوێندیان دام کەڕاست بڕۆم، وتم: سوێندیش نەخۆم هەر ڕاست دەڕۆم.

دوای دادگایی‌و لێکۆڵینەوەیەکی (١ ـ ١,٥) سەعاتی، گوتیان: "ئەوە تۆمان بە دەستبەسەرێکی مەدەنی کە ئەوان (CI) پێدەڵێن، لە قەڵەمدا، تۆ دیلی جەنگ نیت". وتم جا دیلی چی؟ دەعوەتتان کردووم، بەمیوانیی هاتووم، لە سەنگەرو لە بەرەی شەڕدا نەبووم. قۆناغی دووەم لێرەدا کۆتایی هات، لە دوای ئەو دادگاییەو دانانی من وەکو دەستبەسەرێکی مەدەنی.

قۆناغی سێیەم، تا نزیکەی شەش مانگێکم تەواو کرد لە زینداندا، واتە دوای ئەوەی شەش مانگ بەسەر گیرانمدا تێپەڕی، تا ئەوکاتە لێکۆڵینەوەکان هەبوون، بەڵام پچڕ

پچڕ، بەڵام ئەوەی پێشێ بەخەستو خۆڵی بوون، جاری وا هەبوو شەوو ڕۆژ بوو، ڕۆژ هەبوو شەویش دەبوو، بەڵام دوایی پچڕ پچڕ بوو، ناوەناوە بانگیان دەکردم، تا نزیکەی شەش مانگی گیرانم، لەدوای ئەوەوە منیان ئاگادار کردەوەو وتیان: "ئەوە بۆمان دەرکەوتووەو ئاگادارت دەکەین کە تۆ هیچت لەسەر نییە لای ئێمە، ئەو شتانەی کە بۆ تۆ گوتراون، بۆمان دەرکەوتووە کە درۆن، داوای لێبوردنت لێدەکەین، بەڵام داوای لێبوردنیشمان هەیە کە دەتهێڵینەوە، لەبەر ئەوەی بەرژەوەندیمان وادەخوازێ، لە سەرەوە وامان پێگوتراوە، ئەگەرنا، ئەو شتانەی کە لەسەر تۆ گوتراون، هیچیان ڕاست نەبوون، بۆمان دەرکەوتووە کە پیاوێکی ڕاست بوویتو ڕاشکاو بوویت، ئەوەی کە تۆ گوتووتە هەمووی ڕاستبووەو ئەوەی لەسەر تۆ وتراوە، درۆ دەرچوو".

**+ ئەو کاتانە کەی بوون کە تیایاندا لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دەکرا؟ شەو بوون یان ڕۆژ؟**

ـ لە قۆناغی یەکەمدا، نەمزانی چ کاتێ شەوەو چ کاتێ ڕۆژە، شوێنەکە هەمیشە ڕۆشن بوو، ئێمە لە شوێنێکی داخراودا بووین، شەوو ڕۆژم بۆ لە یەك جیا نەدەکرایەوە، بۆ نیوەڕۆکانیش، بە مەزەندە دیاریم دەکردن، لێشم دەپرسینو دەمگوت: ئێستا نیوەڕۆیە؟ شەوە یان ڕۆژە؟ پێیان نەدەگوتم، یەك دووجار دەیانبردم بۆ ژوورێك، لە درزێکەوە دەمزانی کە ئەوە ڕۆژە، لەدرزێکی دەرگاکەوە، بەڵام لەشوێنێکی کەبووین، نەمدەزانی شەوە یان ڕۆژ، بەڵام پێموایە کە جیاوازی نەبوو، بەشەوو ڕۆژ لێکۆڵینەوە لەگەڵم بەردەوام بوو، لەو نۆ ڕۆژەی یەکەم، دوایی بەزۆری بەڕۆژ بوو، یەك دووجار نەبێ شەو بوو، ئەویش وەکو فشارێکی دەروونی، بۆ ئەوەی خەوم لێ بزڕێنن، لەنیوەشەودا بانگیان دەکردم، دوایی دەچوومەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، بانگیان دەکردمەوە، بۆ ئەوەی بێخەوم بکەن، بەڕۆژیش هەر هەمبوو، یەك دوو ڕۆژێك وابوو، ئیدی دواتر هەر ڕۆژ بوو.

**+ بە شێوەیەکی گشتی، لێکۆڵینەوەکان چەندیان دەخایاند؟**

ـ هەریەکە بە لای کەمەوە سەعاتێکی دەخایاند، لای زۆری سەری دەکێشا بۆ سێ سەعات، بۆ چوار سەعات، ڕەنگە بۆ پێنج سەعاتیش، جاری وا هەبوو سێ سەعات، دوو سەعات، بەوشێوەیە، هیچ جارێ لە سەعات کەمتری پێنەچووە.

**+ ئەو دەزگایانە کامانەبوون لێکۆڵینەوەکانیان ئەنجام ئەدا؟ "ئێف بی ئای"، "سی ئای ئەی، هەواڵگریی سەربازی"؟ یان چ دەزگایەکی تر بوون؟**

ـ بەمنیان نەدەگوت چین، ئەوان خۆیان بەمن نەدەناساند، بەڵام دوایی لە هاوەڵە زیندانییەکانم دەمبیست، دەیانگوت کە هەموو جۆریان تێدایە، هەم، "ئێف بی ئای"یان تێدایە، هەم "سی ئای ئەی"یان تێدایەو هەم سەربازییەکانیان تێدان.

من نازانم چەند دەزگای لێکۆڵینەوەو تەحقیقیان هەیە، دەیانگوت کە هەموو جۆرەکانیان تێدایە، هەستیشم دەکرد یەکەم جارە بیانبینم، جار جاریش موحەقیقەکانیان دەگۆڕی، خۆشیان بەمن نەدەناساند، تا یەکێکیان بڵێ من لەفلان دەزگام، ئەو هاتووە لێکۆڵینەوە دەکاتو تەواو.

**+ جاری چەند کەس بوون؟**

ـ جاری وا هەبوو چوار کەس، جاری وا هەبوو سێ کەس، بەلای کەمەوە دوو کەس دەبوون، جگە لە وەرگێڕ، کە بۆ عەرەبی وەری دەگێڕا، ئەوان بە ئینگلیزی قسەی خۆیان دەکرد.

**+ بە عەرەبی تەحقیقتان لەگەڵ دەکرا؟**

ـ بەعەرەبی بوو، تەنها یەك دووجار موحەقیقەکان خۆیان عەرەبییان دەزانی، ئەمریکی بوون، بەڵام عەرەبییان دەزانی، ئەگەرنا، ئەوانی دی بە ئینگلیزی قسەیان دەکردو وەرگێڕەکە بۆ عەرەبی وەری دەگێڕا.

**+ تۆمەتەکان چیبوون کە ئاڕاستەتان دەکران؟**

ـ لەسەرەتاوە چوار تۆمەت بوون.

یەکەم" ئیحتیمالی ئەوەم بۆدانرابوو کە بەنیازبووین، وەکو کۆمەڵی ئیسلامی لەهێزەکانی هاوپەیمانان بدەین، ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی.

دووەم" ئەوە کە ئێمە پشتگیریی گرووپی ئەنصارمان کردبێ.

سێیەم" ئەوە کە ئێمە لەگەڵ ڕژێم پەیوەندیمان بووبێ.

چوارەم" لەگەڵ ئێران پەیوەندیمان بووبێ.

دوایی لە قۆناغەکانی کۆتایی لێکۆڵینەوەدا ئەوەی ئێرانیان لابرد، لەجیاتی ئەوە، وەکو لە دوانامە کە بۆمنیان ناردو منیش وەڵامم دانەوە، هاتووە، لەجێی پەیوەندیی لەگەڵ ئێران، ئەوە کە من ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامییم! ! یەکێ لەتۆمەتەکان ئەوەبوو کە ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامییم! !

**+ چۆن وەڵامی ئەو تۆمەتانەت دەدانەوە؟ بەنووسراو، بەدەمی؟ ئێمە لێرە بیستمان کە لەچەند ڕۆژی سەرەتادا چەند لاپەڕەیەکت وەڵام نووسیوە، ئەوە دەنگوباسێکی بڵاو بوو، ئەوە تا چەندێك ڕاستە؟**

ـ من نازانم، هاتوومەوەو باسی نووسینو شتی وام لای هیچ کەس نەکردووە، پێم شك نایەت، بیستم کە گوتراوە "فڵان کەس هەشتا لاپەڕە شتی نووسیوە"، شتی وام نەگوتووەو بەدەمیشمدا نەهاتووە، ئەوەندەشم نەنووسیوە، من دوو جار داوایان لێکردم کە دەبێ وەڵامەکانم بەنووسین بێت، ئەویش بەکورتی نووسیم، لەوانەیە (٤ ـ ٥ ) لاپەڕەیەك بووبێ، هەردوو وەڵامەکە ڕەنگە پێنج لاپەڕە، ئەوپەڕی شەش لاپەڕە بووبێ، من بەکورتیش وەڵامم دەدایەوە، باقی وەڵامەکانم هەمووی دەمی بوون، جا ئایا دوایی خۆیان تۆماریان دەکرد یان نا، من نازانم، بەڵام هەمووی دەمی بوو.

**+ پێمان خۆشە باسی وەڵامەکانمان بۆ بکەیت..**

ـ وەڵامەکان هەرچەندە لە نامەکەشمدا هاتوون.

**+ ئەوە بە پاشکۆ لەگەڵ ئەم کتێبە بڵاو دەکەینەوە.**

ـ خۆتان بڵاوی دەکەنەوە، ئەوە چوار تۆمەتە سەرەکییەکە بوون، ئەگینا ئەوان زۆر شتی دیکەیان دەپرسی، ئەو چوار تۆمەتە سەرەکییە لقو پۆپی زۆریان لێدەبووەوە، ئەگەر بڵێم هەزار پرسیارم لێکراوە، ڕەنگە زۆرم نەگوتبێ، دانیشتنەکانیش، لێکۆڵینەوەکان زۆر بوون، ئەگەر هەمووی بخرێتە سەریەك، ئەتوانم بڵێم هەشتا نەوەد سەعات، ڕەنگە زیاتریش بووبن.

لەسەرەتاوە پێمگوتن: ئێوە بە هەڵە منتان گرتووەو پەشیمانیش دەبنەوە. من ئەو کەسە نیم کەبۆ ئێوە باسکراوە، ئەوان بەوە زۆر تووڕە دەبوون، ئەوکاتە دیارە نارەحەتی‌و شتی تریشیان هەبوو، وتیان: "چۆن وا دەڵێی؟"، گوتم دوایی بۆتان دەردەکەوێت، ئێوە بەپێی ڕاپۆرتی درۆ حوکم لەسەر من دەدەن و، زانیاریی هەڵەتان پێگەیشتووە، چونکە من دژی ئەو ڕژێمە (بەعس) بووم، هەروەها ئێمە هیچ شتێکمان تا ئێستا لە دژی ئێوە ڕانەگەیاندووە، بەڵێ، من پێم ناخۆشە ئەمریکا عیراقی داگیر کردووە، بەداگیرکەریشیان دەزانم، خۆشتان خۆتان بەداگیرکەر ناوزەد کردووە، بەڵام هیچ شتێکی وامان نەکردووە کە پاساوی ئەوە بێت من بگیرێم. بەنیسبەت ئەو تۆمەتانە، من ئاوا وەڵامم دانەوە.

سەبارەت بە تۆمەتی یەکەم، کە"تۆ بەتەمابووی لە هێزەکانی هاوپەیمانان بدەیت"، وتم ئێوە چ بەڵگەیەکتان بەدەستەوە هەیە؟! ئەوان وتیان: "تۆ دەبێ ئیعتراف بکەیت، وتم ئاخر من تەحەدداتان دەکەم بەڵگەیەکتان پێ بێت، نووسینێ، شتێ، هیچ شتێکتان بەدەستەوە نییە، ناو دڵی منیشتان هەڵنەکۆڵیوە، جگە لەخوا، کەس نازانێ ناو دڵی من چی تێدایەو بەتەمای چیبووم، ئەمجا لەشەرعدا، لە قانووندا (قصاص قبل الجناية)، تۆڵەسەندنەوەی پێش تاوانکردن دروست نییە، کەسێ بەتەمابووبێ شتێ بکات، مادام نەیکردبێ تۆ ناتوانی حوکمی بەسەردا بدەی. جارێ بەتەمابوونەکەشی بەڵگەی دەوێ، چۆنتانزانی من بەتەمام؟ وتم ناکرێ‌و دروست نییە.

سەبارەت بە یارمەتی‌و پشتگیریی گرووپی ئەنصار، وتم بچن لەخەڵکی کوردستان بپرسن، لەیەکێتیی نیشتیمانی بپرسن، لە خەڵکی لایەنە سیاسییەکان بپرسن، ئێمە هەڵوێستمان ڕوون‌و ڕاشکاو بووە دەربارەی گرووپی ئەنصار، ئەسڵەن بوونەکەیانمان بەناشەرعی زانیوە، پێمان گوتوون: بوونتان هەڵەیە، پاساوو بەڵگەی بوونتان نییە، پاشانیش ئێمە بەیانمان لەسەر دەرکردوون، پاشان لەگەڵ یەکێتیی پەیماننامەمان هەبووە، ئەگەر ئێمە پشتگیریمان کردوون، یەکێتیی بۆچی مانگانە هاوکاریی کردووین بە دوو ملیۆن دیناری سویسری؟ بۆ کارئاسانی بۆکردووین؟ بۆچی لەگەڵماندا پەیوەندیی هەبووە؟ ئەوە ئەسڵ‌و ئەساسی نییەو درۆیە، بچن لەهەموو خەڵکی بپرسن،

بەڵکو ئێمە باجی دراوسێیەتیو نزیکیی ئەنصارمان داوە، کە بنکەو بارەگاکانمان لە نزیك ناوچەکەی ئەوانەوە بوون.

سەبارەت بە پەیوەندیی لەگەڵ ڕژێم، من هەر لە سەرەتاوە تەحەددام کردنو وتم: پێم سەیرە ئەو تۆمەتە دەگوترێ، وتم: کێ وای پێگوتن؟ کێ ئەو درۆیەی لەگەڵ کردوون؟ ئەوە صەددام خۆی لێرەیە، هەتا دوایین کەس کە لە ڕژێمەکەیدا بووە، لە سەرکردایەتیی سیاسییو ئیداریی، ئەگەر پەیوەندییم بووبێ، نابێ لەگەڵ یەکێ لەوان بووبێ؟! فەرموون بانگیان کەن، بیانهێننە بەرەو ڕوومان، لێیان بپرسن، کە من دڵنیاشم لێتان پرسیون، عەلی حەسەن مەجید وتی: "لێیان پرسیوم". عەبد حەممود وتی: "لێیان پرسیووم"، خەڵکی دیکەیان وتیان: "پرسیاری تۆیان لێکردووین، ئێمەش ئەوەی کە زانیومانە، وەڵاممان داوەتەوە، کە هیچ پەیوەندییو شتێکیان نەبووە، بەڵکو دژی ئێمە بوون". ئینجا وتم بیانهێننە بەرەو ڕووم، من تەحەدداتان دەکەم یەکێ بتوانێ بڵێ ڕۆژێك لەڕۆژان پەیوەندییەکمان هەبووە. بەڵێ، ئەوان خەڵکیان ناردووە، بەڵام ئێمە وەڵاممان نەداوەتەوە، زۆر داکۆکییان کردووە، بەڵام ئێمە وەڵاممان نەداونەتەوە.

سەبارەت بە پەیوەندیی لەگەڵ ئێران، گوتم: بەڵێ، ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ ئێران بووە، پەیوەندیی دیبلۆماسیو ئاسایی، وەکو هەموو لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی پەیوەندیمان هەبووە، بەڵام پەیوەندیی لایەنەکانی دیکە، بەتایبەتی برادەرانی پارتیو یەکێتیی لەهی ئێمە لەپێشتر بووە، توندو تۆڵترو گەورەترو بەرفراوانتریش بووە، ئەگەر پەیوەندیی سەلامو کەلام لەگەڵ ئێران ئەوەبێت، دەبێ ئێستا ئەو خەڵکەش بهێنن بۆ ئێرە، ئینجا ئێمە بەڵێ مەکتەبی پەیوەندیمان هەبووە لە تاران، بەڵام بۆ بەڕێکردن بووە، گەر هاموشۆیەکمان کردبێ، چونکە هیچ ڕێیەکی دیکەمان نەبووە هاموشۆی دەرەوە بکەین. وتم: بۆ نموونە، من ویستوومە عەمرە بکەم، یان حەج بکەم، دەبوایە لە ئێرانەوە بچین، چونکە لەڕێی ڕژێمەوە بوارمان نەبووە، هیچ دەروازەیەکی دیکەمان نەبووە جگە لە کۆماری ئیسلامیی ئێران، پەیوەندیمان لەگەڵ کۆماری ئیسلامیی پەیوەندییەکی ئاوا بووە، وەکو کۆماری ئیسلامییش، هاوکاری گەلانی عیراقی کردووە لە بەرانبەری ڕژێمدا. بەتایبەتی پێش ئەوەی ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٨٨ لەگەڵیان

ئیمزا بکەن، یارمەتی ئۆپۆزسیۆنی عیراقییان داوە. ئێمە نایشارینەوە، یارمەتی ئێمەشیان داوە، بەڵام کاتێك کە ئەو ڕێککەوتننامەیان ئیمزا کردووە، وتوویانە کاکە ئێمە هاوکارییتان ناکەین، لەبەر ئەوە کە ئێمە ڕێککەوتننامەمان ئیمزا کردووە. ئەگەر هاوکارییەکی ئێمەشیان کردبێ، کاتی خۆی وەکو بزووتنەوەی ئیسلامیی بووە، نەك وەکو کۆمەڵی ئیسلامیی، کۆمەڵی ئیسلامیی ئەوکاتە نەبووە. لەڕاستیدا پەیوەندی ئێمە زۆر کەمترو زۆر لە پاش خەڵکی دیکەوە بووە.

دەربارەی ئەوەی کە یەکێ لەتۆمەتەکان: "تۆ ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامییت"، وەك لەنامەکەشدا هاتووە، بۆم نووسین، ئەگەر ئەوە کەمن بەرپرسی لایەنێکی ئیسلامیی بم تاوان بێ، مانای ئەوەیە کاری ئیسلامیی لای ئێوە تاوانە، جا زەحمەت نەبێ ئەوەمان بە بەڵگەیەکی ئاشکرا، بە بڕیارێکی سیاسیی ئاشکرا پیشان بدەن، بڵێن کاری ئیسلامییمان لە جیهانی ئیسلامییدا قاچاغ کردووە، مسوڵمانان نابێ کاری ئیسلامیی بکەن، مسوڵمانان نابێ خۆیان ڕێك بخەن لە چوارچێوەی ڕێکخراوێکی سیاسیی ئیسلامییدا، با شتێکی ئاوا، بڕیارێکی ئاوا بێ، ئەوکاتە ئێمەش قسەیەکی لێدەکەین، بەڵام کە قەدەغە نەبێو قاچاغ نەبێ، پێم سەیرە، کە من ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی بم، خەڵکەکە منی هەڵبژاردووە، یان منی پێش خۆی خستووە، بۆ دەبێ ئەوە تاوان بێو منی لەسەر بگیرێم؟! بەڕاستی، دوای ئەوەی بۆ جاری دووەم ئەو تۆمەتانەیان دووبارە کردبووەوە، وەڵامم دانەوە، بەردیان لەسەر دانا، جارێکی دیکە دووبارەیان نەکردەوە، من کە داوای بەڵگەم لێدەکردن، یان بێوەڵام دەبوون، یان دەیانگوت: "بەیانی، یان دوایی بەڵگەکە دێنین"، دووبارە دەهاتنەوە، دەمگوت کوا بەڵگە؟! تەماشایەکی یەکتریان دەکرد، یان دەیانگوت: "دەستمان نەکەوتووە" یان دەیانگوت: "دوایی بۆت دێنین"، ئیدی تاکو ئێستا هیچ بەڵگەیەکیان پیشانی من نەدا، چونکە نەبوو، جا کە نەبێ، چۆنی پیشانی منی بدەن؟

**+ لە پێش زیندانییکردنت، خۆت ئاگاداربوویت کە ڕۆژنامەی "هەواڵ" شتێکی هەڵبەستراوی بڵاو کردەوە، کە گوایا ئێوە پەیوەندییتان لەگەڵ ڕژێمی بەعس هەبووە. پاشان ئەوکاتەی لە زیندان بوویت، ڕۆژنامەی "ئاسۆ"ش شتێکی هەر لەو بابەتە بڵاوکردەوە. هەرچەندە لە کاتی خۆیدا وەڵامی ئەوانە**

**دراوەتـەوە، ئایـا هـیچ یەکـێك لەوانـە نەکـرانە سـەنەدێك بـۆ ئـەو تـۆمەتانەو ڕووبەڕووی ئێوە بکرێتەوەو ڕۆژنامەکان بەکار بهێنن؟**

- وا پێدەچێت ئـەو قسانەی ئـەو جـۆرە ڕۆژنامانـە لەکوردستاندا دەیکـەن، لەنێو هەنـدێ خەڵکی فەقیرحاڵ ڕەواجیان هەبێ، بەڵام موخابەراتی ئەمریکی کە دەزانن شتی بەڵگـەدار چـییەو شـتی بێبەڵگە چییە، ڕەنگە پێیان عەیب بێت ئەو شتانە بهێننە بەرەو ڕووی مـن، نەخێـر، ئـەو شـتانەیان بـاس نەکرد، ئەوشـتانەیان بـە بەڵگـە نەهێـنایەوە، چونکە ئەوانە بەڵگە نین.

**+ تـۆمەتەکان لەهەمـوو لێکۆڵیـنەوەکاندا هـەمان پرسـیارو هـەمان ئـەو تۆمەتانە بوون، دووبارە ئەکرانەوە؟ یان بۆ نموونە، ئەم لێکۆڵینەوەیە کە تۆ بـۆت سـەلماندن ئەمـەیان بێبـناغەیە، ئایـا دووبارەیـان دەکـردەوە لـە لێکۆڵینەوەیەکی تردا؟**

- بـەڵێ، زۆریـان دووبـارە دەکردەوە، هـەتا مـن ڕۆژێك تووڕە بووم، موحەقیقەکان بـەین بـەین دەگۆڕان، لەوانەیـە (٣٠ - ٤٠) موحەقـیق تەحقیقـی لەگـەڵ من کردبێ، ئەو وەجبەیە دەچـوون، وەجبەیەکـی تـر دەهـاتن، وەجبەیەکی دی دەڕۆشتن، یەکێکی کە دەهـاتن، بـەڵام بـەزۆری ئەمریکـی بـوون، ئەوانـی تـر بەریتانـی بـوون، یـەك دوانیشیان ئوسترالی بوون.

مـن ڕۆژێـك تـووڕە بـووم، وتم: وەڵامی ئەو پرسیارانە نادەمەوە، وتیان: بۆچی؟ وتم بـڕۆن ئەوانـی پێشـتر بخوێـنـنەوە، نووسـیوتانەو هەمـوو وەڵامەکانـی تـێدایە، یەکێکیان وتـی: "نـا، تـۆ دەبـێ وەڵامـان بدەیتەوە"، وتم: من ئەوەی کە پێشتر گوتوومە، هەر ئـەوە دەڵـێمەوە، یـەك قسەیە. جارێکی کە لەگەڵ یەکێکیان دانیشتم، وتی: "بۆ بەیانی هەنـدێ پرسـیاری گـرنگمان هەیـە، دەبـێ وەڵامـان بدەیتەوە، خۆتی بۆ ئامادە بکە"، منـیش پـێمگوتن گـرفت نیـیە، ئـێوە پرسـیارەکان دووبارە بکەنەوە، منیش وەڵامەکان دووبـارە دەکەمـەوە !! هـەر هەمـووی هـەر دووبارەیـە، وتم: مـن تا ئێستا هیچ شتێکی نـوێم نەبینیوە، هەریەك پرسیارە، بەڵام بەشێوەیەکی دیکە دەیکەن، هەرهەمان ئاستی هەیـە. بـەڵێ، زۆریـان دووبـارە کـردنەوە، مـن پێشـێ وامدەزانـی موخابەراتی ئەمریکی لێکۆڵیـنەوەیان زۆر شـتی قـوڵو گـرنگو زۆر خـاوەن زانـیاری بـن، بـەڵام زۆر سـادەم

دەهاتنە بەرچاو، جار هەبوو موحەقیقێك دەهات، دەمگوت بابە، ئەو قەزیەیەی تۆ لە ئەلف و بێوە لەبارەیەوە دەپرسیت، ئێمە لەگەڵ ئەوانی دیکە گەیاندوومانە تە کۆتایی، بچۆ بیخوێنەوە، ئەوان ئاگاداری شتی یەکتر نەبوون، هەیانبوو دەیگوت: "من یەکەمجارە ئەو زانیارییانە بزانم"، وتم ئاخر تۆ نازانی من پێشتر چیم گوتووە، باشە ئێوە ئاگاتان لە یەکتر نییە؟ من هێندێ شتم دەهاتنە بەرچاو، پێم سەیر بوون، هەڵبەتە هۆی سەرەکیشی ئەوەبوو ئەوانە هەمووی بە گرێبەست دەهاتن، شەش مانگ شەش مانگ، یان بۆ چەند مانگێك بە گرێبەست دەهاتن، وەکو بڵێی بەکرێیان دەگرتن، ئەوەی کە دەهات لێکۆڵینەوەی لەگەڵ من دەکردو دەیگەیاندە ئەنجامێك، دوایی یەکێکی دیکە دەهات، دەبوو لە سفرەوە دەست پێ بکاتەوە، یان یەکێکیان بەنیوە چڵ بەجێی دەهێشت، چونکە کاتەکەی تەواو بووە، بەڵام ئیشەکەی لەگەڵ من تەواو نەبوو، کاتی تەواو بووەو دەڕۆشتەوە، ئیشەکەی بەنیوەچڵی بەجێ دەهێشت، لەو بارەیەوە بێسەروبەریەکی زۆرم دەبینی.

**+ با بێینەوە سەر کەسایەتییەکان، ئەو کەسانەی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ تۆ دەکرد، لە چ ئاستێکدا بوون؟ پیاو بوون یان ئافرەت؟ ڕوتبەو مەکانەتیان چی بوو لەناو دەزگاکانی خۆیاندا؟**

- نازانم ڕوتبەو مەکانەتیان چی بوو، بەڵام جارێکیان یەکێك لێکۆڵینەوەی لەگەڵ من کردو گوتی: "من لێکۆڵینەوەم لەگەڵ عەلی حەسەن مەجیدو تەها یاسین و تاریق عەزیزدا کردووە"، لام وابێ ناوی مستەر پۆڵ بوو، پیاوێك بوو تەمەنیشی هەبوو. جار جار ئافرەتیشیان تێدا هەبوو، لەسەرەتاوە، دوایی ئافرەتیان نەهێنا بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵ من، بەس لەسەرەتاوە چوار پێنج جار ئافرەتێکیان لەگەڵ دەهات، هەریەکی پرسیارێکیان ئاڕاستە دەکردم.

**+ لەو لێکۆڵینەوانەدا کە لەگەڵت دەکران، ئایا تۆمەتەکان تەنها ئاڕاستەی خۆت و ڕۆڵی خۆت دەکران، یان لەسەر بەرپرس و کەسایەتییەکانی تری ناو کۆمەڵی ئیسلامییش لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دەکرا؟ بۆ نموونە، هاوکات لەگەڵ دەستگیرکرانی ئێوەدا، هێزەکانی ئەمریکا بەدوای کاك دڵشاد کەلاریدا**

**دەگەڕان‌و تۆمەتی هاوکاریی ئەنصاریان دابوویە پاڵی، ئایا لەو بارەیەوە هیچ پرسیاریان لێ نەکردن؟**

ـ دەیانپرسی، دەربارەی زۆر لە ئەندامانی سەرکردایەتیی کۆمەڵی ئیسلامییان لەمن دەپرسی، زیاتر پرسیارەکانیان دەربارەی خۆم بوو، بەڵام دەربارەی ئەوانیش دەیانپرسی، دەربارەی جەنابی مامۆستا شێخ موحەممەد بەرزنجی دەیانپرسی، دەربارەی برایانی مەکتەبی سیاسیی دەیانپرسی، مامۆستا نازم عەبدوڵڵا لەرۆژانی سەرەتا، نازانم شتێکی گوتبوو، لێدوانێکی دابوو..

**+ بۆ کەناڵی جەزیرە بوو.**

ـ بەڵێ، وتیان: "ئەوە جێگرتە؟"، وتم نا، من جێگرم نییە، وتیان: "ئەوە چییە؟"، وتم ئەندامێکی مەکتەبی سیاسییە. دەربارەی مامۆستا ناصح مەلا صالح دەیانپرسی، دەربارەی حاجی دڵشاد دەیانپرسی، دەربارەی ئەو برایانەی دیکە دەیانپرسی، لەبارەی هەندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی پرسیاریان دەکرد، دەمگوت ئەوە ئەندامی مەکتەبی سیاسییە، ئەوە سەرکردایەتییە، ئەوە ئیشێتی، چۆن بوون وام باسدەکردن، ڕێک‌و ڕاست.

**+ لێرە دۆسیەی کاک دڵشاد کەلاری زۆر گەورە کرا، ئەوە لای ئێوە هیچ ڕەنگدانەوەی نەبوو، کە بەتایبەت تەوەرەیەکی بۆ تەرخان بکەن؟**

ـ با، لەهەموویان زیاتر دەربارەی حاجی دڵشاد کەلاری پرسیاریان لە من دەکرد، بەس من زۆر بە ڕاشکاوانە پێم دەگوتن کە کاک دڵشاد ئەندامی مەکتەبی سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامییە. یەکێکە وەکو ئەو برایانەی تر، یەکێ لەبرا نزیکەکانە لەمن، هەر شتێکی کردووە، بەفەرمانی من کردوویەتی، من بەرپرسم، هەرشتێکتان لەو بارەیەوە هەیە، لە منی بپرسن.

وەك خۆتان ئاگادارن، مامۆستا داراو مامۆستا تۆفیق‌و کاك حاجی عەبدوڕڕەحمان ئەحمەدیشم لەگەڵ گیران، لە برایانی سەرکردایەتی، هەر لەسەرەتاوە گوتم ئەو برایانە بەردەن، پێشمەرگەکانیش بەردەن، دیارە ئێوە منتان ویستووە، منیش ئەوە هاتووم، من بەرپرسی کۆمەڵی ئیسلامییم، هەر پرسیارێکتان هەیە لەمنی بکەن، پێمخۆشە زوو

ڕزگاریان بکەنو بەریان دەن، با لەپەنای مندا تووشی ناڕەحەتی نەبن، هەرواشم دەزانی، زوو بەربوون ئەوان، تا دوایی نامەیەکم دوای یانزە مانگ لە ئیبراهیمی برام بۆ هات کە "من بەردەبم، منیش کۆتا نەفەرم"، ئەوجا من زانیم ئەو برایانە تا ئەوکاتە ماونەوە.

جا دەربارەی حاجی دڵشاد، وتم بەڵێ، تا من لەوێ بووم، هیچ ئیشێکی بێ فەرمانو ئاگاداریی ئێمە نەکردووە، قەناعەتیشم وایپێیەتی کە منیش لێرەم، هیچ شتێك ناکات کە پێچەوانەی سیاسەتو بەرنامەی کۆمەڵی ئیسلامیی بێت، هەرشتێك لەبارەی ئەوەوە بۆتان هاتووە، خەڵکی قینلەدڵ نووسیویەتی، خەڵکێك کە غەرەزی شەخسی بەکار هێناوە، حاجی دڵشاد پیاوێکی ئازابووەو پیاوێکی زیرەکە، لەمنیشەوە نزیکبووە، وەکو باقی برایان کە لەمنەوە نزیکبوون، خەڵکێك ئەگەر ڕقی لێی بێت، لەبەر ئەوە بووە کە دڵسۆزبووە بۆ کۆمەڵی ئیسلامیی، یان ئەگەر شەڕو ڕووبەڕووبوونەوە بووبێ، پیاوێکی ئازا بووە، غەرەزی شەخسیو ئەوانەیان لێی هەیە، ئەگەرنا، هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەوانی دیکە.

**+ ئەو باسانەی لەوێ لەسەر کاك دڵشاد ئەیانوروژاند، چیبوون؟**

- زیاتر قەزیەی ئەمنیی خۆیان، کە "ئەو زانیارییەمان هەیە کە یارمەتیی گرووپی ئەنصارولئیسلامی داوە"، یاخود "زانیاریمان هەیە کە بەتەمابووە لەهێزەکانی ئێمە بدات"، لەوبارەیەوە زیاتر،" ئایا پیاوێکی توندوتیژە؟ ئایا توندڕەو نییە؟". وتم نەخێر وانییە، ئێمە قاعیدەمان وایە" لەشوێنێکدا شەرع پێمان بڵێ توند بن، هەموومان توند دەبین، ئەگەر بڵێ نەرم بن، نەرم دەبین، ئێمە شەرعڕەوین، ئەوە نییە بڕیارمان دابێ هەر توندبین، یان بڕیارمان دابێ هەر نەرم بین، ئەویش یەکێکە وەکو ئێمە.

دەربارەی ئەنصار، وتم بەپێچەوانەوە، ئەسڵەن ئەو ئەوەندە گلەیی لە ئەنصار هەبوو زۆر لەگەڵیان تێکدەگیرا، ئەو زۆرکاری لەسەر ئەوە کرد کە ئەنصار هەر بتوێنێتەوەو بێنە نێو کۆمەڵی ئیسلامیی، بەڵام لەو هەوڵەیدا ئەویشو ئێمەش نەمانتوانی سەرکەوتوو بین، چونکە ئەوانە لەگەڵ ئێمە نەدەگونجان، ئەو ڕۆڵیشی بینی لەوەی ژمارەیەك لە ئەنصار بێنێتە نێو کۆمەڵی ئیسلامییەوە، زیاتر لە دووسەد کەس،

مەرج نییە ئەو لەوەدا بەتەنیا بوو بێت، بەڵام ئەو یەکێك بوو لە وانەی لەوەدا ڕۆڵیان بینی.

**+ ئایا وەڵامەکانی تۆ وایکرد ئەمریکییەکان بگەنە ئەوقەناعەتەی کاك دڵشاد بێتاوانە؟**

ـ من پێموابوو گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتە، چونکە دوایی دووبارەیان نەکردەوە، وتم بشپرسن، ئەوەی من پێتان دەڵێم هەمووی بەڵگەمان هەیە، بەڵام خۆ من ئێستا هیچم لەلا نییە، وتم بشپرسن لەخەڵك کە ئایا وایە یان نا؟ وتم خەڵکێك هەیە کە ڕەنگە گومانی پێبردبێ، بەڵام گومان جیایەو شتی بەڵگەدار جیایە، من ئەوەی دەیڵێم هەمووی بەڵگەدارە، کە کاك دڵشاد چووە لەگەڵ ئەنصار دانیشتووە، تاکو بیانهێنێ بۆ نێو کۆمەڵی ئیسلامیی، ئامۆژگاریی کردوون، بەبێ ئاگاداریی من هیچ شتێکی نەکردووە، گوێبیستیی‌و گوێڕایەڵیی هەبووە بۆ سەرکردایەتی خۆی، ئەوانە هەمووی شتی بەڵگەدارن، بەڵام ئەوانەی بۆی دەگوترێن، لەسەری گوتراون، هەمووی تۆمەتن‌و گومانن.

**+ ئەوەی جەنابت وتت لەدوایین لێکۆڵینەوەدا بەمنیان وتووە کە "داوای لێبوردن دەکەین، تۆ بێتاوانی"، ئایا خۆیان لە کەناڵەکانی خۆیانەوە گەیشتنە ئەو بڕوایەی بێتاوانیت، یان وەڵامەکان کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەبووە لەسەریان کە بگەنە ئەو قەناعەتەی تۆ بێتاوانیت‌و هیچ شتێکت لەسەر نییە؟**

ـ لەوانەیە هەموو شتەکان کاریگەریی خۆیان بووبێ، هەم وەڵامەکانی من، کە هەمووی وەڵامی ڕاست‌و ڕاشکاوو بێ پێچ‌و پەنا بوون: چەند مەڵبەندتان هەیە، ئەوەندە مەڵبەندمان هەیە، چەند ئەندام سەرکردایەتین؟ ئەوانەی چەکتان پێیە؟ بەڵێ چەکمان هەبووە، چەند پێشمەرگەتان هەبووە؟ نزیکەی ئەوەندەمان هەبووە، دوایی چییان لێهات؟ دوایی پێشمەرگەمان ئیزندایە ماڵەوە، لەبەرئەوەی ڕژێم ڕووخاو ئێمە کەوتینە کەش‌و هەوایەکی ئازادەوە، ئەگەر شەڕمان پێنەفرۆشن‌و یەخەمان پێنەگرن، بۆچی باری شانی خۆمان بەچەکەوە گران کەین، زۆر بەڕوون‌و ڕاشکاوی من وەڵامم دەدانەوە، بەڵام خەڵکی دیکەش کە تەکلیفیان کردووە، ڕێپێوان کە کراوە، ڕۆڵی خۆی

هەبووە، بەقەناعەتی من ڕێپێوانەکان ڕۆڵی کاریگەریان هەبووە، ئیمزاکۆکردنەوە، مامۆستایان، عەشائیر، خەڵکی سیاسیی، لایەنە سیاسییەکانو دۆستو نزیك لەدەرەوەی کوردستانو لەناوەوەی کوردستان، پێموایە هەریەکەو بەپێی خۆی کاریگەریی و ڕۆڵی بووە، پاشانیش واقیعی کۆمەڵی ئیسلامیی، کە بەشداربوون لە هەڵبژاردنو دەرکەوت کە پێگەی جەماوەریی خۆی هەیە، ئەوەش بێگومان ڕۆڵو دەوری گرنگی بووە.

**+ ماوەیەك دوای دەستگیرکرانی ئێوە، مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیزیش دەستگیرکرا، ئایا لەو بارەیەوە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کردن؟**

ـ ئەو ڕۆژە کە مامۆستا مەلا عەلی-یان گرت، یەکسەر لێکۆڵەرە ئەمریکییەکە وتی: "بۆ ئاگاداریيشت، ئەمڕۆ مەلا عەلی عەبدولعەزیزمان گرتووە"، دیارە من ڕاچڵەکیمو گرژ بووم، پێم ناخۆشبوو، وتی: "دەڵێی پێت ناخۆشە؟"، وتم هەر زۆریشم پێناخۆشە، وتی: "بۆ؟ خۆ ئێوە لەنێو خۆدا ناکۆکیتان هەبووە"، وتم جا ناکۆکیمان هەبووە، لەنێو خۆماندا ناکۆکیمان هەبووە، بەڵام ناکۆکیمان لەنێو خۆماندا لەسەر شێوەی کاری ئیسلامیی، وام لێناکات کە پێمخۆش بێت ئەو بکەوێتە بەردەستی ئێوە، مسوڵمانێك بکەوێتە بەردەستی کافران، وتم هەرنەبێ ئەو چوار ڕۆژ ڕابەرمان بووە، ئینجا مامۆستا بەتەمەنەو ڕیشی سپییە، پاشان ئەو مامەڵەیەی لەگەڵ منتاندا کردووە، ئەو بەتەمەنەو تەحەمولی شتی وا ناکات، بەڵێ زۆرم پێ ناخۆشە.

**+ لێرە پڕوپاگەندە وابلاو بوو کە لەسەر زانیاریی ئێوە مامۆستا مەلا عەلی دەستگیر کراوە؟**

- زانیاریی من؟!!

**+ بەڵێ، ئەمە تا چەندێك ڕاستە؟**

ـ وەڵڵا هیچ ئەسڵو ئەساسێکی نییە، پرسییان کە کاتی خۆی چۆن بووە، لەگەڵ بزووتنەوە بوون، بزووتنەوەی یەکبوون، ئێوە چۆن بوو کۆمەڵی ئیسلامییتان ڕاگەیاند؟ بۆم باس کردوون، کەئێمە کۆنگرەیەکمان بەست، دوایی مامۆستا مەلا عەلیو ئەوانەی کە لەگەڵی بوون، بەئەنجامی کۆنگرەوە پابەند نەبوون، خۆمان ناچار بینی،

دوای ئـەوەی نـۆ مـانگ چـاوەڕوانیمان کـردو خەڵکـێك کەوتـنە بەیـنمان، نەمانتوانـی چیدیکە ئـارام بگرین، بۆ ئـەوەی خەڵکەکـەمان دڵسـارد نـەبێ، کۆمەڵـی ئیسلامییمان ڕاگەیانـد، وەکـو درێژەپـێدەری سـەروەرییەکانی بـزووتنەوەی یەکبوونـی ئیسـلامی، بەمافی خۆشمان زانی، چونکە لە نزیکەی سی ئەندامی هەڵبژێردراوی نێو کۆنگرە، (٢٥ ـ ٢٦) یان لەگەڵ ئێمە بوون، زۆربەی هەرەزۆری کادێرەکان، ئەندامان، پێشمەرگەکان، بارەگاکـان لەگـەڵ ئـێمە بـوون، شـەرعییەتی ئـەوەمان هەبـوو، ئـێمە هەرخـۆمان بزووتنەوەی یەکبوونـی ئیسـلامین‌و ناوەکـەمان گۆڕی، مامۆستاش لەبەرئەوەی پابەند نەبوو، سڕیمانەوە. مـن ئاوا وەڵامم دانەوە، جا ئەگەر ئەمریکا شتێکی لەسەر مامۆستا مـەلا عـەلی هەبووایە، بە (١٠ ـ ١٥) ڕۆژ بەرنەدەبوو، ئیتر نازانم خەڵکیتر پێیان گوتوون یـان خـۆیان قەناعەتـیان وابووە بیگرن، من وەکو دوایی مامۆستا مەلا عەلی–شم بینی، دەرکـەوت ئـەو بـەو شـێوەی ئێمەش نەبووە، ئەزیەتیان نەداوە، وتی ئەزیەتیان نەدام، زووش ڕزگاری بووە (سوپاس بۆ خوا).

ئـەمما ئـەوە لەشـەهامەتی مـن ناوەشـێتەوە، نـەك قسـە لەسـەر مامۆستا مەلا عەلی بکـەم، مـن کـە دەربـارەی خەڵکـی دیکـە شـت نەڵـێم، لـە سـەرکردایەتیی سیاسـیی پرسـیاریان لێکـردووم، شـتی ئەوانیشـم لابووە، بـەڵام وتـوومە پێتان ناڵێم، وتیان "بۆ پـێمان ناڵێـی؟"، وتم بەبێشـەهامەتیی دەزانم کـە کابـرا قسـەیەکی بەئەمانـەت لای مـن کـردووە، یـان نهێنییەکی لای من هەیەو بیدرکێنم، ئەوە ئەمانەتێکە، پێتان ناڵێم، مەرج نییە زەرەریشـی بۆ ئـێوە هەبێت، زۆریشیان پێ سەیر بوو، وتیان: "دەنا خەڵك هەیە قسـەی لەسـەر تـۆ کـردووە، ڕاپۆرتـی لەسەر تۆ داوەو قسەی لەسەر تۆ کردووە". وتم کەیفـی خـۆیانە، هەرکـەس بـە عەقڵـی خـۆی بـەڕێگادا دەڕوات، مـن دینم ڕێم نادات کە شتێك بڵـێم زەرەری بـۆ خـەڵك هەبێت، دەربارەی خۆم چ دەپرسن بپرسن، بۆ خەڵکی تر، بچن خۆتان لێیان بپرسن.

**+ کاتـێ پرسـیارو تـۆمەتەکانت ئاڕاسـتە دەکـرا، هەسـتت بەچـی دەکـرد؟ بەواتایەکی تر، کێت بەسەرچاوەی ئەو زانیارییانە دەزانی؟**

ـ هەسـتم دەکرد خەڵکێك لەنـێو کوردسـتاندا هاوکاریـی کـردوون، ئەوانیش ڕەنگە نـاوی هەنـدێ کەسـیان بـردبێ، بـەڵام مـن بـە ئەمریکییەکانیشـم دەگوت: ئێوەش ناوی

خەڵك بێنن، ناوی لایەنێکی سیاسیی، یان هەندێ خەڵك لە لایەنێکی سیاسییدا، من هەر لە خۆتانی دەزانم، ئێوە گرتووتانم، هەر ئێوەم بینیوەو هیچ کەس بە تەرەفی خۆم نازانم، ئەگەرنا، من وام هەست دەکرد ئەو زانیارییانە هی خۆیان نەبوون، خەڵکی تر ئەو زانیارییانەی دابوونێ.

**+ بە شێوەیەکی دیاریکراو، هەرچەندە لە سەرەتاوە کەمێك ئاماژەت پێدا، بەڵام دوایین لێکۆڵینەوە کە لەگەڵتدا کردیان، لەگەڵ کاتی ئازادبوونت چەندیان بەین بوو؟**

- دوایین لێکۆڵینەوە دوای شەش مانگ لە دەستگیرگرانم بوو، واتە ساڵێكو چوار مانگ بەر لە هاتنەوەم ئەوان وتیان هیچ شتێکمان لەسەر تۆ نییە، سەبارەت بە دوایین لێکۆڵینەوەش ئەگەر هەندێکیتان بۆ بگێڕمەوە، خراپ نییە:

دوو موحەقیقی بەریتانی بوون، هاتنو وتیان: "ئەمڕۆ هەندێ پرسیاری گرنگمان هەیە لەگەڵ تۆ، دەمانەوێ لاپەڕەیەکی نوێت لەگەڵ هەڵبدەینەوە، بۆمان دەرکەوتووە تۆ پیاوێکی گرنگیت، سەرڕاستیت، مەبدەئییت، هەندێ پرسیارمان هەیە، پێمانخۆشە ڕێكو ڕاست وەڵاممان بدەیتەوە". وتم فەرموون. ئەوە ئەو موحەقیقە بوو کە گوتم وتوویەتی من لێکۆڵینەوەم لەگەڵ تەها یاسینو عەلی حەسەن مەجیدو تاریق عەزیزو ئەوانی دیکە کردووە، وتم فەرموون، پرسیاری زۆر کرد، نزیکەی سێ سەعاتێك پێکەوە دانیشتین، ئەوەی کە مەبەستم بێت باسی بکەم" وەرەقەیەکی پێبوو، خەتێکی کێشا، خەتێکی بەناو وەرقەکەدا کێشا، لێرەی نووسی سوننە، وتی "ئەوە سوننەیە، ئەوە شیعەیە"، وتم بەڵێ، ئەوە من هەر تەماشای دەکەم تابزانم دەیەوێت بگاتە کوێ، گوتی: "ڕێکخراوی قاعیدە سوننەیە یان شیعەیە؟"، وتم ئەهلی سوننەیە، ئەوی لەوێ نووسی، وتی: "ئەی حزبی دەعوە؟"، وتم ئەوانیش شیعەن، وتی: "باشە، ئەی تۆ سوننەیت یان شیعەیت؟"، وتم من موسڵمانم، وتی: "ئاخر دەزانم مسوڵمانیت"، وتم: موسڵمانم، بەڵام لەسەر ئەهلی سوننە حیسابم، مەبەستت چییە؟ وتی: "مەبەستم ئەوەیە ڕێکخراوی قاعیدە ئەهلی سوننەیە، حزبی دەعوەش شیعەیە، کەواتە تۆ لە قاعیدە نزیکتری تا لە حزبی دەعوە، وانییە؟"، وتم جا تۆ دەتەوێ بەو شێوەیە کە خۆت پێت خۆشە وەڵام بدەمەوە، یان ئەو شێوەیەی کە خۆم قەناعەتم پێیەتی؟ وتی:

"نـا، بەوشێوەیەی کـە خـۆت قەناعـەتت پێیەتـی"، دەی وتم ئـەو وەرەقەیـە لابـەرەو قەڵەمەکەشـم بدەرێ، وتـی: "بۆچی؟"، وتم تۆ بمدەرێ، تامن خۆمت پـێ بناسێنم، وتم: ناتـەوێ مـن بناسـیت؟ وتـی: "بـا"، وتم ئـەوە ئیسـلامە (مەبەسـت لـە خەتـی سـەر کاغەزەکەیـە)، وتـی: "بـەڵێ"، وتم پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو خەتەیە، کە خوای گەورە بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: کـە بڵـێ (.. وَأَنَـاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ) (الأنعام : ١٦٣ )، من یەکەمینـی مسـوڵمانانم، پێغەمبەری ئێمە ﷺ یەکەمین ئیماندارو مسوڵمانەو لەسەرووی خەتەکەیە، وتم: ئەوە خەتی ئیسلامە، من بەو خەتەدا دەڕۆم.

سـوننەی لەسـەر بـێ، شـیعەی لەسـەر بـێ، هەرکەسێك لەسەر ئەم خەتە بڕواتو بە دوای پێغەمـبەر ﷺ بکـەوێ، لەگـەڵ مـندایە، منیش لەگەڵ ئەودام، من مسوڵمانم پێش ئـەوەی باسـی سوننیایەتیو شیعایەتیی بکەم، شوێنکەوتووی پێغەمبەرم ﷺ، ئەوەش (صِرَاطٍ مُّسْتَقِيم)ە، موسـڵمان ئـەو کەسەیە بە دوای پێغەمبەری ﷺ بکەوێ، بە دوای قورئانو سوننەت بکەوێ.

گوتـی: "باشـە، بـا سـیغەی پرسـیارەکەم بگۆڕم"، وتم: بەڵێ، وتی: "تۆ دەربارەی قاعیدە هەڵوێستت چییە؟"، گوتم: دە تۆ بڵێ هەر لەوە دەگەڕایت، لە سەرەتاوە ئەو خـەتو مەتـەت کێشـا، گوتـی: "بـەڵێ، مەبەسـتم ئەوەبوو"، وتم بەپێـی شـەریعەتی ئیسلام، خوای پەروەردگار فەرموویەتی (وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ..) (الإسراء: ٣٦)، شتێك کـە زانیاریـت دەربارەی نییە، بە شوێنی مەکەوە، قسە دەربارەی مەکە، گوتم: جـا لەبـەر ئـەوەی هـیچ زانیارییەکم دەربارەی قاعیدە نییە، داوایەکت لێدەکەم، گوتی: "بـەڵێ". گـوتم: ڕێکخسـتنی ڕێکخـراوی قاعیدەم بۆ بێنەو لێرە داینێ، منیش لێیان دەپرسـم، کۆمەڵێك پرسـیاریان لـێدەکەم، لەبـەر ڕۆشـنایی وەڵامەکانـی ئەوانـدا دەڵێم هەڵوێستم بەرانبـەر بـە قاعیدە ئاوایە، ئەگەرنا، پێچەوانەی شەرعەو پێچەوانەی عەقڵو مەنتیقیشـە کـە مـن هەڵوێسـت لەکەسێك وەربگرم کـە نایناسـم، گوتـی: "یانـی نایـان ناسیت؟"، گـوتم: نەخێر، جگـە لـەوەی لـە تەلەفزیۆن ئەگـەر هەندێ قسەم بیستبێ، ئـەویش نـازانم چـەندی ڕاسـتە، چـەندی هـی خـۆیانەو چـەندی وانییـە، لـە نـزیکەوە نایانناسـم، لەگەڵیان تـێکەڵ نیم، چۆن حوکمیان بەسـەردا بدەم، گوتم ئایـا ڕەوایە

بەکەسێك بڵێم چاکیت یان خراپیت بێئەوەی بیناسم؟ گوتی: "نەخێر"، دە گوتم جا تۆ وەڵامی منیشت دایەوە.

پاشان گوتی: "باشە، بیگوازینەوە بۆ تەوەرەیەکی دی"، گوتم فەرموون، گوتی: "هەڵوێستت دەربارەی تیرۆر چییە؟"، گوتم: پێناسەی تیرۆرم بۆ بکە، گوتی: "تیرۆر ئەوەی کە ئێستا باوە"، گوتم: ئاخر دەزانم ئەو باوە چییە، بۆم پێناسە بکە، گوتی: "یانی نازانی؟"، گوتم: جا پێمخۆشە لە تۆی ببیستم، داخۆ لە زیهنی تۆدا تیرۆر چییە؟ گوتی: "تیرۆر ئەوەیە کە خەڵك دەکوژرێ بە ناهەق‌و دەتەقێنرێتەوە"، گوتم: من کوشتنی بە ناهەقم پێ ناڕەوایە، ئەمریکا بیکات، مسوڵمانێك بیکات، کافرێك بیکات، هەرکەسێك خەڵك بەناحەق بکوژێت، پێم ناڕەوایە، بەڵام مەبەست لە کوشتنی ناڕەوا چییە؟ دەبێ ئەو شتانە ورد بکرێنەوە، دوایی بۆم باسکرد، گوتم: جا با من پێناسەی تیرۆر بکەم.

وتم: وشەی تیرۆر وشەیەکی فەرەنسییە، لەدوای شۆڕشی فەرەنسییەوە، ئەوانەی شۆڕشەکەیان بەرپا کرد لەدژی پادشا، هەر کەسێك لەگەڵ شۆڕشدا نەبوایە، بە نەیاری شۆڕشیان دانابایە، بە تیرۆریستیان لە قەڵەم دەدا، بە سزای شۆڕشیان دەگەیاند، ئامێرێکیان هەبوو، بە عەرەبی (مقصلة)ی پێ دەڵێن، نەیارەکەیان دەخستە ناو ئەو مەقسەڵەیەوە، پلاکێکی هەبوو دەستیان پیادا دەنا، دادەبەزی‌و سەری لە لاشەی جیادەکردەوە. وتم جا ئەوە یەکەمین کەس کە ئەو زاراوەیەی داهێنا (ڕۆبسپیر) بوو، کە زۆر توندوتیژ بوو لەگەڵ نەیارەکانی خۆیدا. وتم کەواتە ئەو وشەیە، ئەو زاراوەیە زاراوەیەکی فەرەنسییە، ڕۆژئاواییەو هیچ پەیوەندییەکی بە جیهانی ئیسلامییەوە نییە، نێوەڕۆکەکەشی ئەوەیە کە تۆ بیروباوەڕی خۆت، فیکرەی خۆت لەسەر تەرەفێك فەرز کەیت، بە پەنابردن بە زەبرو زەنگو ترساندن‌و تۆقاندن. وتم: ئەوە لە ئیسلامدا نییە، ئەوە هی خۆتانە، ڕۆنی خۆتانەو لە ئێمەی دەدەن، هیچ پەیوەندیی بەئێمەوە نییە.

ئەو باسی ئوسوڵییەتی کرد، وتی: "باشە، جەنابت وەکو ئیسلامییەکی ئوسوڵی"، وتم: ئەوە تۆمەتێکە تۆ دەیدەیتە پاڵ من، وتی: "بۆ؟"، وتم: من ئوسوڵی نیم، من ئیسلامیم‌و مسوڵمانم، وتی: "بۆ ئوسوڵی چییە؟"، وتم: ئوسوڵی هەرهی خۆتانە، ئوسوڵی بزووتنەوەیەکی نەصرانی بوو، کاتی خۆی لە ئەورووپاو لە ئەمریکاش هەبوو،

ئێستاش دەیانەوێت خەڵك بگێڕنەوە بۆ تەعالیمی کەنیسە، کە لەگەڵ ژیانو لەگەڵ عەقڵو مەنتیقدا ناگونجێ، هەرکەسێك دژایەتییان بکات، خوێنی بەحەلاڵ دەزانن، خۆیان زۆر بە سەرسەخت دەبینن لە پابەندیی بە تەعالیمی کەنیسەوە، کە بەلای ئێمەوە دینێکی خورافییە، ئەوەیە ئەسڵی ئوسوڵگەرایی کە "فەندەمێنتالیزم"ی پێدەڵێن، لە ئەوروپا سەری هەڵدا، بزووتنەوەیەکی ڕۆژئاوایی ئەوروپییە، هیچ پەیوەندییەکی بە جیهانی ئیسلامییەوە نییە. ئێمە ئوسوڵی نین، ئێمە ئیسلامیین، ئەوەش دیسان هی خۆتانە، ئنجا هاتە سەر باسی عەلمانییەت، باسی دیموکراسییەت.

وتی: "باشە، هەڵوێستت دەربارەی دیموکراسی چییە؟"، وتم دیموکراسی سیستمێکی حوکمە، چاکی نێو خراپانە، لەچاو دیکتاتۆرییەت، دیموکراسی خراپەی کەمترە، بەلام کە بەراوردی دەکەین لەگەڵ ئیسلامدا، ئاسمانو ڕێسمانی فەرقە، وتی: "چۆن؟"، وتم: وێنەیەکت بۆ دێنمەوە، ئایا لەپەرلەمانەکانی ئەوروپا، ئێستا لەژێر سایەی سیستمی دیموکراسیدا ڕەوا نییە بەقانون پیاو لەپیاو مارەکەن؟ وتی: "با"، گوتم: ئەوە یەکێکە لە بەرهەمەکانی دیموکراسی، کە پەرلەمان هەرشتێکی بڕیاردا، هەرشتێ خەڵك ویستی، نوێنەرایەتی خەڵك کە لە پەرلەماندا بەرجەستەن، هەر شتێکیان ویست، هەر شتێکیان پێ چاك بوو دەیکەنە قانوون، وتم: ئێمە شوورامان هەیە، هەرچەندە هێندێ خەڵکی ئیسلامیی وا دەزانن شوورا هاوواتای دیموکراسییە، بەلام شوورا لە ئیسلامدا وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُم) (الشورى: ٣٨)، مسوڵمانان بۆیان هەیە ڕاوێژ بکەن لە هەر کاروبارێك کە دەقێکی قورئانو سوننەتی لەسەر نەبێت، بەلام بۆیان نییە شیرازەکانی شەریعەت بپچڕێنن، لە ئیسلامدا دزی حەرامە، کوشتنی بەناحەق حەرامە، ستەم حەرامە، داگیرکردنی خاکی میللەتان حەرامە، ئەو قەدەغانە نابێ بشکێنرێن، لەو بوارەدا کە فەراغو بۆشاییە، لە چوارچێوەی دەقە شەرعییەکاندا دەبێت ڕاوێژو ئیجتیهاد بکرێ.

وتم: کەواتە ئێمە شوورامان هەیە، ئێوە دیموکراسیتان هەیە، شوورای ئێمە وابەستەیە بەشەریعەتەوە، کە خوا (جلّ شأنه) پایەکانی دیاریی کردووە، بەلام دیموکراسییەتی ئێوە ڕەهایە، بەدوای ئارەزووی خەڵك دەکەوێت.

لەو بابەتانە زۆر قسەمان کرد، زۆر شت باسکرا، باسی مێژووی ئەوروپا، کەچۆن لە شەڕی کاسۆلیكو پرۆتستانت چەند ملیۆن کەس لە بەیندا کوژران، باسی دادگاکانی پشکنین کە چەند خەڵکیان سووتاندو چەند خەڵکیان لەقەنارە داوە، لەبەرئەوەی کە بوونەتە مسوڵمان، یان لەبەرئەوەی بڕوایان بە تەعالیمی کڵێسا نەماوە.

کۆتا قسەی ئەو کابرایە ئەوە بوو کە وتی: "بەڕاستی من هەڵوێستم زۆر گۆڕا بەرانبەر خەڵکی ئیسلامیی، وادیارە شارەزایی ئەوروپاو ئەفکاری غەیری خۆشتان هەن"، وتم: ئەی چۆنت تەسەور کردووە؟ وتی: "وامزانی هەر قورئان دەخوێنن"، وتم نا، ئێمە غەیری قورئانیش دەخوێنین، چونکە قورئان حەقی موتڵەقی تێدایە، بەڵام تۆ دەبێ لە باتڵیش تێ بگەیت، ئێمە هەر بە حەقی خۆمان ئاشنا نین، بە باتڵی ئێوەش ئاشناین. وتی: "باشە پرسیارێکی کۆمەڵایەتی"، وتم: بەڵێ، وتی: "بیستوومە تۆ دوو خێزانت هەبووە، کاتی خۆی"، وتم: بەڵێ، وتی: "جا ئەوە چۆن عەدالەتە؟"، من پێم سەیربوو لەوێوە بازیدا بۆ ئەوێ! وتی: "ئەوە هەرچەندە ڕەنگە شتێکی شەخسی بێت"، وتم: نا، گرفت نییە، وەڵامەکەی ئاسانە، لە شەریعەتی ئیسلامییدا ڕەوایە پیاوێك بە حەڵاڵی چوار خێزانی هەبێت، تا چوار ئافرەت، بەڵام ناڕەوایە کە زینا بکات لەگەڵ سەدان ئافرەتدا، واتە لە شەریعەتی ئیسلامییدا وا باشترە پیاو چوار خێزانی حەڵاڵی هەبێت، نەك سەدی حەرام، کە دوایی منداڵەکانی نەزانن بابیان کێیە؟! تۆزێ سووربووەوە، وتی: "وەڵڵا من یەك خێزانم هەیە، لەگەڵ غەیری خێزانیشم هیچم نەکردووە"، وتم: کەیفی خۆتە، من باسی بارودۆخی ئەوروپا دەکەم، ناڵێم ئەتۆ هیچت کردووە یان هیچت نەکردووە، وتی: "ئاخر ئاینی مەسیحی دەڵێ دەبێ تەنها یەك خێزانت هەبێت"، وتم دەزانم، ئاخر ئەوەی لێکەوتووەتەوە کە دەبینیت. یەکێکی حەڵاڵیان هەیەو سەدی حەرامیشیان هەیە، بەڵام لە ئیسلامدا تا چواری حەڵاڵ بۆتان هەیە، بەڵام نابێ توخنی حەرام بکەویت، جا من دووی حەڵاڵم هەبوون، هیچ پێشم شەرم نییە، پێمواپێ ئەوەش زۆر چاکترە بۆ پیاویشو بۆ ئافرەتیشو بۆ خێزانو بۆ کۆمەڵگەو بۆ دونیاو بۆ قیامەتیش.

**+ ئەوە دیارە مێزی تەحقیقەکان بووەتە مێزی گفتوگۆی فیکری؟**

ـ بەڵێ، ئەو خۆی وای گوت، وتی: "بەڕاستی پێم خۆشە زۆر گفتوگۆی فیکریی‌و سیاسییت لەگەڵ بکەم، بۆ ئەوەی لێت تێ بگەم، ئێوە بڕواتان بەرانبەر ژیان‌و دەربارەی سیاسەت‌و دەربارەی فیکرو دەربارەی ئەخلاق‌و ئەوانە چییە".

دوای ئەوەی پرسیارەکانی تەواو کرد، جارێکی کەش هەر بینیمەوە وتی: "من پێم خۆشە وتووێژت لەگەڵدا بکەم، مەبیە باری لێکۆڵینەوەوە، من لێبوومەوە، ئێستا بۆم دەرکەوت کە تۆ پیاوێکی بەری‌و ئەو شتانەی بۆت دروست کراون، ڕاست نین، بەڵام من دەمەوێ بەڕاستی لێت تێ بگەم‌و لەڕێی تۆشەوە لە ئیسلامییەکانیش حاڵی بم، زۆر لەو شتانەی تۆ بۆ منی دەڵێی، شتی تازەو نوێن‌و نەمزانیوە خەڵکی ئیسلامیی ئاوا کراوەن‌و شتی خەڵکی تریش دەخوێننەوە". جا بۆم باسکردو وتم لە زینداندا تەورات‌و ئینجیلم هەموویان خوێندووەتەوە، کە نزیکەی سێ هەزار لاپەڕەیە، پێشتریش کتێبی زۆرم لەسەر ئەورووپاو لەسەر ئەو فکرانە خوێندووەتەوە، کتێبم هەیە لەسەر عەلمانییەت‌و لەسەر دیموکراسییەت‌و لەسەر عەولەمەو لەسەر مەسەلەی تیرۆرو مافی مرۆڤ و ئەو مەسەلە فیکرییانە کە هەن، ئێمە لە فیکری خەڵکی دیکەش شارەزاین.

**+ ئەم گفتوگۆیە کە تاڕاددەیەك چێژێکی باشی هەبووە بۆ هەردوولا، ئایا دووبارە بۆتەوە لەوانەی پێشووتردا، یان هەر لە ئەو لێکۆڵینەوەیەدا هەبوو؟**

ـ نەخێر، لەسەرەتاوە من بەلای مەسائیلی فیکرو سیاسیی‌و ئەوانەدا نەدەچووم، تەنها پرسیاری دیاریکراوو وەڵامی دیاریکراویان دەویست، بەڵام دوایی تاڕاددەیەك بۆیان دەرکەوت کە وەڵامەکانم هەمووی هەریەك وەڵام بوون‌و دووبارەم دەکردنەوە، ئەگەر شتێکی فەرعییان پرسیبا، تەوزیحاتی زیاترم دەدا.

وتم ئێوە دەپرسن کۆمەڵی ئیسلامیی چۆنە؟ بۆم وەسفکردن، دەربارەی ئەنصار هەڵوێستتان چییە؟ بۆم باس دەکردن، دەربارەی ڕژێم، بۆم باس دەکردن، "بە تەمای چیت لە ئایندەی کوردستانی عیراقدا؟" دەموت بەتەمای ئەوەم قەوارەیەکی ئیسلامیی پێك بهێنم، وەکو خوای کاربەجێ فەرمانی کردووە، خوای پەروەردگار فەرمانی کردووە دەبێ مسوڵمانان ئاینی خۆیان لە وڵاتی خۆیاندا پیادە بکەن، ئەوە بەرنامەو ئەوە ئامانجمانە، لێم نەدەشاردنەوە، وتی: "تۆ سووریت لەسەر حکومەتێکی ئیسلامیی لە کوردستان؟" وتم بەڵێ، وتی: "ئاخر ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی تۆ

بهێڵنەوە، چونکە مانای وایە تۆ بڕوات بەچیو چی هەیە..". وتم: وەڵڵا دەبێتە هۆی هێشتنەوەم یان نابێتە هۆی هێشتنەوەم، من ئەو شتانەم نووسیوەو وتوومەو لێشیان پەشیمان نیم، چونکە دینی خوا بۆ فەرمانڕەوایی هاتووە، جا ئێوە چی حیساب دەکەن حیسابی کەن، کەیفی خۆتانە، من ئەوە مەبدەئمەو ئاینمە، بۆ ئەوەش هەوڵ دەدەم، هەر لایەنێکی سیاسیش، ئیسلامیی یان غەیری ئیسلامیی بۆ ئەوە هەوڵ دەدات کە دەسەڵات بەدەستەوە بگرێ، بەڵام دەسەڵاتەکە نەك بەدەستی شەخسی خۆمانەوە بیگرین، بەڵکو دەسەڵات بەدەستەوە بگرین بۆ ئەوەی شەریعەتی خوای پەروەردگاری پێ پیادە بکەین.

لە سەرەتاوە پرسیارەکانیان زیاتر موخابەراتیو تەحقیقی بوون، بەڵام دوایی ئاڕاستەیەکی سیاسیو فیکریی زیاتریان وەردەگرت.

**+ بێگومان لای ڕۆژئاواییەکان بەتایبەتیش خەڵکی ئەمریکا، وێنەی مسوڵمانانو مێژووی ئیسلامیی شێواوە، ئەم گفتوگۆیەی جەنابت تا چەندێك وایکرد کۆمەڵێك پەردە لەسەر ڕووی ئەوان لابچێت سەبارەت بە ئیسلام، مێژووی مسوڵمانان؟ تا چەندێك کاریگەریی لەسەر قەناعەتی ئەوان دروستکرد بەرانبەر مسوڵمانان؟**

- بەڵێ، من نامەوێ هێندێ تەعبیر بەکار بهێنم، چونکە دەچێتە قاڵبی جۆرێك لە باسی خۆکردن، ئەگەرنا، من وام هەست دەکرد کە هەندێ لە لێکۆڵەرەوەکان زۆر دەکەوتنە ژێر کاریگەرییم، هێندێ وشەی سەرسوڕمانو شتی وایان دەردەبڕی، هەستم دەکرد زۆر دەکەونە ژێر کاریگەرییم، بۆ نموونە" یەکێکیان وتی: "من بڕیارمداوە کە لەمەودوا دیراسەی ئیسلام بکەم".

من زۆر شتم باسدەکرد، ئێستا لێرە هەمووی باس ناکرێ، یەکێکیان پرسیو وتی: "باشە ئێوە بڕواتان وایە قەوارەی ئیسلامیی چۆن دروست دەکرێت؟"، وتم پێغەمبەری ئێمە ﷺ دەوڵەتی ئیسلامیی دروست کرد، بێئەوەی یەك دڵۆپە خوێن بڕژێ، خەڵکی بانگکرد، خەڵکی ڕۆشنکردەوە، خەڵکی هیدایەتدا، خەڵکی تێگەیاند لەو پەیامەی خۆی، پاشان ئەو خەڵکە هاتن پەیمانیان پێدا، لەبەیعەی عەقەبەی یەکەمو دووەم، نوێنەرانی خەڵکی مەدینە (کە ئەوکاتە یەسریبی پێ دەوترا) لە ئەوسو خەزرەج

پێکدەهاتن‌و هاتن پەیمانیان بە پێغەمبەر ﷺدا، بە سەرۆکی ئەو قەوارە سیاسییەی خۆیانیان قەبوڵ کرد، ئەوجا پێغەمبەر ﷺ چوو جاڕی دەوڵەتی ئیسلامیی دا، گوتم: من قەناعەتم وایە کە دەوڵەتی ئیسلامیی لەسەر شانی کۆمەڵگەیەکی ئیسلامیی، دوای بڕینی قۆناغی بانگەوازو پەروەردەو پێگەیاندن‌و هۆشیارکردنەوەی خەڵك دێت. گوتم: پێغەمبەرانیش هەموویان وایان کردووە (علیهم الصلاة والسلام)، هیچ پێغەمبەرێك نەبووە لە خۆیەوە تەقە لە خەڵك بکات، بانگی کردوون، خەڵك هەبووە تەقەی کردووە لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، بەڵام هیچ پێغەمبەرێکم نەبینیوە تەقەی لە خەڵك کردبێ.

دوای ئەوەی کە ئەو قەوارەیە دادەمەزرێ، دەبێ دیفاعی لێ بکرێ، دەبێ پەیامی خوا بگەیەندرێ بە خەڵکی تر، بەربەستەکان لابچن، بەڵام قەوارەی ئیسلامیی لەسەر بناغەی بانگەوازو ڕاگەیاندنی خەڵك‌و قەناعەت پێکردنیان بنیات دەنرێ.

جا ئەوشتانەم کە ڕوون دەکردنەوەو بەدووروودرێژی ئایەت‌و فەرموودەم بۆ دەخوێندنەوە، زۆرجار دەیانویست لە تەفسیری ئایەت‌و فەرموودەکانیش تێ بگەن، بە وەرگێڕەکەیان دەگوت بۆمان دووبارە بکەرەوە، هەستم دەکرد گۆڕانیان بەسەردا دێ، بەڵام کابرا هاتووە لێکۆڵینەوەم لەگەڵ بکات، خۆ ناڵێ ئەوە من مسوڵمان بووم، یان هاتووم مسوڵمان بم، ئەگەرنا، پێموایە زۆریان دەکەوتنە ژێر کاریگەریی. پێموایە زۆریشیان بیروبۆچوونیان زۆر دەگۆڕا.

سەبارەت بە تەوژمی ئیسلامیی‌و ڕەوتی ئیسلامیی، من زۆریش تەئکیدم دەکردەوە کە ئێوە بەیەك چاو تەماشای هەموو ئەهلی ئیسلام دەکەن، مەچن قیاسی هەموو مسوڵمانان لەسەر دوو سێ هەڵسوکەوت بکەن، هەرکەسەو وەکو خۆی بیناسن، هەر ڕەوت‌و تەوژمێك وەکو خۆی بناسن.

**+ ئەی لە بەرانبەردا ئەوان تا چەندێك تێڕوانینی قوڵیان هەبوو؟ کە تۆ دەکەوتیتە گفتوگۆ لەگەڵیان سەبارەت بە مێژووی ئەورووپا، سەبارەت بەمێژووی مسوڵمانان، گفتوگۆکە یەك لایەنە بوو یان ئەوانیش بەشدارییان دەکرد؟**

ـ ئەوانیش بەشدارییان دەکرد، بەڵام بڕوام پێ بکە، هەستم دەکرد لە شتەکانی خۆشیان باش شارەزا نەبوون، من کە پێناسەی تیرۆرم بۆ دەکردن، کەباسی فەندەمێنتالیزمم بۆ دەکردن و وتم: هی ئێوەیە، یەکێکیان وتی: "من تائێستا وامزانیوە زاراوەیەکی عەرەبییە"، وتم نەوەڵڵا، تەرجەمەی فەندەمێنتالیزمم کردو وتم هی خۆتانە، هیچ پەیوەندییەکی بەزمانی عەرەبیو زمانەکانی دیکەی جیهانی ئیسلامییەوە نییە، هی ئێوەیە وەرمان گێڕاوە، عەلمانییەت هیچ پەیوەندییەکی بە جیهانی ئیسلامییەوە نییە، سیکۆلاریزمەو وەرگێڕدراوە.

دەربارەی ئیسلامیش هەستم نەدەکرد شارەزاییان هەبێ، بەڵی هێندێکیان هەندێ شتیان بیستووە، بەڵام هەستم نەدەکرد شارەزاییان لە ئیسلام هەبێ.

**+ ئێمە تەوەرەی تایبەتمان سەبارەت بە سزاو ئەشکەنجەکان هەیە، بەڵام ئایا لێکۆڵینەوەکان زەبروزەنگیان لەگەڵ بوو؟**

ـ لە سەرەتاوە بەڵێ.. لە نۆ ڕۆژی یەکەم بەڵێ، لە قۆناغی دووەمیش، پێش چل ڕۆژەکە، یەک دوو ڕۆژ شتێك هەبوو کەمتر لەوەی نۆ ڕۆژەکە، ئەگەرنا، دوایی نەخێر، فشاری دەروونییان بەکار دەهێنا، هەڕەشەیان دەکرد، دوایی دەیانگوت: "دەتبەین بۆ گوانتانامۆ، ماڵو منداڵەکەت دێنین لێرە زیندانییان دەکەین، تۆ جارێکی دیکە چاوت بەدونیا ناکەوێتەوە، کۆمەڵی ئیسلامیی نابینیتەوە"، ئەوەیان زۆر دووبارە دەکردەوە، دەیانگوت: "تۆ خۆت بەقوربانی شتێك دەکەیت کە تازە نەماوە، بۆ هەموو شتێکمان پێ ناڵێی؟ هەموو شتێکمان پێ بڵێ، تازە کۆمەڵی ئیسلامیی نەماوە، بەتەما مەبە کۆمەڵی ئیسلامیی ببینیتەوە". وتم ئەوەی هەبێ پێم وتوون، کۆمەڵی ئیسلامییش ئەگەر خوا بیەوێت دەیبینینەوەو گوانتانامۆ یان هەر شوێنێکی تر هەیە، چی خوا ویستی کردبێ، ئێمە پێی ڕازین. ئێوەش ناتوانن هیچ شتێك بکەن غەیری ئەوەی خوای گەورە بڕیاری دابێت، ئەوانەم دووبارە دەکردەوە، جار جار دەیانگوت: "وا پێدەچێت زۆر بڕوات بەخوا هەبێت، زۆری تێ ڕادەبینی"، گوتم: ئەرێ وەڵڵا زۆری تێ ڕادەبینم، چونکە خوا هەموو شتێکی بەدەستە، خۆ ئێوەش بەحساب خوا دەناسن، دەیانگوت: "بەڵێ، ئێمەش دەیناسین، بەڵام بەقەد تۆ ئاوا باسی ناکەین، پێمان وانییە تەداخول ئەوەندە بکات لە ژیانی مرۆڤدا، ئەو ئێستا چی پەیوەندی بەتۆوە هەیە؟". وتم: نا،

زۆر زۆریـش، چونکه مـن بەنـدەی ئـەوم، خـوای بـە بەزەیـی دەفەرمـوێت: مـن دۆستی ئیماندارانمو پشـتیوانیانم. بـەڵێ، مـن هاتـووم بۆ ئێرە، بەڵام ئەمە ڕەنگە خێرێکی منی تـێدا بێت، لەوانەیـە مـن لـە ڕووی ئیمانییەوە گەشـەی پـێ بکـەم، جـار جـار ئەو شتە ڕوحییانەشـم بـاس دەکـرد، دەیانگـوت: "ئـێمە بیسـتوومانە تـۆ "کتێبـی پـیرۆزت" خوێنـدووەتەوە، (ئـەوان "عەهـدی قـەدیمو عەهـدی جەدیـد"ی پـێ دەڵـێن) چـی تـیا دەبینـی؟ وتم: هێندێکـی تـێدا هەیـە کـە وەکـو خـوا فەرموویەتـی، ماوەتـەوە، بـەڵام زۆریشـی خـورافاتو ئەفسـانەیە، ئـەو خـورافاتو ئەفسـانەیەش وای لـە ئـێوە کـردووە ڕێگـەی سـیکۆلاریزم (لادینـی) بگـرنە بـەر، چـونکە دینـی خورافـی خـەڵك لێـی هەڵدەگەڕێتەوە، بـەڵام هەرچۆن بێت، هێندێ شـوێنەوارو بۆنـی وەحی خواشی پێوە مـاوە، مـن سـوودم لـە هێندێ شتی وەرگرتووە، کـە لەقورئاندا بە پوختی باسکراوەو لەوێدا بەدرێژتـر هەیـە، بـەڵام خورافاتـی زۆری تێدایە، هەر قورئانیش تەرازووی هەموو مەسـەلەکانە. جـا مەبەسـتم ئەوەیـە، ئەوان جار جار فشاری دەروونییان بەکار دەهێنا، لە قۆناغەکانی دوای لێکۆڵینەوەدا، هەڕەشەو گوڕەشەیان دەکرد.

هەنـدێ سووکایەتیی سووکەڵەشیان دەکرد، من لەسەر کورسی دانیشتبووم، کابرای لێکۆڵینـەوەکەی دەکـرد، دەیگـوت: "دەبـێ لەسـەر زەوی دابنیشـی"، باشـە.. لەسـەر زەوی دادەنیشـتم، دووسـەعاتو سـێ سـەعات، ئـەوە خـۆی لەسـەر کورسـییەکە دانیشـتووەو دەیگـوت تـۆ دەبـێ تەماشـام بکـەیت! باشـە تەماشـام دەکـرد، بەینـێك دەیگـوت نابـێ چـاوت وەرگێـڕیت، وتم باشـە فەرمـوو، دوایـی دەیگـوت بـۆ چـاوت ناتـرووکێنی، واتـە ئازایت؟ دەمگوت باشـە تـۆ چیت دەوێـت؟ چاوت لـێ بکەم، چاوت لێنەکەم، واتـە هەنـدێ شتی منـاڵانە، پاشـان ڕۆژێـك پـێمگوت: ئـەو شـتانە لەگەڵ من مەکـە، وتـی: "بۆچـی؟"، وتم: خـۆ مـن پـیاوم، منـداڵ نـیم، ئـنجا ئەگـەر لەسەر زەوی دامنێـیتو سووکایەتیی بکەیت، ئەوا سووکایەتیی بەخۆت دەکەیت، وتم: من لێرە دیلم، دەسـەڵاتم نـیـیە، کـەیفت لێبێ ڕێزم لێبگریت، ڕێز لەخۆت دەگریت، کەیفت لێبێ بێڕێزیم بەرانبـەر بکـەیت، ئەوە دیارە بێڕێزییەکە هی خۆتە.

ئـیدی لـەو جـارەوە بـڕێ هەڵوەسـتەی کردو وتـی: "نا مەبەسـتمان بێڕێزیی نەبووە، بـەڵام مەبەسـتمان ئەوەبـووە ڕاستمان لەگەڵ بڵێی"، وتم من لەسـەر کورسی یان لەسـەر

زەوی بم یەك قسەیە، لە قەبریشدا بم هەر یەك قسەیە، سەری خۆتان بەمنەوە مەیەشێنن، من لە ئەوەڵەوە پێمگوتوون، زۆرتان ئەشکەنجە داوم، نەتان بیستووە؟ لێکۆڵینەوەکانی پێشێتان نەخوێندووەتەوە؟! من گوتم هەر یەك قسەیە، زەوی‌و کورسی‌و ئەو شتانە کار لە قسەی من ناکەن.

**+ دەزگای هەواڵگریی ئەمریکاو هەموو کەناڵەکانیان، چ سی ئای ئەی، چ هەواڵگریی سەربازی، چ ئەوانی تریان کە سەر بە ئەنجومەنی پیران‌و ئەوانەن، ئەزموونێکی شکستخواردوویان هەبوو سەبارەت بە جەنگی عیراق، ئێستا ڕۆژانە دانی پێدا ئەنێن، کە لەسەر زانیاریی هەڵبەستراوو هەڵە زۆر کاریان کردووەو عیراقیان داگیرکردووە، لیژنەشیان دروست کردووە بۆ پێداچوونەوەو دیاریکردنی کەموکوڕییەکانی ئەو دەزگا هەواڵگرییانە. بەڵام لەسەر ئاستی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەگەڵ تۆ دەکران، چۆن ئەو ئەزموونە هەڵدەسنگێنی؟ بەواتایەکی تر، تا چەندێك ئەوان وردبین بوون لە گواستنەوەی زانیارییەکان‌و تۆمەتەکاندا؟**

ـ ئەوان کە هەموو جارێ پرسیارەکانیان لە من دەکرد، وا پێدەچوو لە ئەمریکاوە بەچاپکراوی بۆیان دەهات، واتە بەئینگلیزی‌و بە چاپکراوی لە بەردەمیاندا بوو، لەوێوە پرسیارەکانیان بۆ دیاری دەکران، جاری وا هەبوو هەندێکیان دەسەڵاتی ئەوەیان نەبوو لەدەرەوەی چوارچێوەی ئەو پرسیارە دیاریکراوانە پرسیاری دیکە بکەن، هەبوو پرسیارەکانی تەواو دەبوو دەیگوت: "ئەوە من پرسیارم تەواو بووە، ئەگەر تۆ قسەیەکت هەیە"، دەمگوت نا، من قسەم نییەو لەسەر قسەی ئێوە هاتووم، جاری واش هەبوو جیا لەو پرسیارانە، بەدەر لەو پرسیارانە، پرسیاری دیکەشیان دەکرد، بەڵام هەستم دەکرد هەموو شتێکیان دەنووسی، هەستم دەکرد ئەگەر لە شتێك باش حاڵی نەبووبان، لە وەرگێڕانەکەی، پێیان دووبارە دەکردەوە، هەستم دەکرد کە دەیانویست وردبن، بەڵام بەڕاستی لەقەدەر ئەوەی باسی ئەمریکا دەکریٚ‌و باسی موخابەراتی‌و ئەو هەموو ملیاران دۆلارەی بۆی خەرج دەکریٚ‌و ئەوانە، هەستم دەکرد زانیارییان دەربارەی زۆر شت زۆر کەمە، بۆ وێنە" لەویٚ ئەو هاوزیندانیانەی لەگەڵمدا بوون، تەحقیقاتیان زۆر لەگەڵدا کردن، دەربارەی چەکی کۆکوژو بایۆلۆژی‌و ئەوانە،

هیچیان دەست نەکەوت، دەی هەموو قەناعەتیشیان وابوو کە بەعس هەیەتی، لەسەر بناغەی ئەوەیش شەڕیان لەگەڵ ڕژێم کرد. جا مانای وایە ئەو دەزگا موخابەراتییە زەبەلاحەی ئەمریکا هەڵخەڵەتێنراوە، ئەوانەی زانیارییان پێداون، دیارە زانیارییەکانیان بێئەساس بوون، چونکە هیچیان دەست نەکەوت لەوێ، من لەوێ ئەوانەم دەبینی، دەیانگوت لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کردووین، هیچیان دەستگیر نەبووە، هەندێکیان زۆر ناڕەحەت کردبوون‌و ئەشکەنجەیان دابوون، لە سەرانی بەعس، ئەوانەیان کە هەستیان کردبێ زانیارییان لایە، بەڵام هیچیان هەر دەست نەکەوت، بۆ خۆشیان دوایی ڕایانگەیاندبوو، کە هێندێ لەهاوزیندانییەکان بۆمنیان باس دەکرد، دەیانگوت: "پێیان گوتووین ئێستا بۆمان دەرکەوتووە فیعلەن کە کاتی خۆی ڕژێم وتوویەتی هیچمان لانییە، ئێستا بۆمان دەرکەوتووە کە ڕاست دەکات". جا گوتم: ئەوەیە کە پاش باران کەپەنەکە، بۆیان دەرکەوتووە کە ڕاست دەکات، ئەگەر ڕژێم ڕاستی کردبێ، مانای وایە موخابەراتی ئەمریکی درۆی کردووە، بە هەڵەدا چووە.

**+ لەو ژوورەی یەکەمجار تەحقیقیان لەگەڵ کردیت، کەچاویان کردیتەوە، لە دەوروبەرت چیت بینی؟**

- من هەر خەڵکی سەربازییم نەبینی لەوێ، تەنها خەڵکی مەدەنیم دەبینی، دیارە موخابەرات‌و ئەمن‌و ئەوانەبوون، ئەمریکی بوون‌و وەرگێڕی عەرەبییان لەگەڵدا بوون، یان هەندێکیان ئەمریکی بوون‌و عەرەبییان دەزانی، من هەر ئەوانم بینی.

**+ ژووری تەحقیق چی تێدابوو؟ مێزی تێدابوو؟**

- لێی نەبوو، دوایی مێزیان هێنا، کورسییەکیان هێنا، من بە تەنیا لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کردم.

**+ سەرەتا مێزو کورسی لێ نەبوو؟**

- نا، هێندێ جار مێزو کورسی نەبوون، هێندی جار هەر لەو شوێنەی منیان لێ ئەزیەت دەدا، هەر دەبوو لەوێ دابنیشی‌و پرسیاری خۆیان دەکرد، ئەو دەڕۆشت، دوایی ئەشکەنجە دووبارە دەبوویەوە.

**+ قەت بووە لە کاتی تەحقیقدا وتارەکانت یا کتێبێکت بە بەڵگە لەسەر بهێننەوە؟**

ـ نەخێر، بەس جارێك گوتیان: "تۆ قسەت بە ئەمریکا گوتووە لە وتاردا"، گوتم بەڵێ، گوتم باسی جۆرج بوش-م کردووە، شوبهاندوومە بەفیرعەون، وتم ئەوەم گوتووەو ئێستاش دەیڵێم، چونکە جۆرج بوش نەیگوتووە هەرکەس لەگەڵمان نەبێت دژمانە؟! ئینجا ئەوە واتای بناغەی ئیرهابو تیرۆرو تۆقاندنو خۆفەرزکردنو خەڵك داپڵۆسینە، تۆ ئەوەی لەگەڵت نەبێ دژت بێت، مانای وایە هەرچی لەگەڵت نەبێ ئیعلانی شەڕت لەدژی کردووە، بەواتایەکی تر، ئەوەی ئەمریکی نەبێ‌و سەر بە ئەمریکا نەبێ‌و تەسلیمی ئیرادەی ئەمریکا نەبێت، ئێوە بەدوژمنی دەزانن، ئێ مەعنای وایە دونیا دەبێتە دووبەرە، ئەمریکاو هەموو دوونیا، ئەوەی تەسلیمی ئەمریکا نابێ، ئەمریکاو ئەوانەی کە تەسلیمی بوونو ئەوەی کە تەسلیمی ئەمریکا نابێ، وتم جا فیرعەونیش کاتی خۆی وای دەگوت: (مَا أُرِيكُمْ إِلَّا مَا أَرَى وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ الرَّشَادِ) (غافر: ٢٩). واتە: من تەنیا بۆچوونی خۆمتان پێدەڵێم، ئەوەش کە من دەیڵێم هەمووی ڕاستە، وتم هەرکەسێك حەقی لەسەر خۆ تاپۆ کردو حەقی بۆ خۆی پاوان کرد، ئەوە بەرانبەرەکەی ڕەفز دەکات.

ئینجا وتی: "جا خۆ ئەوە مەشهوورە کە ئیسلام وادەکات"، وتم: ئەوە ئەسڵو ئەساسی نییە، ئیسلامیی دەڵێن (وإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَى هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ) (سبأ: ٢٤)، واتە: ئێمە یان ئێوە لەسەر هیدایەت یان لەسەر گومڕایین لەمەسەلە فیکریو ڕەئییەکاندا، وتم: ئیسلام دەڵێ ئەوەی کە خوا فەرموویەتی، ئەوە حەقی موتڵەقە، بەڵام هیچ مسوڵمانێ ناڵێ بۆچوونی منو ڕەئی منو فیکرەی من حەقی موتڵەقی تێدایە، مانای وایە تۆش ڕەنگە بیپێکی، ڕەنگە من بیپێکم، وەرە با لێی بکۆڵینەوە (قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ) (النمل: ٦٤). واتە: بڵێ بەڵگەتان بێنن ئەگەر ڕاست دەکەن. (تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ) (آل عمران: ٦٤). واتە: وەرن بۆ شتێ کە تێیدا هاوبەشین.

**+ ئایا دەقی قسەکانیان دەزانی؟ ئایا لەبەریان بوو یان لایان بوو؟**

ـ مەفهومەکەیان گوت، گوتیان تۆ باسی ئەوەت کردووە کە تۆ ئەمریکا بە داگیرکەر دەزانی، وتارت داوە کەپێمان ناخۆشە ئەمریکا عێراق داگیر بکات. وتم من پێم ناخۆشە ئەمریکا عێراق داگیر بکات، نەك لەبەر ئەوەی ڕژێم نەڕووخێ، ڕژێم با بڕووخێو بە نیعمەتی خوایی دەزانین کە ئەو ڕژێمەمان لەکۆڵ بۆتەوە، بەڵام پێم ناخۆش بووە ئەمریکا داگیری بکات، چونکە ئێرە وڵاتی مسوڵمانانە، دەبوایە بۆ خۆمان کێشەی خۆمان چارە بکەین، دەبوایە ئەمریکا یارمەتیمان بدات، نەك بێت عێراق داگیر بکات، خۆشی بەداگیرکەر ناوزەدکات، دەبوو هاوکاریمان بکات ئەو ڕژێمە بڕووخێنین، پاشانیش لێمان گەڕێ بەئیرادەی خۆمان گۆڕانکاریی سیاسییو ئەوە بکەین، بەڵام ئێستا کە ئەمریکا هاتووە، خۆ ئەوە هاتووەو واقیعێکە، ئایا ڕێگەمان لێدەگرن ناوتان لێ بنێین داگیرکەر، وەکو خۆتان ناوتان لەخۆتان ناوە؟! یەك دووجار ئەو شتانەیان گوت، دوایی باسی ئەو شتانەیان نەکردەوە، بەڵام من بۆ خۆم پێم دەگوتن بچن من کتێبم هەیە، ئەو سیخوڕو جاسوسە کوردانەی ئەو ڕاپۆرتانەیان داونێ، بچن کتێبەکانی منیان لێ بپرسن، لەکتێبی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)دا، داخۆ من چۆن باسی تیرۆرم کردووە، چۆن باسی عەلمانییەتو باسی دیموکراسییەتم کردووە، هەڵم سەنگاندوون، چۆن باسی عەولەمەم کردووە، خێری هەیەو شەڕی هەیە، چۆن باسی مافی مرۆڤم کردووە، بچن شتەکانی من بخوێننەوە، ئەوەی ئێستا دەیڵێم، لە کتێبەکانیشمدا هەروام گوتووە، وتیشیان کە پەیدای دەکەینو دەیخوێنینەوە، ئیتر نازانم خوێندوویانەتەوەو خەڵك بۆی وەرگێڕاون، یان نا!

**+ ئایا یەك کەس تەحقیقی لەگەڵ دەکردی، یان زیاتر بوونو بەرپرسێکیان هەبوو؟**

ـ جاری وا هەبوو سێ چوارێك دادەنیشتن، هەریەکەی وا پێدەچێت (توزیع الأدوار)یان کردبێ، بەس ئەوەی ئێستاش بەبیرم دەکەوێتەوەو پێکەنینم پێی دێت" ڕۆژێك موحەقیقێکی ئەمریکی، کە یەکێکی ڕەشپێست بوو شکڵێکی زۆر دزێویشی هەبوو، لاشەیەکی ناڕێکی هەبوو، بەڵام دیوە مەعنەویو ئەخلاقییەکەی لە لاشە زاهیرییەکەی ناڕێکتر بوو، زۆر شێوازێکی ڕەقو ناڕێكو ناشیرینی هەبوو، ئەوە وتی: "من قسەت بۆ دەکەم، تا خۆم لێنەبمەوە، یەك قسە نەکەیت"، وتم باش، نزیکەی (١٠

ـ ١٥) دەقیقە بە ئینگلیزی قسەی کرد، من پێشم وت کە لە ئینگلیزی تێناگەم، وتم کەلیمە کەلیمە دەزانم، بەس تۆ کە ئاوا تێکەڵی دەکەیت، من تێی ناگەم. وتیان: "نا، تۆ ئینگلیزی دەزانی". گوتم ئەمن پێتان دەڵێم نایزانم، بەخۆڕایی دەمی خۆشتان هیلاك دەکەن، نزیکەی (١٥ ـ ٢٠) دەقیقە قسەی کرد، چوار موحەقیقی دیکەش دانیشتبوون، جا وەرگێڕەکە وتی: "جا دەڵێی چی؟". وتم هیچی لێ حاڵی نابم، وتم: نەمگوت ماندووبوونەکەت بەخۆڕاییە؟! وتی: "چۆن حاڵی نابیت؟"، وتم: هیچ حاڵی نەبووم، ئەگەر وەری دەگێڕیت حاڵی دەبم، وتی: "ئەو هەمووە چۆن تەرجەمە دەکرێتەوە"، منیش وتم: بەخۆڕایی خۆی ماندوو کرد. زۆرم پێ سەیربوو، دوایی وام هەست دەکرد کە ئەوە فشاری دەروونی بێت. ئەو دەیگوت: "کە قسە دەکەم، دەبێ بەس تەماشای دەمی من بکەیت، کە موتەرجیمەکەش تەرجەمەی دەکات، نابێ تەماشای دەمی موتەرجیمەکەش بکەیت!"، وتم باشە، کە وەری دەگێڕێت، خۆ دەبێ تەماشای دەمی بکەم تا بزانم چی دەڵێ، دەیگوت: "نا، هەر تەماشای من بکەو تۆ هەر گوێ مەدە بەهیچ"، وا پێدەچێت ئەوەش وەکو ئوسلوبی موخابەراتی بێ، ڕەنگە لەو کاتەدا تۆ ڕەنگت گۆڕانی بەسەردا بێت یاخود چاوت گۆڕانی بەسەردا بێ و ئەوانە، وام هەست دەکرد کە هەڵسەنگاندنێکی دەروونی خۆیان بوو.

**+ ئایا بە وشەی داگیرکەر حەساسیەتیان نەبوو؟**

ـ با، خۆ پێیان ناخۆش بوو، من وتم ئەوە قەناعەتمە، ئەی بۆ خۆشتان وا ناڵێن؟ ناڵێن ئێمە داگیرکەرین، لە نەتەوە یەکگرتووەکان ناوتان لەخۆتان ناوە داگیرکەر، ئایا داواتان لە نەتەوە یەکگرتووەکان نەکردووە کە بەپێی یاسای داگیرکەر ڕەفتارتان لەگەڵ بکەن؟ وتیان: "با"، ئێ وتم هەروەکو خۆتان دەڵێن، هەروا دەڵێم، وەکو واقیعەکە، منیش هەروا دەڵێم.

ئەوان گوتیان: "تۆ هەڵوێستت چییە؟ پێتوایە ئێمە چ بکەین چاکە؟"، وتیان: "ئایندەی ئێمە چۆن دەبینی؟"، وتم: تا بەو عەقڵیەتەوە بن، من ئایندەی ئێوە بە تاریکی دەبینم، وتیان: "بۆ؟"، وتم: من پێموایە ئێوە لە کێشەی ئەفغانستان ڕزگارتان نەبووە، ئێرەتان هێناوەتە سەری، هەست دەکەم ئێوە زیاتر بەعەسکەری بیردەکەنەوە، هەست دەکەم ئینگلیزەکان زۆر لەئێوە عاقڵترن، ئەوان سیاسییانە بیر

دەکەنـەوە، ئـێوە بـە عـەزەڵات بیردەکەنـەوە، مـرۆڤ نابـێ بەعەزەڵات بیر بکاتـەوە، جا ئـێوە تەکالیفـی زۆر دەخەنـە سەرشانی خۆتان. وتم: ئەو کەسەی کە بەتەمای کوێخایی دونـیا بـێت، دەبـێ هەمـوو دونیا لەکۆڵ بنـێ، خەرجیی هەموو دونیا بکێشـێ. وتم: ئەوە پشتی لـە ژێریدا دەشـکێ. جـار جـاریش زۆرم پـێ سـەیر دەبـوو، ئەوان وەکو خەڵکی سیاسـیی لای ئـێمە نـین، جارێـك یەکێکـیان وتـی: "وەڵـڵا ڕاسـت دەکـەیت، پشـتمان لەژێریدا شکاوە، بەحەقیقەت ڕاست دەکەیت، پشتمان لەژێریدا شکاوە ! !".

ئـاوا جـار جـار دانیشـیان پـێدا دەهێـنا، یان کە هەندێك شتی ئیسلامم باس دەکرد، هەیانـبوو دەیگوت: "وەڵلاهـی ڕاسـت دەکـەیت.. تـۆ پیاوێکـی ڕاسـتگۆیت، لایەنگیری دەکەم، لە هەرچی گوتووتە". ئاوا زۆرجار ئەو وشانەیان دەگوت.

**+ ئـەوان لـە چ شـتێکی تـۆ زۆر بێـزار بـوون؟ چ شـتێکی تـۆ زۆر بێتاقەتـی دەکردن؟**

ـ لـەوە کـە دەیانگـوت ئـەو شتانەی لێت دەپرسین، هەر ئەوە دووبارە دەکەیتەوە. وتم جـا هــەق گۆڕانـی تـێدا نییە، دوو + دوو دەکاتە چوار، ئەمڕۆ دەکاتە چوار، بەیانی دەکاتــە چـوار، سـەد سـاڵی تـریش هـەر دەکاتـە چـوار، ئـەوە ناگۆڕێ، من خۆ قسەی حەلـەق و پەلـەقم بـۆ نەکـردوون، مـن باسی واقیعێکم بۆ کردوون، واقیعەکە چۆن بووە، ئـاوام بـۆ بـاس کردوون، ناگۆڕێ. دەیانگوت: "ئاخر دەشتێکی کەمان بۆ باس کە، هەر خـۆت لەخـۆتەوە شـتێك بـاس بکـە"، وتم: لەخـۆمەوە چ باس بکەم، ئەگەر شتێکی دی سیاسـییتان دەوێ، وەرە موناقەشـەی بکـەین. دەیانگـوت: "دەربـارەی زانیاریـی، چی شـتێکی گرنگ تۆ لات بێت، بۆمان باس بکە". وتم هیچی گرنگ لای من نییە، بۆ خۆتان دەزانن.

**+ ئایـا زانیارییەکانیان لەسەر کوردستان و کۆمەڵ و سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامیی ورد بوو؟**

ـ وام هەسـت نەدەکـرد و ئـنجا ئـەوان زیاتـر هــەر دەیانپرسـی، دەیانپرسـی کـە "مەکتەبـی سیاسـی چـەند نەفـەر بوون؟ سەرکردایەتیتان چەند کەسبوون؟ مەڵبەندتان لەکوێ هەیە؟ بارەگاکانتان لەکوێن؟" جار جار دەربارەی پارتی و یەکێتیش پرسیاریان

دەکرد، دەربارەی حزبەکانی تر پرسیاریان دەکرد. بەڵام من دەمگوت: لە خۆیان بپرسن. ئەگەر هێندێ شتی ئاشکرا هەبوایە باسم دەکرد، بەس بۆ ئەوی دی، دەمگوت برۆن ئەو زانیارییانە لەخۆیان بپرسن باشترە.

**+ قەت بووە ڕووداوێکی ڕاستەقینە لەسەر تۆ بیێتە ماڵ؟**

- نەخێر.. هیچ.

**+ لێکۆڵەرەوەکان بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵت چۆن بوون؟ یان ئەمریکیو بەریتانییەکان لە مامەڵەیاندا جیاوازییان هەبوو؟**

- ئەمریکییەکان بەزۆری توندبوون، بەریتانییەکان ئاسانتر بوون، لەسەرەتاش توندبوون، دوایی هەڵسوکەوتیان ئاسان بوو، هەشبوو لەسەرەتاشەوە هەر ئاسانکاربوو، یان هاوسۆز بوو. من یەکەمجار کە گرتیانم، ئەوان دوو بەش بوون، هەستم کرد لە نێوان خۆیاندا بوونە دووبەش، مشتومڕیان بوو، هەندێکیان دەیانگوت: "وانییە، ئەو شتانەی لەسەری هاتوون، ڕاست نین"، ئەوەی تر دەیگوت: "نەخێر وایە، دەبێ ئەزیەتی بدەین، بۆ ئەوەی ئیعتراف بکات".

یەکێکیان بە ئەبوعومەر خۆی بەمن ناساند، عەرەبی دەزانیو ئەمریکی بوو، عەرەبییەکی باشی دەزانی، وتی: "کاکە، من بە ڕاشکاوی پێت دەڵێم، ئێمە دوو بەشین"، وتی: "من دەزانم بێتاوانیتو ئەو شتانەی لەسەرت وتراون، درۆن"، ئەوە هەر لەڕۆژانی سەرەتا، بەڵام ئەوانەی دیکە ئەو قەناعەتەیان نەبوو، ڕۆژێکیش لە گەرمەی ئەزیەتدانو شتدا ئەوە هات، وتی: "ئەو ئەزیەتدانو شتە ڕاگرن"، تووڕە بوو وتی: "بابە من پێم نەگوتن؟" ئیتر دوایی لەنێو خۆیاندا بووە مشتومڕو ئەوانە، دوایی وتیان کاکە دەی بۆی دووبارە بکەنەوە، ئەو هات وتی: "کاکە بەقسەی من ناکەن، من دەزانم ئەوەی لەسەر تۆ گوتراوە، درۆیە، دوایی خۆیان دەگەنە نەتیجە". ئاوا هەستم دەکرد، جا ئایا ئەوەش ئوسلوبێکی موخابەراتی بوو، ئایا بەڕاستی هاوسۆز بوو؟ بەس هەستم دەکرد جار جار لەنێو خۆیاندا لێیان دەبووە کێشە، بەڵام دوایی یەك ڕەوتی وەرگرت، لەسەرەتاوە ئاوابوو، بەڵام دوایی یەك ڕەوتی وەرگرت.

**+ واتە تیایاندا هەبوو لەگەڵت هاوسۆزو هاوڕا بێت؟**

ـ هەندێ جار هەندێکیان کە ڕاستییەکانو واقیعم بۆ باس دەکردن، زۆر لەگەڵم موتەفاعیل دەبوون، جارێك یەکێکیان وتی: "هەرچی گوتووتە هەمووی بەڕاست دەزانم، زۆر داوای لێبوردنیشم هەیە، بەڕاستی ئەوانەی تۆیان گرتووە، زۆر هەڵەیان کردووە، بەو ئوسلوبەی لەگەڵ تۆ مامەڵەیان کردووە، زۆر هەڵە بوون"، باسی کردو وتی: "ئەزیەتیان دایت؟"، وتم: بەڵێ، ئاوا بووەو ئاوا بووە، وتی: "من زۆر نیگەرانمو داوای لێبوردنیشم هەیە، بەس من فەرمانبەرێکمو هیچم بەدەست نییە، ئەگەرنا بەدەستم بێت، ئێستا رزگار دەکرێیت". بەڵێ، جاری وا هەبوو وایان دەگوت.

**+ مامۆستا، تەوراتو ئینجیلەکان خۆت داوات دەکردن یان بۆیان هێنایت؟**

ـ نا، ڕەفیقێکی زیندانیم لەوێ لای بوو، دکتۆر سەتتام ئەلگەعود بوو، ئەو بەعسییش نەبوو، هەر پیاوێکی دەوڵەمەند بوو بەتۆمەتی ئەوەی هاوکاریی موقاوەمەی کردووە، جا ئەو تەوراتو ئینجیلی لابوو، دوو هەزار لاپەڕە بوو، ئینجا "التفسير التطبيقي للعهد الجديد" لەلای تاریق عەزیز بوو، ئەویشم وەرگرت، هەردووکیان نزیکەی سێ هەزار لاپەڕە بوون، خوێندمەوە لە زیندان، جا ئەوان خۆشییەکەیان لەوەدا بوو دەیانگوت: "تا ئێستا تەوراتو ئینجیلمان نەخوێندووەتەوە". جا وتم لە شتەکانی کەش هەروان، وتم: بڕواتان بێت لەو شتانەی دیکەش هەروان، من لەو سەری دێمەوە.

**+ مامۆستا، بە چ ناوێك بانگیان دەکردی؟ چۆن بانگیان دەکردی؟**

ـ دەیانگوت: "مستەر باپیر، یان وەن سێڤنتین (١١٧)".

**+ یەعنی چی؟**

ـ واتا ژمارەکەم سەدو حەڤدە بوو، خەڵك هەر بە ژمارەی خۆی بانگی دەکەن، بەس ئەگەر جار جار ویستبایان موڵاتەفەم بکەن، دەیانگوت: مستەر یان مستەر عەلی، شێخ عەلی، بەزۆری هەروایان پێدەگوتم، زۆر جار هەر ناویشیان نەدەهێنام، نە ژمارەو نە ناو، ئەوە لەسەرەتاوە، چونکە ئەوە دەلالەت لە جۆرێك لە موڵاتەفەو موجامەلە دەکات، ئەوانەیان هەر نەبوو.

**+ لە کاتی لێکۆڵینەوەدا، لێکۆڵەرەوەکان هیچ شتێکیان پێ نەگوتی؟ ئەو چالاکییە مەدەنییانەی لێرە کۆمەڵی ئیسلامیی دەیکردن، خۆپیشاندان و ناڕەزاییەکان و..؟**

- هیچیان پێ نەگوتم، نەخێر، بەس لە میانەی هێندێ قسەیان، هەستم دەکرد کە هەندێ شت هەن، بۆ نموونە" دەیانگوت: "بۆمان دەرکەوتووە تۆ پیاوێکی گرنگیت"، یان جارێك یەکێکیان وتی: "ئەوە خەڵك بۆ خۆشی دەوێیت؟ ڕێزت لێدەگرن؟"، وتم: جا ئەوە دەبێ لە خەڵك بپرسن، "بۆ ڕێزی لێدەگرن؟ بۆ خۆشتان دەوێ؟". وتم بڵێم چی؟ دەمزانی کە شتێك هەیە، بەڵام ئەوان هیچیان نەوت، بەڵام لە میانەی قساندا بۆم دەردەکەوت کە جموجوڵێك، شتێك هەیە، ئەو قسانە لەوەوە دێت.




# تەوەرەی پێنجەم:
# ئەشکەنجەدان

٢٠٠٥/٧/٣

ستۆدیۆی کەناڵی سلێمانیی تەلەفزیۆنی کۆمەڵ

www.alibapir.net

**+ مامۆستا، لە بەرایی ئەم زنجیرە گفتوگۆیەدا باست لەوە کرد، کە لە سەرەتای زیندانییکردنتەوە، چەند ڕۆژێك بە چڕی ئەشکەنجە دراویت، دەکرێ ئەو زانیارییانەمان بە درێژی پێ ڕابگەیەنیت؟**

ـ بسم الله الرحمن الرحيم.. ئەشکەنجە دوو جۆری هەیە، ئەشکەنجەی مەعنەوی هەیەو ئەشکەنجەی جەستەیی هەیە، لە ڕاستیدا ئەشکەنجە مەعنەوییەکە زەحمەتترە بە لای منەوە، ڕەنگە بە لای هەموو کەسێکیشەوە هەروابێت، وەك لە ئەشکەنجەی جەستەیی. ئەشکەنجەی مەعنەوی یەکەم لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە لە ڕێی دوکان کەوتینە بۆسەکەیانەوەو کەلەپچەیان کردینو چاویان بەستین، شێوەی دەستبەستنەکەمان زەحمەت بوو، ئەو شتەی کە دەستیان پێ بەستین، ئێستاش شوێنەکەی لە دەستم ماوە، بە دەستمدا چووبووە خوارو برینداری کردبوو، ئەوە زۆر ناڕەحەت بوو، تا چەند ڕۆژێکیش ئینسان شانو قۆڵی هەر ژانی دەکرد، چەند سەعاتێك بەو شێوە ماینەوە تا نیوەی شەو.

دوای ئەوەی کە لە موصڵ دایانبەزاندینو دوایی بە فڕۆکەیەکی تر بردینیان بۆ بەغدا، لە سەرەتاوە ئەشکەنجە نەبوو تا لەگەڵمان دانیشتن، شەوو ڕۆژێك، دوایی ئەوە بوو کە منیان جیاکردەوە لە برایان، وردە وردە ئەزیەتدانیان دەستی پێکرد، لە ڕاستیدا ئەگەر بڵێم ئەوان هەموو شێوازەکانی ئەشکەنجەدانیان لەگەڵ مندا بەکار هێناوە، وانییە، بەڵکو دەیانتوانی من زۆر زیاتر ئەزیەت بدەن، وەکو لەخەڵکی ترم بیستووە کە بە شێوازی دیکە ئەشکەنجە دراون، بەڵام ئەوەی کە لەگەڵ مندا بەکاریان دەهێنا، زیاتر دوو سێ شتبوون: یەکەم" بێخەوی، بێخەویان دەکردم. دووەم" ماندووکردن، دەبوایە ڕۆژی چەند سەعات بە پێوە بووەستیت، یان لەسەر ئەژنۆ بووەستیت، بوتڵێکیش لەسەر سەرت بێت، یا جلیکانەیەك لەسەر سەرت بێت، یان شتێکی قورس، ئینجا کە زۆر ماندوو دەبوویت بەپێوە، دەیانگوت لەسەر ئەژنۆو لەسەر کۆنکرێتیش.

لەسەرەتاوە بەوشێوەیە بوو، واتە ماندووکردنو بێخەوکردنو ئەوانە، من هەریەك قسە بووم، وتیان: "تۆ دیارە ئەو شتانەی لێت دەپرسین چاك بۆمان باس ناکەیت، زیاتر ئەزیەتت دەدەین". وتم یەك شتە، زیاتر بێت یان کەمتر بێت درۆ ناکەم، چیش

ڕاستە هەر ئەوەم پێدەگوتن، ئەوەبوو دوایی شتێکی دیکەیان لێ زیاد کردم، بلاجیکتۆریان دادەنا، دوای ئەوەی کە من چەند سەعات ڕاوەستاوم، یان لەسەر ئەژنۆ چەند سەعات ڕادەوەستیتو ئەو شتە لەسەر سەرت بێت، دەستت شل دەبوون، پشتت شل دەبوو خەوت دەهات، یان بێ خەویت، ئینجا تینووت دەبوو، ئاویشیان نەدەدایتێ، یان ئەگەر دابیشیان ئاوی گەرمیان دەدایتێ، ئیدی مانگی تەممووزیش بوو زۆر گەرما بوو، دوای ئەوە بلاجیکتۆریشیان دادەنا، هەموو جارێ دوو بلاجیکتۆر، سێ بلاجیکتۆری زۆر بەهێزو گەرم، وەکو عەلادین، ئیتر ئارەق بەهەموو بەدەنتدا دەهاتە خوار، بەتایبەتیش شەوێك لەنوێژی شێوانەوە تاوەکو بانگی بەیانی هەروا لەگەڵم خەریکبوون، بەئاسن لەو ئەژنۆیانەیان دەدام، لەو ئانیشکانەیان دەدام، ئینجا لەشێوەیەك دەبوونەوە، شێوەیەکی دیکەیان بەکار دەهێنا، ئەو بلاجیکتۆرانەیان دادەنا زۆر گەرم بوو، بۆم وەسف ناکرێ، زۆر دوعام دەکرد: خوای تەعالا یان ڕوحم بکێشی، یان لەهۆش خۆم بچم. کە من لە ژیانمدا لەهۆش خۆم نەچووم، لەوێش هەر لەهۆش خۆم نەچووم، زۆر دوعام دەکرد کە تۆزێك لەهۆش خۆم بچمو ئاگام لەو ئەزیەتو شتە نەمێنێ، ئەوەشم هەر بۆ نەبوو، دیارە من لەکاتی ئەزیەتدانەکەشدا هەوڵم دەدا هەر دوعا بکەمو قورئانم دەخوێند، نزیکەی شەش جوزم قورئانم خوێند لە سەرەتاوە، لەگەڵ ئەو ئەشکەنجەو شتانەدا.

هەروەها دوو گونیەیان بەسەرمدا کردبوو، یەکێکیان نایلۆن بوو بە زەحمەت هەناسەت بۆ دەدراو تەنگەنەفەس دەبوویت، تینووم دەبوو دەمگوت: کاکە تۆزێ ئاوم بدەنێ، ئاویش نەبوو، دەکەوتیتو بە ڕیش هەڵیان دەستاندیتەوە، بە گوێت، یان جاری وا هەبوو مرۆڤ لە پەلو پۆ دەبوو، بە ڕیش هەڵیان دەساندیتەوە، کە دەستیان دەدایە ڕیشت ئازارت زۆر دەبوو، بە ناچاری تۆزێك تینت دەدایە خۆتو هەڵدەسایتەوەو دەکەوتیتەوە، یان پێلاقەیان پێدەدایت، یان شتێکیان لەسەر سنگت دادەنا، یا کارتۆنێکیان بەسەرتدا بەردەدایەوە، کە تینووت دەبوو، دەیگوت دەبێ دەمت بکەیتەوە، بتڵەکەی لەسەرەوە ڕادەگرتو بەئەنقەست بەچاوتیدا دەکرد، بەلوتیدا دەکردیت، نەدەچووە ناو دەمت.

هەموو ئەوشتانە ناخۆش بوون، پوختەی ئەزیەتو ناڕەحەتییەکان: گەرما، ئەوە جگە لەوەی گۆرانییەکیان بە دەنگێکی زۆر بەرز لێدەدا، تەپڵو مۆسیقا، ئەو شەوەی کە گوتم زۆر ناڕەحەت بوو، ئافرەتێکیان هێنابوو سووری دەدا، دەیانگوت دەبێ تەماشای بکەیت، ئینجا قسەیان دەکردو جار جار جنێویان بەکوردی پێدەدام، ئەوان ئەمریکیبوون، بەڵام واپێدەچوو سیخوڕێکی کورد فێری دەکردن، وام هەست دەکرد، بەس خۆ من هیچم نەدەبینیو چاوم بەسترابوو.

ئاکامی ئەو هەموو شتانە، نزیکەی ئەو نۆ ڕۆژە، دوایی کە بردیانمو لەوێ گواستمیانەوە، من ئیشتیهام گیرابوو خواردنم بۆ نەدەخورا، ئاویشم بۆ نەدەخورایەوە، وەکو ئێستا زانیبام، ئاوی گەرمیش بووایە هەر دەمخواردەوە، بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت کە ئەوە شتێکی خراپبوو کە ئاوم نەدەخواردەوە، ئەو هاوڕێیانەی دیکەم جار جار بینیمن، وتیان مامۆستا تۆ هیچ نەخۆیت دەمریت، ڕۆژێك مامۆستا دارا شتێکی پێبوو، کیسەیەك کەمیوەی موعەللەبات بوو وتی: "شتێکی لێ بخۆ"، وتم وەڵڵا هیچم بۆ ناخورێ، مەعیدەم گیراوە، ئەوان نەیاندەزانی، منیش وتم تۆزێ ئەزیەتو شتی وایان داوم، ئەوان دیاربوو (سوپاس بۆ خوا) حاڵیان باشبوو. نوێژەکانم بەدانیشتنەوە دەکرد، ئاویش نەبوو تەیەمومم دەکرد، وەختەکەم نەدەزانیو بە مەزەندە کاتی نوێژەکانم دیاری دەکرد.

لە ئاکامدا من لەوێ لابرام، بەڕاستی ئەزیەتدانە نەفسییەکە بۆ من زۆر قورستر بوو لە لایەنە جەستەییەکەی، کە هیچ نەبوو، ماندوو دەبووم، بەڵام پێم هیچ نەبوو، کە قسەیەکیان پێدەگوتم، یان زللەیەك، یان شەقێکیان دەوەشاند، ئەوەم زۆر لەسەر دڵ قورس بوو، یان پێیان دەگوتم: "تۆ درۆزنیت"، بە عەرەبی یان بە ئینگلیزی دەیانگوت: "تۆ درۆ دەکەیت".

ئەوە زۆر لەسەر دڵم قورس بوو، تا پێم گوتن لێرە نەبێ لەژیانمدا پێم نەوتراوە درۆ دەکەیت، کەس پێی نەگوتووم، تەنها ئەمریکییەکان پێیان گوتووم درۆ دەکەیت، کە بردیانم بۆ ئەو قاعەیە (دوای نۆ ڕۆژ)، دیاربوو بەدەنم ڕەشو شین ببووەوەو چەرمی لووتم هاتبووە ئێرە (ناوچەوان)و ئێرەم (سەر لووتم) ئاوا بریندار بوو، ناڕەحەت بوو، بەهەرحاڵ شوێنەواری لێدانو شتم پێوە دیاربوو، ئافرەتێکی پەرستار هەبوو، لەگەڵ

خۆی بردمی بۆ چارەسەر، وتی: "وەرە تۆ نەخۆشی؟" وتم: بەڵێ، نەخۆشم خواردن‌و شتم بۆ ناخورێ‌و ئەوانە. کراس‌و فانیلەو شتەکانم لەبەرمدا دڕابوون، وتی: "ئەوە چیت لێ هاتووە؟" ئەوەبوو وتی: "ڕاکشێ بزانم چۆنی" پشکنینی بۆ کردم‌و بانگی دکتۆرەکەی کردو وتی: "ئەوە حاڵی زۆر خەتەرە"، هەروەها چڵکن بووم، چونکە ئەو نۆ ڕۆژە خۆشتن‌و شتی وا نەبوو، هەر لە خۆڵدابووم، شوێنەکە وا بوو ئاوو شتی لێنەبوو. وتی: "ئەوە لەکوێ بوویت؟ بۆ وات لێهاتووە؟" منیش هەروا بەزەردەخەنەوە گوتم ئەوە ئەمریکییەکان پێشوازی گەرمیان لێکردووم، میوانبووم، بەپێی دینی ئێوە، دیارە ئاوا پێشوازی لەمیوان دەکرێ، فانیلەم دڕاوو کراس دڕاو، وتی: "بۆ چ بووە؟" گوتم: وەڵڵا من دەعوەتی ئێوە بووم، ئاوا پێشوازیتان لێکردووم‌و بەو شێوازە ئەزیەتیان داوم‌و ئەوانە.

دوایی پشکنینی بۆ کردم، کە ڕادەوەستام سەرم دەسووڕا، خەریك بوو دەکەوتم، گوتی: "تۆ خراپ دەوەستی‌و دڵت لە دووسەد لێدەدات". وتی: "پێم سەیرە نەمردووی"، منیش وتم: وەڵڵا جا تا خوا نەتمرێنێ نامری، وتی: "گورچیلەکانیشت خەریکن بووەستن، چونکە شلەمەنی لە بەدەنتدا نەماوە، تۆ دەڵێی برژاندوویانی"، وتم: شتێکی وابووە، شتێکی لەو بابەتە بووە!! دیاربوو یەکسەر وتی: "ئاوی بۆ هەڵواسن، نزیکەی (٦ - ٧) بتڵ ئاویان تێکردم‌و وتی: "دەبێ ڕۆژی سێ بتڵ ئاو بخۆیتەوە" وتم وەڵڵا ڕەنگە دووپەرداخیشم بۆ نەخورێتەوە، وتی: "بۆ؟" وتم ئاخر بۆم ناخورێتەوەو شەهییەم گیراوە، وتی: "بابە بەخوا دەمری، گورچیلەکانت دەوەستن‌و ئەوانە". بەهەرحاڵ وتم باشە، جا ئاخر تۆ شتێکی وا بکە نانم بۆ بخورێ، چونکە شەهییەم گیراوە، جا بە ئەزیەتدان‌و ئەو شتانە، دیارە مرۆڤ تەبیعەتی دەگیرێ.

ئیتر دوایی وردە وردە خوای پەروەردگار شیفای نارد، بەڵام جگە لەو جارە کە بردیانم بۆ چارەسەر، تا مانگێك من نەخۆشی هەوکردنی سیشم هەبوو، ئەوکاتە ئەزیەتیان زۆر دام، هەر وەکو کێم‌و بەڵغەم‌و شتم هەبوو، وتم من کە هاتووم نەخۆش بووم، چارەسەرو شتم هەر هەبووە، بمبەن بۆ دکتۆرو چارەسەرو شتم بدەنێ، زۆر ناڕەحەتم، سنگم ئیلتیهابی هەیەو ئەوانە، هەستم دەکرد موحەقیقەکان بەئەنقەست هێشتمیانەوە، تا نزیکەی مانگێك، نەیانهێشت چارەسەر بکرێم، وتیان: "لێی گەڕێ با

ئاوا بێ"، وەکو فشارێکی دەروونی، ئیدی دوایی خوای شیفابەخش وردە وردە شیفای نارد، ئەو ئەژنۆیانەم زۆر دەئێشان، نەمدەوێرا بەسەر زەویدا بڕۆم، ئەو ئانیشکانەم دەئێشان، وردە وردە شوێنەواری شتەکان نەما، دەستم توێخێکی هاویشتو ئەو ڕەشو شینییەی بەدەنم نەما.. دنیا هەر ئاوەهایە کاک هاوڕێن! هەورازەو نشێوە، ئەوە گوشراوەکەیەتی، ئەگەرنا هەموو شتێ باس ناکرێ!!

**+ کارەبالێدانی تیابوو؟**

- نا، ئەوەی تێدا نەبوو.

**+ ئەو ئامێرانەی کە بەکار دەهاتن، چیبوون؟ زۆرجار ئامێری تایبەت بە سزاو ئەشکەنجە دەبینین، لە زۆر دەوڵەتی عەرەبیدا ئێمە بینومانە؟**

- ئەو ئامێرو شتانەیان بەکار نەهێنا، بەس لێدان هەبوو، شەقیان تێ هەڵدەدام، بەزللەو بەپێ لاقە، کات هەبوو ڕادەکشام، کارتۆنێکیان بەسەر سکمدا، بەسەر سنگمدا دەدا، من پێم سەیر بوو، دەمگوت ڕەنگە پەراسووم هەمووی شکابێت، بەس بەهەرحاڵ سەلامەت دەرچووم، لەقەدەر ئەوە سەلامەت دەرچووم.

**+ هیچ جۆرێکی تری ئەشکەنجە هەیە کە باسمان نەکردبێ؟**

- خولاسەکەی ئاوایە، ئەوە کورتەکەیەتی.

**+ مامۆستا، بە تاک ئەشکەنجە دەدران یان بە کۆمەڵ؟**

- وەڵڵا من تەنیابووم، بەس واپێدەچێت برایانیان هێنابێت بۆ تەماشای من، چونکە دوایی کە هاتمەوە، برایان لێرە باسیان کرد، وتیان بە ئێمەیان دەگوت وەرن تەماشای براگەورەکەتان کەن، بەڵام من نەمبینیون، چونکە چاوم بەسترابوو، دوو گونیە بە سەر سەرمدا کرابوو، ئەوانەم لەبیرە، بۆ ئەوەی (بە حساب) ئەوانیشی پێ بترسێنن، کە ئەها ئاوا ئەزیەتی فلان کەس دەدەین.

**+ مامۆستا، کێبوون ئەوانەی ئەشکەنجەیان دەدان؟ سەربازەکان بوون یان پاسەوان؟**

- بەڕاستی من هەر نەمدەبینین، بەرگی مەدەنییان لەبەردا بوو، بەس من نەمدەبینین، مرۆڤی زلەو ئەوانە بوون، نەمدەبینین کە ئەوانە کێن، ئەوەندە هەبوو

سەربازی لێ هەبوو بۆ پاسەوانی، تفەنگیان پێبوو، ئەوانەی منیان ئەزیەت دەدا، ڕەنگە خەڵکی تایبەت بووبن بەئەزیەتو ئەشکەنجەدان، چونکە زۆر دڵڕەق بوون.

**+ مامۆستا، لە ژێر ئەشکەنجەدا تەنها قورئانت دەخوێند یان..؟**

ـ وەڵڵا دوعام دەخوێند، قورئانم دەخوێند، لەوێش هەر قەڵس دەبوون، دەیانگوت: "دەبێ بێدەنگ بیت، چ دەڵێی؟" دەمگوت: ئەو دوعایە دەکەم، دەیانگوت: "نابێ دەم بجوڵێنی".

**+ لە ڕووی دەروونییەوە، هیچ ئارامییەکت هەبوو؟**

ـ بێگومان، ئەو تامەی لەو قورئان خوێندنەی ئەوێم کردووە، زۆر شتێکی دەگمەن بوو، من دووجاریش لەژێر ئەشکەنجەدا سەکینەتم داباریبە سەر، نازانم چۆنی وەسف کەم، لە گەرمەی ناڕەحەتیدا کە مردنم بەئاوات دەخواست، ئەوەندەم زانی وەکو بڵێی شتێك دابارێتە سەرت لە ئاسمانەوە، وەکو چۆن زۆر زۆرت گەرما بێتو گۆزە ئاوی ساردت پێدا کەن، ئەو حاڵەتەم بەسەردا هات، هەرچی ئازار هەبوو لەبەدەنمدا نەما، من بەدەردی کابرا دەڵێ: نەمدەزانی کوێم دێشێ، واتە هەموو شوێنێشم دێشا، بەس کە ئەو حاڵەتەم بەسەر هات، وەکو نە بام دیبێ نەباران، زۆرم پێ سەیر بوو، نوێ بوومەوە، جارێك ئاوا، جارێکی دیکەش زۆر ناڕەحەت بووم، بەپێوە بووم دەمگوت ئێستا دەکەوم، لەوانەیە لەهۆش خۆم بچم، ئاوا تۆزێك چاوم نوقاند وامزانی لەهۆش خۆم دەچم، یەکسەر دیسان ئەو حاڵەتە دووبارە بوویەوە، ئەوە سەکینەتە، سەکینەت بوو، خوای پەروەردگار باسی دابەزاندنی سەکینەت دەکات، دووبارە بەوەش نوێ بوومەوە، ئەو حاڵەتەم کە بەسەردا هات وەکو یەك تۆز ئازارم نەبینیبێ، من لەو زیندانە نەبێو لەو حاڵەتەدا نەبێ، ئەوەم نەبینیوە لە ژیانمدا، ئەوەش لە بەرەکەتی زیندان بوو.

**+ مامۆستا، باسی برینداربوونی لەشت کرد، بە شێوەیەکی تایبەت کوێی لەشت بریندار بووەو تاکەی ئەو ئازارەی پێوە مابوو؟**

ـ وەڵڵا تۆزێ دەموچاوم، جاری وابوو بەلوتم هەڵیان دەگرتم، بۆ ئەوەی هەستم، یان بەگوێم، یان بەڕیشم، دەموچاوم چەرمی لێبووەوە، دەست و پەلم بەو کەلەپچەو

شته بریندار ببوو، ئەژنۆیەکانم بریندار بوون، بەئاسن لێیان دەدام، جاری وابوو ئەو ئەنیشکانەم بەئاسن لێیان دەدا، جاری وابوو بۆ ئەوەی کە هەستمەوە، جا ئیدی بەدەنیشم ڕەش‌و شین بوو بوو، بەپێ لەقەو شەق‌و ئەوانە پەلاماریان دەدام.

**+ قەدەغەکردنی خەو لێت، تەنها لەو نۆ ڕۆژەدا بوو یان چەند ڕۆژێکی تریشی گرتبووەوە؟**

ـ دوایی و لە قۆناغی دووەمیشدا شەوێك ئاوا بە بێخەوی ئەزیەتیان دام، لەبەر ڕۆژ ڕایانگرتم، چەند سەعاتێك لەبەر خۆر ڕایانگرتم، تینووشم بوو نەخۆشیش بووم، لە شوێنێك ڕایانگرتم دڕکەزی لێبوو، گەر کەوتبام، بەسەر تەلبەندەکەدا دەکەوتم، لەشم بریندار دەبوو، وتیان لێی گەڕێ تا بۆ خۆی دەکەوێ، وەڵڵا ئیدی منیش تۆزێ دوعام کردو زۆر نارەحەت بووم، زۆریشم تینوو بوو، وتم تۆزێك ئاوم بۆ بهێنن، وتیان: "ئاو نییە"، ئێ وتم: چیتان دەوێ؟ وتیان: "دەبێ بڵێیت"، گوتم چیم گوتووە هەر ئەوەیە، بکەوم‌و نەکەوم، بمهێڵنەوەو نەمهێڵنەوە، دوایی کە بێهیوا بوون، گوتیان با بیبەینەوە ژووری.

چوومەوە ژووری، گوتم تۆزێکم ئاو بدەنێ، وتیان: "نەخێر، ئاو نییە، دەبێ قسە بکەیت"، قسەم بۆ نەدەکرا، من نەخۆشیش بووم‌و زۆریشم تینوو بوو، ئارەقیشم کردبوو لەبەر هەتاوەکەدا، وتیان: "دەتۆزێکی ئاو بدەنێ"، تۆزێکیان دامێ، دوو قووم، وتیان: "تۆزێ دەمی پێ تەڕکە، بۆ ئەوەی قسەکانت بۆ بکرێ" تۆزێ دەمم تەڕکرد، وتی: "دەی ئەنجا قسە بکە"، ئێ وتم: باشە، خۆ قسەکان بۆ ئێوەن، قازانجەکەی بۆ ئێوەیە، ئەگەر قسە بکەم، وتم با وابێ قسەم بۆبکرێ! ! وتیان: "نا، ئەوەندەیە، قسە بکە، ئێنجا تۆزێکی دیکەش ئاوت دەدەینێ"، واتە هێندێ شتم لەوان بە منداڵانە دەبینی، وتم ئێوە بانگەشەی مافی مرۆڤ و ئەو شتانە دەکەن، منیش مرۆڤم، باشە خۆ مافی ئەوەم هەیە ئاو بخۆمەوە، زۆر شتتان لەگەڵ من کاریگەری نییە، خۆ من بشخنکێم‌و نەشخنکێم عەینی حسابە، خۆ بزانە یەك قسەم گۆڕیوە؟ دەیانگوت: "ئاخر ئێمە بە زۆری ڕقمان بەوە هەڵدەستێ"، وتیان: "واتە تۆ خۆت بە بەهێز دەزانی کە دەڵێی من قسە ناگۆڕم"، وتم: نا، بەس من درۆ ناکەم، چی ڕاستە هەر ئەوەم گوتووە.

**+ لە ژێر ئەشکەنجەدا هیچ قسەیەکت نەگوتووە، هیچ لێدوانێکت نەداوە کەلێی پەشیمان بیت؟**

ـ نا، نەوەڵڵا، من لەژێر ئەشکەنجەش وەهام نەدەکرد، دەهاتن‌و دەیانگوت: "دەڵێی چی؟ دەیڵێی؟" وتم: چیم گوتووە هەر ئەوەیە، دەهاتنەوەو دەیانگوت: "داوات لێکراوە چی دەڵێی؟" دەمگوت: چیم گوتووە هەر ئەوەیە، دەیانگوت: "ئاخر هەر ئاوا دەمێنیتەوە"، گوتم: کەیفی خۆتانە، دەمگوت کاکە من لەژیانمدا درۆم نەکردووە. دەتانەوێ درۆ بکەم؟ دەیانگوت: "نا، دەمانەوێ ڕاستی بڵێی"، ئێ گوتم ڕاستی ئەوەیە کە گوتوومە.

**+ ئەوکاتەی ئێوە لە زیندان بوون، دەیان وێنەی وەکو زیندانەکانی ئەبوغرێب ئاشکرا بوون، کە تیایدا سووکایەتی بە زیندانییەکان دەکرا، لەسەر دەستی لێکۆڵەرەوەکان‌و سەربازە ئەمریکییەکان، سووکایەتی وەکو ڕووتکردنەوەو دەستدرێژیکردنە سەرو چەندین مامەڵەی دڕاندانەو بێشەرمانەی تر، ئایا ئێوە ڕووبەڕووی هیچ یەکێك لەوانە بوونەوە؟**

ـ نەخێر، بەس یەکێك لە زیندانییەکان بۆی باسکردم، وتی: "بیست‌و سێ ڕۆژ وەکو چۆن لە دایکی خۆم بووم، ئاوا ڕووتیان کردمەوە".

**+ قەت هەبووە لە کاتی سزاو ئەشکەنجەداو لە بەردەمتاندا سووکایەتی بەپیرۆزییەکانی ئیسلام، بەتایبەتی قورئان کرابێت، تا وەکو سزاو ئەشکەنجەیەکی دەروونی بەکاری بهێنن؟**

ـ نەخێر.. قورئانی هەر لێ نەبوو، نەشم بینی.

**+ یەکێك لە زیندانییەکانی گوانتانامۆ، دوای ئازادبوونی لە لێدوانێکیدا بۆ ڕادیۆیەکی ئەمریکی دەڵێت: "کە ناڕەزاییمان دەردەبڕی، لەسەر ئەوەی سەربازو پاسەوانەکان سووکایەتییان بە قورئان دەکرد، دەهاتن‌و جلی تەواویان لێدەسەندینەوە، یان نەیاندەدا پێمان، بەتەنها شۆرتیان دەدا پێمان، لە ماوەی بیست‌و چوار سەعاتدا، ئەویش گرفتی زۆری بۆ ئێمە دروست**

**دەکرد، چونکە نە دەگونجا نوێژی پێوە بکەین". هیچ شتێکی وەکو ئەوە ڕووبەڕووی ئێوە نەبۆتەوە؟**

- نەخێر..

**+ بەڵێ.**

- نەبۆ من، نەبۆ ئەوانەش کە لێم دەپرسین، جگە لەو نەفەرەی کە گوتم، ئەگەر خەڵکی تر هەبووبێت، شتێك کرابێت، من نەمزانیبێ یان نەمدیبێ، نازانم، تەنیا ئەو کوڕەش کە گوتم، کاتی خۆی سەر بەموخابەرات بووە، وتی بیستو سێ ڕۆژ ڕووتیان کردوومەتەوە، نینۆکەکانیشیان کێشابوو، نینۆکی پەنجەی هەردوو پێی، گوتی: "ڕۆژێکیش بردیانم بۆ ژوورێك، کە ژووری عەمەلیات بوو، پێیان گوتووم ئێستا دەتکەین بەئافرەت، وتی منیش زۆر ناڕەحەت بووم، زۆر تێکچووم.. کە دوایی دیاربوو هەر هەڕەشە بوو"، ئنجا: "یەکێکی دیکەشم بینی شەش دانی شکابوو، وتم چییان لێکردووی؟ وتی: لە کاتی ئەشکەنجەدا بۆکسێکیان لێداوم، ئەو شەش دانەم شکاوە"، خەڵکێکی تریش ڕەنگە هەبووبێو زۆر زیاتریشیان ئەشکەنجە دابێ، زیاتریشیان ناڕەحەت کردبێ، بەڵام من سەبارەت بە خۆم شتی سووکایەتی تەنها ئەو ئافرەتەبوو کە دەیانهێنا، دەیانگوت: "دەبێ تەماشای بکەیت"، جارجاریش هێندێ وشەی کوردی کە فێرکرابوون، دیار بوو ئەوەی کە من پێی قەڵس بووم، ئەوان دەیانگوت، ئەگەر نا شتی ترم نەبینی، بێگومان هەمووی هەر سووکایەتیو ئیهانەیە، بەڕیش هەڵیان دەساندمەوەو ریشیان رادەکێشامو گوێیان رادەکێشام، ئەوانە هەمووی سووکایەتین، بەڵام قسە بە قورئان گوتن، یان قسە بە خودا گوتن، یان بەئیسلام گوتنو ئەوانەم نەبیست.

**+ ئەو جیاوازییەی کە باسی دەکەن، بۆ نموونە لەوانەیە هەندێك کەس سزادرابێ، وەکو ئەوەی ریزێ دانی ئەو زیندانییەی تریان شکاندووە، یا وەکو رووتکردنەوەی یەکێکی تر بۆ ماوەیەکی زۆر، ئەو جیاوازییەی کە هەبووە، جەنابتان بۆچی دەیگێڕنەوە؟ کە تۆ زۆر رووبەڕووی ئەو جۆرە مامەڵانە نەبوویتەوە؟**

– مـن بۆ فەزڵو لوتفی خوای پەروەردگاری دەگێڕمەوە، هەر بۆ ئەوی دەگێڕمەوە، خوای پەروەردگار لوتفی لەگەڵمدا کردووە، دیارە تواناکەم هەر ئەوەندە بووە، لەوە زیاتـرم لەوانەیـە بەرگـە نەگرتایە، نازانم، سەبارەت بەو کوڕە دیار بوو کە سەر بە رژێم بـوو، هی ئەوان دیار بوو سەر بە رژێمەو رەنگە هەندێکیان لە کاتی شەڕدا گیرابن، بەس مـن لـە کاتـی دەعـوەتدا گـیرام، لەوانەیـە ئەگەر هەندێك موراعات کرابێت، دوای فەزڵو لوتفی خوا، ئەوەش هۆکار بووە.

**+ جگـە لـە هۆڵـی ئەشـکەنجەدان، لـە نـاو ژووری زیـنداندا چ شـێوازێکیان وەکـو ئەشـکەنجەی جەسـتەیی یـان دەروونـی بـەکار دەهێـنا؟ بـە تایبەتـی چاودێریکردن، هیچ هەستت بەو شتانە کردووە؟**

ـ بـەڵێ، مـن لـەو کاتـەی کـە بردوویانم بـۆ ژووری تاکی تا هاتوومەوە، لە هەر نیو سـەعات جارێك پاسـەوان دەهـات، ئەگەر دیار نەبای لە ژوورەکەتدا، لە گۆشەیەك بای، دەیگوت: "لـە کوێـی؟" جـا عـەلی حەسـەن مەجید رۆژێك وتی: "گرفتەکە ئەوەیە (جا دیارە چوونە سەر ئاوو شتی وای بە زەحمەت بوو، چونکە لاق و لەتەری سەقەت بوو) جـارێ مـن لـە سـەر ئـاوم، لـە تەوالێـتم، (لە ناو ژوورەکەی خۆیدا) دەڵێ: "لە کوێی؟" دەڵێم: ئـەوە لـە تەوالێـتم، دەڵـێ: "چ دەکـەیت؟" ئـێ بابە کابرا لە تەوالێتە، دەبێ چ بکـا؟! ئـەوە زۆر ناخـۆش بوو، هەر نیو سەعات جارێك، لە بیستو چوار سەعاتدا چلو هەشـت جـار، شـەوو رۆژی بێپسـانەوە پاسـەوان دەبوو بێ بنووسێ کە تۆ چ دەکەیت؟ گـەر دیـار نەبی، بانگت دەکات، جاری واش هەبوو بە توندی پەنجەرەکەیان پێوەدەدا، ئەگـەر خەوتباشـی بـە خەبـەر دەهاتی، یان لایتی لە چاوت دەدا، دیارە هەمووشیان وا نەبوون، بـەلام هەندێکیان دڵ پـڕ لەقینانە مامەڵەیان دەکرد، ئەوە لە روویەکەوە، ئەو چلو هەشت جار نووسینو..

**+ هەر بیستو دوو مانگەکە بەو شێوەیە بوو؟**

ـ هـەروا بـوو، تـا هاتـوومەوە بـەو شـێوەیە بـوو، شـتێکی تـریش ئـەوە بـوو کـە دەیانگوت: "یـەڵڵا، قونچکە جگەرە هەڵبگرنەوە"، ئەوەی هەڵینەگرتبایەوە لە وەرزش بێبەشیان دەکرد، نەدەهاتە دەر، ئینجا لە سەرەتاوە سەلام لە یەکترکردنیش قەدەغە

بوو، کەسێك سەلامی لەوی تر کردبایە لە وەرزش بێبەشیان دەکرد، دەستشۆردن یان دەمو چاو شۆردن بە سابوون، یان دەمو چاو شۆردن قەدەغە بوو، زۆر جار قەدەغەیان دەکرد. هەموو جارنا، هەندێجار دەیانگوت: "نابێ دەست بشۆن، دەست بشۆ بەڵام نابێ دەمو چاو بشۆی". کەسێك ئەوەی کردبا، لە وەرزش بێبەشیان دەکرد.

جا لەوێ پیسترین سزا، ناخۆشترین سزا، بە تایبەتی لەو سەرەتاوە کە رۆژی نیو سەعات، شەو نیو سەعات دەردەچووین، بیستو سێ سەعات لە ژوورەوە، ئەو کاتە ماوەیەکیش کارەباشی تێدا نەبوو، هیچ شتێك نەبوو، پەنجەرەیەکی تەختە بوو ئەویشیان دادەخست، شەوە زەنگ، شەوو رۆژ بۆ خۆت دابنیشە هەر یادی خوا بکە، هەندێك لە زیندانییەکان چاویشیان بەوە کز بوو، پێموایە شوێنەواری ئەو هەموو تاریکیو شتە بوو، جا لە ماوەی ئەو بیستو چوار سەعاتەدا ئەو دوو نیو سەعاتە دەردەکرای، ئەگەر یەکێك لەو سەرپێچییانەی کردبایە، دەستت بە سابوون شۆردبا، کە دەتگوت ئێ تارەتم گرتووەو دەستم دەشۆم، دەیانگوت "نا"، دەی باشە لێم گەڕێ با دەمو چاوم بشۆم، "نەخێر، نابێ دەمو چاوت بشۆی"، کابرا لە خەو هەستاوەو لە نێو تۆزو خۆڵدا بووە، چونکە ژوورەکەت بەردەوام تۆزو خۆڵو مێشو مەگەزو مێشولەو ئەو شتانەشی هەر بۆ دەهات، بیابان، "نەخێر، نابێ دەمو چاوت بشۆی"، هەر کەسێك ئەوانەی کردبا، لە وەرزش بێبەشیان دەکرد، ئینجا کابرا بۆ ئەوەی کە بێبەش نەبێت، بە ناچاری سەرپێچی نەدەکرد.

**+ بە ڕای ئێوە، بۆ چی سەربازەکان یان موحەقیقەکان بەوشێوە دڕندانەیە ئەشکەنجەیان دەدان؟ ئایا ڕەگەزپەرستی وەکو پاڵنەرێك نابینن بۆ ئەوە؟ بە تایبەتی ئێستا لە جیهاندا دەبینین کە ڕەگەزی سپی خاوەنی هەستی ڕەگەزپەرستییە؟ یان فەرمان بوو پێیان کرابوو؟ یان باوەڕیان وا بوو بەو شێوەیە نەبێت زانیارییان دەست ناکەوێت لە ئێوەو لە زیندانییەکانی تر؟**

– رەنگە هەرسێ هۆیەکانی تێدا تێکەڵ بووبێ، یەکەم" فەرمان بوو پێیان کرابوو، چونکە دوایی کە تەوجیهاتی تریان بۆ هات، مامەڵەیان گۆڕی. دوو" بێگومان میزاجی سەربازەکانیش کاریگەری هەبوو لە سەر شێوەی مامەڵەیان، واتە ئەو کاتەی کە زۆر

سەختگیرییان دەکرد، سەربازی وا هەبوو، یان یەکێك لە سەربازەکان دەیگوت: "لە نۆرەی من پێکەوە قسە بکەن، بەڵام دەنگ بەرز مەکەنەوە"، یان بۆ نموونە لە سەرەتاوە (جا خۆ هەموو شتێ باس ناکرێ) بە دوو دەقە، بە سێ دەقە دەبوو سەرئاو تەواو بکەیتو بێیتەوە، بە دە دەقیقە دەبوو خۆت بشۆی، خۆت لەبەر کەیتو هەمووی، ئەگەر خۆت نەشۆردایەو نەهاتبایتە دەر، دەرگاکەی دەدایە بەر شەق، یان هەبوو کابرا بە کەفو سابوونەوە دەبوو بهاتایەتە دەرەوە، جاری وا هەبوو سەربازەکە بەزەیی هەبوو، یان سۆزی هەبوو دەیگوت: "خۆت بشۆ، تەنیا با پێنج دەقیقەیەکی کەشی لەسەر بێت، چارەکێك لە ژووری بە"، ئێستاش لە یادمە شەوێك ئێمە چووینە دەر، دوای ئەوەی دەستنوێژمان گرت، گوتمان ئەوە ئامادەین ئەگەر بچینە ژوور، وتی: "بۆ وا بە پەلەن بچنە ژوور؟ تۆزێك لەو هەوایە هەڵمژن"، هەندێکیان ئاوا لێبوردەییان هەبوو، وتی: "قەینا راوەستن، با دوو سێ قسە بکەین پێکەوە". کەواتە میزاجی سەربازەکان کاریگەری هەبوو، فشار لێکردنیش لە تەحقیق بۆ ئەوەی کابرا نەرم بێت، بێگومان ئەوەش هەر کاریگەری هەبوو.

**+ لە مامەڵەو سزاو ئەشکەنجەکاندا، رق هەستی پێدەکرا، کە کەسێك بە پاڵنەری رقی ئاینی ئەزیەتی زیاترتان بدات، یان مامەڵەیەکی نا دروست بکات؟**

ـ تیایاندا هەبوو، بەڵام بە گشتی نا، تیایاندا هەبوو (بۆ نموونە) دەیانگوت کە ئەوە جولەکەیە، یان دەیانگوت: "ئەوە نەصرانییەو زۆر دەمارگیرە"، یەکێکیان زۆر دڵ پڕ لەقین بوو، هەر لە خۆیەوە خەڵکی سزا دەدا، بەڵێ تیایاندا هەبوو دەیانگوت: "جولەکەیە زۆر قین لەدڵە، ئەوە نەصرانییەکی پیسو دەمارگیرە"، هەش بوو بڕیارەکانی جێبەجێدەکرد، کۆی دەکردینەوەو دەیگوت: "کاکە، لە سەرەوە ئەو تەوجیهاتانەمان بۆ هاتووە، سەرپێچی مەکەن بۆ ئەوەی سزاتان نەدەن، چونکە منیش سەربازێکم، ئەگەر جێبەجێی نەکەم، منیش سزا دەدرێم"، هەبوو ئاوا تێی دەگەیاندی، هەشبوو میزاجی خۆی دەکردە قانوون، جا بە باری چاکەدا بۆ ئاسانکاری، یان بە باری خراپەدا بۆ ئەزیەتدان.

**+ کەس هەبووە لە ژێر ئەشکەنجەدا وەفات بکات؟**

– لـەوێ بەپێـی زانـیاری مـن نەخێـر، بـەڵام رەنگـە لـە شـوێنی تـربووبێ، لـەوێ نەمبیست.

**+ ئایا لە کاتی ئەشکەنجەکاندا، ئەوان وایان دەڕوانی کە ئێوە تیرۆرست بن، بەرپـرس بن لە کوشتنی ئەمریکییەکان؟ ئایا ئەمەیان پێدەگوتن لە کاتی ئەشکەنجەدا؟**

– بە مـن نەخێـر، نـازانم ئەگـەر بـە خەڵکـی تـریان گوتـبێ. چونکە زانیارییان لەو بارەوە لەسەر من نەبوو، کە شتێکی وا هەبووبێ.

**+ ئەو سزاو ئەشکەنجەو سووکایەتییانە، تا چەندێك کاریگەریی دەروونی لەسەر ئێوە بەجێهێشتووە؟**

- لە چ روویەکەوە؟

**+ جەنابت باسی ئەوەت کرد کە یەکەمجارە یەکێك پێی وتبێتی کە تۆ درۆ دەکەیت، ئەویش لە سەر دەستی ئەمریکییەکان، ئەمانە لە رووی دەروونییەوە تا چەندێك کاریگەریی سلبی لەسەرتان بەجێهێشتووە؟**

- بێگومان زۆر، چونکە من لە ژیانمدا شتی وام نەبینیوە، هەر لە ژیانمدا یەکەمجار بوو بگیرێم، ئەمجار بەو شێوەیەش، ئەمجا بە ناڕەواش، ئەمجا بەفێڵ لێکردنیش، واتە کۆمەڵێك شـت تـێکەڵ بـووە، ئـەمجا سێ چوار مەزڵومیەتیشمان هاتبووە سەرێ، ئێمە چـووین داوای قەرەبووکـردنەوەی ئـەو مەزڵومیـیەتە بکـەین کـە ئەمـریکا سـتەمی لێکـردبووین، کەچـی دووچـاری ئـەوەش بـووین، بەراسـتی کۆمەڵێك شت بۆ من تێکەڵ بـوو، پێـی ناڕەحـەت بـووم، بێگومان مرۆڤ پێـی ناڕەحـەت دەبـێ، بـەڵام ئـەوەی وای کـردبوو کـە مـن (لـە خـوا بـەزیاد بێت) زۆر بیر لەو لایەنە رەش‌و سەلبییانە نەکەمەوە، ئەوەبوو کـە ئـەو زیندانە بـۆ مـن هـەل‌و دەرفەتێکی باش بوو، کە موراجەعەی قورئان بکەمـەوە، لـە خوا نزیك ببمەوە، چاو بە خۆدا بگێڕمەوە، دوعا بکەم، زیاتر قوڵ ببمەوە بە مەعریفەتی خواو بە تەقواو بەوانەدا، ئەو شتانە وردە وردە لە بیرم چوونەوە.

**+ منیش ئەو پرسیارەم هەر لەو رووەوە کرد..**

ـ ئـەوە ئێسـتا تـۆ بـەبیرم دەهێنیـتەوە، ئەگـەر نـا هـەر پـێمخۆش نییە بـە بـیرم کەوێتەوە.

**+ منیش ئەو پرسیارەم ئەوەبوو، تا چەندێك لە رووی باوەڕو ئیرادەوە ئەو زیندانە کاریگەریی لەسەرت بەجێ هێشتووە؟**

ـ وەڵـڵا زۆر پتەوتـرو قـایمتر بـووم، کە من هاتمەوە، لە کۆڕە رۆژنامەوانییەکەدا کە هێندێ قسـەم کردبوون، برادەرانـی عەلمانـی دیارە پێیان ناخۆش بوو وتبوویان دیارە فـلان کـەس هـەر وەك خۆیەتی، وتم ئەوانە زۆر فەقیر حاڵن، ئەوانە وادەزانن بە زیندانی ئەمریکا ئـێمە دەسـتبەرداری مەبادیئـی ئیسـلامو دینداریـی خـۆمان دەبـین، من ئەگەر قـایمتر نەبـووبمو پتەوتر نەبووبمو دینداریم قوڵتر نەبووبێتەوە، بێگومان کاڵ نەبۆتەوە، مـن پێموایە ئینسانی ئیماندار هەتا نارەحەتیو تاقیکردنەوەی زیاتر ببینێ، دینەکەی لا شـیرینتر دەبـێ، خـوای پـەروەردگاریش ئیمانـی مەحکـەمتر دەکـاتو لـە خـوا نـزیکتر دەبێـتەوە، خـوا زیاتـر لوتـفـو بەرەکەتـی خـۆی لەگەڵ دەنوێنێ، لەراستیدا بوار نییە، ئەگـەر نا من شتی وام بینیوە لە مەسائیلی روحیو لایەنی مەعنەویی و ئیمانیو فەزڵو لوتفـی خـوای پـەروەردگار کە وەسف ناکرێ، جا من هەمووی لە بەرەکەتی ئەو زیندانە دەبینـم. بەڵـی زیندانەکە زاڵمانە بووە، بەڵام لای خوای پەروەردگار ئاسانە، وەکو چۆن ئاگری بۆ ئیبراهیم پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) سارکردەوە (قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْداً وَسَلَاماً عَلَى إِبْرَاهِيمَ) (الأنبياء: ٦٩)، زیندانێکی زاڵمانەش بۆ ئێمە بکاتە شوێنێك کە ئیمانمان تیایدا کامڵ بێتو تیایدا لە خوا نزیك بینەوە.

**+ مامۆستا، من لە میانەی وەڵامەکانی جەنابتاندا هەست دەکەم حەزەرێك دەکەن لە باسکردنی درێژەی ئەشکەنجەدانەکاندا، ئەو پرسیارە دەکەم: بۆچی مامۆستا عەلی باپیر نایەوێ هەر هەمووی باس بکات، بە وردو درشتییەوە؟**

ـ هـەر خـۆش نییە، ئێسـتا خۆشـە تـۆ بڵێی وەڵڵا پـەنجا شەقیان تێهەڵدام؟ خۆش نییە، یان بۆ نموونە ئاوا کەوتم یان ئاوا بوو، خۆش نییە، هەر ئەوەندەیە، پوختەکەشم باسکرد، خولاسەکەی هەمووی ئەوەبوو.

من ئەوەم بیر چوو، بردیانم بۆ لای ئەو دکتۆرە، وەزنیشیان کردم، کێشم نزیکەی هاتبووە سەر شەست کیلۆ، من کە گیرام نزیکەی (٧٥- ٧٦) کیلۆ بووم، واتە بە نۆ رۆژ پانزە کیلۆم کەم کردبوو، جا ئەوە ئاکامی ئەشکەنجە و ناڕەحەتی دەروونیو جەستەییەکەیەتی، دیارە پانزە کیلۆ لە ماوەی (٩-١٠) رۆژدا کەم بکەیت، مانای وایە ئینسان زۆر ناڕەحەت بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێموابوو کە دەگونجا زیاتریش ناڕەحەت بکرێم، وەکو خەڵکی تر باسی کردووە، ئەگەر نینۆکیان کێشا بام، ئەگەر بە جۆرێکی تر بوایە، لە رووی دەروونی، لە رووی جەستەیی، مرۆڤ زۆر زیاتر تووشی ناڕەحەتی دەبوو، ئەو کاتە رەنگە لە باتی پانزە کیلۆ، سی کیلۆم کەم کردبایە.

+ **پێتوایە ئەو دڕەندەییە لە مامەڵەدا، لە ئەشکەنجەدا گوزارشتە لە ناخی ئەمریکییەکان؟ یان ئەوەتا کۆمەڵێك سەرباز وەکو ئامێرێك بەکارهێنراون؟**

- من پێموایە چاكو خراپ لە هەموو شوێنێ هەیە، چونکە هەر لە نێو سەربازە ئەمریکییەکاندا خەڵکی باشم دەبینی، خەڵکم دەبینی سەد قسەی دەگوت بە ئەمریکا، دەیگوت: "ئێمە خزمەتکاری جولەکەین، ئێمە هەموومان دیفاع لە ئیسرائیل دەکەین"، هەبوو دەیگوت: "ئەمجارە بە سەلامەتی بچمەوە، بە حەیاتم چەك لە شان ناکەمەوە بۆ ئەمریکا"، دەیانگوت: "ئەگەر لەبەر لوقمەی عەیشو ژیانیش نەبوایە ئەوەمان نەدەکرد"، هەبوو زۆر موتەعاتیف بوو لەگەڵمان، کە بانگم دەدا، هەبوو دەهات دەیگوت: "تۆ (بە تەعبیراتی خۆیان) حاڵەتێکی روحانی سەیرت پێوەدەبینم، پێم خۆشە بۆم باسی ئیسلام بکەیت" لە سەربازەکان، ئافرەتیانو پیاویان.

هەبوو دەیگوت: "من لە خزمەتدام چیت دەوێ، چیت پێویستەو ئەوەی بە من دەکرێ، تۆ بەپیاوێکی موبارەك دەبینم"، واتە ئاوا تەعبیراتی خۆیان بەکاردەهێنا، "چیت دەوێ لە خزمەتدام، پێموایە من ئەگەر شتێك بۆ تۆ بکەم، خوا پێی خۆشە"، واتە قەڵەمێك یان دەفتەرێکم پێویست بوایە، ئەو کاتەی کە مۆڵەتیان دا، مەبەستم ئەوەیە بەبێ ئاگاداری ئیدارەی زیندانیش، هەیانبوو دوو دەفتەری بە پارەی خۆی دەکڕی، کە لەوێ خەڵك لاپەڕەیەکی دەست نەدەکەوت، دوو دەفتەری (١٠٠-٢٠٠) پەڕەیی بە پارەی خۆی دەکڕیو بۆی دەهێنام، دەیگوت: "بەڵام با کەس نەیزانێت"، سێ چوار قەڵەمی بەجارێك بۆ دەهێنام، ئەوە هەموو شتی خۆیان بوو، پاسەوانەکان

وەك خۆیان، هەبوو بۆ خۆی دەچوو شتی شیرینی دەكڕی بۆ ئێمە، جۆرەها شیرینی، هەموو شتی دەهێنا، ئێمە پارەو شتمان لا نەبوو، چییان بۆ دەهێنایین هەر ئەوەبوو، شتە شیرینییەكانی دەهێنا بۆ ئێمەو پێی دەداین، ڕۆژێك لە یەكێكیانم پرسی كە ناوی (جۆزیف) بوو، وتم: ئەوە تۆ پیاوێكی باش دیاری، چ شتێك پاڵت پێوە دەنێت ئەم شتانەمان بۆ بێنی؟ شتی شیرینمان بۆ دێنی، مولاتەفەمان دەكەیت. وتی: "وەڵڵا ویژدانم وا ئاسوودە دەبێت، هەست دەكەم ئێوە پیاوی گەورەن، بە پیاوی چاكتان دەبینمو منیش دڵم وا ئاسوودە دەبێت، دەزانم وەكو چۆن ئێمە كەیفمان لە شتی خۆشە، ئێوەش كەیفتان لێیەتی، بەس پارەتان لا نییە بیكڕن، هیچی لێ نییەو لە شوێنی خۆشی ڕەنگە لێپرسراو بنو پێم خۆشە (چكولاتە) یان هەر شتێكی شیرین بێت، منیش هاوكاریتان بكەم".

مەبەستم ئەوەیە من وام نەدەخوێندەوە، هەتا موحەقیقەكانیش كە هەمووی وابێت، قینلەدڵ بێتو ڕقی لە تۆ بێت، وام هەست دەكرد وەكو فەرمانێك ئەنجامی دەدەن، بێگومان خەڵكیشیان تێدا هەبوو قینلەدڵ بوو، بەڵام زیاتر هەستم دەكرد، چ سەربازەكان یان موحەقیقەكان وەكو فەرمانێك، كارمەندێكە ئیشێكی پێ سپێردراوەو ئەنجامی دەدات.

**+ ئایا زانیارییت لەسەر ئەشكەنجەی سەركردەكانی بەعس هەیە، بەتایبەتی گەورەكانیان؟ وەكو تاریق عەزیز، عەلی حەسەن مەجید، تەها یاسین ڕەمەزان، صەددام حسێن خۆی؟**

ـ هی صەددام حسێن ئاگام لێی نییە، بەڵام عەلی حەسەن مەجید خۆی بۆی دەگێڕامەوە، وتی كە زۆریان نارەحەت كردووە، وتی: "تەها یاسین ڕەمەزان-یشیان لە پەنای من ئەشكەنجە داوەو زۆریان نارەحەت كردووە"، خەڵكی تریش هەبووە نینۆكیان كێشاوە، خەڵكی دیكە هەبووە كە وتوویەتی دەستیان شكاندوومو قاچیان شكاندوومو باسیان دەكرد، ئەوانەیان كە گرتوویانن، بەس ئەوانەیان كە خۆیان بە دەستەوەداون، پێموابێ ئەزیەتیان نەداون.

**+ جۆرەكانیان باس نەكرد؟**

– بەڵـی، وەڵـڵا باسـیان کـرد، بـەڵام جـا پێویسـتیمان بـەو هەمـوو تەفاصیلە نییە، باسیشـیان دەکـرد، بـۆ نمـوونە" یەکێك لەوانە (ئەبو زەینەب)ێك کە برایەکی شیعە بوو، کاتـی خـۆی پێموایە لە حزبی دەعوە بوو، یەکێك کە لە نزیك ئەوەوە بووە و ئاگای لێی بـووە گوتـی کە رۆژێك زۆر هاواری کرد میزم دێ، میز دەکەم، بمبەنە دەرێ، وتی: هەر نەیانـبرد لـەو شوێنە کە لێی ئەشکەنجەیان دەدا، زۆر هاواری کرد، هەر نەیانبرد، دوایی گوتـی ئەگـەر نەمـبەنەدەر، هەر لێرە دەیکەم، چونکە خەریکە میزەڵدانم دەتەقێ، وتی هـەر نەیانـبرد، وتـیان لـەوێ نەیکـەی هـا، دوایـی سـزات دەدەیـن، وتـی: بـە ناچـاری میـزەکەی لەوێ کرد، وتی: هاتنو وتیان ئەوە میزت کرد؟ هاتن لە نێو میزەکەیدا رایان خسـت، گوتـی هەمـوو میـزەکەیان بـە خـۆی سـڕییەوە، جـا نـوێژکەریش بـوو، هەمـوو ژوورەکـەیان پـێ سڕییەوە، هەموو بەدەنیان لە میز دەرداو وتیان ئەو جا ئاوا نوێژ بکە، ئەوە یەکێکە لە شتەکان.

**+ ئەو شوێنەی کە نۆ ڕۆژ لێی بوویت، بینا بوو، یان خێمە بوو؟**

- بینا بوو.

**+ پەنجەرەی تیا بوو؟**

- پەنجەرەکانیان بە تەختە گرتبوو.

**+ هیچ رووناکی نەبوو؟**

- هیچ نەبوو.

**+ کارەبای لێبوو؟**

– بەڵی کارەبای لێبوو، جار جارە کارەبا دەکوژایەوە.

**+ کاتتان چۆن دەزانی، شەوە، رۆژە، چەندی مانگە؟**

- وەڵڵا، بە مەزەندە، من ئەو شوێنەی کە لێی بووم، ئەو شوێنە یەك دوو لە برایانی دیکـەی لێـبوو، درزێکـی لـێ بوو، بە درزەکە دەیانزانی کە رۆژە، ئەو شوێنەی کە منی لێبووم درزو شـتی لـێ نەبـوو، نەمدەزانـی، بەس هەر بە مەزەندە تەقدیرم دەکرد، جا ئـیتر نەمدەزانـی تەقدیـرەکەم راسـتە، دروسـتە؟ گرنگ ئەوەیـە هـەوڵم دەدا لـە شـەوو

ڕۆژێکدا پێنج جار نوێژ بکەم، بە تەیەموم، بە دانیشتنەوە، نوێژەکانم بە دانیشتنەوە دەکرد، بە پێوە بۆم نەدەکرا.

**+ دوایی چۆن‌و بە چی ڕۆژەکانتان دیاری دەکردو کاتەکانتان دەزانی؟**

- دوایی کە بردینیانە ژوورە ئینفرادییەکان، ئەو کاتە لە یەکترمان دەبیست، من بۆیە دەڵێم لەوانەیە تەقدیرەکانم تەواو نەبووبێت، وامدەزانی دە ڕۆژ لە شوێنی ئەشکەنجە بووم، دوایی دیار بوو ئەوان (هاوڕێکانم) وتیان: نەخێر، نۆ ڕۆژە. واتە حیسابمان کرد ڕۆژی ٧/٢٠ من لە ئەشکەنجە، لە قۆناغی یەکەم نەجاتم بوو، من وامزانی بیست‌و یەکە، واتە شەوو ڕۆژێك لە مێشکمدا زیاد بوو بوو.




# تەوەرەی شەشەم:
# هاوڕێیانی نێو زیندان

**٢٠٠٥/٧/٣**

**ستۆدیۆی کەناڵی سلێمانیی تەلەفزیۆنی کۆمەڵ**

**+ مامۆستا عەلی باپیر، سەرەتا دەمانەوێ بزانین کێبوون هاوڕێیانی نێو زیندانت؟**

- بسم الله الرحمن الرحيم.. الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله، محمد وآله وصحبه ومن اهتدى بهداه.. دەربارەی ئەوانەی کە لەگەڵم بوون لە زینداندا، کە پێیان دەوت سەربازگەری "کرۆپەر"، من پێیان ناڵێم هاوڕێیان، چونکە هاوڕێ ئەوەیە کە لەگەڵت بەڕێدا بڕوات، ئەوانە لەگەڵ مندا یەکڕێ نەبوونو یەك ڕا نەبوون، دەتوانین بڵێین دراوسێیانی نێو زیندان، چونکە ئێمە هەر بە حوکمی ئەوەی کە ژوورە ئینفرادییەکانمان بە تەنیشت یەکەوە بوون، یاخود لەیەك سەربازگەدا بووین، هەر ئەوەبوو کۆی کردبووینەوە، ئەگەرنا، خاڵێکی دیکەی هاوبەشمان (سەبارەت بە من) لەگەڵ ئەواندا نەبوو، جگە لەوە نەبێت کە بە حوکمی جوگرافی شوێنەکەمان، ژوورەکانمان بەتەنیشت یەکەوە بوون.

ئەگەر بە کورتی بیڵێم، ئەوانەی لەگەڵم بوون لەو سەربازگەیەدا، هەموو سەرانی ڕژێم بوون، سەرکردایەتیی سیاسیو ئیداریی ڕژێمی پێشوو هەموویان بوون، دیارە لە سەرەتاوە صەددام حسێنو عەلی حەسەن مەجیدو هەندێکی دیکە لەوێ نەبوون، ئەوانە دوای ئەوەی کە من لەوێ بووم، هێنایانن، بەڵام ئەوانی دیکە، مەگەر ئەوەی کە نەکەوتبێتە بەر پەلی ئەمریکییەکانو دەستگیر نەکرابێ، یاخۆ بەدەستەوە نەدابێ، ئەگەرنا هەموویان بوون.

**+ ئەوەی کە لەیادت بێت، بتوانیت ناوەکەیمان پێ بڵێیت، لەگەڵ پۆستەکەیدا، ئەوانەی کە تا ئێستا لەیادتن.**

- بەڵێ، ئەوەی کە لە یادم بن، دیارە دوای ئەوەی کە من ماوەیەك لەوێ بووم، صەددام حسێن-یان هێنا، با لەوەوە دەست پێبکەین، دیارە ئەو کەسی یەکەمیشیان بووە، پاشان تاریق عەزیز، ئینجا تەها یاسین ڕەمەزانو ئینجا عەلی حەسەن مەجید، پاشان وەزیری بەرگری سوڵتان هاشم، وەزیری نەوت کە ئێستا ناوەکەیم لەیاد نییەو (ئەبو فاتن)یان پێدەوت، چونکە ئەوان لەوێ یەکتر بە کونیە بانگ دەکەن، دیارە

دکتۆرێك بوو، ڕەنگە دوایی ناوەکەی بێتەوە یادم[11]، ئینجا وەزیری تەصنیع عەسکەری عەبدوتتەواب مەلا حوەیش، وەزیری بازرگانی دکتۆر موحەممەد ئەلڕاوی، وەزیری ئەوقاف دکتۆر عەبدولمونعیم ئەلتکریتی، هەرچەندە ئەو دەیگوت: "شێخ، پێم خۆش نییە پێم بڵێن تکریتی، هەر پێم خۆشە بەناوی باوکمەوە ناوم هەڵدەن". پیاوێکی شەرم بەخۆو هێدی و مەندیش دیاربوو، ئینجا وەزیری کشتوکاڵی لێبوو، وەزیری نێوخۆی لێبوو، هەندێ لەوانە پێشتر بەردران، سەرکردە سەربازییەکانیان جگە لە وەزیری نێوخۆ، ئەوانیتر ئەوەی کە ڕوتبەی لیواو ئەوانەیان هەبوو، ژمارەیەکی زۆری لێبوون، یەکێ لەوانە قەیس ئەلئەعزەمی، یەکێکی تر لەوانە لیوا فەرحان ئەلجەبوری بوو، هی تریشی لێبوون، ئینجا هەندێ لە بەڕێوەبەرە گشتییەکانو هەندێك لەوانەی موخابەراتو خزمەکانی صەددام بوون، هەروەها بەرزانو وەتبانو ئینجا دوایی سەبعاوی یان هێناو بەرزانێکی دیکەی لێبوو کە ئەو دەبوو بە ئامۆزای صەددام، ئەو عەسکەری بوو، دەتوانین بڵێین ئەوە ناوی هەندێکیانە، دەنا ئەوانەی ڕژێم، ئەوەی کە خۆی پەنهان نەکردبێت، هەموویان لەوێ بوون، جا چ ئەوەی کە خۆی بەدەستەوە دابێت، لەوێبوو، کە بەزۆری ئەوان خۆیان خۆیان تەسلیم کردبوو، چ ئەوەی کە ئەمریکییەکان گرتبێتیان.

**+ کە جەنابت برایتە "کرۆپەر"، ئەوانەی لەوێ بوون زۆربوون؟ یان دوای تۆ زۆربەیان دەستگیرکرانو هێنرانە ئەوێ؟**

- زۆربەی هەرەزۆریان لەوێ بوون، یەکێکی دی لەوانە (مزبان خزر هادی) کە ئەوە ئەندامی "ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش" بوو، ژمارەیەك لە ئەندامانی "ئەنجومەنی قیادەی قوتری"، وەکو دکتۆر سەیفەددین ئەلمەشهەدانی، سەمیر ئەلنەجم، زۆریتر، لەڕاستیدا ئەندامانی ئەنجومەنی قیادەی قوتری زۆریان لەوێ بوون.

**+ مامۆستا، صەددام-یش کە لە زیندانداییەو لە "کرۆپەر"ە، هیچ کات لەگەڵی بوویت؟ یان هیچ کات بینیوتە؟ لە نزیکەوە گفتوگۆتان کردووە؟**

---

[11] دکتۆر عامر بوو.

ـ صەددام شوێنی جیا بوو، هەر لە بازنەی ئەو سەربازگەیەی "کرۆپەر"دا بوو، بەڵام شوێنەکەی جیابوو، ئێمە دەمانبینی کە دەیانبرد بۆ سەر پزیشك، یان بۆ کاتی تەحقیق، جار جار دەیانبردو نەماندەزانی بۆ کوێی دەبەن، بەس دەمانبینی کە ئۆتۆمبێلی (مقفص)یان دەهێناو ئەویشیان دەهێناو یەك دوو نەفەر، یەك دوو سەرباز دەستیان دەگرتو ئەملاو لایان دەگرت، یان کە بۆ حەمامیان دەهێنا، هەندێکیان، هەموو نا، ئەوانەی کە لێی نزیکبوون دەیانبینی، بەڵام بە قسەکردن نا، چونکە شوێنەکەی جیابوو دووریش بوو، کاتێ کە ئەویشیان دەهێناو ئەملاو لایان پێدەکرد، لە سەرەتاوە نا، بەڵام دوایی دەیان وت "Lock Down"، دەبوو هەموو بڕێینە ژوورەکانو پەنجەرەکانیشیان دادەخست، بەڵکو جاری واش هەبوو دەیان وت لە ژوورەکەشدا نابێ بەپێوە بوەستن، دەبوو ڕابکشێی لەسەر قەرەوێڵەکەو هیچ نەبینی، ئەوجا دەیانهێنا، بەڵام خەڵك لە درزەوە هەر دەیبینی، ئەوە دیارە لەسەرەتاوە وانەبوو، دوایی تۆزێ توندیان کرد.

هەر نکوڵیشیان دەکردو دەیانوت "صەددام لێرە نییە"، بەڵام دوایی هەر پاسەوانەکان خۆشیان پێیان دەگوتین: "بەڵێ، ئەو لە فلان شوێنە"، بەئەمانەت، بەهەندێ لە دراوسێ سجنەکانمانیان دەگوت کە: "فلان کەس لێرەیەو لە فلان شوێنە"، دوایی هەر دەمانبینی، ئەوجار دوایی ئاشکرا دەبوو.

**+ ئایا لەسەر هەمووتان قەدەغە بوو کە ببیینن یا قسەی لەگەڵ بکەن، یان هەر لەسەر جەنابت قەدەغە بوو؟**

ـ لەسەر هەموومان، ئەگەر بەکورتی بۆتان باس بکەم" هەرچی هەڵسو کەوتو مامەڵەی زیندانە لەوێ، لە ڕووی ئیدارییەوە هەمووی وەکو یەکە، خواردن، کاتی خەوتن، کاتی وەرزش، بردن بۆ سەرئاو، بردن بۆ گەرماو، جلوبەرگو ئەو پێداویستیانەی بۆت دێنن هەمووی وەکو یەکە، جیاوازی لەنێوان کەس ناکەن، جگە لە صەددام، چونکە دیارە ئەویش وەکو ئێمە بوو، چونکە لێمان دەپرسین، لە پاسەوانەکان، دەیانگوت: "ئەویش خواردنو شتی هەر وەکو ئێوەیە". بەڵام پێموایە شوێنەکەی ئەو گەورەتر بووە. وەکو بیستمان، وتیان ژوورێکی (٣م X ٤م) بووەو حەمامی لەناودا بووە، کە دوایی بۆیان دروست کردووە، ئەگەرنا پێشێ دەیان هێنا بۆ

گەرماوێکی گشتی، کە ئێمەشیان بۆ دەبرد. بەڵام لە شتەکانی تر هەمووی وەکو یەك مامەڵەیان لەگەڵ دەکردین.

**+ بەهۆی پاسەوانەکانەوە، هیچ کات نەبووە ڕاسپاردەیەك بنێرن بۆ صەددام؟ لەگەڵ صەددام قسەو باس بگۆڕنەوە؟**

ـ لەگەڵ صەددام پێموانییە، چونکە لەوە زۆر سەختگیرییان دەکرد، بەڵام جاری وا هەبووە بە پاسەوانێکدا شتێکمان بۆ یەکێکی دیمان دەنارد، بۆ نموونە" من کتێبێکم پێویست دەبوو کە لای یەکێکیان هەبوو، دەمنارد، دوو وشەمان دەنووسی بۆ ئیدارەی زیندانو پاسەوان دەیبرد بۆ ئیدارەکە، کەمن فلان شتم لای فلان کەس پێویستە، یان فلان شتەی بۆ دەنێرم، پۆشاکێکی زیاد، یان پێداویستییەك، یان کتێبێك، بۆ وێنە: یەکێك لەوانە "صەحیحی بوخاری" لابوو، ئەویش لەتیف نوصەیف جاسم بوو، ئەویش هەر لە ئەندامانی "ئەنجومەنی قیادەی قوتری" بوو، ئەوە ڕۆژێك پرسی منی کردو وتی: "شێخ! من قورئانم زۆر خوێندۆتەوە، چیتر بخوێنم؟". وتم: صەحیحی بوخاری بخوێنە. دیارە کوڕێکی هەیە بەناوی دکتۆر ئەنمار، ئەویش هەر لەوێ بوو، دوایی پێش خۆی بەر بوو، وتی: "بە ئەنماری کوڕم دەڵێم، کە ئەوەم بۆ بنێرێ". وتم: زۆر باشە، دیاربوو کە بۆیان نارد، دوایی بە پاسەوانەکەم وت، ئەو کتێبەم بۆ بنێرن، وتی: "شتێك بنووسە بۆ ئیدارەی زیندان". نووسیمو بەڕاستی کتێبەکەی بۆ ناردم، نزیکەی مانگێك لام بوو، جاری واش هەبوو بە قاچاغی هەندێ لەوانە (وەکو دەمانبیست) لەگەڵ هەندێ لە پاسەوانەکان ڕێك دەکەوتن، نامەیەك، شتێکی تایبەتیان بۆ ماڵەوە دەنارد، ئیدی نازانم چەندی ڕاستەو چەندی ناڕاستە.

ڕەنگە پاسەوانەکە وەکو هەستێکی ئینسانی، یان عەتفێکی بەرانبەر بەیەکێکیان دەجولا، کە یان نەخۆش دەبوو، یان پیر دەبوو، ئیدی شتێکی هەبوو بۆ ماڵەوە، دوو وشەی دەنووسی بۆ ماڵەوە، یا ڕاسپاردەیەکی هەبوو دەینارد.

**+ بەڵێ مامۆستا، ئەو حاڵەتە لەگەڵ صەددام-دا، ئەو دوورییە، ئەو نەهێشتنی گفتوگۆو قسەکردنە، تا کاتی بەربوونیشت هەر وا مایەوە؟**

ـ هەروا بوو.

**+ واتە کەس دەنگی پێی نەگەیشت لە ڕێگەی پاسەوانەکانیشەوە؟**

- پێم وانیە، بەپێی زانیاریی من پێموا نییە، چونکە ئەو پاسەوانەکانیشی تایبەتبوون.

**+ کە دەتانبینی، چۆن دەهاتە پێش چاو، بە ورەبوو یان کەسێکی ڕووخاو بوو؟**

- جا بڕوا بکە ئێمە لەدوورەوە دەمانبینی، بەڵام قیتو قنج دیاربوو، ئیدی نازانم، بەڵام لە پاسەوانەکانمان دەپرسی: چۆنە؟ دەیانگوت: "لەوێش هەر توندوتیژە، قسەی لاواز ناکات". ئاوا پتەو دیارە، پاسەوانەکان وایان دەگوت، ئیدی نازانم.

**+ ئێوە لە تەوەرێکی پێشووتردا وتتان: کوردی تر کە لە "کرۆپەر" زیندانی کرابێت، جگە لە خۆتان، عومەر بازیانی یەکێك لە سەرکردەکانی گرووپی "ئەنصارلئیسلام" بوو، بەڵام ئایا هیچ کەسێکی تری غەیری جەنابت (وەکو کورد) لەگەڵ سەرکردەکانی تری بەعس لەوێ هەبوو؟ بۆ نموونە ئیسلامییەکان، یان یەکێك کە لەسەر تۆمەتی ئیسلامی زیندانی کرابێت لەوێ، لە کاتێکدا ئێمە ڕۆژانە گوێبیستی دەستگیرکرانی گەورە بەرپرسانی ڕێکخراوی "قاعیدە" لە عیراق و یاریدەدەرەکانی زەرقاوی دەبین؟**

- من پێم شك نایەتو نازانم، رەنگە لێی بووبن، من نەمبینین، بەڵام ئەوەی کە من بینیم (ئەویش بۆ ماوەیەك) عومەر بازیانی بوو، دوای ماوەیەك دیار نەما، من هەروا لەدوورەوە بانگم کردو وتم ئەوە لەکوێ بوویت؟ وتی: "بردمیانەوە بۆ سلێمانی، بۆ تەحقیق". یەکێکش کە لەنزیك قاتعەکەی ئەوەوە بوو بۆی باسکردمو وتی: "عومەر بازیانیم بینیوەو وتوویەتی کە من هەموو شتێکم گوتووە، ئیعترافم لەسەر هەموو شتێك کردووە". جا هەر ئەوم بینی، ئەویش بۆماوەیەكو دوایی دیار نەماو نەمزانی بۆ کوێیان بردو بۆ کوێیان گواستەوە، بەڵام سەبارەت بە ئیسلامییەکانیش، ئەم دوادواییە، بەر لەوەی من ڕزگارم ببێت، دەمبیست کە هەندێ خەڵکی ئیسلامییان بۆ هێناوە، عیراقیو غەیرە عیراقی، بەڵام ئەوان شوێنەکەیان تۆزێ جیاکردبوونەوە، نەمدەزانی کێن، بەس دەمانبیست، دەیانگوت "ئەمە هەندێ خەڵکی دیکەی ئیسلامییە". دیاربوو هەڵسوکەوتیشیان لەگەڵ ئەوان سەختتر بوو، کە دەیانبردن بۆ تەحقیق، بەسواری

عارەبانەیەك دەیانبردن، نەك بۆ خۆیان بەپێ برۆن، هەروەها زنجیریان دەكردن، مامەڵەیان لەگەڵیان سەختتر بوو، وەكو مامەڵەیان لەگەڵ ئێمە لەسەرەتاوە كە زیندانی كراین، رەنگە دوایی مامەڵەیان لەگەڵیان ئاسان كەن، جا كەسێكی تری دیاریكراو كە من ناوی بزانم، نەمبیست، بەس ئەوەندە هەیە دەمانبیست كە خەڵكی تری ئیسلامییان هێناوە.

**+ لەناو ئەو سەركردانەی بەعسدا كە دەستگیر كرابوون، كامیان لەهەموویان لێتان نزیكتربوو زۆرترین كات لە زیندان پێكەوە دەمانەوە؟**

ـ لەسەرەتاوە، كە یەكەم رۆژ دوای هەندێ ئازارو ئەشكەنجەو تەحقیقی سەرەتایی بردیانم بۆ قاعەیەك، كە نزیكەی پێش بەرەبەیان بوو، نیو سەعاتێك، سەعاتێك پێش بانگی بەیانی بوو، كە بە ژوور كەوتم، وتیان بچۆ ئەو قاعەیەوە، نزیكەی (٨ ـ ١٠) نەفەرێكی تێدا بوو، ئیدی من نەمزانی كێن، دوایی وردە وردە دونیا روون بووەوەو تینووم بوو، لە رووی تەندروستییەوە تۆزێ حاڵەتم ناجۆر بوو، دوای ئەزیەتدان‌و شت، وتم: ئەگەر ئاوی لێیە، ئاوم بدەنێ، وتیان: "بەڵێ فەرموو ئەوە ئاو، تۆ كێی؟" وتم: من فلان كەسم، ئەی ئێوە كێن؟ وتیان: "دوای نوێژ خۆمانت پێ دەناسێنین". ئەوەبوو نوێژمان كردو دوایی دەركەوت وەزیری ئەوقاف بوو، ئینجا كۆمەڵێك لە ئەندامانی "ئەنجومەنی سەركردایەتیی شۆرش" بوون، كۆمەڵێك وەزیری دیكە بوون، ئاوا لەو قاعەیەدا (٨ ـ١٠) نەفەرێك بوون، بەس من یەك رۆژ لەوێ مامەوە، دوایی یەكسەر بردینیان بۆ ژوورە تاكەكان، لە ژوورە تاكەكان ئەوەی كە زۆر بە حوكمی دراوسێیەتی‌و وەكو دراوسێیەتی لێم نزیكبوو، مزبان خزر هادی بوو، كە (ئەبو عروبە)یان پێدەگوت‌و ئەندامی "ئەنجومەنی سەركردایەتیی شۆرش" بوو، لەملامەوە وەزیری ئەوقاف بوو، كە دوای سێ مانگێك ئەو بەربوو.

لەراستیدا خەڵكەكە هێندێ جار گوازە گوازیان پێدەكردن، بۆ وێنە" من پێشێ یەكێ لە لام بوو بەناوی ئەبو ئەحمەد، خەڵكی بەسرە بوو، كاتی خۆی پارێزگاری بەسرە بوو، دوایی كە ئەو رۆیشت، دكتۆر موحەممەد ئەلراوی هاتە تەنیشتم، هەروەها دكتۆر سەتتام ئەلگەعود كە ئەو بەعسی نەبوو، ئەوە هەر بەوە تۆمەتبار كرابوو كە دەستی لەگەڵ رژێمە، یان لەبەر ئەوە كە دەوڵەمەندە، گومانی ئەوەیان لێدەكرد

هاوکاریی مقاوەمەی کردبێ، ئینجا کە دوایی گواستمیانەوە بۆ قاتعێکی دیکە، عەبدوتتەواب مەلا حوەیش وەزیری تەصنیعی عەسکەری لەملامەوە بوو، غازی عوبێد لەولا تربوو، پاشان بۆ ماوەیەکی دیکە عەلی حەسەن مەجید-یان هێنا، نزیکەی دوو ژوورمان بەین بوو، ئاوا بەو شێوەیە، خەڵکەکە وەنەبێ جێگیر بووبێ لەشوێنێ، بەڵام من نزیکەی دوو سێ شوێنیان پێکردم، خەڵکیان زۆر دەهێنا بۆ تەنیشتمو دەیانگواستنەوە، دەتوانم بڵێم ئەوانەی کە ناوم هێنان، بە حوکمی دراوسێیەتی نزیکتر بوون.

**+ تۆ کە بە درێژایی تەمەنت دژی بەعس بوویتو لای ئەوان قاچاغ بوویت، سەرەتای مامەڵەو یەکترناسینت لە زینداندا لەگەڵ ئەوان چۆن دەستی پێکرد؟ باست لە قاعەکە کرد، پێموابێ ئەوە یەکتر ناسینێکی سەرەتایی بوو. وەکو کرانەوە لەگەڵیان، دەستکردن بە قسەو باسو چوونە ناو درێژەی بابەتەکانەوە، چۆن دەستی پێکرد؟**

- یەکەمجار کە زۆر ئازارو ناڕەحەتیو شتم هەبوو، چوومە قاعەکە، یەکەمجار تێکگیراین، وتم ئێوە کێن؟ وتیان: "ئەوە فلان کەسو فلان کەسو فلان کەسە"، وتم واتە ئێوە سەرانی ڕژێمن؟ وتیان: "بەڵێ". وتیان: "تۆکێی؟" وتم منیش فلان کەسم، وتیان "ئێمەش ناوی تۆمان بیستووە، فلان کەسیت؟"وتم بەڵێ، دەی وتیان: "فلان کەس ئێستا یەك دەردمان هەیەو ئەمریکا دوژمنی هەموولایەکەو هەموولایەکمانی پێکەوە گرتووە، دەبێ چاوپۆشی لە شتی ڕابردوو بکەین". وتم ئاخر ئێوە ئەگەر ئاواو ئاواتان نەکردبایە، ئێستا ئەو بارودۆخە ئاوا نەدەبوو، زەمینە بۆ ئەمریکا خۆش نەدەبوو ئاوا بێت. وتیان: "کاکە ئێستا وەختی ئەوە نییە، جەنابت تازە هاتوویت، با تۆزێ یەکتر بناسین". من تۆزێ لەگەڵیان تێکگیرام، دوایی ئەوان دایانە نەرمی، وەکو بڵێی وتیان: "جەنابت میوانیو ئێمە ڕێزت دەگرین، ئەمجا دوایی تۆش بوار بدە پێکەوە گفتوگۆ دەکەینو قسە دەکەین". وتم باشە بەهەرحاڵ، بەڵام زۆرم پێ سەیرە، من بۆ هاتوومەتە ئێرە؟ وتیان: "خۆ بەدەست ئێمەش نییە، نازانین". پێم سەیر بوو، بۆ من وەکو موفاجەئە بوو، تەسەورم نەدەکرد من بچمە ئەوێ، هەرچەندە نزیکەی سێ چوار مانگی سەرەتا سەلام لەیەکترکردنیش قەدەغە بوو، ئەوەندە نەبێ کە

هێندێ لە پاسەوانەكان (وەكو هەڵوێستی شەخسی خۆیان) لەنۆرە وەرزشی خۆیاندا دەیانگوت: "لەنۆرەی مندا، كە من پاسەوانتان بووم، قسە بكەن قەیناكا"، قەدەغە بوو دابنیشیتو ڕاوەستیت، هەردەبوو بێیو بچیت، بەڵام دوایی وردە وردە هەندێ قسەی پچڕ پچڕمان لەو كاتەدا لەگەڵ یەكتردا دەكرد، بەڵام دوایی كە ماوەی وەرزشیان زیاد كردو كردیان بە دوو سەعات شەوو ڕۆژێو دواتر كە كردیان بەسێ سەعاتو چوار سەعات، پاشان پێشێ بوار نەبوو دابنیشین بەیەكەوەو نوێژی بەكۆمەڵ بكەین، دوایی بواری ئەوەشیان دا، نزیكەی دوای (٨ ـ١٠) مانگێك لە مانەوەی من لە زینداندا، واتە دوای ساڵێك بواریاندا كە قاتعێك (كە حەوت نەفەر بوو) بەیەكەوە دابنیشن، كورسییەكان دابنێینو مێزیان بۆ هێناینو لە دەوری مێزەكە دابنیشین، یا جار جار كاتی نیوەڕۆ پێكەوە نان بخۆین، یا پێكەوە نوێژ بەكۆمەڵ بكەین، ئەگەر كاتی نوێژ بێت، ئەو كاتە زیاتر بواری گفتوگۆمان بۆ كرایەوە، لەوكاتەدا ئەوان زیاتر منیان ناسی، لەسەرەتاوە هەر دەیانزانی من ئەمیری كۆمەڵی ئیسلامییم، كاتی خۆی لە بزووتنەوەی ئیسلامییدا بووم، دوژمنی سەرسەختی ڕژێمی بەعس بووم، منیان دەناسی، دەیانگوت: "تۆمان بە پیاوێكی خەتەر دەزانی، كە دەیانگوت ئینسانێكی زۆر مەبدەئییەو ڕژێمی بەعسی پێ كافرە، شتمان زۆر لەسەر تۆ بیستووە". وتم بەڵێ، من ئەوم.

جا سەرەتاكەی بەو شێوەیەبوو، وردە وردە، دیارە زیاتر ئەوانیش كە منیان ناسی، وەكو ئەفكارو تەسەوراتم، منیش زیاتر دەرگای قسەو گفتوگۆم بۆ كرایەوەو بوارمان پێدرا، ئاوا چووینە ناو قسەو باسی زۆرەوە.

**+ واتە مامەڵەكانت لەگەڵ ئەو بەعسییانەدا لەسەر چ ئاستێك بوو، بە چ شێوازێك بوو؟ بۆ نموونە، دەچووە بابی ئامۆژگاری؟ دەچووە بابی گفتوگۆو باس لە هەندێ ڕابردووی تاوانكارییان دەكرا؟**

ـ نەك هەر گفتوگۆو ئامۆژگاری، بەڵكو زۆر بە ڕاشكاوی دەتوانم بڵێم كە ئەوەی لێرە گوتوومە، لەسەر مینبەرەكان، لەوێش هەر ئەوەم پێدەگوتن، بەڵام دیارە لەگەڵ ڕەچاوكردنی باری دەروونییان، لەگەڵ ڕەچاوكردنی كەشی ئەوێ.

بۆ وێنە: جارێکیان کۆمەڵێك لە وەزیرو ئەوانە، کە لێم نزیك بوون لە ئەندامانی "ئەنجومەنی قیادەی قوتری" دانیشتبووین، پێم گوتن من لەبەر خوا هەندێك ئامۆژگاریتان دەکەم، زۆر بەجددی لێم وەرگرن، وتیان: "فەرموو"، وتم لەڕاستیدا ئێوە صەددام حسێن-تان کردبوو بە بتێكو دەتان پەرستو پەیکەرەکانی کە بۆتان دروستکردبوو، لە بەغداو شارەکانی دیکە، بتەکانی "لاتو عوززا"و ئەوانەی دەهێنایەوە یاد، ئێوە داهاتی عیراقتان هەموو تەرخان کردبوو بۆ پیرۆزکردنی ئەو کەسە، واتە هەموو ئیمکانیاتێکتان بۆ ئەوەبوو کە کەسێك پیرۆز بکەن، لەبەر ئەوە پێمخۆشە زۆر چاك بزانن کە ئێوە لەسەر خەتی ئیسلام ترازابوون، لەڕاستیدا ئەوان خۆیان بە مسوڵمان دەزانی، وتم: چونکە ئیسلام بناغەکەی تەوحیدە، خوا بەیەکگرتن، تەنیا خوا بپەرسترێت، خوا بەندایەتی بۆ بکرێ، تەنیا خوا بە پەروەردگارو حاکم بزانرێ، بەلام ئێوە ئەو کەسەتان بەهەموو شتێکی خۆتان دەزانی، ئەوەم بە بەڵگەوە بۆ هێنانەوەو وتم کاتی خۆی من لە پەیمانگای ئیسلامیی بووم لە سلێمانی، نەوەدو نۆ ناوتان بۆ صەددام بلاو کردەوە، وەکو (أسماء الحسنى)ی خوای پەروەردگار، نەوەدو نۆ سیفەتتان لێ هەڵدابوو، شوبهاندبووتان به خوا (جلّ شأنه)، ئینجا باسی خەیروڵلا تەڵفاح-م کرد کە نامیلکەیەکی نووسیبوو: "ثلاثة ماكان على الله ان يخلقهم، اليهود والفرس والذباب". ئەوە کوفرەو ئەنجا وەزارەتی ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندنی خۆشتان بۆی چاپ کردبوون. باسی کتێبولکەی "نظرة في الدين والتراث"ی صەددام حسێن-م کرد کە چۆن باسی ئیسلام دەکاتو دەڵێ: "شەریعەتی ئیسلام بە کەڵکی ژیان نایە"و باسی هێندێ بیروڕای میشیل عەفلەق-م کرد کە ئەو بەڵێ باسی پێغەمبەری ﷺ دەکرد، بەلام وەکو سەرکردەیەکی عەرەبیی هەڵقولاوی نێو کۆمەڵگەی عەرەبی باسی دەکرد، نەك وەکو پێغەمبەرێك کە خوا وەحی بۆ بنێرێو ئەمانە.

بەڵێ زۆر بە زەقیو بەڕەقی زۆر شتم پێدەگوتن، دیارە ئەوانیش لەسەرەتاوە لەگەڵم تێکدەگیران، جاری وا هەبوو لێك توورە دەبووین، ئەوان بەڕاستی کێشەیان ئەوەبوو بەڵگەو شتیان بەدەستەوە نەبوو لە بەرانبەر مندا، من لەسەر بناغەی: یەکەم" قورئانو سوننەت قسەم لەگەڵدا دەکردن، کە ئەوان بەڕاستی لەو شتانە شارەزا نەبوون. دووەم" لەسەر بناغەی واقعێك کە من تیایدا ژیابووم.

واقیع ئا بەو شێوەیە بوو نەیاندەتوانی ئینكاری بكەن.

دیارە جار جار هێندێ شتیان دەهێنایەوەو دەیانگوت: "نا بەو شێوەیە نەبوو، یان موبالەغە كراوە"، بۆ نموونە: باسی كیمیاباران‌و ئەنفال‌و ئەوانەم دەكرد، دەیانگوت: "ئێمە شتمان بیستووە، بەڵام بەو شێوەیە نەبووەو موبالەغە كراوە". هەر چۆن بێ من لەڕووی بەڵگەوە قسەكانم بەهێز بوو، هەم پشت ئەستوور بوو بە قورئان‌و سوننەت، هەم بە بەڵگەی واقیعی.

تۆ پرسیارت كرد ئایا چۆن بوو؟ ئەمجارەیان تێكگیرانی تێدا هەبوو، ئامۆژگاریشی تێدا هەبوو، زۆر ئامۆژگاریشم دەكردن، ئیمانتان وابێ، عەقیدەتان وابێ، خواپەرست بن، نوێژ بكەن، ڕەوشتتان وابێ، هەتا كە لەڕووی پەیوەندی نێوخۆیان تێك دەگیران، ئامۆژگاریم دەكردن.

لەڕووی ڕوونكردنەوەی ڕاستییەكانی ئیسلام، بۆم ڕوون دەكردنەوەو لەو ڕووەوە دەمگوت: باشە ئێوە دامەزرێنەری حزبەكەتان میشیل عەفلەق بووە، میشیل عەفلەق كابرایەكی گاور بووە، ڕۆژێك یەكێك لە بەرپرسە بەرزەكانیان تۆزێ گفتوگۆو مشتومڕی لەگەڵ مندا كردو وتی: "شێخ، ئێمە خۆمان بە موسڵمان دەزانین، بەڵام حزبی بەعس ئێمە دروستمان كرد بۆ دیفاع لە ئوممەتی عەرەبی‌و.." وتم: جارێ زاراوەی (الأمة العربية) هەر هەڵەیە، بڵێ: گەلی عەرەبی، ئوممە ئوممەتی ئیسلامییە، چونكە ئوممەت واتە كۆمەڵە كەسێك كە لەسەر بەرنامەیەك كۆببنەوە، بۆ مەبەستێك تێ بكۆشن، عەرەب ئێستا نەصرانی تێدایە، عەلمانی تێدایە، موسوڵمانی تێدایەو سەر بە جولەكەشی تێدایە، سەر بە ئەمریكای تێدایە، سەر بە ڕووسیای تێدایەو سەر بە هەرچی تێدایە، كەی ئوممەتن، بڵێن گەلی عەرەبی، گوتی: "بەهەرحاڵ، ئێمە حزبی بەعسمان دروست كرد بۆ خزمەتی ئەوەو، ئینجا گەلی عەرەبیش، ئوممەتی عەرەبیش موسوڵمانەو خۆشمان بە موسوڵمان دەزانین"، وتم باشە، ئاوا یەخەم گرت‌و وتم وەرە، سەییدیش بوو، خۆی بە سەیید دەزانی، وتم باشە ئەگەر لەڕۆژی قیامەتدا پێغەمبەر ﷺ ئاوا یەخەی گرتی‌و وتی: وەرە خۆت بە نەوەی من دەزانی، منت بە باپیری خۆت دەزانی، ئایا من قورئان‌و سوننەت‌و شەریعەتی ئیسلامم بۆ بەجێ هێشتبوون یا "في

سبیل البعث"ی میشیل عەفلەق؟ ئایا من ڕابەرت بووم کە قورئانو سوننەتم بۆ بەجێ هێشتبووی، یا میشیل عەفلەق کە حزبی بەعسی بۆ دروست کردبوویت؟ چ دەڵێی؟!

وەڵڵا کابرا گریاو وتی: "وەڵڵا تا ئێستا فیکرم لەو قەزیە نەکردبۆوە، واتە باشە حزبی بەعسیش دینە؟!". وتم: ئەی دینە، چۆنە؟ وتم دین واتە مەنهەجی ژیان، تۆ دوای دینی میشیل عەفلەق کەوتووی، نەك دینی پێغەمبەر ﷺ، جا ئاوا لەو بابەتە، زۆر مشتو مڕمان دەبوو، دەتوانین زیاتر درێژەی بدەینێ.

**+ مامۆستا ئەو کاتە کەی بوو شوێنەکەی کوێ بوو؟**

- هەر لەو شوێنە.

**+ لەناو ژوورەکانی زیندان؟**

- نا، ئەوە دوایی کە بۆ وەرزش دەریان دەکردین، ئەو دوو سێ سەعاتە بەیەکەوە دادەنیشتین، یان بەیەکەوە هاموشۆمان دەکرد، بەس هەندێ قسەی زەقو ئەوانەم کە پێ دەوتن، مەگەر کاتی تێکگیران بوایە، ئەگەرنا هەردوو بەدوو پێم دەگوتن، چونکە دەمگوت لەناو یەکتردا کابرا ئامۆژگاری باش قەبووڵ ناکات، یان هەست بە شکانەوە دەکات، دوو بەدوو قسەی زۆر ڕوونو ڕاشکاوم پێدەگوتن، مەگەر کە دادەنیشتین خۆیان شتێکیان بورووژاندایە، دیارە من چی بەڕاستم دەزانی، وام دەگوت، ئەگەرنا، ئەو قسانەی کە شتی تایبەتی یان ئامۆژگاری تایبەتی، یا نوقورچلێدانی تایبەتی بوونو دەمویست کە خەبەریان بکەمەوە، زیاتر دوو بەدوو قسەم لەگەڵ دەکردن.

**+ پێمان خۆشە لەسەر گفتوگۆکان لەگەڵ سەرکردەکانی بەعسدا زیاتر بزانین، بە تایبەت کە ئێستا لە ناوچەکەو لە جیهانیشدا تامەزرۆییەك هەیە بۆ بیستنی هەواڵی سەرکردەکانی بەعس، لێرەش ئێمەی کورد ئەزموونێکی تاڵمان بەتایبەت لەگەڵ چەند سەرکردەیەکیاندا هەیە، وەکو عەلی حەسەن مەجید، وەکو کەسانی تر، پێمان خۆشە زیاتر بچینە درێژەی ئەو گفتوگۆیانەوە. ئەو تەوەرانە چیبوون کە لەبارەیانەوە گفتوگۆت لەگەڵ دەکردن؟ با سەرەتا گفتوگۆی عەلی حەسەن مەجید بە نموونە وەربگرین.**

ـ من پێم باشه پێش ئەوەی بێینه سەر باسی عەلی حەسەن مەجید، وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە، ئەو تەوەرانە چیبوون؟ دوای ئەوەی لەگەڵیان تێکەڵ بووم‌و پێیان ئاشنا بووم، تەماشا دەکەم ئەوانە هەموویان خۆیان بە مسوڵمان دەزانن، زۆربەشیان ئەگەر نەڵێم هەموویان بە جۆرێك لە جۆرەکان نوێژیان دەکرد، هەیانبوو من فێرە نوێژم کرد، هەشیانبوو بەجۆرێك لە جۆرەکان نوێژێکیان دەکرد، هەموویان خۆشیان بە مسوڵمان دەزانی، من وتم ئەوە پێویست دەکات تێیان گەیەنم کە ئیسلام واتای چی؟ خۆشیان بە مسوڵمان دەزانی‌و خۆشیان بە بەعسی دەزانی، پێشیان وابوو کە بەعسایەتی‌و مسوڵمانەتی هیچ ناکۆکییەکیان پێکەوە نییە، من بەڕاستی ئەوەی کە دوایی زۆر کاری تێکردن و زۆر زەمینەی بۆ من خۆشکرد کە چاك بیروباوەڕی بەعسیان لە مێشك‌و دڵدا هەڵتەکێنم، ئەوەبوو کە هەستام چەمکی دینم بۆ ڕوون کردنەوە، چەمکی عیبادەتم بۆ ڕوون کردنەوە، چەمك‌و واتای ئیسلامم بۆ ڕوون کردنەوە، چەمك‌و واتای پەرستراوێتی خوا (الوهـية)، چەمك‌و واتای (ربوبـية)ی خوا (جلّ شأنه)، پەروەدگارێتی خوا، ئەوانەم کە بۆ ڕوون کردنەوە، هەیانبوو سەدو هەشتا پلە دەگۆڕا. بۆ وێنە" ڕۆژێك ئاوا دانیشتبووین، خۆیان داوایان دەکردو دەیان وت: "شێخ، (نوّرنا)". دەیانوت: "کە تۆ قسەمان بۆ دەکەیت، هەست بە ئاسوودەیی دەکەین‌و دڵمان خۆش دەبێت‌و دەچینە جیهانێکی دیکەوە، قسەمان بۆ بکە، هەر ڕۆژە بۆ خۆت چ بابەتێکت پێ چاکە، لە بارەیەوە قسەمان بۆ بکە".

ئەوە سەرەتای دەرسەکانم بوو بۆیان، واتە ئەگەر نیوسەعات دانیشتباین، بیست دەقیقەیان بۆ من تەرخان دەکرد، دەیانگوت: "بیست دەقیقە قسەمان بۆ بکە، پانزە دەقیقە قسەمان بۆ بکە"، ئەگەر سەعاتێك بووایە، دەیانوت: "نیو سەعات قسەمان بۆ بکە".

من هەڵسام کۆمەڵێك چەمکم بۆ ڕوون کردنەوە، وتم من بە پێویستی دەزانم هەندێ چەمك هەیە، هەندێك زاراوە هەیە ئەگەر ئێوە تێی بگەن باشە، دەبێتە کلیلێك بۆ تێگەیشتنتان لە قورئان‌و لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ‌و لە ئیسلام‌و لە دینداری. وتیان: "باشە، تۆ چیت پێ چاکە بۆمان باس بکە".

من چـەمكی دینم بۆ باس كردن، وتم بۆ ئەوەی كە بەڕاستی لە دین حاڵییان بكەم، كە ئـەوان لەسـەر ڕێبازی پێغەمبـەر نـین ﷺ لەكاتـێكدا كـە خـۆیان بە بەعسی بزانن، ناتـوانن خـۆیان بە مسوڵمان بزانن. كاتێ كابرا خۆی بە عەلمانی بزانێ، بەلادینی بزانێ، بـە غەیرە دیـن بزانێ، ناتوانێ خۆی بەدیندار بزانێ، ئەوان كە خۆیان بە بەعسی بزانن، ناتـوانن خـۆیان بـە مسـوڵمان بـزانن، بـۆم باس كردنو گوتم: وشەی دین لە قورئاندا بە چوار واتـا بـەكار هاتووە، بە واتای سزاو پاداشت، خوای پەروەردگار دەفەمووێ (مَالِكِ يَـوْمِ الـدِّينِ) (الفاتحـة: ٤)، هـەروەها بـەمانای ملكەچـی، وەكـو خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ (أَلَـا لِلَّـهِ الـدِّينُ الْخَـالِصُ) (الزمر: ٣)، واتە بێگومان ملكەچیی ساغ تەنیا بۆ خـوایە، یـان (فَاعْبُدِ اللَّـهَ مُخْلِصاً لَّهُ الدِّينَ) (الزمر: ٢). وشەی دین لێرەدا واتە ملكەچی (خضـوع)، واتـای سـێیەم واتـە بەرنامـە، بەرنامـەی ژیـان، وەكـو خـوای پـەروەردگار فەرمووویەتـی: (لَكُـمْ دِينُكُمْ وَلِـيَ دِينِ) (الكافـرون: ٥)، دینـی خـۆتان بـۆ خـۆتان، واتـە بەرنامـەی خـۆتان بـۆ خـۆتان ئەی كافرەكانو بەرنامەی خۆشم بۆ خۆم، چونكە لێرەدا (سـوورەتی الكافـرون) خیـتاب لەگـەڵ ئەهلـی كوفـرە (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ* لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ* وَلَـا أَنـتُمْ عَابِـدُونَ مَا أَعْبُدُ* وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ* وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ* لَكُـمْ دِينُكُمْ وَلِـيَ دِينِ). كەواتە كافریش دینیان هەیە، (لَكُمْ دِينُكُمْ) ئەی كافرەكان دینی خـۆتان بـۆ خۆتان، (وَلِيَ دِينِ) منیش دینی خۆم بۆ خۆم، دینی كافرەكان چییە؟ خەڵك وا دەزانـێ وشـەی دین تەنیا دینی ئاسمانی دەگرێتەوە، بەڵام وانییە، چونكە كافرەكان تەنیا ئەهلـی كیـتاب نـین كـە وشـەی دیـن یەهودییەتو نەصرانییەتو مەجووسییەتو ئەوانـە بگـرێتەوە، بەڵكو كافـرەكان هەیانـە مولحیدە كە هیچ دینێكی[12] نییە، هەیانە زەندیقـە، هەیانـە جولەكەیە، هەیانـە نەصـارایە، هەیانـە هاوبـەش پەیدا كەرە، هەیانە بتپەرسـتە، هەیانـە دووڕووە، هەیانە مورتەدە، واتە مسوڵمانەو هەڵگەڕاوەتەوە، كەواتە (قُـلْ يَـا أَيُّهَـا الْكَافِـرُونَ) هەمـوو جۆرەكانـی ئەهلـی كوفـر دەگـرێتەوە، خـوای پـەروەردگاریش وشـەی دیـن پـاڵ دەداتـە لای هەموویان، دەفەرموێت (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ)، كەواتـە هەمـوو كافـرێك دینێكـی هەیە، دین واتە بەرنامەی ژیان، واتە مەنهەجی

---

[12] واتە (دین) بە چەمكە عورفییە باوەكەی كە دینی ئاسمانییە.

ژیان، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ) (التوبة: ٣٣).

دینی حەق واتە ئیسلام، (عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ)، هەموو دینەکان، کە لێرەدا وشەی دین، (ال)ی جنسی لەسەرە، واتە جنسی دین، واتە هەموو بەرنامەکان، کە هەموو ئەو بەرنامانە دەگرێتەوە کە خەڵك پەیڕەویان لێدەکات بۆ ڕێکخستنی ژیانی تاکیو کۆمەڵیی، بەو پێیەبێ عەلمانییەت دینە، دیموکراسییەت دینە، کۆمۆنیزم دینە، عەولەمە دینە، هەر وەکو چۆن یەهودییەتو نەصرانییەتو مەجوسییەتو ئەوانەش دینن.

واتای چوارەمی وشەی دین لە بەکارهێنانی قورئاندا واتە ئیسلام، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الإِسْلاَمُ) (آل عمران: ١٩)، وشەی دینی بە ئیسلام داناوە، یان (وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً) (المائدة: ٣). واتە ئیسلامم بۆ کردوون بەدین، واتە بە بەرنامە.

بۆ سەرانی بەعسم ڕوون کردەوە کە دین واتە بەرنامەی ژیان، بۆشم ڕوون کردنەوە بەڕاشکاوی کە بەعسایەتی دینە، عەلمانییەت دینە، دیموکراسییەت دینە، سەرمایەداری (کاپیتالیزم) دینە، سۆسیالیزم دینە، سیکۆلاریزم دینە، عەولەمە دینە، ئینجا هەر ڕێچکەو ڕێبازێکی تر کە دادەنرێ خەڵك کۆبکاتەوەو ژیانی خەڵك بەشێوەیەك لە شێوەکان ڕێکبخات دوور لە هیدایەتی خوا، دینە، بەڵام هەموویان دینی بەتاڵن، کە خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: (هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ)، خوا ئەو زاتەیە کە پێغەمبەری خۆی ناردووە بە هیدایەتەوە، بەدینی حەقەوە، کەواتە موقابیلی دینی حەق، دینی بەتاڵ هەیە، (لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ)، خوا پێغەمبەری خۆی ناردووە بەهیدایەتەوە بۆ تاکەکان، بەدینی حەقەوە بۆ کۆمەڵگاکان، (لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ)، بۆ ئەوەی زاڵیکا بەسەر هەموو بەرنامەکاندا، واتە هەموو بەرنامەکان بخاتە ژێر هەژموونو ڕکێفی خۆیەوە.

دوای ئەوەی کە وشەی دینم بەو شێوەیە بۆ شیکردنەوە، پرسیاریانکرد: "واتە ئێمە کە بەعسی بووین، لەسەر دینێکی کە بووین؟". وتم: بەڵێ بێگومان، وتم پرسیارێکتان لێدەکەم، وتیان: "بەڵێ"، وتم: ئەگەر کاتی خۆی لە صەددام حسێن–

تـان پرسـيبا، ئايـا ئـەو بەرنامـەی ئـێمە كـە ناومـان لێـناوە "حـزب الـبعث العربـي الأشـتراكي"، وەكـو ئيسـلامەو قـورئانو سـوننەتە، يـا شـتێكی ديكەيـە، چی دەگوت؟ وتـيان: "دەيگـوت وەڵڵا ئەمـە شـتێكی ديكەيـە، چـونكە ئيسـلام وەكـو كەلەپـوورێك تەماشـا دەكـرێ". وتم باشـە مـن پرسـيارێكی تـر دەكەم، ئەگەر گوترابا حزبی بەعسی ئيشـتراكیو ئەوانـە لا بـەرنو قـورئانو سـوننەت لەجـێێ دانـێن، ئـێوە ڕازی دەبـوون؟ وتـيان: "باشـە خـۆ ئيسـلام هـەر ئيسلامەو ئەوە بۆ قيامەتەو بۆ عيبادەتە"!، وتم: نا، جـا ئاخـر هەڵەكەتان لێرەدايە، نەخێر ئيسلام وا نييە، بەڵكو ئيسلام دوای شێواندنی لە زيهنـی ئـێوەدا، واتـان زانـيوە كـە شـتی شەخصييە، قياسی ئيسلامتان كردووە لەسەر نەصـرانييەتی ئـەوروپا، نەصـرانييەتی ئەوروپا دوای ئەوەی دينی مەسيح (عليه الصلاة والسـلام) تەحريفكراو گۆڕدراو كرايەوە بەشتی شەخصی، پڕ كرا لە كۆمەڵێك خورافاتو ئەفسـانە، ئـێوە ئيسـلامتان قـياس كـردۆتە سـەر ئـەوە، ئەگـەرنا، ئيسـلامێك كە دينی حەقـی خوايە، كورت هەڵنەهاتووە لە دروشمەكاندا، بەڵكو ئەو ئيسلامە كە دينی حەقی خـوايە، هـەم هـيدايەتە بـۆ شـەخص، هـەم بەرنامەيـە بـۆ ژيانـی كـۆمەڵ، وەكـو خـوای پـەروەردگار وای ناو لێناوە (بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ).

بەڕاسـتی دوای ئـەوەی چـەمكی ديـنم بەتـەواوی بـۆ ڕوون كـردنەوە، ئينجا چەمكی عيـبادەتم بـۆ ڕوون كـردنەوە، وتم ئـێمە دەڵـێين (إِيَّـاكَ نَعْبُدُ وإِيَّـاكَ نَسْتَعِينُ* اهـدِنَـــا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ) (الفاتحـة: ٥-٦)، ئـێمە قسـە لەگـەڵ خـوای پـەروەردگار دەكەين و دەڵـێين: هـەر تـۆ دەپـەرستينو داوای يارمەتـيش هـەر لـە تـۆ دەكـەين، ڕێـی ڕاستمان پێنيشـاندە. عيـبادەت واتـای چـی؟ وتيان: "عيبادەت واتە نوێژ، ڕۆژوو، زيكر، دوعا". وتم نەخێـر، ئـەوە بەشـێكی بچووكی عيـبادەتە، عيـبادەت ئەسـڵی ماناكـەی لـە زمانی عەرەبـيدا دەوتـرێت "طريق معبَّد"، واتە ڕێگەيەكی تەختكراوو هەموار كراو، يا دەوترێ "بعـير معبَّد اذا ذُلِّل بالقطران" وشتر كاتێ كە قەترانيان تێدا بێ، وەختێ خرووی هەبێ دادە سـەكنێ، دەڵـێن ئـەو وشـترە (معـبَّد)ە، واتـە داسـەكناوەو ئارامـبووە، "عـبد - عـبودية" واتـە ملكەچـی بـۆ خـواو تەسـليمبوونی فەرمانـی خـوا، جـا وەكـو چۆن نوێژ لەسـەجدەو ڕكوعو ئەوانـە پێكدێت، ملكەچييە بۆ خوا، ڕۆژوو گرتن ملكەچييە بۆ خوا، بەهـەمان شـێوەش فەرمانبەرييكردن بۆ شەريعەتی خوا، بۆ ئەوەی حەڵاڵو حەرامت بۆ

دیاری بکات، ئەمرو نەهـیت بـۆ دیاری بکات، لە بواری کۆمەڵایەتی، لەبواری سیاسی، لەبواری پەیوەندی لەگەڵ خەڵك، هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵك، چ لەسەر ئاستی تاکەکان، لەسـەر ئاسـتی خێـزانەکان، لەسەر ئاستی حزبەکان، لەسەر ئاستی دەوڵەتان، هەمووی هـەر ملکەچییە بـۆ خـوا، خـوای پـەروەردگار چۆن باسـی عیـبادەتو شـتی کەسـیی کـردووە، باسی لایەنی سیاسییو ئابووریو کۆمەڵایەتیو ئەوانەشی کردووە، دەبێت تۆ لـە هەمـوو بوارەکانـی ژیانـدا ملکەچ بیت بـۆ خـوا، ئـەوجا تۆ ئەوەت هێناوەتە دی کە دەڵێیت (إِيَّاكَ نَعْبُدُ)، تەنیا تۆ دەپەرستین، ئەگەر نا ئەوەی کە لەمزگەوت نوێژ بۆ خوا بکـاتو لـە بـازاڕ لـەڕووی ئابووری، لـەڕووی کۆمەڵایەتی، یان لەڕووی سیاسیی بەدوای بەرنامەیەکـی تـر بکـەوێت، هاوبەشـی بۆ خوا قەراردراوە، (إِيَّاكَ نَعْبُدُ)ی نەهێناوەتە دی، چـونکە (إِيَّاكَ نَعْبُدُ) واتـە تەنـیا تۆ دەپەرستین، تۆ دەپـەرستین وەکو شەخص لەزاتی خۆماندا، وەکو دروشم، وەکو خۆمان، وەکو لایەنی سیاسییو کۆمەڵایەتیمان.

ئـەو چـەمکانەم کـە بۆ ڕوون کردنەوە، دەتوانم بڵێم لێرە خاڵی وەرچەرخانیان بوو، وتـیان: "وەڵڵاهـی تـا ئێسـتا هـیچ کـەس وای لەئـێمە حاڵـی نەکـردووە، تـا ئێسـتا نەمانـزانیوە، باشـە مـەلاو شتیشـمان هەبووە، بەڵام ئەوەیان بۆ باس نەکردووین، هیچ کـەس نەیوتووە بەعسیایەتی دینە، کەس نەیوتووە ئیشتراکییەت دینە، کەس نەیوتووە عەلمانییەت دینە". وتم: چۆن، دینە، دین مەنهەجی ژیانە، واتە بەرنامەی ژیان.

ئینجا شـتێکم بـۆ هێـنانەوە، ڕۆژێـك هەندێکیان وتیان: "شێخ، موفاوەزاتمان هەیە لەگـەڵ ئەمریکییەکان، ئەگـەر گەیشـتینە نەتـیجەیەك، تـۆشمان لـەبیر ناچێ، بەڕاستی لەخـزمەتین، بـەوە نییە کاتـی خـۆی بەرهەڵسـتکارو ئۆپۆزیسـیۆن بوویت، ئێمە هەر لە خزمەتین". منـیش پێکەنـیم، وتم: سوپاسـتان دەکەم، بەڵام خۆتان بەدەردێکی هێندە چاك نەبردووە تا منیش تووشی ئەو دەردە بکەن.

وتـیان: "چۆن؟" وتم: وەڵڵا چارەنووسـتان جوانە لێرە. وتم: بەعسیایەتی سەری بەئێـرە گەیانـدوون، ئێ چیتان لەدەست دێت بۆ من! وتم: بۆ خۆتان هیچتان لە دەست نەهاتووە تاکو بۆ من شتێك بکەن!

دوایـی شـتێکم بـۆ گێـڕانەوە، وتم: وەرن بـۆتان بـاس بکەم، وتیان: "بەڵێ". وتم لە گۆڤارێکدا خوێندمەوە کـە کاتـی خـۆی لـە سـاڵی (١٩٦٧) کە جولەکەو عەرب شەڕیان

بوو، جولەکە مسولّمان نەبوو، عەرەب بەناوی عروبەوە، بەناوی عەرەبایەتییەوە شەڕیان دەکرد، ئەگەر بەناوی مسولّمانەتییەوە بووایەو هەموو ئوممەت تیایدا بەشدار بووایە سەردەکەوتن، کاتێ کە جولەکەو عەرەب شەڕیان کرد لە ساڵی (١٩٦٧)، دوای ئەوەی کە عەرەب تێکشکان، سوپای دەوڵەتە عەرەبەکان تێك شکا، بنکەو بارەگاکانی هێندێك لە سوپای وڵاتە عەرەبییەکان کەوتە بەردەست جولەکە، دیارە یەکێکیان هی بەعسییەکان بوو، ئیتر نازانم هی ئێوە بوو یان هی حزبی بەعسی سوریا، لەسەر بنکەکەیان نووسیبوویان (بەپێی ئەوەی کە من لەگۆڤارەکەدا خوێندوومەتەوە): "لا تسأل عن مسلكي أو مذهبي، أنا اشتراكي بعثي عربي"، مەپرسە لە ڕێبازی منو لە مەزهەبی من، من بەعسیمو عەرەبیمو سۆشیالیستیم. وتم مانای وایە تۆ بەعسایەتیت بەدینو بەمەزهەبو مەسلەكو ڕێبازی خۆت زانیوە، من بیستوومە کە جولەکەکان زەربێکیان بەسەر ئەو دێرەدا هێناوەو لە پشتەوە نووسیویانە: (..كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ..) (البقرة: ٢٥٠)، جولەکەکان ویستوویانە بەعەرەبەکان بڵێن ئێستا ئەو ئایەتە بەسەر ئێمەدا چەسپیوە، ئێمە بەپێی ئەو ئایەتە بەڕێوە دەچین، چونکە جولەکە هەر نەبێ لەگەڵ دینی گۆڕدراوی خۆیاندا ڕاستیان کردووە، بەڵام ئێوە خۆتان بەمسولّمان زانیوەو لەگەڵ دینە ڕاستەکەی خۆتاندا درۆتان کردووە.

جا پێمگوتن پەند وەربگرن، ئێوە تەماشا دەکەن ئەم هەموو عەرەبە، سێ سەد ملیۆن عەرەب زەلیلی بەردەستی چەند ملیۆن جولەکەیەکن، ئێوە دەبێ خەڵك پەندتان لێ وەربگرێ، نەك خەڵك تەماشاتان کات، چیتان لێ فێربێت؟!

ئاوا جار جار لەو گفتوگۆو شتانەمان دەبوو، جار جار گفتوگۆکەمان حاڵەتێکی توندی بەخۆوە دەبینی، قسەمان لێك هەڵدەبەزیەوە، بەڵام بەڕاستی من هەوڵم دەدا هەر پارێزگاری بەهاوسەنگیو ئەدەبی خۆمەوە بکەم، هەیانبوو هەڵدەچوو، هەیانبوو جۆرێك لە قسەی دەکرد، لە ڕاستیدا ڕێزیشیان زۆر دەگرتم، دەیانگوت: "ئەوەندەی لە تۆ قەبوڵمان کردووە، کە تۆ هەموو شتێکی ئێمە زەربی سفر دەکەیت، لەهیچ کەسمان قەبوڵ نەکردووە، بەڵام لەبەر ئەوەی دەزانین دڵسۆزمانیتو ئینجا لە ڕقو بوغزەوە قسە ناکەیت، دەتەوێت ئیمە هیدایەت بدەیت". وتم: وەڵڵا هیچ ئیشم بەئێوە نییە، بەڵێ ڕقم لە کردەوەکانتانە، بەڵام وەکو بەنی ئادەم، وەکو مرۆڤ بەزەییم پێتاندا

دێتەوە، بەڵام ڕقم لە کردەوەکانی ڕابردووتانەو پێشموایە ئەگەر چاو بەخۆتاندا نەگێڕنەوە، وەکو چۆن ڕابردووتان بەئێرەی گەیاندن، ئەگەر هەر لەسەر ئەو فیکرەو مەسلەکە بن، بەڕاستی سەرەنجامتان خراپتریش دەبێت.

**+ مامۆستا، بەر لەوەی بچینە سەر باسی گفتوگۆکان، بەتایبەتی لەگەڵ سەرکردەیەکی بەعسی وەکو عەلی حەسەن مەجید، لێرەوە پرسیارێکم لا دروست بوو، ئەوان زۆرێک لە چالاکییەکانیان، زۆرێک لە کردەوەکانیان بەرانبەر گەلی خۆیان، بەرانبەر دەوڵەتانی تر کە بە شەڕ هاتوون لەگەڵیان، وەکو کوەیت، وەکو ئێران، زۆرێک لە چالاکییەکانیان بەناوی زاراوە ئیسلامییەکانەوە ناونـاوە، زۆرێک لە فیرقە سەربازیو تاوانکارییەکانیان بەناوی هاوەڵەکانی پێغەمبەرﷺ ناو دەنا، جەنابت هیچ پرسیارێکت لێکردوون کەئێوە هێندە نەفامن، ئەی ئەوەتان بۆ کرد؟ موشەکەکانتان بەناوی حەسەنو حوسێنەوە ناو دەنا؟ ئەمەش جگە لەبەشی دووەمی پرسیارەکە کە ئەو نەفامییەیان بەرانبەر بەدین بۆ خۆی وەلامێك نییە، وەلامێکی دەمکوتکەرانە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت تاوانەکانیان بدەنە پاڵ ئیسلام، وەکو ئەنفال بەتایبەت، وەکو کۆمەڵێك هەڵەو تاوانی تریان؟**

- من بەکورتی ئاوا دەڵێم: ئەوەی بۆم دەرکەوت، سەرانی ڕژێم یەکێکیانم نەبینی لە ئیسلام تێگەیشتبن، ئەوان خۆشیان دوایی ئیعترافیان کرد، دیارە دوای گفتوگۆی زۆر دەهاتن، وتیان: "شێخ، بەڕاستی لەسەر دەستی تۆ هیدایەتمان وەرگرت، بەڕاستی زۆر مەمنوونین، زۆر شتت فێرکردین، زۆر شتمان نەدەزانی". هەتا ئاوایان گوت، ڕۆژێك سێ چوار بەرپرسیان وتیان: "خۆزگە ئەو کاتەی کە صەددام (دیارە ئەوان دەیانگوت: ڕەئیس)، خۆزگە ئەوکاتەی ڕەئیس لەحوکمدا بوو، تۆی لێ هەڵکەوتباو ئەو چەمکو ئەو ڕاستیانەی کە ئێستا بەئێمەی دەڵێی، دەربارەی دینی ئیسلامو ئەوانە، بە ئەوت گوتبا"، دەیانگوت: "ئێمە دڵنیاین، چونکە ئەو قسەی حەقی وەردەگرت، دڵنیاین کە وەرچەرخانێك لە مێژووی حکومەتەکەی ئێمەداو لە مێژووی عیراقدا دروست دەبوو".

دیاره منیش گوتم ئەگەر منیشتان لێ هەڵکەوتبا بەمەرەدی ئەو زانایانەتان دەبردم کە زیندانیتان کردن و کوشتان و دەرتان کردن، وتیان: "نا، ئەویش مرۆڤی بوێری خۆش دەویست و ئەوەی حەقبێژ بووایە، حەقی لێوەردەگرت و ڕێزی لێدەگرت"!

جا من بۆم دەرکەوت کە ئەوان زۆر ناحاڵی بوون لە ئیسلام، بەڵکو زۆر شت بە پێچەوانەوە لێی تێگەیشتبوون، وەکو عەلمانییەکانی خۆمان، عەلمانییەکانی خۆشمان وەنەبێ لەوان چاکتر بن، تەماشا دەکەی کابرا باسی ئیسلام دەکاو زماندرێژی زۆر بەرانبەر بەئیسلام دەکات، خۆی بە مسوڵمان دەزانێ و هیچیش لە ئیسلام نازانێ، ناتوانێ ئایەتێك بە دروستی بخوێنێتەوە، فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺی لە بەر نییە، شارەزایی لە ئیسلام نییە، وەکو ئەوەی خوا ناردوویەتی، بەڵکو هەندێ زانیاری هەڵبزرکاوو پچڕ پچڕی هەیە، ئەویش لە چاویلکەی ڕۆژهەڵاتناسەکان، یان هەندێ خەڵکی موغریز کەدەربارەی ئیسلام نووسیوێتی، یاخود ئیسلام قیاس دەکاتە سەر ئاینی نەصرانییەت، عەلمانییەکانی ئێمەش هەروان، من بەگشتی بۆم دەرکەوت کە بەڕاستی عەلمانییەکان زۆر نە شارەزان لە ئیسلام، بەپێچەوانەوی ئیسلامییەکان کە زۆر چاك عەلمانییەت و باقی قوتابخانە فیکری و تەوژمە فیکری و سیاسییەکان دەزانن، کە دیارە مسوڵمان لەسەری پێویستە هەروەك چۆن حەقی خۆی دەزانێ، بەتاڵی خەڵکیش بناسێ، بەڵام ئەوان بەڕاستی وانین، زۆر داخراون، من زۆر پێم سەیرە هێندێ جار ئیسلامییەکان بە داخراو ناوزەد دەکەن، بەڵام ئەوەندەی عەقڵ داخراوی و دۆگمایی بە خەڵکی غەیرە ئیسلامی و بە خەڵکی عەلمانییەوە دەبینم، بە خەڵکی ئیسلامییەوە وام نەبینیوە، من تەماشا دەکەم کابرای ئیسلامیی ڕەنگە لە بەرانبەرەکەی باشتر شارەزای فیکرەکەی بێت، بەڵام ئەو هیچ لە ئیسلام نازانێ، نە ئایەتێکی لەبەرە، نە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ، نە زانیاریی ڕاستی هەیە.

جا بەعسییەکانیش لەڕاستیدا وابوون. دیارە لێم دەپرسین: باشە ئەو بوختانانە چیبوون کە بەناوی ئیسلامتانەوە دەکردن؟ میللەتێکتان لەناو دەبرد بەناوی ئەنفالەوە، میللەتێکی مسوڵمان، ئەوە من یەکێکیانم لەو مسوڵمانانە، ئێوە ئیعتراف دەکەن کە لە سەردەستی من فێری ئیسلام بوون، دەی من قوتابی ئەو زانایانەم کە ئەو میللەتەیان پەروەردە کردووە، من یەکێکم لە قوتابییەکانیان، من یەکێکم لە

فەقێیەکانیان، ئەمجا ئێوە بۆ بوختانتان بە ناوی هاوەڵانەوە دەکرد (خوا لێیان ڕازی بێت). بەو پیاو چاکانەی ئیسلام کە هاتوون کاتی خۆی نوورو هیدایەتی خوایان بڵاو کردەوە، ئێوە بەعسیایەتیتان بڵاو دەکردەوە، چ پەیوەندیی بەو هاوەڵانەوە هەبوو؟ دیارە لە سەرەتاوە (وەکو گوتم) ئەوان زۆر دیفاعیان دەکرد، بەڵام دوایی هەیان بوو زۆریان دانیان پێدا دەهێناو دەیانگوت: "فیعلەن ئێمە ڕاستمان نەکردووە لەگەڵ ئەو ناوانەدا، ڕاستمان نەکردووە لەگەڵ ئەو دروشمانەدا". ئینجا ئەگەر کەسانێکیش هەبن ئەو شتانەی کە بەعس کردوونی، بیخەنە ملی ئیسلام، ستەمێکی زۆر گەورەیە لە ئیسلامی دەکەن، لە ڕاستیدا ئێمە کوشتەی عەلمانییەتین، بەڵکو من لە چاوپێکەوتنێك لەگەڵ هەفتەنامەی "میدیا" باسم کرد، وتم پێم سەیرە سەرکردایەتیی سیاسیی کورد داکۆکی لە عەلمانییەت دەکات، لەوە کە دەستوور دەبێ عەلمانی بێت، ئێمە وەکو خێرو بەرەکەتی ڕژێمە عەلمانییەکانی بەعسو کەمالیزمو شای ئێرانو بەعسی سوریامان زۆر بۆ هاتووە، میللەتی ئێمە کوشتەی دەستی ڕژێمە عەلمانییەکانە، چیمان لە عەلمانییەت داوە؟ بێجگە لە نەگبەتیو نارەحەتیوماڵوێرانی، هیچمان لە دەستی ڕژێمە عەلمانییەکان نەبینیوە.

کە باسمان دەکرد، بۆ نموونە من باسی کارەساتی ئەنفالم بۆ کردن، هەیانبوو دەیوت: "من نەمزانیوە بەو شێوەیە بێت". وتم ئەوە ناوی سوورەتێکی قورئانە، کەلامی خوای پەروەردگار بۆ چیتان بەکار هێنا؟ بۆ قەتڵو عامکردنی بەشێکی زۆر لە میللەتێك، سەدو هەشتاو دوو هەزار ئەنفال، تۆ بڵێ سەدو پەنجا هەزار، بڵێ سەد هەزار، خۆ ژمارەیەکی زۆرە، چونکە ئەوان دەیانگوت: "زۆر موبالەغەی تێدایە". وتم: خۆ یەك نەفەریش بێت زۆرە، یەك نەفەر بەناحەق بکوژرێ، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (..مَن قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعاً..) (المائدة: ٣٢)، کەسێك یەك کەس بکوژێ، بەناحەق، بەبێ ئەوەی ئاشوبو ئاژاوەگێڕیی لەزەویدا کردبێ، وەکو ئەوە وایە کە هەموو خەڵکی سەرزەوی کوشتبێ، کەسێکیش کەسێك زیندوو بکاتەوە، وەکو ئەوە وایە کە هەموو خەڵکی سەرزەوی زیندوو کردبێتەوە. چونکە ئەوان زۆرجار دەیانگوت "موبالەغەیەو پێنج هەزار کەس لە هەڵەبجە بە کیمیایی نەکوژراوە، ئەنفال سەدو

هەشتاو دوو هـەزار کـەس نەبووە". جا گوتم بڵێ سەد هەزار کەس، پێنج هەزار کەس نەبووە، دوو هـەزار کـەس، ئەگەر یەك نەفەریش بکوژرێ بەناحەق هەر زۆرە، دیارە کە ئـەو ڕاستیانەم بـاس دەکردو دەمگوت بەتایبەتـی بۆتە هـۆی ناو بەدکردنی ئیسلامو هێندێ دروشمـی ئیسـلامیی‌و کەسایەتی ئیسلامیی، لەبەرچاوی کەسانێك کە لە ئیسلام شـارەزا نـین، ئاخـر کەسـێك لـە ئیسـلام شـارەزا بـێت، دەزانـێ ئـەوە بوخـتـانە بـەو کەسایەتییە ئیسلامیانە، بەو ناوە بەرزو پیرۆزانە کراوە.

**+ مامۆسـتا، ئایـا نەیاندەگـوت کـە بـۆ چـی ئـەو ناوانـەمان لـەو هەڵمـەتو تاوانانە دەنا؟**

ـ دەیانگوت کـە لەبـەر ئـەوەی ئـێمە خۆمانو سوپاکەمان بە مسوڵمان دەزانیو بۆ ئـەوەش کـە ببێـتە مایەی بەرزکردنەوەی ڕوحی مەعنەوی لە سەربازەکانماندا‌و بزانن کە ئـێمە لەسـەر ڕێبازی ئیسـلامین، لەسـەر ڕێبازی ئەو پیاوچاکانەین کە کاتی خۆی دژی ڕۆمو فارس جەنگاون.

وتم سـوپای ئیسـلام کـە دژی ڕۆمو فارس دەجەنگا، لەژێر ئالای (لا اله الا الله محمد رسـول الله)دا دەجـەنگان، ئێستا ئێوە لەژێر ئالای (وحدة حرية اشتراكية)دا دەجەنگێن، تـێکەڵەیەك لەنەتەوەپەرسـتیو لـە سۆسیالیزمو لە شەرقگەراییو لە غەربگەرایی، ئەوە چ پەیوەندی هەیە بەو بەیداخی (لا اله الا الله محمد رسول الله)یەوە. سوپای ئیسلام کە دەهـات دژی فارسو ڕۆم بوو، دژی دەسەڵاتـی فارسو ڕۆم دادگەرییان بڵاو دەکردەوە، (فضـائل)یـان بـڵاو دەکردەوەو چاکەکارییان بڵاو دەکردەوە، بەڵام ئێوە دژی میللەتن، دژی میللەتەکەی خۆتان، نەك هەر دژی میللەتانی دیکە.

**+ بـەڵێ. مامۆسـتا بـا بێینـەوە سـەر گفتوگۆ لەگـەڵ عـەلی حەسـەن مەجـید، دیـارە لەلایـەن ئێمەوە وا ناسراوە کە ئەو بەرپرسـی یەکەمە لـە هەڵمەتەکانـی کیمیاییبارانو ئەنفالکردن، تا چەند جەنابت سەبارەت بەوە گفتوگۆت لەگەڵ دەکرد؟ بۆچی ئەوەی کرد؟ چۆن لەو ڕووداوەی دەڕوانی؟**

ـ عـەلی حەسـەن مەجید کـە هێنایان، من نزیکەی دوو مانگێك بوو گیرابووم، وەکو بێتەوە یـادم، دوو مانگێك یـان مـانگو نیوێك، دوای ئەوەی زانی کە من لەو ژوورەدام، وتـی: "أيها الشيخ!"، وتم بـەڵێ. وتـی: "مـژدەت لێبێت". وتم: مـژدەی چـی؟ وتی:

"خۆپیشاندانێکی زۆر گەورە کراوە، نازانم لە سلێمانی بوو یان لە هەولێر، بەڵام بە هەزاران کەس بوو دژی ئەو گیرانەی تۆو داوایان دەکرد تۆ بەر بیو دروشمیان دەگوت". وتم لەکوێ بینیت؟ وتی: "لەکەناڵەکانی جەزیرەو ئەوانەوە بینیم". وتم: دڵنیایت ئەوە هۆیەکەی بوو؟ وتی: "بەڵێ". دوایی خزمێکی تریشی هات ناوی بەرزان بوو، برای صەددام نا، بەرزانێکی دیکەبوو، ئامۆزای بوو، ئەویش بە هەمان شێوە وتی: "منیش هەر خۆم بینیم".

عەلی حەسەن مەجید لە ئێمە دوور بوو، دوای چەند مانگێك گواستیانەوە بۆ ئەو قاتعەی ئێمەو دوو ژوورمان بەین بوو، جار جار دەیگوت: "شێخ، ئەگەر ئیجازە بدەیت، پێمخۆشە (پێشیێ بەتەنیا وەرزشیان پێدەکرد، جۆرێك لە سەختگیری لەسەر بوو، دەبوو بەتەنیا وەرزش بکات، ئێمە شەش کەس بەیەکەوە دەردەچووین، ئەو بەتەنیا، قاتعی حەوت نەفەربوو) کورسییەکەم جار جار بێنمە بەرانبەر پەنجەرەکەی تۆ، پەنجەرەکە بکەیتەوەو هەندێ قسە بکەین". وتم باشە. جارێك هات، نازانم شەو بوو یان ڕۆژ؟ سەعاتێك مۆڵەتیان دەدا ئەو وەرزش بکات، ئەو سەعاتە هەمووی لەگەڵ مندا قسەی کرد، من هێندێ پرسیارم لێکرد، وتم: ئەبو حەسەن! (دیارە لەوێ خەڵك هەر بە کونیە بانگ دەکرێ)، باشە تۆ هەندێ قسە دەکەیت، کە لەڕاستیدا هەندێ قسەی دەکرد، دەیگوت: "ئەوە ڕەئی منەو کاتی خۆی من ڕەئیم وابوو، کە بوار بدرێ ئەحزابی سیاسی هەبێت، مومارەسەی سیاسیی هەبێتو تەنیا حزبی واحید نەبێت، سەرەنجامی لەئەوە دەردەچێت، وام بە ڕەئیس دەگوت، باوا بکەینو باوا نەکەین، ئەوە خراپەو ئەوە چاکە"، وتم باشە ئەو قسانەی جەنابت دەیانکەیت، قسەکان باشن، بەس ئەو قسە باشانە من بەرهەمەکەیان نابینم، ئەگەر ئەو ڕەئیە باشانەت هەبوو، بۆچی بەصەددام—ت نەدەگوت؟ وتی: "پێم دەگوتن". ئەی وتم بۆ وەری نەدەگرت؟ وتی: "خەڵکێکی کەی بەدەورەوە بوو (ئاماژەی دەکرد بۆ هەندێ کەسی وەکو تاریق عەزیزو تەها یاسین ڕەمەزانو عیززەت دووری)، ئەوانە زیاتر دەوریان دابوو قسەی زیاتر لەوان وەردەگرت". دوایی هەر لە میانەی ئەو قسانەدا لێم پرسی، وتم: باشە (ئەبو حەسەن)، جەنابت بۆ خۆت دەزانی ناسراوی بە عەلی کیمیایی؟ وتی: "دەزانم، ئێستا جەنابت بچیتەوە بۆ کوردستانو بڵێی لە نزیك عەلی حەسەن مەجیدەوە بووم،

دەڵێن بە کیمیایی نەبوویت؟ کیمیاییت پێوە نەنووساوە؟ دەزانم وا ناوم بەد بووە". وتم باشە چۆن ئەوەتان کرد؟ پاشان ئەوە ئەنفال، چۆن ئەوانەتان کرد؟ بەچی عەقڵێك؟ بە چ ویژدانێك؟ میللەت میللەتی خۆتان بوو، میللەتێکی مسوڵمان، خەڵکێکی ڕەش‌و ڕووت، هەر لەبەر ئەوەی داوای مافی خۆی دەکات، هەر لەبەر ئەوەی دەڵێ مەمچەوسێنەرەوە، هەر لەبەر ئەوەی بەرگری لە نەفس‌و نامووس‌و وڵاتی خۆی دەکات؟ نەتاندەزانی خوایەك هەیەو تۆڵەتان لێ دەسێنێ؟ ئەو زۆر بە تەئکید باسی کرد، زۆر بە (أغلظ الأيمان) سوێندی خوارد: "کە من دەستم لە کیمیاییبارانددا نەبووە، بە قەراری قەتعی، من مەسئولی حزبی بووم، ئەوەی کە دەستی تێدا هەبووەو بەرپرسی ڕاستەوخۆ بووە، نزار خەزرەجی بوو، کە ئەوکاتە قائیدی فەیلەق بووە لە سلێمانی، ئەو سوپایە هەمووی بەدەستی ئەو بووە، ئەویش ئەمری کردووە". هەتا ئەو دەیگوت: "صەددام–یش ئاگای لێی نەبووە، دوایی لێشی تووڕە بووە، موحاسەبەشی کردووە، ویستوویەتی سزاشی بدات، وتی چۆن ئەوەت کردووە؟ وتوویەتی: ئەگەر وامان نەکردایە، ئێران دەهات‌و پاساوی هێناوەتەوە، وتوویەتی: نا، چۆن ئێمە گەلی خۆمان ئاوا لێدەکەین". ئەوە قسەی عەلی حەسەن مەجیدە.

جا ئەوەی کە پێم سەیر بوو، هەندێ لەبەرپرسانی ڕژێم دەیانگوت: "ئەسڵەن ئەو کیمیاییە هی ئێران بووە، ڕۆژێك بەڵگەنامەیەکیان بۆ من هێناو وتیان بیخوێنەرەوە، ئەوە کاتی خۆی فلان ڕۆژنامەی ئەمریکی دەریکردووە، کە دەڵێت: (کیمیاییەکە ئێران وەشاندوویەتی)". وتم: عەلی حەسەن مەجید دەڵێ: "ئێمە بۆ خۆمان وەشاندوومانە، بەڵام من نەبووم، نزار خەزرەجی بووە، صەددام لێی تووڕە بووە"، کەچی ئێوە وا دەڵێن؟! من پێم سەیرە، لێرەش نکوڵی دەکەن‌و دەڵێن نەخێر ئێران بووە، وتم: باشە ئەگەر ئێران وەشاندوویەتی، ئەی چۆن ڕاگەیاندنی ئێران ئەو کیمیاییبارانەی بەدونیا گەیاند، ئەو مەرگەساتەی بەسەر میللەتی کورددا هات، ئەو چەند هەزار کەسەی کە لە هەڵەبجەدا گیانیان لەدەست دا، ئێران بەدونیای گەیاند، ئەگەر هی خۆی بێت، شتی وا دەکات؟ دەربارەی ئەنفالیش لێم پرسی، وتی: "من هەر ئاگام لێ نەبووەو دەستم تێیدا نەبووە، ئاگام لێی نەبووە". وتم، باشە چۆن؟ خۆ دەڵێن لە دوای صەددام تۆ زیاتر قسەت ڕۆشتووە، جا ئەوانی تری ڕژێمیش هەروایان دەگوت. دەیانگوت: "عەلی

حەسـەن مەجید ڕاسـت ناكات كـە دەڵێت مـن قسـەم كـردووەو پێشـنیارم كردووە بۆ صـەددامو لێـی وەرنەگـرتووم، قسـەی ئـەو ڕەت نەدەكـرایەوە". وایـان دەگـوت، دەیانگوت: "قسـەی ئـەو ڕەت نەدەكرایەوەو لـەدوای صـەددام-یش لـە هەموو كەس زیاتـر بـە دەسـەڵات بـوو، شەخسـییەتی دووەم بـوو، سیاسـەتی ڕژێـم، سیاسـەتی حكومەت زیاتـر ئەو ڕەسمی دەكرد، لەدوای صەددام حسێن". لێم پرسی ئەگەر هیچت بـە دەسـت نەبوو، چۆن خـەڵك ئـاوا تەسەور دەكەن؟ وتی: "خەڵك نازانن، چونكە من ئامۆزای صـەددام بـووم، ئـەوان وا دەزانـن هەمـوو شـتێكم بـە دەست بووە، نەخێر وا نەبـوو، ئـەوان ئاگایـان لێی نییە". ئینجا ئەو حاشای دەكرد كە نە ئاگای لە ئەنفالو نە لـە كیمیایـی بێت. هەڵبەت ئـەو زۆر دەیویسـت مـن ئیقنـاع بكـات، منـیش وتم: (ئەبو حەسـەن) ئـەو شـتە لـەناو خەڵكدا وەكـو تەواتـوری لـێهاتووە، فـەرزەن ئەگـەر مـن قەناعەتـیش بكـەم، سوودی نییە، ئەمریكییەكان كە دادگاییت دەكەن، لای ئەوان ئەو قسانە بكەو دیفاع لە خۆت بكە، وتی: "نا، هەر وتم وەكو حەقیقەتێك جەنابت بیزانیت، ئەگەرنا، لەوێش وەڵامی خۆم دەدەمەوە".

**+ چەندێك لەگەڵ عەلی حەسەن مەجید بەو نزیكییە مانەوەو ئاوا بواری گفتوگۆتان هەبوو؟**

- چەند مانگێك.. دوو مانگ، سێ مانگ.

**+ ئەو كاتەی یەكەم دادگایی كرا، دوای ئەوە هەر لەگەڵ جەنابت مایەوە؟**

- نەخێر، دوایـی ئەوانـیان جیاكردەوە، پێش دادگاییكردن جیایان كردنەوە، یانزە كەسیان جیاكردەوە، عـەلی حەسـەن مەجـیدو تـارق عەزیـزو تـەها یاسـین ڕەمـەزانو بـەرزانو وەتبانو زاواكەیو برای زاواكەی صەددام كە ناوی كەمال بوو، عەبد حەمودو وەزیری دیفاعو..، ئەوانەیان هەموو جیا كردەوە.

**+ جەنابت باست لەوە دەكرد كە عەلی حەسەن مەجید باسی لەوە كردووە كـە "لـە تەمەنـی بەرپرسـایەتیی خـۆیدا داكۆكـی لـە فرەحزبـیو فرەلایەنـی كردووەو كۆمەڵێك ئارائی فیكریو سیاسیی خۆی هەبووە"، لێرەوە دەچینە سەر پرسیارێك، ئێمە جارو بار دەبیستین كە كەسە نزیكەكانی صەددام، كە**

**حزبی بەعس دەسەڵاتی گرتە دەست هەموو کەسانی ئاست نزم بوون، بۆ نموونە" دەڵێن عەلی حەسەن مەجید شۆفێری تەکسی بووە کە ئاوا کراوە بە بەرپرسێکی باڵا. تا چەندێك ئەو سەرکردانەی بەعس، کە تۆ لەگەڵیان ژیایت لە زیندانذا، خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی فکری، سیاسیو مەعریفی بوون کە وایان لێبکات خاوەنی نەزەریاتی خۆیان بن؟ ئێمە لە جەنابت دەبیستین کە زۆر نەزان بوون بەرانبەر بە ئیسلام، ئەی لە کاری سیاسیو لە بواری فیکری سیاسیدا خاوەنی شارەزایی بوون؟**

- هەر بەرەو ڕوو بە خۆشیانم دەگوت کە من پێم سەیرە ئێوە وڵاتتان بەڕێوە دەبرد، پێم سەیرە، دەیانگوت: بۆ؟ دەمگوت نازانم ئەو ئاستەتان تێدا نابینم، ئەوانیش وتیان: "ئاخر زرووفی سجنەو نەخۆشین"، ئیتر وایان پیشان دەدا، هەڵبەتە هەمووشیان بێمستەوا نەبوون، هەشیان بوو مستەوای هەبوو، بە توانا بوو، لە ڕووی ڕۆشنبیریی گشتی، وەکو مەسائیلی سیاسی شارەزایی هەبوو، بەڵام بە زۆری کەمتوانام دەبینین، زۆربەیانم کەمتواناو بێمستەوام دەبینین، ئەمجار بۆچی کاتی خۆی ئەوان لە هەرەمی سەرکردایەتییدا بڕیاریان بووە، پێموایە کە کاتی خۆی ڕژێمی بەعس، صەددامو ئەوانەی دەوروبەری، وا پێدەچێت کۆمەڵێك بووبن وەکو کودەتاو ئینقلابێك کردوویانەو هەر ئەوانەی زیاتر جێی پشت پێبەستنو متمانەی خۆی بوون، ماونەوەو هێشتوونیەوە، چونکە تیایاندا هەبوو نەیدەتوانی بە عەرەبی نامەیەك بنووسێ، نامەیەك بە عەرەبیی فەصیح بنووسێ، واتە خەڵکی بەو مستەوایەیان تیایە، هەیانبوو، یان زۆربەیان نەیاندەتوانی بە عەرەبی فوصحا قسە بکەن، من کە قسەیان بۆ دەکردم، یان هێندێ جار نوکتەیان دەگێڕایەوە، یەکێکیان کە عەرەبییەکەی باشتر دەزانی، پێم دەگوت زەحمەت نەبێت بە عەرەبی بۆم تەرجەمە بکەرەوە، دەمگوت وەڵڵا ئەوە عەرەبی نییەو تێ ناگەم، عەرەبیتان وا سەروگوێ شکاندووە، پیاو نایناسێتەوە ! زەحمەت نەبێت بە عەرەبی بۆم تەرجەمە بکەرەوە، بە زۆری کەمتوانام دەبینین، بەس هەشیان بوو ڕووناکبیر بوو، شارەزابوون، بەڵام ئەوانەی بە زۆری شارەزاییەکیان هەبوو، بە گلەیی بوون، دەیانگوت کە قسەیان وەرنەگیراوە، یەکێك لەوانە کە دەتوانم ناوی بهێنم سەمیر عومەر ئەلنەجم بوو، کە وتی: "من سەرۆکی

یەکـەمین وەفـدی دانوستکار بووم کە چووم لەگەڵ مەلا مستەفا دانیشتووم"، دوایی بۆ کـاك مەسـعود بارزانـیم باسـکرد وتـی: "ڕاست دەکات، ئەو کاتیش پیاوێکی بە مستەوا بـوو، فـیعلەن سـەرۆکی یەکـەمین وەفـد بـوو کـە هـات لەگـەڵ بابمـدا، ئـەو کاتە لەگەڵ سـەرکردایەتیی شۆڕشـی ئەیلـول گفتوگۆو دانوستانیان کرد". پیاوێکی بە مستەوا بوو، بـەڵام زۆریـش بـە گلەیـی بـوو دەیگـوت: "زۆر شـتمان دەگوتو بە قسەمان نەدەکرا". زۆربەشـیان لـە سـەر ئـەوە بە دەنگبوون کە صەددام، خۆیو کوڕەکانی وەکو بنەماڵەو ئەوانـە خـاوەن دەسەڵات بوونو ئەمرو نەهییەکە زیاتر بە دەستی ئەوانە بوو، زۆربەیان دانـیان بـەو ڕاستییە تاڵەدا دەهێنا، هەشیان بوو بە جۆرێکی کە تێدەگەیشتن، هەشیان بـوو لـە نـێو خـۆیاندا کـە دادەنیشـتین بـە دەسـتە جەمعـی، ڕووپامایـیان لەگـەڵ یەکتر دەکرد، ئیـزدیواجییەتیان لەگـەڵ یـەکتر دەکرد، لەگەڵ من قسەیان دەکرد بە جۆرێکی دیکـەو دڵـی خـۆیان بۆ یەکالا دەکردمەوە، زۆر ڕەخنەو گلەییشیان هەبوو لە صەددام، لە کوڕەکانی، بەڵام لەگەڵ یەکتردا، کەمن دادەنیشتم باسیان نەدەکرد.

**+ مامۆسـتا، ئـەو سـەمیر عـومەر ئەلـنەجمە، دوایـین پۆسـتی لـە حکومەتـی بەعسدا، پێش ئەوەی دەستگیر بکرێت چی بووە؟**

ـ ئەندامـی ئەنجومەنـی قـیادەی قوتـری بـوو، ناشـزانم بـە تـەواوی چـی دیکـەی بە دەستەوە بووە، بەڵام پیاوێکی بە تەمەن بوو، لە سەرو شەستەوە بوو.

**+ بـەڵێ مامۆسـتا، لەگـەڵ کێـی تـر لـەو سـەرکردە بەعسییانە گفتوگۆی تێرو تەسـەلت کـردووە؟ بـۆ قسـەکردن لەسـەر کۆمەڵـێك بابـەت کـە لـە سـەر ئاسـتی مێژووی بەعـس دەورووژێنـرێن، بـۆ نمـوونە" ئێسـتا ئێمە باسـی عـەلی حەسـەن مەجیدمان کرد، کێی تر لەسەر ئەو هاوکێشەیە گفتوگۆی تێرو تەسەلت لەگەڵ کردووە؟**

ـ ڕاسـتییەکەی پـێم چاك نییە ناوەکانیان زۆر بڵێم، بەڵام بابەتێکی دیکە کە من زۆر گفتوگۆم لەگـەڵ دەکردنو تێکیش دەگیراین لەسەری، دۆزی کورد بوو، دیار بوو ئەوان هـەر وەکـو خـۆیان دەیانگـوت "شمـال العراق". وتم لە کۆڕی مندا پێم خۆش نییە بڵێن (شمـال)، بڵـێن کوردسـتان، ئەگـەر دەتانـەوێت ڕەچاوی هەستی من بکەن، ئەوا مەڵێن

(شمال)، دەیانگوت "بۆ؟"، دەمگوت: چونکە وشەیەکی ناشەرعییە، بە بۆچوونی من زاراوەیەکە شەرعی نییە، خوای پەروەردگار میللەتێکی خولقاندووە بە ناوی کورد، شوێنەکەشی پێی دەوترێت کوردستان، وەکو چۆن ئەفغانستان هەیە، پاکستان هەیە، عەرەبستان هەیە، تورکستان هەیە، کوردستانیش هەیە، بڵێن کوردستان. بەڵێ لکێندراوە بە عیراقەوە، بەڵێ باکووری عیراقە، وەکو عیراقی سیاسی، بەلام بڵێن کوردستان، دەیانگوت: "ئاخر کە دەڵێین (شمال)، مەبەستمان پێی موسڵیشەو هەندێ شوێنی دیکەش، کە هەر سەرووی عیراقە، بەلام لەناو بازنەی کوردستان نییە. شێخ، تۆ لێمان مەگرە". وتم نا، مەبەستتان پێی ئەوەیە کە زارتان هەڵنایە لە زیندانیشدا بڵێن کوردستان.

لە سەر دۆزی کوردو هەڵوێستی شەرعییانە دەربارەی چارەسەری کێشەی کورد، زۆر تێك دەگیراین، جار جار دەیانگوت: "ئێمە هیچ تێبینییەکمان لە سەر جەنابت نییە، ئەوە نەبێت کە هەست دەکەین ئاوا دەمارگیریی کوردایەتیو شتی وات هەیە"، وتم: نا، من میللەتی خۆمم خۆش دەوێت، وڵاتی خۆمم خۆش دەوێت، بەلام نەك لەسەر حسابی بوغزاندنی میللەتانی ترو خەڵکی تر، عەرەب و غەیری عەرەبیشم خۆش دەوێ، ئەگەر لەسەر هەق بن.

بە کورتی دەتوانم بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە بڵێم: کە ئایا ئاستیان چۆن بووە؟ بەگشتی ئاستیان نزم بوو، ئاستی فیکریو سیاسیی، خەڵکی بە مستەواشیان تێدا هەبوو، بەلام خەڵکە بە مستەواکەیان گلەیی ئەوەیان هەبوو کە قسەیان لێوەرنەگیراوەو صەددامو هەندێ خەڵکی دەوروبەری، بەتایبەتی خزمانو کوڕو داروەستەکەی زیاتر خاوەن بڕیار بوون، ئەگەرنا، ئەوان ڕەخنەو تێبینیان لەسەر زۆر شت هەبوو، بەلام پێشنیازو ڕەخنەکانیان بە هەند نەگیراون. خەڵکە بەمستەواکەیان ئاوایان دەگوت، ئەگەر بەقسەی ئێمە کرابا، ئەگەر بەقسەی خەڵکی دڵسۆز کرابا، چارەنووسمان بەئەمڕۆ نەدەگەیشت.

**+ مامۆستا، باسی سەمیر ئەلنەجمت کرد کە سەرۆکی وەفدی دانوستکار بووە لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردیی ئەوکات، هیچ پرسیارێکت لێ**

**نەکرد لە بارەی دانوستانەکان، لە بارەی شۆڕشی ئەیلول، نسکۆی شۆڕشی ئەیلول، کەسایەتیی بارزانی، لە بارەی هەوڵەکەی تیرۆرکردنی بارزانی؟**

ـ با، لێم پرسی، وتی: "من یەکەمین وەفدبووم کە نێردرابووم لەگەڵ مەلا مستەفا (بەڕەحمەت بێ)و سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلولی ئەوسا دانوستان بکەم، من بەرپرس بووم، هەتا باسی ئەوەی کرد کە کاك ئیدریسو کاك مەسعود دوو گەنج بوونو لای باوکیان بوون و هیچ بەرپرسیارێتییان نەبووە".

سەمیر ئەلنەجم باسی ئەوەی دەکرد کە: "بەڵێ لەگەڵ مەلا مستەفا دانیشتووم، وتم: چیت دەوێت ئەوە من هاتووم بە نوێنەری حکومەتی عیراقی، تۆ چیت لە ئێمە دەوێت؟". دیارە ئەویش قسەکانی خۆی باس کردو وتی: "پێشێ هەندێ مەرجی هەبوو"، (کە من لێرەدا نامەوێت باسیان بکەم)، وتی: "هەندێ مەرجی هەبوون، وتمان ئەو مەرجانە جێبەجێ ناکرێن، بۆ ڕۆژی دوایی بەهێندێ لە بەرپرسەکانم گوت (تەنانەت باسی دکتۆر مەحمود عوسمانی کرد) ئەگەر مەلا مستەفا دەیەوێت بەیەکەوە قسە بکەین، من نوێنەری حکومەتی عیراقیمو هاتووم، ئەو مەرجانەی کە هەیەتی کە فلان کەسمان بەدەستەوە بداو ئەوانە، ئەوە ڕێی تێ ناچێت، ئەگەر دەیەوێ با قسە بکەین، ئەگەر هەر لەسەر مەرجەکانی خۆشی سوورە، من دەگەڕێمەوە بەغداد، دیاربوو قسەیان لەگەڵ کردبوو، وتبووی نەخێر بابێت. چووین دانیشتین، بارزانی نەخشەی کوردستانی هێنا، من بەوانەی خۆمم گوت ئەمجارە جددییە، گفتوگۆکە جددییە، مادام نەخشەیان هێنایە پێشێ، باسی سنووری کوردستانو ئەوانە کرا".

ئەمجا من دەربارەی کەسایەتیی مەلا مستەفا لێم پرسی، وتم: چۆنت دەهاتە بەرچاو؟ ئەو بەرێزەوە باسی کردو وتی: "پیاوێکی سیاسیو پیاوێکی مەبدەئی دیاربوو، سەرسەخت دیاربوو لەسەر مەسەلەی خۆی". ئینجا وتی: "ئەوەی تێبینیم کرد، زۆر حسابی بۆ مەکتەبی سیاسیو ئەوانە نەدەکرد، زیاتر خۆی خاوەن بڕیار بوو، ئەوەی من تێبینیم کرد حیسابی پیاوی بۆ نەدەکردن". ڕەنگە ئەو بە تەعبیرێکیتر گوتبێتی، بەڵام هەر ئاوا دەیگێڕمەوە.

دەربارەی ئەوەش لێم پرسی، لەوم پرسیو لەوانی تریشم هەر دەپرسی، ئێوە چ زانیارییەکتان هەیە دەربارەی ئەو هەوڵەی بۆ کوشتنی مەلا مستەفا درا، کە کاتی

خۆی هەندێ مەلایان نارد؟ ئەوەی کە لە کۆی قسەکانیان دیاربوو ئەوەبوو ئەو مەلایەی (من ئێستا ناوەکەیم لە یاد نەماوە) کە ناردوویانەو مەلا مستەفا ئاشنایەتی لەگەڵی هەبووە، وتیان ئەو کە لە میانەی ئەو نەخشەیەدا بووە، ئاگادار نەبووە کە ئەو جبەو بەرگەی لەبەری کردووە، (TNT) ڕێژ کرابێت، بەڵام ئەوانی دیکەیان لەزمنی پلانەکەدا بوونو بەتەمای ئەوەش بوون کە شتەکەش بکەنو دەریش بچن، وتیان دیارە بەو شێوەیە بووە، ئەو نەفەرە (دیارە لەوانەیە کۆنترۆڵەکە بەوانەی دەرەوە بووبێ) کە زانیویانە ئەوە لەگەڵ مەلا مستەفا دانیشتوونو کەوتوونەتە گەرمەی قسەکردن، تەقاندوویانەتەوە، وتی: "ئەو مەلایە کە ئاشنای مەلا مستەفا بووە، لە زمنی نەخشەکەدا نەبووە، ئاگای لێ نەبووە، تەقێنراوەتەوە"، وتی: "بەڵام ئەوانی دیکە ئاگادار بوون".

**+ ئەوان کێیان بە بەرپرسی نسکۆی شۆڕشی ئەیلول دەزانی؟**

ـ ئەوان بەتەئیکد دەیانگوت کە لایەنی کوردی بوو، چونکە بە ڕوونی گوتیان "بە بەڵگەوە بۆمان دەرکەوت کە سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول دەستی چاك تێکەڵ کردووە، ئەوە هیچ لەگەڵ (شا) کە ئەوە ئاشکرابوو، لەگەڵ جولەکەش، لەگەڵ ئیسرائیل، بەخەستیش لەگەڵ موخابەراتی ئەمریکی". دەیانگوت کە "موخابەراتی ئیسرائیلو (CIA)و موخابەراتی شا لەنێو قەزیەی ئەواندا بوون، بۆیە ئێمە هەستمان بە مەترسییەکی گەورە کردو بەناچاری مساوەمان لەگەڵ شا کردو تەنازولمان لەبەشێك لە کەنداوی عەرەب کرد، بۆ ئەوەی کە ئەو کێشەیە کۆتایی پێ بهێنین، ئەوەبوو کە لەسەر دەستی سەرۆکی ئەوسای جەزائیر، لە جەزائیر ئەو ڕێککەوتنە مۆرکرا". ئەوان بەحسابی خۆیان دەیانگوت: "ئەگەر شۆڕشی کورد وانەبووایەو دەستی لەگەڵ موخابەراتی ئەمریکیو جولەکە، کە ئێمە زۆر پێی حەساسین، تێکەڵ نەکردبایە، ئێمە خۆمان ناچار نەدەبینی تەنازول لە بەشێك لە نیشتمانی عیراقو نیشتمانی عەرەب بکەینو ئەو شۆڕشە هەرەس پێ بهێنین".

**+ ئایا ئەو قسانە جێگەی قەناعەتی تۆ بوون، یان تۆ بەپێی زانیارییەکانی خۆت گفتوگۆت لەگەڵ دەکردن؟**

ـ وەڵڵاهی لەبەر ئەوەی کاک دکتۆر مەحمود عوسمان بۆ خۆی شتێکی بڵاوکردەوە، کە لە ڕاستیدا کاتی خۆی پەیوەندیی لەگەڵ ئیسرائیل هەبووە، دیارە پەیوەندیی لەگەڵ ئەمریکاش شتێکی شاراوە نەبووە، بەس من دەمگوت مەسەلەیەکی کوردی هەیە دەڵێ: "ئینسان کە بە ڕووباردا چوو، دەست بۆ پووشیش دەبات". ئێوە ستەمتان لەکورد کردو کوردیش کە مەزڵوم بوو، زۆرلێکراو بوو کەسیش نەبوو پشتیوانی لێ بکات، خۆیان ناچار بینیبوو، مەرج نییە من ئەو هەڵوێستانە بەڕاست بزانم، بەڵام وەکو پاساوهێنانەوە بۆ ئەوکاتو بۆ ئەو سات، وتم سەرکردایەتیی کورد خۆی بە ناچار بینیوە لە بەرانبەر ئەو زوڵمەی ئێوەدا، پەنای بۆ ئەو لایەنانە بردووە، کە بە داخەوە درۆشیان لەگەڵ کرد، چونکە (شا) دوایی بەرژەوەندیی خۆی بۆ دابین بوو، دیارە ئەگەر چرای سەوزی لەلایەن ئەمریکاو لەلایەن جولەکەوە بۆ هەڵنەکرابا، شا ناتوانێ بڵێ من ئەو بەلوعەیەی دەگرمەوە"، واتە ئەو هاوکارییەی شۆڕی ئەیلول دەگرمەوە، دیارە ئەو هاوکارییەی بەدەست لەپشتدانی ئەمریکاو بەدەست لەپشتدانی ئیسرائیل بووە، چونکە شا نۆکەری جولەکەو نۆکەری ئەمریکا بوو، ئینجا کاتێك شا ئەو بەلوعەیە دەگرێتەوە، دیارە دوای ئەوەیە کە لە لای ئەوانەوە موافەقەی بۆ کراوە.

کەواتە ئەوەی شۆڕشی کوردی هەرەس پێهێنا، نسکۆی بە سەر کورددا هێنا، ئەمریکاو جولەکە بوون، جا من باسی ئەوەم دەکرد کە میللەتی کورد، سەرکردایەتیی سیاسیی کورد خۆی بە ناچار بینیوە، بەڵام مەرج نییە من ئەوە بەڕەوا بزانم بۆ خۆم وەکو ئیسلامییەك، کە پەنا بەرمە بەر جولەکە، یان ئەمریکا، چونکە من هەر لە ڕێوە دەزانم ئەهلی کوفر هیچی پێ نییە، وڵاتێکی کۆلۆنیالیزم چی پێیە بۆ میللەتێکی ستەمدیدە، کاتێ کە تەماشا دەکات لە بەغدا بەرژەوەندی دەست دەکەوێت، پردی تۆ بەئاودا دەدا، ئێستاش هەروایە، ئێستاش قەناعەتم وایە سەرکردایەتیی سیاسیی کورد ئەگەر وا بزانێت ئەمریکا لەبەرچاوی کاڵی کورد هاتووە بۆ عیراق، لەبەر چاوی کاڵی شیعەو سوننەو عەرەبو چیو چی، زۆر بەهەڵە تێگەیشتووە، ئەمریکا هاتووە بەرژەوەندی لەوە بووە ڕژێمی عیراق بڕووخێنێو بوونی هەبێت لە ناوچەکەدا، یاخود ئەو بوونەی کە هەیەتی زیادی بکات، بۆیە هەرکاتێك بەرژەوەندی لەوەدا بوو کورد فیدراڵییەتی هەبێت، دەڵێت با هەیبێت، هەرکاتێك بەرژەوەندی لەوەدا بوو نەبێت،

دەڵێت با نەبێت، وەکو چۆن کاتی خۆی بەرژەوەندی لەشۆڕشی ئەیلولدا بوو دەستی لەپشتی شا دا هاوکاری بکات، کە بەرژەوەندی نەماو وتی بیگرەوەو ئەویش بەلوعەکەی گرتەوە.

جا مەبەستم ئەوەیە" من بەڵێ لەگەڵ ئەواندا قسەم دەکردو دەمگوت کاتی خۆی سەرکردایەتیی سیاسیی کورد پاساوی ئەو هەڵوێستەی خۆیان بەوە داوەتەوە کە ناچار بوون، بەڵام من وەکو ئیسلامییەك ئەگەر ناچاریش بم، ئەوە بەڕەوا نابینم، چونکە دەزانم سەرەنجامەکەی هەموو میللەتەکە لەسەری قەرزدار دەبێتەوە، لەبەر ئەوە، من پێموایە شۆڕش ئەگەر نەکرێ چاکترە وەك لەوەی لەسەر بناغەیەکی هەڵە بکرێ، چونکە دوای ڕەنجو قوربانیدانی زۆر، هیچت دەستگیر نابێ.

بەڵام بەهەرحاڵ، ئەو کابرایە (سەمیر عومەر ئەلنەجم) زۆر بەرێزەوە باسی مەلا مستەفای دەکرد، وەکو پیاوێکی مەبدەئی، وەکو پیاوێکی دڵسۆز بۆ قەزیەی خۆی. دەیگوت: "لە لامان بەرێز بوو"، چونکە کاتی خۆی هێندێ دیعایەو پڕوپاگەندەی لە لایەن نەیارانیەوە بۆ دەکرا، ئەو کابرایە (سەمیر ئەلنەجم) کە سەر بە ڕژێمی بەعس بوو، وتی: "من بە پیاوێکی مەبدەئیو دڵسۆز بۆ قەزیەی کوردم دەبینی، بەڵام هەڵەی کردووە لە سیاسەتی، لە پەیوەندییەکانی، ئەوە شتێکی ترە".

**+ مامۆستا، کێشەی کورد ئەوساشو ئێستاش چەقی هاوکێشەکان بووە، ئێوە هیچ گفتوگۆیان دەکرد لەو بارەیەوە؟ ئەوان هیچ باوەڕیان بە کوردستانیبوونی کەرکووك هەبووە؟**

- بڕوایان پێی نەبووە، ئەوەندە کە من قسەم لەگەڵ دەکردن، هەیانبوو تاك تاك لە خەڵکی بە ئینساف دەیگوت: "من باوەڕم بە دەوڵەتی کوردی هەیە"، دیگوت: "من زۆر تەئیدی قسەکەی موعەممەر قەززافی دەکەم کە دەڵێت: کوردیش میللەتێکە لەو میللەتانە، خوا خولقاندوویەتی، با دەوڵەتی هەبێت".

یەکێك لەوانە دکتۆر سەتتام ئەلگەعود بوو، دەیگوت: "زوو سەر بەبرایانی مسوڵمان بووم (ئیخوان موسلمین)". دەیگوت: "هەر لەبەر ئەوەی ڕژێمی بەعس تەنگی پێ هەڵچنیم، چووم لە ئەمریکا خوێندنم تەواو کرد"، پیاوێکی بەشەخسییەتو بەتواناش بوو. ئەو دەیگوت: "ئەگەر بەربم، زۆر بەڕاشکاوانە دەڵێم کە کورد مافی

خۆیەتـی فیدراڵـی بوێت، دەوڵەتـی سەربەخۆی بوێت، مافی خۆیەتی، میللەتێکە وەکو باقـی ئـەم مـیللەتانە". دیارە تا ئەندازەیەك پەیوەندیو دۆستایەتیشی لەگەڵ سەرانی ڕژێم هەبووە، بەڵام نەك وەکو بەعسیبوون.

مەبەسـتم ئەوەیـە، خەڵکی تریشیان هەبوو ئەوەی دەگوت، بەتایبەتی کە بۆم ڕوون دەکـردنەوەو دەمگـوت لەڕوانگـەی ئیسـلامەوە کـە خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ: (وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا) (الحجرات: ١٣)، کردوومانن بە چەند گەلێكو چەند تیرەیـەك تاکو یـەکتری بناسـن. کەواتە کاکی عەرەب وەکو چۆن تۆ گەلی، تورك گەلە، فـارس گەلە، ئەفغانی گەلە، کوردیش گەلە، جا گەلبوونی تۆ کە بەخۆتی ڕەوا دەبینی، لەوڵاتـی خـۆتدا بیتو دەوڵـەتت هەبێت، کـیانت هەبێت، گەلبوونـی منـیش بەهـەمان شێوە، هـەمان ئـەو ئیمتـیازو مانایانـەی لەگەڵدایـە، خـوای پەروەردگاریش هەمووماني کـردووە بـە گـەل، ئیمتـیازی کەسیشـی نەداوە بەسەر کەسدا، دەفەرموێت: بەڕێزترتان لای خـوا ئەوەیـە پارێزکارتـر بـێت، واتـە پابەندتـر بـێت بەشـەرعەوەو بـۆ خـوا سـوڵحاوتربێت. دوای ئـەوەی ئەوشـتانەم بـۆ ڕوون دەکـردنەوە، هەیانـبوو دەیگـوت: "وەڵـڵا لـەو ڕوانگەیـەی کـە تـۆ دەیڵێی، من پێموایە کە کورد مافی خۆیەتی هەر شتێك داوا بکـات"، تەئکیدیشـیان دەکـردو دەیانگـوت: "بەڕاسـتی ئـەوەی کـە تـۆ باسـی دەکـەیت، ڕاسـتە، فـیعلەن کورد ستەمی لێکراوە، بەڵام ئێمە بە زۆرێك لەو ستەمانەمان نەزانـیوە". بـۆ نمـوونە" یەکێکیان وتـی: "بـەڵێ من کاتی خۆی هاتووم بۆ کوردستان، ئـەو هەمـوو دێهاتـەم بینـی کاولکرا، ئـەو هەموو ڕەزو باخە، باوەڕ بکە گریام، مزگەوتم بینـی، ئـەوەم بینـی، وتم ئـەم مـیللەتە بـۆ وای لێکـراوە؟ هەرکوێـرە دێـیەکم دەبینـی مزگەوتێکی تیابوو، من بەدەست خۆم نەبوو گریام". وەزیرێکیش بوو.

هەیانـبوو دەیگوت: "بەڕاستی زۆر لەو ناڕەحەتیو مەرگەساتەی تۆ باسی دەکەیت، ئێمە ئاوامان نەزانیوە".

**+ ئەوان سەبارەت بە کەرکووك چییان دەوت؟**

ـ ئـەوان بـەزۆری پێـیان وابـوو کەرکووك بەشێکە دەکەوێتە نەخشەی ئەو شوێنەی کەپێی دەگوترێ عەرەبستان، ئەو شوێنەی کە بۆ عەرەب دانراوەو عەرەبنشینە.

دیاره من لەو بارەیەشەوە گفتوگۆم لەگەڵدا دەکردن، کە کاتی خۆی لەسەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧) زۆربەی کورد بووەو تورکومانیشی لێبووە، عەرەبیشی لێبووە، بەڵام ئێوە خۆتان ئاگادارن کە چەند عەرەبی ڕاگوێزراو هێنرانو لەوێ نیشتەجێکران، کوردان دەرکرانو لە دێهاتو لەشار ڕاگوێزران، وتیان: "دەزانین، بەڵام هەرچۆن بێت ئەوکاتەش هەر عەرەب زۆرینە بوون". ئیدی لەو بارەوە مشتومڕمان دەبوو.

**+ قەناعەتیان نەبوو بە کوردستانیبوونی کەرکووك؟**

ـ ڕاستییەکەی کەمتر پێمەوە دەبینین، بەڵام لەلایەن زۆربەیانەوە، ئەگینا کەمێکیان هەبوو دەیانگوت: "کورد با هەر دەوڵەتی خۆی هەبێت، هەر شوێنێ ساغبوویەوە کە کوردستانە، با لە سنووری ئەو دەوڵەتەدا بێت".

**+ سەبارەت بەعەلی حەسەن مەجید، ئایا ئەو دەستپێشخەریی کرد کە پێکەوە قسە بکەن یان جەنابت؟**

ـ ئەو دەستپێشخەری کرد، هەر ئەویش یەکەمجار وتی: "مژدەت لێبێ ئەوە خۆپیشاندان کراوە دژی گیرانی تۆ"، لەدواییدا وتی: "پێمخۆشە بێم دانیشم لەبەردەم ژوورەکەتو هەندێ ڕاستی هەیە بۆتی باس بکەم". ئیدی ئەو خۆی دەستی پێکرد.

**+ ئەویش تۆی دەناسی؟**

ـ بەڵێ، وتی: "ئەمریکییەکان لە منیان پرسیوە کە فلان کەس دەناسی؟ وتم وەکو ناسین نەمبینیوە، بەڵام ناوم بیستووە کە لە ئۆپۆزسیۆنی عیراقی بووەو دژی ئێمە بووە، ئیتر وتیان پێتوایە پەیوەندیی هەبووبێت لەگەڵ قاعیدەو ئوسامە بن لادن؟ وتوومە نەمبیستووە، شتی وام نەبیستووە، وتیان ئەی لەگەڵ ئێوە؟ وتی پێکەنیمو وتم لەگەڵ ئێمە ئەوە دوژمن بووین، ئەو دژی ئێمە بووەو ئێمەی هەر بەمسوڵمان نەزانیوەو شتی لەسەر ئێمە نووسیوەو خەڵکی لەئێمە کوشتووەو خەڵکمان لێ کوشتووە".

**+ بەدەر لەو تاوانانەی دەدرانە پاڵ عەلی کیمیایی و خۆی نکوڵی لێ دەکردن، تۆ ئەوت چۆن دەهاتە بەرچاو؟**

ـ خۆی کەسێکی موجامیلە، کوردەواریی خۆمان دەڵێن مەشرەب خۆشە، واتە کراوەیە، وەکو کەسایەتی خۆی، بەڵام لەڕووی مەعنەویاتەوە بەتۆکمەو پتەوم نەدەبینی، بەلاوازم دەهاتە بەرچاو، لەڕووی قسەزانینەوە قسەزانە، قسەی مەجلیس دەزانیێ، بەڵام بەڕاستی ئەوێ سەنگی مەحەك نییە، گرنگ ئەوکاتەیە کەلەسەر کورسی حوکم بووە، چۆن بووە، چونکە لە زیندان زۆر کەس عاقڵ دەبێت، لەزیندان زۆر کەس بەخۆیدا دێتەوە، بۆیە بەڕاستی من زۆر حسابم لەسەر ئەو شەخسییەتەی ئەوێیان نەدەکرد، لێیانم دەپرسی‌و دەمگوت: فلان کەس کاتێ کە دەسەڵاتی هەبوو، چۆن بووە؟ ئیدی لە ناو خۆیاندا هەبوو دەیگوت: "ئەو عەلی حەسەن مەجیدە فیرعەونێك بوو بۆخۆی"، هەر لەنێو خۆیاندا هەبوو دەیگوت: "شێخ، ئێستا لای تۆ زۆر خۆی فەقیر ناکاو دەڵێ من وام گوتووەو وام گوتووە؟!" دەمگوت: بەڵێ. دەیگوت: "بڕوا بکە فیرعەونێك بووە بۆ خۆی، وەڵامی کەسی نە دەدایەوە".

بۆیە من شەخسییەتی ئەوێیان ناکەم بەمیزان، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی کراوەبوو، لەگەڵ خەڵك قسەی دەکرد، زۆر موجامەلەی منی دەکرد، زۆر ڕێزی دەگرتم، خۆی لێدەهێنامە پێش، بەڕاستی منیش لە بەرانبەردا ڕێزم دەگرت، (وَإِذَا حُيِّيْتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَسِيباً) (النساء : ٨٦). من بەڕاشکاوی پێشیانم دەگوت کە ئەگەر لەبەر ئیسلام نەبوایە، لەبەر ئەوە نەبوایە کە ئێستا ئێوە لێرە دراوسێمن، مافی دراوسێ لەسەر دراوسێ هەیە، هەر لەڕوانگەی ئەوەی کە ئێوە بەرانبەر بەمیللەتی من کردووتانە، نەدەبوو سڵاوتان لێبکەم، بەڵام لەبەر ئیسلام‌و لەبەر خوا، بەزەییم پێتاندا دێتەوە، لەبەر ئەوەی ئێستا لێقەوماون، بەناجوامێریی دەزانم کاتێ کە لێتان قەوماوەو بارتان کەوتووە، من بە چاوێکی دیکە تەماشاتان کەم، بەس بەچاوی بەزەیی تەماشاتان دەکەم، بەڵام بەچاوی بەزەیی تەماشاکردن بۆتان، ئەوەم لەبیر ناباتەوە کە چیتان کردووە.

بەڕاستی من حیسابم لەسەر شەخسییەت‌و هەڵسوکەوتی ئەوێیان نەدەکرد، گرنگ ئەوەیە ئەو کاتەی کابرا دەسەڵاتی هەیە چۆنە، ئەگەرنا کابرا خۆ لەوشکی مەلە ناکات تا گۆم نەبێت، تا گۆمی ئاو نەبێت خۆلە وشکی مەلە ناکرێ، کابرا دەسەڵاتی نەبێت نازانرێ داخۆ چۆن ڕەفتار دەکات، لەوێ لێقەوماوەو لە زیندانێکدایەو بەدەست

پاسەوانێکی ئەمریکییەوەیە، چوونە سەرئاوی، نانخواردنی، هەڵسانی، خەوتنی، دانیشتنیو هەموو شتێکی بەدەست ئەوە، لەوکاتەدا بۆت هەڵناسەنگێنرێ کە ماهیەتو شەخسییەتی چۆنە.

**+ پێتوایە لەو کاتەدا زانایانیش فەتوایان لێ وەرناگیرێت؟**

ـ زانایانێك فەتوایان لێوەرناگیرێ کە فیعلەن بزانی ژێر دەستو تەسلیمن، ئەوە بۆ زانیارییت، ئەگەرنا، زانایەك کە بزانن لەوێشدا خۆڕاگرەو خاوەنی هەڵوێستی خۆیەتی، تەنازولی نەکردبێ، هەر لێی وەردەگیرێت، هەر لە ڕووی شەرعەوە بۆ ئەوەی بزانیت.

**+ ئایا ئێوە ڕۆژانە یەکترتان دەبینیو گفتوگۆتان دەکرد، یان ئەو چەند مانگە یەکجار یەکترتان بینی؟**

ـ نا، نا، ڕۆژانە یەکترمان دەبینی، ئەوکاتانەی کە بۆ وەرزش دەریان دەکردین، بەڵام وەنەبێ من زۆر سەرو حەوسەڵەم بووبێ، هەمیشە لەگەڵیدا قسە بکەم، چونکە قسەی خۆمان بێت، هەموویان دەیانوت "ئێمە خاوەن شانسین کە لە خزمەت جەنابتین، لەنزیك جەنابتین"، واتە ئەوەی کە دە دەقیقەی لەکاتی من بەرکەوتبا، خۆی بە بەختەوەر دەزانی، چونکە من بەزۆری سەرگەرمی نووسین بووم، سەرگەرمی قورئان خوێندن بووم، کە دەچوومە دەرێش، ئەوان دۆمینەو دامەو شەترەنجو تاوڵەو وەرەقو ئەو شتانەیان دەکرد، من ئەوشتانەم هیچی نەدەکرد، یان موتالەعەم دەکرد، یا قورئانم دەخوێند، یان وەرزشم دەکرد.

ئیدی داوایان دەکرد: "شێخ، ئەگەر پێنج دەقیقە بوار بدەی، یان دە دەقیقە یان چارەکێك پێکەوە دابنیشین؟". ئاوا بوو وەکو قسەکردنی تایبەتی لەگەڵ عەلی حەسەن مەجید، لەوانەیە سێ چوار جارێك قسەم کردبێ، وەکو دیکەش کە شەش حەوت نەفەر پێکەوە دادەنیشتین، وەکو قاتعەکە، چوار پێنج جارێك ئاواش دادەنیشتین، ئەگەرنا، من دووجار لە دانیشتنە دەستە جەمعییەکانیشیاندا دانەدەنیشتم.

من کاتێ دادەنیشتم کە قسەم بۆ کردبانایە، دەرسێکم پێگوتبانایە، ئامۆژگاریم کردبانایە، یان گفتوگۆی قەزیەیەکمان کردبایە، ئەگەرنا، من کاتم هێندە نەبوو، کە هەر دابنیشمو خەریکی قسەو قاڵ بمو حیکایەت بگێڕمەوە، ئەوان زۆر دادەنیشتنو زۆر

شتيان باس دەكرد، باسی خواردنيان دەكرد، بۆنمـوونـه" دادەنيشتن بەخەيالْ دەيانگوت ئەگەر ياپراخ هەبوايە، يەكێكيان دەيگوت گيپە يان كەللەو پاچە هەبوايە، يەكێكيان دەيگوت ئەگەر ئێستا برنجو چی لەسەر بوايە، ئەو خواردنانەی كاتی خۆی خواردوويانە، دەيانگوت: "شێخ، ئەتۆش باسكە كەيفت بۆچی دەچێت؟"، وتم: وەللا كاكە من لەبەردی نەرم تر بێت دەيخۆم! چونكە كێشەی خواردنو شتم نييە، ئێوەش جار جار بەخەيالْ خۆتان دەعوەت بكەن هەر باشە!!

مەبەستم ئەوەيە، من زۆر دەرفەتم نەبوو بچمە ناويان، مەگەر شتی جددی هەبوايە، يان ئەوان پرسيارێكيان هەبوايە، من دەرسێكم پێگوتبان، بابەتێكی فيكری يان سياسيی موناقەشەكرابايە دانيشتبام.

**+ مامۆستا، سەبارەت بە تاوانی هەڵەبجەو ئەنفال، عەلی حەسەن مەجيد خۆی پێی خۆشبوو پاكانەی خۆی لای تۆ بكات، يان تۆ پێت خۆشبوو تاوانێكی وا بەرەو ڕووی ئەو بكەيتەوە؟**

- وەڵلا من لێم پرسی، وتم ديارە جەنابت قسەی باش باش دەكەيت، بەس تۆ تۆمەتباريت، پێم سەيرە، ئەو قسانەی تۆ، لەگەڵ ئەوەی تۆی پێ تۆمەتباريت يەكێكيان ڕاست نييە، جۆرێك لە فەرقو جيايی دەبينم، قسەكانت باشن، بەڵام ئەو شتانەی كە باسكراون..!! ئيدی ئەو لەوەدا پاكانەی خۆی كردو زۆر دەيويست من قەناعەتم پێ بكات، پێمگوت ئەو قسانە لەو شوێنە بكە كە دەتوانی خۆتی پێ تەبرييە بكەيت، ديارە جوان نەبوو لەڕووی خۆيدا پێی بڵێم درۆ دەكەيت، وام نەدەگوت بەڕاستی، بەس ئەو زۆر هەوڵی دەدا كە من قەناعەت پێ بكات. منيش گوتم گريمان ئەگەر من موقتەنيعيش بم، خۆ سوودێك بەتۆ ناگەيەنێ، تۆ ديارە دادگايیو شتت لەپێشە، ئەوكاتە دەتوانی ئەو قسانەی خۆت زۆر باش بكەيت.

**+ تۆ پێشتر شارەزاييت لە مەنهەجی بەعس هەبوو كە لەوێ موناقەشەت دەكردن؟ يان ئەوان دەيان وت ئێمە تێڕوانينمان بۆ فلان شت ئاوايەو تۆش مشتومڕت لەبارەيەوە لەگەڵ دەكردن؟**

ـ من لەوسەری هاتبوومەوە، من پێم دەگوتن هەندێ کەلەپوورو شتی ئێوەم خوێندووەتەوە، ڕەنگە خۆشتان وا نەتان خوێندبێتەوە، پێم گوتن من کتێبەکانی ئیلیاس فەرەح–م خوێندووەتەوە، کتێبەکانی (شبلي العیثم)م خوێندووەتەوە، کتێبەکانی میشیل عەفلەقم خوێندووەتەوە، "في سبیل البعث"و نامیلکەکانی صەددام حوسێنم خوێندووەتەوە، من شتم لەسەر نووسیون، من لە کتێبی (سۆزی نەتەوایەتی)دا هێندێ شتم لەسەر نووسیون، قسەکانیشم بەنموونە هێناونەوە کە سەرانی بەعس ئاوایان گوتووە، بۆیە کە سێ ئەو قسانە بکات حوکمی کافربوونی بەسەردا دەدرێ، من لەڕووی زانستییەوە قسەم لەگەڵ دەکردن، لەڕووی زانیاریی پێشتر، نەك هەرچاوم لە دەمی ئەوان بێت.

**+ باسی ئەوەت کرد کە زۆر جار ئەوان هەڵدەچوون، جارێکت بیر دێتەوە کە یەکێکیان هەڵچووبێت، وەك کاردانەوەیەك لە بەرانبەر قسەکانتدا؟**

ـ بەڵێ، بەس کاردانەوەکە دەکەوتە قاڵبی ئەوەی دەیانگوت: "شێخ، ئێمە ڕێزت دەگرین"، وتم منیش ڕێزتان دەگرم، ئەگەر ڕێزتان نەگرم، نابێ لەگەڵتان دابنیشم، هەر نابێ سەلامیشتان لێ بکەم، ئاخر وتیان: "تۆ هیچ بۆ ئێمە ناهێڵیتەوەو چۆن دەڵێی (سید الرئیس) واو بتێك بووەو ئێمە هەر زەربی سفر دەکەیی‌و دەڵێی هەر لە ئیسلام دوور بوون"، ئێ وتم جا من بە بەڵگەوە پێتان دەسەلمێنم، ئەوجا من لە ڕووی دڵسۆزیشەوە ئەو شتانەتان پێ دەڵێم، بۆ ئەوەی کە لەسەری بوون، چیدی لەسەری نەچن، بە خۆتاندا بچنەوە، ئەگەرنا، وەکو چارەنووسی دونیاتان ڕەش‌و تاڵە، چارەنووسی دواڕۆژیشتان وا دەبێ. دەڵێم لانیکەم گەر دونیاشتان چوو، با قیامەتەکەتان هەبێت، خۆ من دڵسۆزتانم.

قسەی خۆمان بێت، کەسێك کە هەڵیش دەچوو، دوایی دەهات گەردنی خۆی پی ئازاد دەکردم‌و دەیگوت: "من داوای لێبوردنم هەیە، بەخوا دەزانم تۆ دڵسۆزمانی، بەس تۆزێ موراعاتمان بکە، چونکە ئەو شتانە تۆ بتەوێ بەشەوو ڕۆژێ هەمووومان لە مێشك دەربێنی، ئەستەمە، تەمەنێك لەسەر ئەوە ژیاوین". یان دەیانوت: "تۆزێ موراعاتمان بکە، وا بەتوندی یەکسەر پێکدادانمان لەگەڵ مەکە، تۆزێ بە ئەسپایی، یان ئەگەر هەڵچووین، چاوپۆشیمان لێ بکە"، چونکە ئەوان تووڕە دەبوون، منیش تووڕە

دەبووم، ئەی ناڵێن جوابی تەحەی پەحەیە؟! کە ئەوان تووڕە دەبوون، منیش قسەی توندم دەکرد، بەڵام بەڕاستی هەوڵم دەدا هاوسەنگیی خۆم تێك نەدەم، چونکە من ئیمامیشیان بووم‌و پێشنوێژیم بۆ دەکردن، بانگم بۆ دەدان، دیارە من هەر نەیارێکی فیکریی نەبووم، ئەوان بە چاوی ئیمامەتی‌و پێشەوایەتی‌و لە دواییدا بەچاوی ئەوەش تەماشایان دەکردم، وەکو بڵێی بەرپرسی دونیاو دینیان بم، بۆ هەموو شتێ دەهاتنەوە لای من، پرسیاریان دەکرد، چ پرسیاری شەرعی هەبوایە، یان لە نێو خۆیاندا ناکۆکییەکیان هەبوایە، دەهاتن پرسیاریان دەکرد، داوای هاوکارییان دەکردو دەیانگوت: "ئاشتمان کەوە، ئامۆژگاریمان بکە".

**+ تیایاندا هەبوو نوێژ نەکات؟**

- تەبعەن تارق عەزیز ئەوە نەصرانی بوو نوێژی نەدەکرد، ئەوەی کە من تێبینیم دەکرد، دەیانگوت بارزان-ی برای صەددام-یش نوێژ ناکات، نەمدەبینی سەبعاویش نوێژ بکات، جا نازانم نوێژی دەکرد یان نا؟ چونکە ئەو لە قاتعەکەی ئەوبەر بوو، ئەوەی من ئاگاداربم ئەوانی دیکە، پێم شك نایەت نوێژیان نەکردبێ، جا مەرج نییە پێشتر، بەڵام دوای ئەوەی کە من لەوێ بووم‌و دەرسم دەگوت‌و ئەوانە، پێم شك نایەت نوێژنەکەری تێدابێ‌و دەیانکرد.

**+ ئەگەر لە دەرەوەو لەکاتی دەسەڵاتیاندا تۆ قسەی ئاوات لەگەڵ بکردنایە، ڕووبەڕووی گەورەترین مەترسیی دەبوویتەوە، لەوێش کە ئەوان هاوفیکر بوون، بەعسیبوون، عەرەبیش بوون، ژمارەیەکی زۆریش بوون، هەستت نەدەکرد ئەم قسانەی تۆ لەوێ جێگەی مەترسی بن بۆت‌و تووشی زیانێکت بکەن؟**

- لەوێ نا، بەڵام لەزیندان بەولاوە چی، خۆ زیندانی بووم‌و کۆمەڵی خاچی سوور دەهاتن‌و پرسیاریان دەکردو دەیانگوت: "ئەوە تۆ چۆن لەگەڵ ئەوانە دەحەوێیتەوە؟ کاتی خۆی ئەوانە دوژمنی ئێوە بوون‌و تۆ ئۆپۆزیسیۆن بوویت، چۆن پێکەوە دەژین؟". وتم: بۆ؟ وەڵلا من تەوجیهیان دەکەم‌و هەڵەکانیان بۆ ڕاست دەکەمەوەو ئامۆژگارییان دەکەم، ئەوانیش ڕێزم دەگرن، لەڕاستیدا ڕێزیشیان زۆر دەگرتم،

(الأنصاف غير الأوصاف)، كابرا لێشی تووڕە دەبووم، جاری وا هەبوو ئەو دەهاتەوە بۆ لای منو دەیگوت: "بەخوا دەزانم لەبەر خوا لێم تووڕە دەبیت، دەزانم تۆ دڵسۆزیت، بەس ئێمەش دڵشکاوینو بۆ خۆت دەزانی کاتی خۆی بەرپرس بووینو ڕێزو ئیحترامامان هەبووەو ئێستا بارمان کەوتووە، تۆ دەبێ خەلفییەتی نەفسیو فیکریی ئێمەش لەبەر چاو بگریت، ئەگەرنا، دەزانین تۆ لە دڵسۆزیتەو هیچ ئیشێکت بە ئێمە نییە". جا کۆمەڵی خاچی سوور زۆر پێیان سەیر بوو دەیانگوت کە چۆن دەتوانی لەگەڵیان دابنیشیو قسە بکەیت؟ وتم بۆ ناتوانم؟ خۆ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبو جەهل قسەی کردووە، موسا لەگەڵ فیرعەون قسەی کردووە، نە من لە موسا چاکترم، نە ئەوان لە فیرعەونو ئەبو جەهل خراپترن[13]، ئێستا بەتایبەتی هەموو لێقەوماون و وەکو یەکن، ئەگەر کاتی خۆشی فیرعەونو ئەبو جەهل بووبن، ئێستا هەموو لێقەوماون. بەزەییم پیایاندا دێتەوە، خۆ ئێوە زۆر باسی لایەنی ئینسانی دەکەن، وەکو خاچی سوور، وتیان وەڵڵا خۆ ڕاست دەکەی، وتم من وەکو مرۆڤێك بەزەییم پیایاندا دێتەوەو مامەڵەیان لەگەڵ دەکەم، چونکە دەمەوێ سوودیان پێ بگەیەنم و لەو زەلکاوەی تێیدان –واتە زەلکاوی گومڕایی– دەریان بێنم!

**+ کەس لەوانە هەبوو کە بەرگری لەفیکری بەعسو تاوانەکانی بەعسو ئەو شتانە بکات؟**

- تیایاندا هەبوو، بەڵێ.

**+ کێ بوون ئەوانە؟**

– پێم خۆش نییە ناویان بهێنم، هەیانبوو نەك بڵێی دیفاع لەهەموو شتێکی بکات، دوای ئەوەی کە من لەگەڵیان دەچوومە نێو گفتوگۆوە، بەڵام ئەوان وایان دیفاع دەکردو دەیانگوت: "ئێمە باجی دژایەتی جولەکەیە دەیدەین، باجی ئەو مووشەکانەی کە بە جولەکەمانەوە ناون، باجی دژایەتیی ئەمریکایە دەیدەین"، دەیانگوت: "ڕژێمیش هەیە لە ئێمە خراپتر، وەکو ئێمەش دیکتاتۆرییەو تاك حزبییە، بەڵام ئێمە

---

[13] دیارە ئەگەر خراپتریش بن، هەر دروستە قسەی هەقیان بە گوێدا بدرێ.

زۆر دژی جولەکەین‌و زۆر دژی ئەمریکا بووین، زیاتر باجی ئەوەیە دەیدەین". هەیانبوو، بەس وەنەبێ دیفاع لە هەموو شتیان بکات، هەبوو دەیوت کە بەڵێ هەڵەشمان هەبوو ستەمیش هەبووە. بەڵام ئێجگار وا خراپ نەبووین کە ئاوامان لێ بە سەر بێت، ئەگەر لەبەر دژایەتیی جولەکەو ئەمریکا نەبوایە، منیش وتم: جا ئێوە پێش ئەوەی دژایەتیی جولەکەو ئەمریکا بکەن، دژایەتیی میللەتەکەی خۆتانتان کرد، خۆ کەستان نەهێشت، نەکورد، نە شیعە، نەسووننی، دراوسێیەکانتان: ئێران، سعودیە، کوەیت، خۆ کەستان نەهێشت.

**+ عەلی حەسەن مەجید بێجگە لە شەڕی (عیراق، ئێران)، لە شەڕی کوەیتیشدا دەورێکی باڵای هەبوو، هیچ کەوتنە ئەو گفتوگۆیانەوە؟**

ـ بەڵێ، ئەو لەوەدا باسی دەکرد کە من لە کوەیت هەوڵمداوە تەعەددا نەکرێ، چەند کەسێکم لەسێدارە داوە لەبەر ئەوەی دەستدرێژییان کردووە، دزییان کردووەو ناوەکانیشیانی دەهێنان، فلان کەس ئەفسەرێکی گەورە بوو، دەیگوت: "خەڵك هەمووی دەزانێ کە من لەوێ ئەمری ڕەمیکردنم داوە، لەبەر ئەوەی تەعەددای لە ئافرەتێك کردووە، یەکێکی تر لەبەر ئەوەی کە دزی کردووە، یەکێکی کە خەڵکی کوشتووە"، باسی ئەو شتانەشی دەکرد، دیارە کابرا خۆ باسی چاکەکانی خۆی دەکات، ئەوەی کە بۆ خۆی بە چاکەیان دەزانێ، خۆ ناچێ بڵێ کاکە ئەو کەموکوڕیانەم هەبوو.

**+ کە یەکەمجار صەددامت بینی، چۆنبوو؟**

ـ یەکەمجار من نەمبینی، بەڵام گوتیان هاتووە، یەکەمجار کە هات دوای ئەوە بوو کە چوار پێنج مانگ بوو من لەوێ بووم، بەس دوای ئەوە نزیکەی بە (١٠ ـ ١٥) ڕۆژێك، دیار بوو ئەو بوو هێنایان، ئەوان خۆیان ناسییانەوە، من فریا نەکەوتم، وتیان ئەوە صەددام بوو، ڕۆیشتنی، قەدو قیافەی، دوایی دیاربوو لە پاسەوانەکان پرسیبوویان، وتیان کە بەڵێ ئەوبوو، شوێنەکەی پشتی لە ئێمە بوو ڕووی لەولا بوو، کاتێ کە بردبوویان، پێم وابێ بۆ چارەسەر بردبوویان.

**+ مامۆستا، هەستت بە چی کرد کە ئەوە صەددامەو بەو هەموو دەسەڵاتەوە ئێستا لەزیندانداییە؟**

ــ وەڵڵا هەرچی فیرعەونو نەمرودو ئەبوجەهلە کەوتنەوە بیرم، وتم ئەوە چارەنووسیانە، ئەو فیرعەونە، ئەو صەددامەی کە دەیگوت "اذا قال صدام قال العراق". ئەو صەددامەی کە ناویان نابوو "قائد الضرورة"و "قائد الأوحد"و نازانم سەد لەقەبیان لێ هەڵدابوو، سەرەنجامەکەی، چونکە لەسەر ڕێیەکی هەڵەبوو، چونکە خاوەن سیاسەتێکی هەڵەبوو، چونکە دەیویست پەروەردگارێتی بەسەر خەڵکدا بکات، سەرەنجامەکەی ئاوابوو کە زەلیل بێتو بکەوێتە بەر دەستی سەربازێکی ئافرەتی ئەمریکی، یا هەتیوێکی ئەمریکی، لەکاتێکدا تا دوێنێ خۆی بە سەرۆکی میللەتێكو وڵاتێك دەزانی، بەڵکو گەورەتر لەوەش، چونکە صەددام باسی ئوممەی عەرەبی و یەکێتیی عەرەبی و ئەو شتانەی دەکرد، هاتەوە بەرچاوم کە ئەو کەسەی ناوێکی گەورەی لێدەنرێ، یاخود ناوێکی گەورە لەخۆی دەنێ، ئەگەر عەقڵێکی گەورەی نەبێو دڵێکی گەورەی نەبێتو ئەخلاقێکی گەورەی نەبێو بەرنامەیەکی ڕاستی نەبێت، سەرەنجام لەسەر ناوە گەورەکەی زۆر زۆر قەرزدار دەبێتەوە، هەر ناوە گەورەکەی دەبێتە هۆی بچووکبوونەوەیو ڕیسوابوونی، زۆر شتم بەمێشکدا دەهات.

**+ پێتان خۆشبوو کە صەددام لەوێیە لە زینداندا؟**

ـ وەڵڵا پێم خۆشبوو، وەکو بیرم لە حاڵی میللەتی کورد و میللەتی عیراق و ئەو هەموو ستەمو زۆرانەی کردەوە کە ڕژێمی بەعس بە سەرۆکایەتیی صەددام بەسەری هێناوە، بەڵام لەسەرێکی کەوە، بەڕاستی پێم ناخۆشبوو، چونکە دەمەوێت هیچ شتێك نەڵێم پێچەوانەی قەناعەتی خۆم بێت، پێم ناخۆشبوو کەسێك کە لەسەر مسوڵمانان حساب دەکرێ، سەرۆکی وڵاتێکە کە مسوڵمانانی تێدا نیشتەجێن، بکەوێتە بەر دەستی دەوڵەتێکی کافر.

پێم ناخۆشبوو کە کارێکی وایکردووە، ئاوا سەرئەنجام بکەوێتە بەر دەستی دەوڵەتێکی کافر، ئەو دەوڵەتە کافرە پاساوی دەست کەوێ، بیانووی دەست کەوێو بێ ئەو دەوڵەتە داگیرکاو سەرۆکەکەشی لای خۆی دیل کا، وەکو کەوی ناو قەفەس، لەو ڕووەوە کە دوژمنی میللەتەکەمەو دوژمنی میللەتی عیراق بووەو دیکتاتۆر بووەو

ستەمکارێك بووە، پێم خۆشبووە زەلیل بێت، بەڵام بەڕاستی پێم خۆش نەبوو بە دەستی ئەمریکا دیل بێت، دەوڵەتێکی زلهێزی وەکو ئەمریکا، کە ئەویش پێموایە صەددامو غەیری صەددام بەهۆی دەست لەپشتدانی ڕۆژئاواو بەتایبەتی ئەمریکاو ئەوانە نەبوایە، نەیدەتوانی بەو شێوە بکات کە کردی، ئەگەر بەچاو لێنوقاندنی ئەمریکاو بەدەست لەپشتدانو هاوکاریی ئەمریکاو ئەوروپاو ئەو زلهێزانە نەبوایە، ڕژێمی بەعس ئەوەی کە کردی لەماوەی ئەو سی چل ساڵەی ژیانی خۆیدا، نەیدەتوانی لەعیراقدا بیکا.

**+ ئەگەر صەددام–ت لەنزیکەوە ببینیایە، چیت پێ دەوت؟**

ـ هەر ئەوەی بەوانم گوتووە، بەڵکو زیاتریشم بەو دەگوت، ئەگەر دەرفەتم بۆ ڕەخسابایە، بێگومان چاکترو تۆخترو زیاتریشم بەو دەگوت، چونکە ئەوان بەزۆری ئۆباڵەکەیان دەخستە ئەستۆی ئەو، دەیانگوت کە ئەو هەمەکارە بووە، لەبەر ئەوە، ئەو شایستەی ئەوە بووە زیاتری لەگەڵ بگوترێ و چاکتر پێی بگوترێ و بە ڕوویدا بدرێتەوە.

**+ کە هەردوو کوڕەکەی (عودەیو قوسەی) کوژران. ئێوە هەواڵەکەتان بیست؟**

ـ بەڵێ، ئەوان تەرمەکانیان هێنابوو بۆ ئەوێ، خزمەکانی صەددامیان بردو تەماشایان کردبوون، عەلی حەسەن مەجیدو بارزانو ئەوانیان بردبوو وتبوویان وەرن تەماشایان بکەن، داخۆ ئەوانن، بۆ دڵنیابوون لەوەی داخۆ ئەوانن یان نا؟ ئیدی لەسەربازگەکەدا دەنگی دایەوە کە عودەیو قوسەی کوژراون، هەروەها کوڕەکەی قوسەی، مستەفا، وتیان ئەو سێیە کوژراون، تەرمەکانیشیان هێناون، خزمەکانی صەددامیشیان بردوون تا تەماشایان کەن داخۆ خۆیانن؟ وتبوویان بەڵێ خۆیانن.

**+ کاردانەوەی ئەوان چۆن بوو؟**

- بەزۆری خەمناك دیاربوون، زۆربەیان.

**+ باسیان نەدەکرد کە پێیان ناخۆشە؟**

ـ با، با، خەمناك دیاربوون، خەمبار دیاربوون، هەیانبوو بەعزە شیعرێكی دەخوێندەوە كە ئەوە صەددام ڕاستی كرد لەگەڵ وڵاتی خۆی، لەگەڵ ئەوەی خۆی وڵاتەكەی بەجێ نەهێشتو كوڕەكانیشی كوژرانو خۆشی گیرا، وتیان كەس بۆی نییە لۆمەیان بكات، ئەو ڕاستیكرد لەگەڵ دروشمەكانی خۆیو وڵاتی بەجێ نەهێشتو ڕاینەكرد، ئەوەی نەكرد وەكو هەندێك سەركردە كە خۆی دەرباز كاوماڵو منداڵی دەرباز كاو خەڵكیش بەكوشت بدات، خۆی لەمەیداندا بوو، ئا ئەو قسانەیان دەكرد.

**+ مامۆستا، باسی ئەوەت كرد كە دكتۆر عەبدولمونعیم وەزیری ئەوقاف پێی ناخۆشبووە بەتكریتی بانگت كردووە؟**

- بەڵێ.

**+ بۆچی؟**

ـ لەبەر ئەوەی دەیگوت كە "تكریتی بۆتە نازناوێك، شۆرەتێك بۆ خەڵكی ستەمكار، كە ستەمیان لە خەڵك كردووەو خۆیان لەخەڵك بەزیاد زانیوە، بەڕاستی خۆم لە خەڵك بەزیاد نازانمو ستەمیشم لەكەس نەكردووە"، بەڵكو دەیگوت "ڕژێم لەگەڵ مندا زۆر ناسازگار بووە، لەبەر ئەوە وەزیری ئەوقاف بووم، ویستوویانە شتی ناشەرعیم پێ بكەن، من نەمكردووە، دەیان بوغزاندم، خەڵكیش ئەوە دەزانێ". لە خەڵكێكی تریشم دەپرسی، دەیانگوت كە پیاوێكی شەرم بەخۆو بەئەدەبو چاكبووەو هەوڵی داوە شتی شەرعی بكاو شارەزایی شەرعی هەبوو، هەرچەندە ئەو پێش من نەدەكەوت بۆ نوێژو دەیگوت تۆ لەمن شارەزاتریو ئەوانە، هەر كە دانیشتین لە قاعەكە، ئەو ڕۆژە كە بەیەكەوە دوو سێ نوێژمانكرد، دوای ئەوەی قسەمان كرد، زانی من قورئانم لەبەرەو ئەوانە، وتی من پێش جەنابت ناكەوم، دەبێ تۆ ئیمامەتمان بۆ بكەیت.

**+ هیچ شتێكی ترت لەگەڵ باس دەكرد كە تیایدا تێك بگیرێن؟**

ـ لەگەڵ ئەونا، بەس لەگەڵ ئەوانی دیكە كە ئەندامانی ئەنجومەنی سەركردایەتیی شۆڕش و قوتری بوون، بەڵێ تێك دەگیراین، بەس وەزیری ئەوقاف یان بێدەنگ دەبوو یا لای منی دەگرت، وەكو ئەوەی شارەزابوو لە ئیسلام، ئیدی زیاتر لای منی دەگرت،

یـان بـێدەنگ دەبـوو، دیـارە ئـەو شـەرمی لـەوان دەکـردو بـێدەنگ دەبـوو، ئەگـەر بەشدارییەکی بوایە، تەئیدی منی دەکرد.

**+ لەمـیانەی قسـەکانتدا، باسـی هاوپەیمانێتیـی بەعسـت کـرد لەگـەڵ ئەمریکادا، کە تا کاتی ڕاپەڕینەکانی کوردستانی عیراق‌و باشووری عیراق لە ساڵی (١٩٩١)، ئەمریکا بەتەواوەتی دەستی لەپشتی ڕژێمی بەعس دەدا بۆ تاوانەکانـی، بـۆ شـەڕەکانی، یـا کۆمەڵـێك هاوکاریـی جـددی دەکـردن، هـیچ گفتوگۆیەکت لەگەڵ نەدەکردن لەو بارەوەو ئەوان باسی هاوپەیمانێتیی خۆیان لەگەڵ ئەمریکا بکەن؟**

ـ ئـەوان باسـیان نەدەکرد، باسـی ئـەوەیان نەدەکرد، بـەس دەیانگوت کە "ئێمە مامەڵـەمان هەبـووە لەگـەڵ ئەمـریکا، دەیانگـوت کـە ئەمـریکا هاوکـاری کـردووین، مامەڵـەمان لەگەڵی هەبووە، مامەڵـەی بازرگانـی‌و سیاسیی‌و ئەوانە"، تا ئەوکاتەی کە دوو شـتیان بـاس دەکـرد، دەیانگوت کـە "تـا ئەوکاتـەی لـێمان نائومێد بوون کە ئێمە تـەنازول ناکـەین لـە قەزیـەی فەلەسـتین‌و تـەنازول ناکـەین لە دژایەتیی جولەکە، وتیان دوای ئـەوە کـە لـێمان نائومـێد بـوون، هـاتن لەڕێـی سـەرۆکی دەوڵەتێکی عەرەبییەوە بەڕەسمـی پـێیان گـوتین (کـە پێویسـت ناکـات نـاوی بهێـنم، لـە ڕاسـتیدا هێندێ کەس شـتیان بـە ئەمانـەت پـێگوتووم، نامەوێ بیدرکێنم)، سەرۆکی دەوڵەتێکی عەرەبی هات بۆ لای صـەددام‌و وتـی کـە ئەمـریکا ئـەو داوایـەی هەیـە، دەسـت لە دژایەتیی جولەکە هەڵگرن، دەسـت لـە پشـتگیریی فەلەسـتینییەکان هەڵگرن، ئـێمە کێشـەمان لەگەڵـتان نیـیە، ئـەو شـتانەش کۆتایـی پێدێنین. ئـەویش ڕاوێژی بـە ئـێمە کـرد، بـە ئەندامانـی ئەنجومەنـی قـیادەی شـۆڕش‌و قوتـری‌و ئەوانـە، ئـێمەش بۆچوونمان وابوو کـە نەخێر دەسـتی لـێ هەڵناگرین، ئەگـەرنا، ئەمـریکییەکان ئامادەبوون کە هەموو مامەڵەیەکمان لەگەڵـدا بکەن، کێشەکانمان لەگەڵ چارەسەر بکەن، بەمەرجێ ئێمە دەست لە دژایەتیی جولەکە هەڵگرین، دەست لە پشتگیریی قەزیەی فەلەستین هەڵبگرین".

لـێم پرسـین، وتم بۆ ئـێوە هاوکاریـی فەلەسـتینییەکانتان دەکرد؟! وتیان: "بەڵێ، هـەر فەلەسـتینییەك بکوژرێ، ئەوەنده پارەمان داوەتێ‌و ئەگەر خانووی وێران بکرایە، ئەوەنـدە قەرەبوومان داوەتـێ". هەشـیان بـوو تێبینی هەبوو لەسەر ئەوە، هەر لە نێو

سەرانی ڕژێم هەبوو دەیگوت کە "ئێمە زۆرمان کرد بۆ فەلەستین، ئێمە وڵاتی خۆمان وێران کرد تائەوێ ئاوەدان بکەینەوە، ئەوێشمان پێ ئاوەدان نەکرایەوەو ئێرەشمان لەدەستدا"، هەبوو دەیگوت کە "چونکە داهاتێکی زۆرمان لەوێ خەرج دەکرد، زۆر هاوکاریی ئەوێمان دەکرد، زۆر شتمان هێنایە سەر خۆمان لەسەر دژایەتیکردنی جولەکە، سەرەنجام ئێرەشمان پێ دروست نەکرا". لەو ڕووەوە دەیانگوت کە "ئێمە سیاسەتێکی هەڵەمان هەبوو، نەدەبوو وامان کردبایە".

**+ مامۆستا، هیچ لەو سەرکردانە هەبوو کە لە حزووری جەنابتاندا دان بەتاوانەکانی خۆیدا بنێت‌و پەشیمان بێ لێی؟**

- وەکو تاوانی شەخسی، نەخێر لێم نەبیستن، بەس بەگشتی هەبوو دەیگوت کە "بەڕاستی ئێمە لەسەر هەڵە بووین، ئەو ڕژێمە کە هەبوو، ئەو حکومەتە کە هەبوو، ئێمە خراپ بووین"، بەڵام ئەوەی کە وای دەگوت، دەیگوت کە من بۆچوونم لەگەڵیا نەبووە، یان دەیگوت کە من کاتی خۆی دوور کەوتبوومەوە، یان دەیگوت کە دەستم لە کارکێشابووەوە. بەڵام کابرا خۆی بڵێ من ئەو هەڵەیەم کردووە، پێم شك نایەت کەس شتێکی وای گوتبێ.

**+ سەرکردە بەعسییەکان لە نێو خۆیاندا پەیوەندییان چۆن بوو؟**

- بەزۆری ناکۆك بوون، قسەیان زۆر تێك دەگیرا، لێشم دەپرسین ئێوە بۆ ئەوەندە ناکۆکن؟ هەر ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئێوە لەسەر باتڵ بوون، چونکە حەق خەڵك کۆدەکاتەوەو باتڵ خەڵك لێك بڵاو دەکاتەوە، ئێوە دوو نەفەرتان نییە بۆچوونتان یەك بێت، دەیانگوت: "ڕاست دەکەیت، ئەوەش نەگبەتیی‌و نەهامەتیمانە".

زۆر تێك دەگیران، پێنج شەش جار سوڵح‌و ئاشتەواییم لە نێوانیاندا دەکرد، دەنگیان لە یەك هەڵدەبڕی، جاری وا هەبوو ڕەنگە ویستبێتیان پەلاماری یەکتری بدەن، بە یەکەوە ئاشتمان دەکردنەوە.

لەنیوخۆدا ناکۆکبوون، ناتەبابوون، هەتا خزمەکانی صەددامیش لێم دەبیستن کە لە نێو خۆیاندا ناکۆکن، خۆشیان گلەییان لەیەکتری دەکرد، هەمووشیان زۆر دژی تکریتییەکان بوون، سەرکردەیەکی سەربازییان کە شیعە بوو، وتی: "شێخ؟" وتم،

بەڵێ. وتی: "ئەوە دەبینی (ئیشارەی کرد بۆ زاواکەوی صەددام کە ناوی جەمال بوو)؟" وتم: بەڵێ، وتی: "وەزیر نەبوو کە ئەوە بەلوتی ڕاینەکێشێ، (کان یجره علی خشمە)، بە لوت ڕایدەکێشا"، وتی: "بۆ وەزیر هەبووە، ئەندامی ئەنجومەنی قیادەی سەورەو قوتری هەبووە لەبەریدا بکۆکێ؟" وتم چۆن؟ باشە محەلی لە ئیعرابدا چی بوو؟ وتی: "هیچ شتێکی وا نەبوو، بەڵام زاوای صەددام بوو". واتە هەموویان بەرانبەر بە تکریتییەکان‌و بنەماڵەی صەددام‌و خزمەکانی زۆر حەساس بوون.

دەیانگوت کە "هەموو شتیان بۆ خۆیان قۆرخ کردبوو، هەموو شت بەدەست خۆیان بوو، ئەو خەڵکەیان بەهیچ نەدەزانی، لەبەینی خۆشدا هەر ناتەبا بوون".

**+ ئەو سەرکردانە شیعەیان تێدا بوو؟ غەیری ئەوەی ئێستا باست کرد؟ یان هەموویان سوننە بوون؟**

ـ تیایاندا هەبوو، مزبان خزر هادی ئەندامی ئەنجومەنی قیادەی شۆڕش شیعە بوو، شیعەی کەشیان تێدا بوو، ئەندامی ئەنجومەنی قیادەی قوترییان هەبوو شیعە بوو، وەزیریان تێدابوو شیعە بوو، بەڵام کەمتر، ڕێژەی زیاتریان سوننییەکان بوون.

**+ ئایا هیچ کات باسیان لەدوایین جەنگی ئەمریکا بۆ سەر عیراق‌و ڕۆڵی خودی ئەوان تیایداو هۆکارەکانی شکستە خێراکانیان نەکردووە؟**

ـ زۆریان باس دەکرد، تەفسیراتی زۆر جۆراو جۆریان هەبوو، بەڵام بەزۆری قسەکانیان ئەوەبوو: "ئێمە شەڕێکمان کرد کە خۆمان بۆ ساز نەکردبوو، شەڕێکی نابەرانبەرمان کرد، قسەکانمان زلتربوون لەکردەوەکانمان"، من پێم دەگوتن باشە خۆ دونیا وایدەزانی چەکی کۆکوژتان هەیە، کیمیاییتان هەیە، چەکی بایۆلۆژیتان هەیە، هەندێ کەس گومانی وایدەبرد کە قومبەلەی زەڕڕەشتان هەبێت، باشە کە ئەو شتانەتان نەبوو، ئەو قسە زلانەتان بۆ دەکرد؟ بەزار خۆتان تاوانبارو تۆمەتبار کردو بیانووتان دایە دەست ئەمریکا، دەیانگوت بێگومان ڕاستە.

من گوتم هەموو خەڵك قەناعەتی وابوو ئەو شتانەتان هەمووی هەیە، بەڵام دوایی زۆر گەڕان‌و هیچیان نەدۆزییەوە، هەر نەتان گوت خەڵکینە وەڵڵا هەر نەمانبووە، ئێ وتم باشە" بۆ ئەوەتان نەکرد؟ جار جار ڕەنگە لێدوانی واتان دابێ‌و ئیهامی خەڵکتان

کردبێ کە هەتانە، وتیان "بەڕاستی ئەوە ڕەنگە وەکو جەنگێکی دەروونی بەکارهاتبێ، بەڵام خۆ زۆر حاشامان دەکرد کە نیمانە، بڕوایان پێنەکردین، ئەوەتا هەموو شتێ گەڕان‌و هیچیان نەدۆزییەوە".

**+ ئیقراریان دەکرد کە چەکی کۆکوژ لە عیراقدا نەماوە؟**

ـ بەڵێ، دەیانگوت کە هەر کاتی خۆی نەمان هێشتووەو نەبووە، یا هەر نەمان بووە، یان ئەوەی هەشبوو لەناو براوەو نەهێڵراوە.

**+ ئەی هۆکاری شکستەکەیان چی بوو؟**

ـ هۆکاری شکستەکە، دەیانگوت ئەوەبووە "ئێمە تەقدیری بارودۆخەکەمان چاك نەکردووە، باش تەقدیری ئەو تەکنەلۆجیا سەربازییەمان نەکردبوو کە ئەمریکا هەیەتی، تەقدیری هێزی خۆمانمان باش نەکردبوو". دەیانگوت: "هەندێکمان قەناعەتمان وابوو ئەمریکا شەڕەکە هەر ناکات، لەبەرئەوەی خۆپیشاندانی ملیۆنی‌و چی‌و چی هەیە، پێمان وابوو هەر نایکا"، هەندێکیان دەیانگوت: "هەڵەکەمان لەوەدا بووە کە ئەو چەك‌و ئیمکانیاتەی هەبووە، باش بەکارمان نەهێناوە، لێزانانە دابەشمان نەکردووە"، دەیانگوت کە زیاترمان بۆ خوارەوە ناردبوو، دەیانگوت: "ئەمریکا سەرقاڵی کردووین لە ئوم قەصرو بەصرەو لەو شوێنانە، هێزەکانمان بەزۆری بۆ ئەوێ نارد، دوایی ئەمریکا دزەی کرد، یەکسەر بەرەو بەغدا هات، کە ئەویش وەکو دڵ‌و سینە وایە بۆ مرۆڤ، کە ئەوێ دەگرێ، مانای وایە دەوروبەر بۆ خۆی پەك دەخات‌و دیفاعی بۆ ناکرێ". هەشیانبوو دەیگوت: "ئێمە دەمانزانی وایە، صەددام زۆر چاك دەیزانی وایە، بەڵام وتی کە من پێموایە لەسەر مەبادیئی خۆمان با بکوژرێین‌و با وڵاتمان داگیر بکرێ، لە مەبادیئی خۆمان تەنازول ناکەین، ئەمریکاش نیەتی هێناوە هەر لێمان دەدات"، هەندێکیشیان وایان تەفسیر دەکرد، هەبوو دەیگوت کە قەناعەتی وابوو هەر لێمان نادات، هەندێکیان دەیانگوت کە نەخێر، دەمانزانی لێمان دەدات، بەڵام لە شەڕێکی نابەرانبەردا پیاوانە بکوژرێین یان وڵاتەکەمان بگیرێ پێمان باشترە وەك لەوەی تەنازول بکەین.

بەڕاستی تەفسیراتی جۆراوجۆریان هەبوو.

**+ لێره لەهەندێ کەناڵی ڕاگەیاندنەوە باس لەوە دەکرێ کە لە نێو سوپای عیراقیدا خیانەت کراوە (بەگوزارشتی خۆیان)؟**

- من ئەوەم لێ پرسین، وتم ڕاستە؟ گوتیان: "نەخێر، ڕاست نییە"، گوتم: ڕاستە خەڵکی ئەفسەرو پلە بەرزتان لە سوپادا یان لە موخابەراتدا پەیوەندییان بووبێ بە ئەمریکاوەو ئەوە پشتی شکاندبن؟ گوتیان: "نەخێر وا نییە"، گوتیان: "ڕەنگە هێندێ خەڵك بووبێ، بەڵام ئەوە نەبوو کە پشتی ئێمەی شکاند"، هەندێکیان دەیانگوت: "ئەو لێدانە گورچکبڕە، ئەمریکا زۆر بەسەختیو زۆر بەخەستی لە هێزەکانی ئێمەی داو هەموو لەناو بردو ماکینەی سەربازی تەفنیش کردینو خەڵکێکی زۆری لێ کوشتینو شیرازەی وەزعەکە پچڕا". دەیانگوت کە زیاتر بەوە مەعنەویات نەما، هەش بوو لەوانەی کە ڕقیان لە ڕژێم بوو، هەر لە نێو خۆیاندا دەیانگوت: "خەڵك باوەڕی نەبوو دیفاع لەو بارودۆخە بکات"، بۆ نموونە" یەکێکیان دەیگوت کە من پێموایە ئەمریکا بۆ ئێمە هاتووە. یەکێکیان لیوایەکی سەربازی بوو ناوی ناهێنم، دەیگوت: "شێخ، من پێموایە ئەمریکا تایبەت بۆ ئێمە هاتووە کە ئەو ڕژێمە بڕووخێنێو لەکۆڵ ئەم میللەتەی کاتەوە، ئێ چۆن دیفاع بکەین؟".

**+ پلەکەی لیوا بوو؟**

- بەڵێ پیاوێکی ناوداریشە، بەس ناوی ناهێنم.

**+ بەرپرسیان هەبوو مەیدانییەن بەشداریی شەڕەکەی کردبێ؟**

- بەڵێ، زۆربەیان بۆ منیان باس دەکرد کە بەشدارییان کردووە.

**+ مامۆستا، ئەو سەرکردە بەعسییانە چۆن باسی صەددام حسێنو بنەماڵەکەیو کوڕەکانیان دەکرد، لە زیندانیشدا هەر بە گەورەی خۆیان دەزانی، یان بە هۆکاری نسکۆ یەك لەدوای یەکەکانی عیراق؟**

- هەیانبوو هەر بە گەورەی خۆی دەزانی، ئەوانەی بە حوکمی دراوسێیەتی لێم نزیکبوون، دەتوانم بڵێم نیوەیان هەر بە گەورەیان دەزانی، هەر بەپیاوێکی گەورەیان دەزانیو بە سەرۆکیان دەزانی، هەندێکیشیان دەیانگوت: "مایەی نەهامەتییەکانی

ئێمە بوو، دیکتاتۆر بوو، ڕەئی خۆفەرزکەر بوو، گوێی بۆ خەڵك نەدەگرت، وەکو بنەماڵەی خۆیان حوکمیان دەکرد"، هەیابنوو واشیدەگوت.

**+ بەڵێ، ئەوانەی کە نەیاری صەددام حسێن بوون، بە وتەی خۆیان، باسیان لەوە نە دەکرد کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بیریان لە کودەتایەك کردبێتەوە بۆ ئەوەی کۆتایی بە دەسەڵاتی ئەو بێنن؟ بۆ ئەوەی کۆمەڵێك گۆڕانکاری لە ڕژێمەکەدا بکەن؟**

ـ کاك هاوڕێن، ئەوانەی لەوێ بوون، هەموو ئەوانە بوون کە ماونەوە، ئەوانەی کە کودەتایان کردبێ‌و بیریان لێکردبێتەوە، ئەوە فەوتاون، ئەوانە بوون کە بۆ صەددام مابوونەوە، بەلاّم لە نێویاندا هەبوو گوتی کە "کاتی خۆی موحاوەلەیەك کراو منیشی تێدا بووم، خۆشم دانابوو ئیعدام بکرێم، بەلاّم دیاربوو زانیاریی وردیان نەبوو لەسەرمو لەبەر عەشیرەتەکەشم چاوپۆشیم لێکرا"، ئەوە یەکێکیان بوو کە وتی: "من لە شتێکدا هەبووم، خزمەکانی ئێمە پێی هەڵسابن، دوایی هەمووشیان لەسێدارە دران"، بەس گوتی کە من چاوپۆشیم لێکرا، یان ڕەنگە زانیاریی تەواویان نەبووبێ، ئەو بەس ئەوەی بۆ گێڕامەوە، ئەوانی دیکە لەوانەبوون کەمابوونەوە، لەگەڵ صەددام مابوونەوە.

**+ دەتوانین ناوەکەی بزانین، ئەوەی کە دوای موحاوەلەی کودەتاکە مابووەوە؟**

ـ نەخێر، پێم باش نییە، بەس لیوایەکی سەربازیی بوو.

**+ عەلی حەسەن مەجیدو ئەوان باسی دەستگیرکرانی خۆیان نەکرد؟**

ـ لێم دەپرسین، من لە عەلی حەسەن مەجیدم پرسی، وتم: چۆن گیرایت؟ دیارە هاوڕێکانی زۆریان مەبەست بوو کە چۆن گیراوە؟ دەیانگوت کە کەسمان جورئەت ناکەین پێی بڵێین، شەرم دەکەین، وتیان ئەوە مەگەر جەنابت پێی بڵێیت، وتم وەڵلا من پێی دەڵێم، وتم ئەبو حەسەن ئەوە چۆن گیرایت؟ خۆت تەسلیم کرد یان گیرایت؟ وتی: "ئەگەر بڵێم خۆم تەسلیم کرد، وانەبوو، ئەگەر بشڵێم گیراشم، هەر وا نەبوو. پێم چاك نەبوو چی دیکە خۆم بشارمەوە، بەنەوعێك لەشوێنێ بووم کە دەمزانی پێم دەزانن، بەلاّم خۆشم نەچووم خۆم تەسلیم کەم، بەلاّم دەشمزانی کە دەگیرێمو

دەمتوانی بەنەوعێکی تر خۆم پەنهان بکەم، خۆم پەنهان نەکرد". ئاوا قسەکەی کرد، جا چەندی ڕاستەو چەندی درۆیە، نازانم.

**+ ناوی شوێنەکەی نەوت؟**

- نەخێر، شوێنەکەی نەگوت، بەس زۆربەیان خۆیان تەسلیم کردبوو، تاك تاکێکیان گیرابوون، هەیانبوو چووبووە سوریا، لە سوریا وەرنەگیرابوو، دوو سێیەك لە وەزیرەکان قسەیان بۆ من کرد کە چووبوونە سوریاو حکومەتی سوریا ئیزنی دابوونەوە، وتبووی وەرتان ناگرم، هاتبوونەوەو خۆیان تەسلیم کردبوو. هەیانبوو هەر لە ناو عیراقدا بووەو خۆی تەسلیم کردووە، کەمێکیشیان هەڵیان کوتابووە سەریان و گیرابوون.

**+ کەسیان هەبوو برینی شەڕێك یان شوێنەواری شەڕێکی پێوە بێت، برینی کاتی دەستگیرکرانی، یان کاتی شەڕەکە؟**

- پێمەوە نەدەبینین، جا ڕەنگە برینێکیان پێوە بووبێ و چاك بووبێتەوە، نازانم.

**+ مامۆستا، بەشێوەیەکی گشتی، تۆ چۆن ورەو نەفسییەت و کەسایەتیی ئەوان لەزیندانلدا لێك دەدەیتەوە؟ ئایا ورەیان بەرزبوو یان ڕووخاوبوون؟**

- هەیانبوو ورە ی بەرز بوو، هەشیان بوو ڕووخاوم دەهاتنە بەرچاو، قسەی خۆمان بێ، بەشێك لە ڕووخاویەکەش پەیوەندی بە تەمەنیانەوە هەبوو، بەنەخۆشییانەوە، هەبوو نەخۆشی شەکرەی هەبوو، نەخۆشی زەختی هەبوو، نەخۆشی فەقەراتی هەبوو، نەخۆشی گورچیلەی هەبوو، ئەوانەشیان هەبوو، دیارە کە ئەو نەخۆشییانە تەنگی پێ هەڵدەچنین، زیاتر لاواز و زەبوون دەهاتنە بەرچاو، بەڵام هەموو جۆرەکانیان تێدا هەبوو، ئەوانەی خۆیان کە بۆ منیان باس دەکرد، یا موحەقیقەکان کە هەندێ جار هێندێ شتیان باس دەکرد، هەشبوو لای ئێمە خۆی بە بەهێز پیشان دەدا، بەڵام لای موحەقیقە ئەمریکییەکان کە تەحقیقیان لەگەڵ دەکرد، قسەی لاوازی کردووە. شتیان لەیەکتر دەگێڕایەوە، هەندێکیان گلەییان لەیەکتر دەکرد، هەیانبووە قسەی لەسەر ئەویتر کردووە لای ئەمریکییەکان، ئەوەش هەبوو. کەواتە ئەوە دەلالەت لەسەر داڕووخان و ئەوانە دەکات.

بەڵام کابرا لەڕووی تۆداو لەڕووی ڕواڵەتی، خۆی واپیشان دەدا کە بەهێزە، بێگومان هەردوولای تێدا هەبوو، خەڵکیشیان تێدا هەبوو کە بەحەقیقەت خۆڕاگربوو، بێمنەت بوو لەمردنیش، بێباك بوو، لەوێش هەر پتەو بوو، بەس ئەوانە کەمتربوون.

**+ لەسەر ئەو قسە لەسەر یەکترکردنە لە دادگا، ئایا کات هەبووە بکەونە شەڕە قسە لەگەڵ یەکتر؟**

ـ بەڵێ، هەیانبوو پێیان گوتبوو ئێمە تۆمان بۆیە هێشتووەتەوە، بۆ ئەوەی ئەو قسانەی کردووتە لەسەر فلان کەس، تا ببیە شاهید لەسەری، ژمارەیەکیان بەربوون، ئەوەی هێشتبوویانەوە بۆ ئەوە بوو کە شاهید بێت بە سەر ئەوانی دیکەوە، کە قسەی لە سەریان کردووە.

**+ لە ناو خۆیانداو لەسەر ئەوانە نە دەبووە شەڕە قسەیان؟**

ـ بەڵێ، زۆر دەبوو، تێك دەگیران.

**+ ئەکرێ ناوەکانیان بزانین؟**

ـ ئەمن ناوی کەس ناهێنم، پێم چاك نییە، بەس گومانی خراپیان زۆر بەیەکتر دەبرد، باسی یەکتریان دەکرد، هەبوو دەیگوت: "فلان کەس، پیشانی منیان داوە کە بەخەتی خۆی شتی لەسەر من نووسیوە، نووسینەکەیم ناسیوەتەوە"، یان دەیگوت: "شتێکمان بووە منو ئەو، هی نەفەرێکی دیکە بووە، دەزانم بەس ئەو ئەو باسەی زانیوە، ئەو ئەو قسەیەی لای ئەمریکییەکان کردووە"، بەڵێ ئەو شتانەیان دەگوت، زۆر نازو گلەییان لە یەکتر دەکرد.

**+ جەنابت لەسەرەتاوە باست لەوە کرد کە تیایاندا بووە ئاشنای ناوی تۆو پێگەی تۆ بووە، بەڵام کەس هەبووە لەوان بە تەواوی لە کەسایەتیو ئاستی ئێوە شارەزا بێت؟**

ـ پێم وانییە، بەس هەر ئەوەندە زانیویانە من کاتی خۆی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بزووتنەوەی ئیسلامیی بوومو ئۆپۆزیسیۆنی عیراقی بووین، دژی ڕژێمی بەعس بووین، هەشیان بوو کە زانیوێتی ڕژێم خەڵکێکی ناردووە بۆ لای منو وەڵامم نەداوەتەوە.

یەکێك لەوانە عەبد حەمموود بوو، ڕۆژێك کاتی پشوو بە بەردەم دەرگاکەیدا ڕەتبووم، وتی: "شێخ، چەند جار جوابم بۆ ناردیت جوابت نەداینەوە، هەر جوابت نەداینەوە، پێمان خۆش بوو پەیوەندیمان هەبێت، پشتگیریتان بکەین، هاوکاریتان بکەین"، وتم: ڕاستە جوابم نەداونەوە، بەڵام ئەو قسانە لای ئەمریکییەکان بکە، چونکە من یەکێ لە تۆمەتەکان کە پێی هاتوومەتە ئێرە، گوایە لەگەڵ ئێوە پەیوەندیم بووە، ئەوەتا جەنابیشت گلەییم لێ دەکەیت بۆ پەیوەندیت نەبووە ! وتی: "بەڕاست؟" وتم: بەڕاست. وتی: "بڕوات بێت، بێجگە لە ئێوە، هەموو پەیوەندییان هەبووە"، وتی: "وەڵڵا ئەمریکییەکان لێیان پرسیوم، ئێ وتم وەڵڵا ئەوەندەمان زانیوە کە ئۆپۆزیسیۆنە و دوژمنێکی سەرسەختمانە"، وتی: "پێم سەیرە". ئەو کاتە ئەمریکییەکان جارێ لە تەحقیقدا بوون لەگەڵم، وتم وایان گوتووە، بەس دوایی ئەمریکییەکان بۆ خۆیان گوتیان بۆمان دەرکەوتووە کە ئەوە هەمووی درۆیە، ئەو ڕاپۆرتانەی لەسەر تۆ دراون درۆن، بەس ئەوکاتە ئەو شتەیان بە من نەگوتبوو عوزریان بۆ من نەهێنابووەوە، ئەمریکییەکان هەر لە سەر قەزیەکە سوور بوون، ئەوکاتە لەگەڵ ئەو کابرا ئەو قسەیەم کرد.

**+ بەڵێ مامۆستا، دوای ئەو پرسیارەی کە کردم، ئەوان چەندین جار هەوڵیان داوە بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ خودی ئێوەدا، لەسەردەمی بەعسدا، ئەوە خۆت پێش وەخت وەڵامت دایەوە، کە عەبد حەمموود دانی پێداناوە ئێوە بێبەری بوونو هیچ هاوکارییەکتان نەکردوون.**

- ئەو گلەیی دەکرد، دەیگوت وەڵامت نەداینەوە، وتم ڕاستە.

**+ بەس پرسیاری دواتر" ئەی هیچ یەکێ لەو سەرکردانە، یا عەبد حەمموود باسی لەپەیوەندی لەگەڵ کەسایەتیو ئەندامانی حزبەکانی تری کوردستان نەدەکرد؟ لەکاتێکدا لە دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس مەلەفی چەندین بەرپرسو کەسایەتی ئاشکرا بوو، کە پەیوەندییان بە ڕژێمەوە هەبووە، ئایا ناوی کەسیان دەهێنا؟**

ـ بەرێ وەڵڵا ناوی زۆر کەسیان بۆ هێناوم، ئەگەر بڵێم بە بێ لێدەرکردن، کەم لایەنی سیاسیی هەیە باسیان نەکردبێ، بەس ئەگەر خەڵکێك لە عەلمانییەکان بەناحەق باسی منی کردووە، بەدرۆ، من بەحەقیقیش پێم بێشەهامەتییە باسیان بکەم، بەرێ وەڵڵاهی باسیان کردووە کە چۆن لە بەغدا کۆبوونەوەیان کردووە، لە موصڵ، لە کەرکووك، کێیان هاتووە، چۆن پەیوەندییان بووە، بەس هەر پێم عەیبە باسی بکەم.

**+ لە ڕابردوویەکی نزیکدا؟**

ـ لەزەمەنی نزیك‌و دووردا، باسی زۆرکەسیان بۆ کردووم، بەس تا ئێستا لای یەك کەسیش باسم نەکردووە، هەر بەگشتی ئەوە باسدەکەم، ئەگەر خەڵك بەدرۆش بەڕەوای زانیبێ باسی من بکات، من بەڕاستیش بە چاکی نازانم باسیان بکەم، ئەزانی بۆ؟ کابرا یان ناچار بووە، یان ڕەنگە وای بەبەرژەوەندی زانیبێ، یان مەرج نییە، کەسێك کە پەیوەندی یان قسەیەکی لەگەڵ ڕژێم کردبێ، هەر بۆ ئەوە بێ کە میللەتەکەی بکوژێ، مەرج نییە، واتە دەبینی وای بە بەرژەوەندی زانیوە، یان تەماع‌و ئومێدێکی هەبووەو وتوویەتی ئەوا ئەمریکا درۆی کرد، با شتێکمان هەر هەبێ، مەرج نییە پیاو هەر بە تەفسیری خراپ تەفسیری بکات، من پێم بێئینسافییە، بەتایبەتی برادەرانی پارتی‌و یەکێتی، خۆ خۆشیان نایشارنەوە هەندێ پەیوەندیی بازرگانی‌و پەیوەندیی دیبلۆماسی‌و شتیان هەر هەبووە، خۆشیان نکوڵییان نەکردووە، وەفدی ڕژێم هاتووە بۆ لایان‌و ئەوان خەڵکیان ناردووە، خەڵکی دیکەش، جا مەرج نییە هەر ئەو شێوەی کە ئاشکرا بووە، شێوەی دیکەی پەنهانیش بۆ من باسکراوە، کە دەیانگوت: "زۆر هاوکاریی فلان لایەن‌و فلان لایەنمان کردووەو ئیمکانەتمان داونێ‌و ڕێی بازرگانیمان بۆ ئاسان کردوون، ئاوامان بۆ کردوون"، جا چەندی ڕاستەو چەندیشی درۆیە، من ناتوانم هەرچی ئەوان گوتوویانە، بڵێم هەمووی ڕاستە، بەڵام زۆریشیان باس دەکرد.

**+ ئەو ناوانەی ئەوان وتیان، کەسی زۆر دیاری تیایە، کە ئاستی بەرپرسیارێتیی باڵای هەبێ لە کوردستان؟**

- بەڵێ، نەك هەر یەكو دووش، تیایاندایە.

**+ مامۆستا، وەك باسیان كردبێ، لەناو حزبە ئیسلامییەكاندا كەسیان هەبووە؟ گەر پرسیارت كردبێ؟**

- باسی یەكێكیان كرد، بەڵێ، باسی كەسێكیان كرد كە لەوانەیە كاتی خۆی لەگەڵ ئێمەدا بووبێ، بەس ئایا ڕاست دەكەن، درۆ دەكەن، من نازانم.

**+ ناتوانین ناوەكەی بزانین؟**

- وەڵڵا پێم چاك نییە، من ئەگەر ناوی خەڵكی عەلمانی نەڵێم، ئەوی دیكە بۆ بڵێم. من ئەگەر پاساو بۆ كابرای عەلمانی بێنمەوەو بڵێم ڕەنگە مەبەستی پێی بەرژەوەندیی میللەتەكەی بووبێ، دیارە ئەو كابرایەش ڕەنگە ئیجتیهادێكی هەڵەی كردبێ.

**+ تا ئێستا بەرپرسیارێتیو مەكانەتی هەیە لەناو حزبە ئیسلامییەكاندا؟**

- بەخوا زۆری ورد نەكەینەوە باشە، هەر لەوەدا بووەستین.

**+ بەڵێ مامۆستا، هەرچەندە لە میانەی قسەكانتدا باست لەوەكرد كە ئەوان زۆر جار تاوڵەو دۆمینەیان دەكرد، بەشێوەیەكی گشتی سەركردە بەعسییەكان كاتەكانی خۆیان بەچییەوە بەسەر دەبرد؟**

- ئەوانەی لە منەوە نزیكبوونو كەوتبوونە ژێر كاریگەریم، بەزۆری بە قورئان خوێندنو قورئان لەبەركردن، هەندێكیان من نیوەی قورئانم پێ لەبەر كردن، ئەو قورئانەی كە لە بەریشیان دەكرد، ڕۆژانە ئەگەر ئایەتێكیان نەزانیبا، یان چەند ئایەتێك، بۆم مەعنا دەكردن، ئەو كاتانەی وەرزش دەبوو، من دەرسم پێدەگوتن، ئەوانەی لێمەوە نزیكبوون، ئەوانەی دیكەش دەمبیست یان جاری وا هەبوو دەنگیان بەرزدەكردەوە، یان دەمبیست كە زۆریان قورئانیان دەخوێند، كاتێ كە لەژوورەكانیاندان، دیارە كە نوێژ دەكات، كابرا قورئان دەخوێنێ، بەڵام لەدەرێ، كە دەهاتنە دەر، بەزۆری خەریكی شەترەنجو دامەو دۆمینەو یاری وەرەق بوون، بەڵام لەسەر شت نا، دەیانگوت: "شێخ، ئەگەر شەترەنج لەسەر شت بێت، ئایا حەرامە یان نا؟"، منیش دەمگوت: وەڵڵاهی ئەوە لە ئەصڵدا لەغویە، ئینجا خیلافی تێدایە لە نێو زانایاندا، ئەگەر لەسەر شت بێت ئەوە هیچ حەرامە، قەدەغەیە، بگرە هەندێكیان دەڵێن

لەسەر پارە و شتیش نەبێ هەر حەرامە، بەڵام هێندێ لە زانایان لەبەر ئەوەی وەرزشێکی فیکرییە، بە موباحیان داناوە، ئەوەی دیکە -وەك دامە و دۆمینە- کە لەسەر هیچ نەبێ، هەندێ وردە بەردە دەیهێنیو دەیبەی لەهێندێ خانەو شتدا، بۆ ئێوەش کە بەتایبەتی لە زینداندان (دەیانگوت نازانین چی بکەین)، قسەی خۆمان بێ، من تۆزێ بۆم ئاسان کردبوون، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: گا ڕانیان بە خڕی دەبردو لە گۆلکە سووریان دەپرسییەوە ! !

جارێك یەکێکیان پرسیاری لێکردم، باسی هێندێ گوناهباریو شتی خۆی کرد کە ئەو گوناهەی کردووەو ئاوای کردووەو ئەوانە، دوایی گوتی: "من کاتی خۆی لە زانکۆ کەخوێندوومە، تەماشای کچانم دەکرد، شێخ: ئەوە حوکمەکەی چۆنە؟" منیش پێکەنیم، ئەویش گوتی: "ئەوە بەچی پێدەکەنی؟" وتم: وەڵڵاهی بەوە پێدەکەنم کە ئەو پرسیارەی تۆ بەسەرهاتێکی هێنایەوە یادم، کابرایەك لە کوفەوە چوو بوو بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت)، لێی پرسیبوو ئەرێ خوێنی کێچێ نوێژی پێوەیە یان نا؟ ئەویش وتی خەڵکی کوێی؟ وتی: خەڵکی کوفەم، خەڵکی عیراقم. فەرمووی "ویحکم یاأهل العراق، تسفکون دم الحسین وتسألون عن دم البراغیث" خوێنی حوسەینی دەڕێژن، بەس لەخوێنی کێچێ دەپرسن! !

جا گوتم ئەتۆش دەڵێی ئەو گوناهانەت کردووە، کەچی لە نەزەرەکە دەپرسی، وتی: "ئاخر من بەحیسابی خۆم لە گوناهە گەورەکان تەوبەم کردووە، بەس لەبیرم نەبووە تەوبە لەوە بکەم، ئەویش پێویست دەکات؟" وتم: بەڵێ، لە وردو درشتی تەوبە بکە، بەشکم خوا لێت ببوورێت.

مەبەستم ئەوەیە کە کاتەکانیان ئاوا بەسەر دەبرد، قورئانیان دەخوێند، بەس کە دەهاتنە دەر، بەزۆری وەرزشیان دەکرد، دەهاتنو دەچوون، یا دادەنیشتن بەیەکەوەو قسەیان دەکرد، مشتومڕیان دەکرد، یان ئەوەتا یاری، بەڵام بەزۆری یارییان دەکرد، یاری شەترەنجو دۆمینەو دامەو ئەوانە.

**+ کەسیان هەبوو باسی ئەوە بکات کە دەستی لە کوشتنی کەسێکدا هەبێت؟**

- نەخێر، نەخێر، باسیان نەدەکرد.

**+ کەسیان لەسەر دەستی تۆ تەوبەی نەصوحی کرد؟**

ـ وەللاهی جا تەوبەی نەصوحەکە هەر خوا دەزانێ، بەڵام وام دەبینین، وام بەهێندێکیانەوە دەبینی، بۆنموونە" یەکێکیان وتی: "شێخ، من بۆ ئەوەی خوا لێم خۆش بێت چی بکەم؟" وتم: وەرە، تۆ دەبێ جارێ ئیمانو عەقیدەت ئاوا بێ، غەیری ئیسلام بە باتڵ بزانی، واتە غەیری خوای پەروەردگار نەپەرستیت، پێغەمبەر ﷺ ڕابەرو پێشەوات بێت، میشیل عەفلەقو مەفلەقو ئەوانە هەمووی لەمێشکی خۆت بشۆوە، دەبێ قورئانو سوننەت بەرنامەت بێت. وتی: "باشە، ئەوە هەمووی ئامەننا و قەناعەتم وایە، چی دیکە؟" وتم: نوێژ. وتی: "نوێژ باشە، ئەوە ئێستا دەیکەم"، وتم: قەینا لە کاتی خۆی نوێژت کردووە؟ وتی: "کردوومەو نەمکردووە". وتم خۆت بە مسوڵمان زانیوە یان نا؟ وتی: "بۆ؟" وتم: ئەوەی خۆی بە کافر زانیبێو بڕوای بە ئەصڵی دینو فەرعی دین نەبێ، ڕووی تێناکات، بەڵام ئەگەر خۆی بە موسڵمان زانیبێ، لەسەر ڕەئی زۆربەی زانایان دەبێ ئەو نوێژانە بگێڕێتەوەو ڕۆژووەکان بگێڕێتەوە. هەیانبوو تامن لەوێ بووم، چوو بووە ساڵی هەشتەمینەوە بۆ نوێژ گێڕانەوەی، ئینجا دەیگوت: "زۆرجار کە قورئان دەخوێنم، دەگریمو دەپاڕێمەوە، دەبێ خوا لێم خۆش بێت؟" هەبوو دەیگوت: "ئەوە تۆ شاهیدم بە بۆ قیامەت، کە لەسەر دەستی تۆ تەوبە دەکەم، بڕیارمدا لەمەودوا عەبدی خوا بمو تا ئێستا تێی نەگەیبووم، ئەوە ئێستا خوا هیدایەتی داوم". جا ئیتر خواش بەندەناسە، هەندێکیان ئاوا پێمەوە دەبینین.

**+ کێبوون ئەوانە؟**

ـ وەڵڵا پێم خۆش نییە ناوی کەس بەرم، موریدەکانی خۆم، پێم خۆش نییە ناویان بەرم!!

**+ باست لەوە کرد کە زۆر ئیمامەتیت بۆ دەکردن، یان ئامۆژگاریت دەکردن، ئەمە ئەیسەلمێنێ کە جەنابت مەکانەتێکت هەبووە لە ناویاندا، بەڵکو بۆمان باس بکەیت ئەوان چۆن بۆ کەسایەتیی تۆیان دەڕوانی لە نێو زینداندا؟**

ـ لە سەرەتاوە ئەوان وا حاڵی بوو بوون کە ئەوە بەس مەسەلەی کوردایەتیو عەرەبایەتییە، هەتا کە دەمگوت صەددام واو میشیل عەفلەق واو فلان وا، ئەوانیش

یەکسەر دەهاتنە سەر باسی مام جەلال و کاک مەسعود، دەهاتنە سەر باسی ڕموزی دیکەی سەرکردایەتیی سیاسیی کورد، وتم ئێوە چۆن حاڵی بوون؟ بابە من وەکو مسوڵمان قسەتان لەگەڵ دەکەم، ئینجا وتم بەڵێ، من وەکو کوردێك میللەتەکەی خۆم بەمەزڵوم دەزانم، لەگەڵ سەرکردایەتییە سیاسییەکەشی ئێمە پێکەوە هاوکار بووین، لەخەباتی ڕزگاریخوازیمان، چونکە ئەوە کە کورد ستەمی لێنەکریٚ و کوردستان ئازاد بیٚ و میللەتی کورد سەربەست بیٚ و خاوەنی قەوارەی خۆی بێت، ئەوە حاڵی هاوبەشمانە، هەمووومان وەکو میللەتێکی مەزڵوم لەسەر ئەوە یەکدەنگین، بەڵام لەسەر بەرنامەی سیاسیی و فیکریی، ئێمە جیاین، ئەوانە عەلمانین و من ئیسلامیم، جا دوای ئەوەی بۆیان ڕوون بوویەوە کە من لە مەنتیقێکی ئیسلامییەوە قسەیان لەگەڵدا دەکەم، نەك لە مەنتیقی کوردیی دژی عەرەب، ئەوا گۆڕان، پێشیٚ زۆر تێکدەچوون و کێچیان دەکەوتە کەوڵ و قەڵس دەبوون، دوایی گوتم من لەسەر بناغەیەك قسەتان لەگەڵ دەکەم، کە هەموومان تێیدا بەشدارین، ئەگەر ئێوە ڕاست بکەن، ئێوە ناڵێن ئێمە مسوڵمانین؟ دەی وەرن با بزانین چۆن مسوڵمان بین، ئەوە قورئان وا دەفەرموێت، پێغەمبەر ﷺ وا دەفەرمویٚ، ئیسلام ئا بەو شێوەیە، وەرن زەمینەیەك هەیە هەموومان لەسەری کۆبینەوە، خۆ من دەزانم نەتۆی عەرەب دەبی بەکورد، نە منی کورد دەبم بە عەرەب، ئەگەر کوردایەتی و عەرەبایەتی بێت، ئەوا هیچ پردێك نییە بمانگەیەنێتە یەك، بەڵام من باسی مسوڵمانەتیتان بۆ دەکەم، ئیدی کە دوایی بۆیان ڕوون بوویەوە، بەتایبەتی من ڕەفتارو مامەڵەشم لەگەڵیاندا، ڕەفتارو مامەڵەیەکی چاکەکارانە بوو، لە خوا بەزیاد بێت، من زۆر چاکەم بۆیان لەدەست دەهات، پێنج فەرزە بانگم بۆ دەدان، ئەو کاتانەی کە بواریان دەدا بچینە دەر بۆ نوێژەکان، نوێژی بەکۆمەڵم بۆ دەکردن، دوای عەسران ئامۆژگارییم دەکردن، لەو دوادواییە سیٚ چوار نوێژی هەینیم بۆ کردن، نوێژی جەژنەکانم بۆ دەکردن، یەکێکیان مردبا، نوێژمان لەسەر دەکرد، پاشان پرسیاری شەرعییان لەمن دەکرد، جا غەیری ئەوانەش، من ئەگەر خواردنێکی زیادەم بۆ هاتبایە، جار جار لەماڵەوە هەندیٚ شیرینیی و شتم بۆ دەهات، یان بەرگ و پۆشاکێکی زیادەم هەبوایە، دەمدانیٚ، ئەوانەیان کە نەخۆشبوونایە، دوعایەکم بۆ دەخوێندن، سەلامێکم لێدەکردن، یان هاوکارییم دەکردن

لـه ئیشـێکدا، ئـەوان گوتـیان: "وامـان زانـی هـەر سـەلاممان لێ ناکـەی، یـان بـۆمان دەرکەوتـووە تـۆ خۆبەکەمزانـی، ئینجا دڵسـۆزمانیو پەرۆشـی قیامەتی ئێمەتەو ئینجا ئـەو شـتە کۆنانەی کەپێشـتر ئێمە هەمانبووە، لەگەڵمان لێك نادەیتەوە". وتم وەڵڵاهی ئێسـتا لێتان قەوماوە، من بەبێ شەهامەتی دەزانم ئەتۆ کەوتوویت پێ لەقەت پێدادەم، وتم بەنـی ئادەمیشـی، جـا کـە تۆ دونیاکەشت چووە، بۆ قیامەتەکەشت بچێ، بەڵام من بەزەییم پێتاندا دێت، بەتایبەتـیش کـە بـۆ خۆتان ئامادەیی دەردەبڕنو دەڵێن پێمان خۆشـە لـە ئیسـلام تـێ بگـەینو بگەڕێینـەوە لای خـواو چاك بین، ئێ خۆ دەڵێ عومری درێـژ شەرمی لەکەس نەکردووە، دەبینی تۆ بەردەبیت، کاکە تۆ بە عەقڵییەتێکی نوێو بـە مسوڵمانەتیو بەڕەوشتێکی دیو بە ڕێبازێکی دیکەوە بچیەوە ناو کۆمەڵگە باشترە، بـۆ منـیش باشـترەو بۆ خۆشتانو بۆ خەڵکەکەش باشترە بە گشتی، دوای ئەوە، ئەگەر بڵێم لەنێو ئـەو سـەربازگەیەدا هەیانبوو بۆ خۆی دەیگوت: "شێخ، تۆ بڵێی مان بگرن، کـەس لـە قسـەی تـۆ دەرناچێ، تۆ بڵێی کاکە با ئاوا بکەین، پێموانییە کەس لە قسەت دەربچـێ". زۆر مـتمانەیان بـەمن هەبـوو، بەڕاسـتی دەشـیان زانـی لەگـەڵ موحەقـیقە ئەمریکییەکان هـەر مەبدەئیم، بۆ وێنە" ڕۆژێك دانیشتبووین، ئەم هەڵوێستەم زۆر کاری تێکردن: هـەر بەشـەش مـانگ جارێ نامەیەکیان دەنووسـی کـە کاکـە تـۆ لەسـەر ئەو هـۆیانە لێـرە ماویـەوە. ئـەوان نامـەیان بـۆ نووسیبوون، وەڵامیان دابوویەوە، وتیان کە مەشـۆرەتی لـێدەکەین، هــەر کەســەو نامــەی خــۆی دەخوێنێــتەوە، مــن وا وەڵامــم داوەتـەوەو وا وەڵامـم داوەتـەوە، هەمـوویان لـە کۆتایـی نامەکەیاندا ئاوایان نووسیبوو: "بـناء علـيه فألـتمس منكم أو أطلب منكم أن تطلقوا سراحي"، "داواتان لێدەکەم بەرم بدەن".

منـیش نامەیـەکم نووسـیبوو، نامەکـە نوسـخەم هێـناوەتەوە، پشـت بەخوا بڵاویشی دەکەمـەوە[١٤]، گـوتم بـا منـیش نامـەی خۆمـتان بـۆ بخوێـنمەوە، گوتـیان: بەڵێ، هەموو قـوڵاغ بـوونو گوتـیان: "دەبـێ چـی نووسـیبێ شێخ"، ئەو چوار تۆمەتەی کە بۆمنیان دروسـت کـردبوو، کـە "تـۆ لەسـەر ئـەو چـوار شـتانە ماویـەوە". چـوار تـۆمەتەکەو

---

[١٤] بۆ دەقی ئەو نامەیەو وەڵامەکەی، بڕوانە پاشکۆی ئەم کتێبە.

وەڵامەکەم بۆ خوێندنەوە، زۆر سەرسامبوون، کە بە توندی وەڵامی شتەکانم داوەتەوە، وتیان: "شێخ، یەك شتی ماوە"، وتم چی ماوە؟ وتیان: "بنووسە داواتان لێدەکەم بەرمەدەن‌و ڕزگارم کەن"، وتم: بەڕاستانە؟! وتیان: "ئەی چۆن"، تەماشای یەکترییان دەکردو وتیان کە هەروا باوە، چونکە ئێمەش لێرە دەستبەسەرین، وتم بۆ ئەگەر سەریشم لەملم بکەنەوە شتی وا دەنووسم؟! وتیان: چۆن؟ وتم ئێوە ئاگادار نین، هەموو جارێ داواکاری دەنووسن بۆ تەلەفۆن، من تا ئێستا داواکارییەکم نەنووسیوە، وتیان: "بۆ نانووسی؟"، وتم نابێ من هیچ داواکارییەکم لای ئەوان هەبێت، ئەوان ئەگەر ڕاست دەکەن لەگەڵ مافی مرۆڤ و دیموکراسی، دەبێ بەبێ ئەوەی بپاڕێینەوە، بۆمان دابین بکەن، ئەگەر دابینیان نەکرد، جاڕ بە جەهەننەم، هەر نامەوێ، ئەو تەلەفۆنەشم ناوێ، وتم شتی وا نانووسم، بڕواتان بێ دوایی زۆر شتیان گوت، ئەمن زۆرپێم خۆش نییە بیگێڕمەوە، بەس ئەوەندەیە گوتیان: "بەڕاستی سەرمان زۆر بەتۆ بەرزە، بەڕاستی ئەوە شەهامەتە، ئەوە ئاوایە"، وتم کاکە بۆچی لێیان بپاڕێینەوە، ئەگەر خوای پەروەردگار بڕیاری دابێ کە من بەربم، بەردەبم، بەبێئەوەی بپاڕێمەوە، ئەمجا ئەگەر خوای پەروەردگاریش بڕیاری نەدابێ، بشپاڕێمەوە بێسوودە، جا بۆچی ئینسان خۆی ناشیرین بکا. وتیان: "وەڵڵاهی ڕاستە، ئێمەش پەشیمانین لە قسەی خۆمان، بەڵام ئێمە لاوازین".

بەڕاستی من زۆر بیرم لەو ئایەتە دەکردەوە کە خوای پەروەردگار لەسەر زمانی دوو هاوڕێ زیندانییەکەی یوسف (علیه السلام) دەفەرموێ: (وَدَخَلَ مَعَهُ السِّجْنَ فَتَيَانَ قَالَ أَحَدُهُمَا إِنِّي أَرَانِي أَعْصِرُ خَمْراً وَقَالَ الآخَرُ إِنِّي أَرَانِي أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزاً تَأْكُلُ الطَّيْرُ مِنْهُ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِ إِنَّا نَرَاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ) (یوسف: ٣٦)، واتە: ئێمە تۆ دەبینین لە چاکە کارانی. من زۆرم تێڕامان لەو ئایەتەدا کرد، گوتم کەواتە باشترین شت لە زینداندا مرۆڤ بیکات ئەوەیە چاکەکار بێت، چونکە بەڕاستی کابرای زیندانی، کابرای دیل، کابرای گیراو، بەندکراو، زۆر پێویستی بە چاکە هەیە، هەر لەقسەیەکی خۆشەوە، تا ڕوویەکی خۆش، تا ئامۆژگارییەك، تا هاوکارییەکی ماددی، هەر شتێك، دوعایەکی خێر، زۆر پێویستی پێی هەیە، چونکە دەستی بەهیچ شوێنێ ڕاناگات، بەڕاستی من ئەو ئایەتەم کردبوو بە بنچینەیەك بۆ هەڵسوکەوتم لە گەڵیان.

هـەتا لەگـەڵ پاسـەوانەکانیان، بۆنموونە" پاسـەوانەکان بـەو خەڵکـەیان کـە باشـتر ئینگلیـزییان دەزانـی، دەگوت کـە ئـەوە بۆ سـەلام لـە ئێوە دەکەین مۆن و گرژ دەتان بینین، بـەڵام فـلان کـەس لەگەڵمان گەشە، کە دەیبینین دڵمان خۆش دەبێت، ئەوە بۆ وایـە؟ وتم ئاخر ئـەوە پێغەمبەری ئـێمە ﷺ دەفەرمـوێ: مسوڵمان دەبێ ڕووی گەش بـێ و قسـەی خـۆش بـێ. ئینجا ئێوەش هەموو بەکرێگیراون، بە عەقد هاتوون، لەوانەیە هەندێکتان هـەر بڕواتان بـە سیاسـەتی ئەمریکا نـەبێ، بۆ ڕقـتان لێ دابگرم، وتـیان: "وەڵڵاهـی ڕاسـتە"، هەیانبوو لای من سەد قسەی بە ئەمریکاو بە جۆرج بوش دەگوت، دەیگوت کـە هـەر نـەجاتم بێت و ئـەمجارە نەکوژرێم، دەچمەوە، منیش دەمگوت: من بوغزتان لـێ داناگرم، ئێوە هـەر بەشێکن لـەو میللەتە کـە ئەمریکا وەکو دەوڵەتێك بەسـەرتاندا زاڵـەو تـۆ بـۆ ژیـان و مەعاشـی خۆت هاتووی، لەبەر ئەوە، من بەچاوی ڕق و بوغزەوە تەماشات ناکەم، پاشان تۆ کارێکی خۆت ئەنجام دەدەیت، ئەگەر من لەگەڵت مۆن و گرژ بم و تـۆ مـۆن و گـرژ بیت، خۆشـم ئەزیەت دەدەم و تۆش ئەزیەت دەخۆیت، بـەڵام بـا دوو قسـەی خـۆش پـێکەوە بکـەین، هـەروا ئەوانـەی خاچـی سوور دەهاتن بە هـەمان شێوە، جـا مەبەسـتم لەوەیـە، بەڕاسـتی ئـاوا بـڕیارم دابوو لەگەڵ خەڵکەکە بە ڕەوشـتی مسـوڵمانانە مامەڵـە بکـەم، مرۆڤ ئیجابی بێت لەگەڵ خەڵك و گەش بێ، لە خوا بـەزیاد بـێ، بەڕاستی ئەوە فەزڵێکی خوایە هەموویان ڕێزیان لێ دەگرتم، بڕوات بێ وای لێهاتـبوو بەتایبەتـی لـەم دواداوییەدا، ئەگـەر بمگوتـبا ماسـت ڕەشە، کەس نەیدەگوت سـپییە، واتـە زۆر مـتمانەیان هەبـوو، کێشـەیەکیان هەبـوایە، دەیانهێـنایە لای مـن، دوونەفـەر پـێکەوە کێشـەیەکیان هەبوایە، یـەکێ دەهات و دەیگوت کە ئەو دوو نەفەرە کێشـەیەکیان هەیـە، ئەگـەر پـێکەوە ئاشتیان بکەیتەوە، ئـاوا بوو لە خوا بەزیاد بێت، ڕێزو حورمەتێکی باشمان هەبوو.

**+ بەڵێ، باسی بەزەییت کرد، ئەوە تا چەندێك ڕاستە کە تۆ لە گفتوگۆیەکدا لەگـەڵ پەیامنێـری ڕۆژنامـەی "گاردیـان" داوای لێـبوردنت بـۆ کـردوون، سەرەڕای تاوانەکانیان؟**

ـ ئەصـڵ و ئەساسـی نییـە، چونکە داوای لێبوردن ناکرێت بۆ کەسـانێك کـە مافی خەڵکیان لەسـەرە، ئـنجا باسـی تەوبـەو گەڕانـەوە لای خواش، من خۆ بەهەریەکێکیانم

دەگوت وەکو مافی خۆتان‌و خوا، مافی خوا لەسەرتە دەکرێ تۆبەی لێ بکەی، بەڵام مافی خەڵك هەر دەبێ بیگەڕێنیتەوە، زانایان باسی تەوبەو پەشیمانبوونەوەو گەڕانەوە لای خواش دەکەن، دەڵێن یەکێك لە مەرجەکانی قەبوڵکردنی تەوبە ئەوەیە، دەبێ مافەکانی خەڵك ڕەت بکەیتەوە، ئەوجا تەوبەکەت قەبووڵە، جا من چۆن داوای لێبوردنیان بۆ دەکەم، ئەوە ئەصل‌و ئەساسی نییە، بەڵام من لەوێ بە ئەمریکییەکانم دەگوت، دەمگوت ئەوان خەڵکێکیان تێدایە بۆ خۆی هاتووەو خۆی تەسلیم کردووە، پاشان یەکێك کە تەنها کارمەندێك بووە و هیچیشی لەسەر ئیسپات نەبووە، هیچ تاوانێك، ئەوانە بەردەن باشە، بەتایبەتی ئەوانە کە نەخۆشن، پیرن، بەڵام داوای لێبوردن بۆ کەسانێك بکەم کە تاوانیان کردووەو حەقی خەڵکیان لەسەرەو مافی میللەتێکیان لەسەرە، ئەمە وانییە، کەسێ حەقی کەسێکی لەسەر بێت، دروست نییە داوای لێبوردنی بۆ بکەی، وەکو پێغەمبەر ﷺ بە ئوسامەی کوڕی زەیدی فەرموو، لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە ئافرەتێك دزی کردبوو، ئافرەتێکی مەخزومی بوو لە عەشیرەتێکی ناودار بوو، ئوسامەی کوڕی زەیدیان نارد، خوا لە خۆی‌و باوکی ڕازی بێت، کە شەفاعەت بکا بۆ ئەوەی دەستی نەبڕن، سزای دەستبڕینی بە سەردا نەچەسپێنن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أتشفع في حدّ من حدود الله؟)، ئایا لە یەکێك لە سزا شەرعییەکاندا شەفاعەت دەکەیت، دەبێ ئەو سزایە بچەسپێ. جا بێگومان ئەوەی بۆ من وتراوە، ئەصڵ‌و ئەساسی نییە، چونکە من ئەوە بە شەرعی نازانم داوای لێبوردن بکەم بۆ کەسانێك کە خەتابارن‌و مافی خەڵکیان لەسەرە.

**+ مامۆستا، ئێوە چۆن پێشبینی چارەنووسیان دەکەن؟ پێتان وایە لە سێدارە دەدرێن، زیندانی هەتا هەتایی دەکرێن؟ یان کەسیان هەیە پێت وابێ ئازاد بێت؟**

- من پێموایەو بە قەناعەتی خۆم، نازانم، دەبینی واش دەرناچێ، بەس قەناعەتم وایە کە هیچیان لە سێدارە نادرێن، ئەوپەڕەکەی دەیانبەن بۆ دەرەوەی عیراق‌و لە وڵاتێکدا دەستبەسەر دەبن، یان ئەوەتا بەردەبن‌و لێرە ڕزگاریان دەبێ‌و بەریان دەدەن، ئەوە قەناعەتمە.

**+ پێت وایە صەددامیش چارەنووسی وابێت؟**

- صەددامیش، پێموانییە لە سێدارەی بدەن.

**+ عەلی حەسەن مەجید؟**

- وەکو گوتم، پێموانییە کەسیان لەسێدارە بدرێن، بەقەناعەتی خۆم، ڕەنگە سبەینێ لەسێدارە بدرێن، بەس من وەکو کە لە دەمی ئەمریکییەکانم تام کردووە، لە موحەقیقەکانو لە بارودۆخەکە تێگەیشتوومو تەماشای کەشە سیاسییەکە دەکەم، تەماشای ئەمریکاش دەکەم کە بەرژەوەندییەکانی تەحەکومی بەسەردا دەکات، نەك مەبادیئەکان، ئەوانە لەسێدارە نادرێن.

سبەینێ بەرژەوەندیی ئەمریکا لەوەدا بێ، ڕەنگە قسە لەگەڵ بەعس بکەن، ڕەنگە قسەیان لەگەڵ بکەن، ئەمریکا تەماشای بەرژەوەندیی خۆی دەکات، چۆن بەرژەوەندی بێت وا دەکات، لەبەر ئەوە، ئەگەر بتەوێ بەپێی مەبادیئو بنەما نەگۆڕەکان مامەڵە بکەی، ئەوە عەلی حەسەن مەجید ئەوەی لەسەرەو صەددام ئەوەی لەسەرەو دەبێ ئەو سزایەی بە سەردا بچەسپێ، ئەوە وەکو حەقی شەرعیو قانوونی وایە، بەڵام لە سیاسەتی ئەمریکادا زیاتر بەرژەوەندی فەرمانڕەوایە، خۆشیان ئەوە دەڵێن، کە لای ئێمە بەرژەوەندیی نەگۆڕ هەیە.

**+ مامۆستا، ئەو دەرسانەی پێت دەوتنەوە، مەنهەجیی بوون؟ ڕۆژانە بوون؟ یا ئەوان خۆیان ئەیانوت ئەوەمان بۆ باس بکە؟**

- من بەزۆری خۆم بۆم دیاری دەکردن، جار جاریش خۆیان دەیانگوت کە فلان بابەتمان بۆ باس بکە، بەڵام بەزۆری خۆم باسەکانم بۆ دیاری دەکردن، وانەکانی منیش زیاتر بریتیبوون لە تەفسیری قورئان، قورئانم بۆ تەفسیر دەکردنو فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ.

**+ کەسیان هەبوو لە سەرەتا، یان لە کۆتایی، یان لە کاتێکدا بە ئیمامەتیی تۆ ڕازی نەبێت؟**

- کەسیان نەبوو، ئەوەی کە لەوێ نزیکبوون، نزیکەی بیستو یەك نەفەرێ لەسێ قاتع، ئەوانی کەش واسیتەیان دەکرد بێنە ئەو قاتعەی ئێمەوە، تەکلیفیان دەکرد،

هەیانبوو دەیگوت: "شێخ، هەر بەئاواتەوە بووم کە چاکو چۆنیەکت لەگەڵ بکەم، لەخزمەتدا بمو نوێژێکت لەگەڵ بکەم". ڕێیان نەدەدا غەیری ئەوانەی کە لە گەڵتان بێنە نزیکت، یەك دوو یەکیشیان هاتن بۆ ئەوێ ژووری چۆڵی لێبوو، خەڵکێکیان گواستەوەو هێنایانن بۆ ئەوێ، بەڵام کەسم پێ شك نەدەهات بڵێ من نوێژ ناکەم، دەیانگوت کە سەربازگەکە هەمووی بکرێتە یەكو هەمووی بەیەکەوە نوێژبکەن، ئەوە دیاربوو کە بەندە دەبوو ئیمامیان بێت.

**+ سەبارەت بە هاوکارییکردن یان بەزەیی پێداهاتنەوە بەواندا، دەتوانی نموونەمان بۆ باس بکەیت؟**

ـ بەڵێ، بەڵێ دەتوانم، یەکێ لەوانە، ئەوان ژمارەیەکیان نەخۆشیی فەقەراتیان هەبوو، پیربوون، دەبوایە ئاو بە جلیکان بۆ خۆت بێنی، بۆ ژوورەکەت، تانکەرێکیان دانابوو، دەبوو بەجلیکان ئاو بێنی، هەیانبوو ئاوەکەی بۆ نەدەهات، یان تۆزێکی تێدەکردو زوو لێی دەبڕا، ئەوە من هاوکاریم دەکردن، دەمگوت جلیکانەکە پڕکەنو من بۆتان دێنمو بۆتان هەڵدەگرم.

ئەمجا کە بەرگو پۆشاکی زیادەم بۆ دەهات، ئەوانیش بەڕاستی کە شتی زیادەیان بۆ دەهات، دەیاندا بە من، منیش بەهەمان شێوە، بەس لەوەدا ڕەنگە من دەستپێشخەربووبم، ئەوان خۆیان دەیانگوت کە تۆ لە هەموومان سەخیتری، دەیانگوت کە تۆ کەریمیت، سەخیت، ئینجا کە یەکێکیان نەخۆش دەبوو، دەچووم دوعایەکم بەسەردا دەخوێند، دەستێکم بەسەردا دەهێنا، زۆر پێی دڵخۆش دەبوون، قسەی خۆش، ئامۆژگارییکردن، یەکێکیان قسەیەکی هەڵەی کردبا، بۆم ڕاست دەکردەوە، پێم دەوت جارێکی کە شتی وا مەڵێ، زەرەرت لێدەدا، ناشەرعییە، شتی لەو بابەتانە دەبوو.

**+ مامۆستا، بەپێچەوانەوە هیچ کاتێ هەبووە تۆ ئاتاجی هاوکارییەکی ئەوان بووبی؟**

ـ نەوەڵڵا، من خوا وایکردبوو هیچ پێویستم بەوان نەبێت، بەڵام هەر پێیان خۆشبوو، بۆنموونە" هەبوو شتێکی لەماڵەوە بۆ دەهات، فستقێك، چەرەساتێك،

شتێك، دەیگوت كە "ئەو دشداشەیەی من بۆ تۆ"، دەمگوت تا كاكە نامەوێ، دەیگوت كە "هەر پێمخۆشە شتێكی من لای تۆ بێت، هەر بۆ یادگاری، هەر پێمخۆشە، دڵم پێی خۆش دەبێت"، یان هەبوو دەیگوت كە "پێمخۆشە فانیلەیەكی تۆم لابێ، هەر بۆ یادگاری". من خوا وایكردبوو پێویستم بەوان نەبوو، ئەوان پێویستیان بە من دەبوو، لەخوا بەزیاد بێت، منیش دیارە وەكو دراوسێ، وەكو هاوماڵێتیو دراوسێیەتی، بەوشێوە كە ئیسلام دەڵێ، مامەڵەم لەگەڵ دەكردن، بەڵام بەڕاستی ئەوانیش لە بەرانبەر مندا خۆیان بە خاوەنی شتی خۆیان نەدەزانی، هەبوو دەیپرسی "چیت پێخۆشە تا جواب بنێرم لە ماڵەوە بۆم بێت، بۆ ئەوەی بەدیاری بیدەم بەتۆ، پێمخۆشە"، ڕەنگە هێندێكیان لەڕووی دڵسۆزیو وەكو برایەتی بووبێت، وەكو ئەوەی كەچاكەیەكی منیان لەبەرچاو بوو، دەیانگوت كە "هەموومان قەرزاری تۆین، ئەوە كە تۆ دینمان فێردەكەیت، ئامۆژگاریت كردووین، ئێمە قەد چاكەی تۆ بە هیچ نادەینەوە".

**+ ئەو خواردنانەی بۆیان دەهێنان، شتی تیایە زیادە كە تۆ نایخۆی، بۆ نموونە وەكو جگەرە، چیت لێ دەكردن؟**

- من جارێ ڕۆژێ دووژەمم دەكرد، بەتایبەتی ئەو دوا دواییە من حەوت مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بووم، تەنیا مانگی ڕۆژێك بەڕۆژوو نەدەبووم، لەبەر ئەوەی كە لە فەرموودەدا هەیە، پێغەمبەر ﷺ جگە لە مانگی ڕەمەزان، هیچ مانگێكی بەڕۆژووی سوونەت تەواو نەكردووە، من ڕۆژانە ژەمێكم زایە دەكرد، دەمدا بەوانەیان كە نەخۆشیی شەكرەیان هەیە، یان نەخۆشیی كۆلیسترۆڵیان هەیە، بڵێین گۆشتی مریشك بوایە، چی بوایە، واتە بەزۆری ژەمێكی من بۆ یەكێكیان بوو، دابەشم دەكرد بەسەریاندا.

سەبارەت بە جگەرە، من لە سەرەتاوە جگەرەكانم وەرنەدەگرت، وتم ئەوە حەرامەو خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: (وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ) (المائدة: ٢ ). هاوكاریی یەكتر مەكەن لەسەر گوناهو دەستدرێژی، ئەوەش (اثم)ەو گوناهەو دەستدرێژیشە بۆ سەر نەفسی خۆتو بۆ سەر خەڵكیش، كە خەڵك بەدووكەڵی جگەرە تووشی نەخۆشی دەبن، دوایی وەزیری ئەوقاف (دكتۆر عەبدولمونعیم) وتی: "شێخ"،

وتم بـەڵێ. وتـی: "ئـۆباڵت بـە ئەسـتۆی مـن، ئـەو جگەرانـەش (ئەوکاتـە ڕۆژی شـەش جگـەرەیان دەدا) وەربگرە، ئەوانـە یەکـی بـۆ جگـەرەیـەك خەریکـە شـێت دەبن، ڕۆژی شـەش جگەرەیان دەدەنێ، تۆ کە جگەرە ناکێشی، بابە ئۆباڵت بە ئەستۆی من، ئێستا حاڵەتـی زیندانەو منـیش تـۆزێ لـە شـەرع شارەزام، بۆ قیامەت ئۆباڵەکەی لە ئەستۆی مـن، ئـەمجا ئەوانـە گلەییت لـێدەکەن". منـیش دوایـی بیرم لێکردەوە، وەك بڵێی خۆم لەنـێوان دوو مەفسـەدەدا دەبینی، مەفسەدەی ئەوەی تووڕەیان کەمو بڵێن هاوکاریمان ناکـاو جگـەرەمان ناداتـێ کە بۆ خۆی پێویستی پێی نییەو ڕەفزی دەکات، مەفسەدەی ئـەوەش کـە جگەرەکەیان بدەمێو جگەرەی زیاتر بکێشن، کە تووشی نەخۆشی دەبن، کـە ئـەو دوو مەفسـەدەیەم بـەراورد کـرد، ئەوەی یەکەمیانم پێ گەورەتر بوو، ئەوە کە تـووڕەیان کـەم، چونکە مـن پێویسـتم بـەوە هەیـە قسـەیان بـۆ بکەمو گوێم بۆ بگرنو خۆشـیان بـوێمو دوو سـوودیان پـێ بگەیـەنم. لەبـەر ئـەوە وام بڕیاردا، وتم باشە، مادام تـۆش ئـۆباڵەکەی دەکێشـی، بەڕاسـتی ئـەو بـڕیارە زیاتـر لەسـەر ئەساسـی بـنەما شـەرعییەکەش بـوو، چونکە قاعیدەی شـەرعی هەیـە دەڵـێ کـە هـەرکاتێ ئینسـان لە بەرانبەر دوو خراپەدا قـەراری گرتبوو (دوو مەفسـەدە)، دەبـێ تەماشـا بکـات کامیان خراپییەکەی زیاتـرە، ئـەوی دیکـەیان تەحەمـول کـاو ئـەوی خـراپەی زیاتـرە لـە خۆی دوورخاتـەوە، من ئەوەم پێ خراپتربوو کە تووڕەیان کەم، یان گلەییم لێ بکەن، یان وام تەماشـا بکـەن کـە هاوکاریـیان ناکـەم، چونکە ئـەو حـوکمە شـەرعییە کەمن دەمزانی، ئـەوان بەو شێوە نەیاندەزانی کە حەرامە، دەیانگوت کە ئێمەش لە زانایانمان پرسیوەو گوتـوویانە مەکروهە، هەیانـە گوتوویەتـی مەکروهیش نییـە، زانایانمـان زۆر بینیوە کە جگـەرەیان کێشـاوە. "شـێخ! خـۆ ئـێمەش شـتێکی لێدەزانینو زانامان هەبووە، تۆ بۆ هـەر بەقسـەی خـۆت دەکـەیت؟". وتم جـا ئـەوە ئێسـتا ئەوانە هەموویان بە من ئیقناع ناکرێن، کـە کاکـە حەرامـەو جۆرێکە لـە خۆکوشـتن، وتم سـوودی نییـە، با لە خۆمیان تـووڕە نەکـەم، جگەرەکانیان بدەمێ، یەکێك لەوانە کە من سێجار جگەرەم دایێ، تاریق عەزیز بوو.

**+ چەند دانەت دەدایێ؟**

- هەر جارەی شەش دانە، وای دەزانی خەنیم کردووە!!

**+ مامۆستا، لەگەڵ تاریق عەزیزو تەها یاسین ڕەمەزان قسەت کردووە، لەسەر هەندێك مەسەلە؟**

- هەروا ئەگەر بە پێوە ڕاوەستابایین لە کاتی وەرزشدا، کەمێك، چونکە ئەوان لە قاتعی ئێمە نەبوون، یان کە دەیانبردین بۆ گەرماو، تۆزێك، چەند قسەیەك، چاكو چۆنییەك، بەڵام بواری قسەی زۆرمان نەبوو لەگەڵ ئەوان، چونکە لە قاتعی ئێمە نەبوون، دواییش ئەوانیان گواستەوە، ئەو یانزە نەفەرە کە دەبێ دادگایی بکرێن، دوور خرانەوە لە ئێمە.

**+ کەس هەبوو بۆ جگەرەکان واسیتە بکاتو بڵێ: "شێخ، ئەمجارە جگەرەکانت بە من بدە"؟**

- بەڵێ، هەبوو گلەیی دەکرد، دەیگوت: "شێخ، لە جگەرەکانی تۆ هیچمان پێناگا". دوایی ئیدارەی زیندان کردیان بە پاکەت، بۆ نموونە: مانگی سێ چوار پاکەتیان دەدا، ئەوجا دەمتوانی زۆریانی پێ بگرمەوە، دراوسێیەکم هەبوو دەیگوت: "جگەرەی شێخ هیچ کەس باسی نەکات، هەمووی بۆ من قۆرخ کراوە". دەمگوت ئاخر کاکە ئەو خەڵکەی دیکەش چاوەڕوانیم لێدەکا، دوایی کە کردیان بە پاکەت باشبوو، پاکەتێکم دەدا بەخۆی، دووی دیکەم بۆ شوێنی دیکە ڕەوانە دەکرد، بۆ قاتعەکانی دیکە.

**+ جگەرەت دەدا بە عەلی کیمیایی؟**

- ئەو نەیدەکێشا، نەخێر، جگەرەی نەدەکێشا.

**+ مامۆستا، هیچ کەسێك لەوانە بەر لە ئازادبوونت ڕاسپاردەی پێ نەسپاردووی، تا کە ئازادبوویت بیگەیەنیتە جێی خۆی؟**

- با، هەندێ شتیان پێدا ڕاسپاردم، بەڵام ئەمانەتن، هەندێ شتیان دەوت، بۆ نموونە: "فلان کەس، لای مام جەلال باسی مەزلومیەتی ئێمە بکە، لای کاك مەسعود باس بکە کە وەزعەکە ئاوایە". لەوانەیە لای هێندێکیان باسیشم کردبێ، هێندێ شتی دیکەش لەو بابەتانە، کە زیاتر پەیوەندییان هەبوو بەوەزعی خۆیانەوە، کە نەجاتیان بێو ڕزگاریان بێو نەمێننەوە.

**+ چەند کەسێك لەوان بەر لە تۆ هاتنە دەرەوە لە زیندان، پێموابێ یەکێك لەوانە کە لێرە هەواڵەکەی دەنگیدایەوە دکتۆر عەبدولمونعیم بوو، وەزیری ئەوقافی پێشووی ڕژێمی بەعس، هیچ ڕاسپاردەیەکت پێیا نەناردبووە دەرەوە؟**

ـ نەخێر، کاك هاوژین قسەی خۆمان بێت، من زۆر خۆم قورس ڕادەگرت، هەوڵم دەدا داوا لەکەس نەکەم، پێویستییەکی خۆم ئاراستەی کەس نەکەم، دکتۆر عەبدولمونعیم—یش کە هات، ئەسڵەن فریای ئەوە نەکەوت کە خوا حافیزیشمان لێ بکات، بەڵام دیاربوو دوایی باسی کردبوو، من بیرم دەکردەوەو دەمگوت ڕەنگە خەڵکی ئێمە سەردانی بکەن‌و هەواڵێکی منی لێ بزانن، چونکە ئەوکاتە من هیچ هەواڵ‌و شتم نەبوو، من تا حەوت مانگ نامەی ماڵەوەیان بۆ نەهێنام، نەمزانی چ باسە.

**+ ئەوکاتانەی تۆ دەرست دەگوتەوە، دەت بینی ئەوە یەکێك ئەندامی قیادەیەو ئەوە یەکێ وەزیرەو هەموو دانیشتوون‌و گوێت لێدەگرن، هەستت بەچی دەکرد؟**

ـ وەڵڵا هەستم بەوە دەکرد کە من مامۆستام‌و ئەوانەش قوتابین، من شتێکم پێیە ئەوان پێیان نییە، واتە هەستم بەوە دەکرد کە ئەوانە کاتی خۆی ئەگەر لە ئیسلامدا شارەزابان‌و لە ئیسلامدا پەروەردە بووان، ئێستا پێویستیان بەوە نەدەبوو من لە دەستنوێژەوە، بگرە هەتا ئەحکامی نوێژو هەتا شێوەی نان خواردن‌و هەتا شێوەی قسەکردن‌و هەڵسوکەوتکردن‌و هەموو شتێکم فێرکردبان. ناڵێم هیچیان پێ نەبوو، بەڵام بەزۆری نەشارەزا بوون، دانیشیان پێدا دەهێنا، باسی مێژووی ئیسلامم بۆ دەکردن، باسی عەقیدەم بۆ دەکردن، باسی ئەخلاقیاتم بۆ دەکردن، باسی تەقوا، باسی بەرزەخ‌و قیامەت‌و بەهەشت‌و دۆزەخ‌و حوکم‌و سیاسەت، کە دەهاتنە سەرباسی دەوڵەتی ئیسلامیی، قەوارەی ئیسلامیی، زۆریان پێ سەیر بوو، دەیانگوت: "مامۆستا، کوا دەوڵەتی ئیسلامیی؟ لەکام ئایەت؟ کوا لە کوێدایە؟". دیارە من لەوێ کتێبێکم نووسی، زۆر بە درێژی باسی قەوارە و دەوڵەتی ئیسلامیم تێدا کردووە، وتم بیخوێننەوە، ئەوە سیاسەتی ناوخۆیی ئیسلامیی، ئەوە بنەماکانیتی، سیاسەتی دەرەوە ئاوایە، سیاسەتی جەنگی بەو شێوەیە، لایەنی قەزایی بەو شێوەیە، لایەنی خێزانی بەو شێوەیە، پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان بەو شێوەیە، کاتی جەنگ ئاوا، کاتی

ئاشتی بەو شێوەیە، لایەنی ئابووری بەو شێوەیە. ئەنجا گوتیان: "وەڵڵا ئێستا دەزانین کە قورئان هەموو شتێکی تێدایە".

جا هەستم دەکرد کە بەڕاستی ئەوان نامۆبوون بە ئیسلام، ئەوەش حاڵەتێکی گشتییە بۆ هەموو عەلمانییەکان، لە ئیسلام بێخەبەرن، ئەو پەڕی وادەزانن ئیسلام شتێکی نێوان عەبدو خوایەو هێندێ دروشمو عیبادەتی شەخسییە، نەیاندەزانی ئەو شەش هەزارو ئەوەندە ئایەتە هەموو ئەو شتانەی تێدان کە بۆ دونیاو قیامەتی مرۆڤ پێویستن.

**+ ئەوکاتەی تۆ لە زیندان بوویت، ژمارەیەك لە سەرانی بەعسیان دادگایی کرد، وەك ئاماژەت پێدا چەند کەسێکیان جیاکردەوە، دوای هاتنەوەیان، باسیان لە دادگاییەکە نەکرد؟ لێرە دیمەنەکان دوای سانسۆر کردنیان بڵاو دەبوونەوە؟**

- ئەوانەی کە داداگایی کران ئەو یانزە کەسە بوون جیاکرانەوە، لە شوێنێکی جیابوون، ئێمە نەمان دەبینینەوە دوایی، ڕەنگە هێندێ شتی پچڕ پچڕ بووبێ، فڵان کەس وای لێپرسراو وایگوت، بۆ نموونە" صەددام کە دادگایی کرابوو باسی تاریق عەزیزی دەکرد، باسی کێی تریان دەکرد، هیچی وا زۆر جێی دڵنیایی نەبوو کە بڵێین ئاوای لێپرسراوەو ئەوە تۆمەتەکانێتیو ئەوەش وەڵامەکانێتی، چونکە شوێنەکانیان جیاکردنەوە، ئەوانی تریش کە لەگەڵ ئێمە مابوونەوە بەکراوەیی، ئەوانە دادگایی نەدەکران، تا ئەو کاتە دادگایی نەکرابوون.

**+ لە کاتی دادگاییەکەدا، یان دەرکەوتنی هەریەکێکیان لەو سەرکردانەی بەعس، یا بڵاوبوونەوەی وێنەیان، دەردەکەوێت کە زۆربەیان ڕیشیان هێشتووەتەوە، لە هەمووشی دیارتر عەبد حەممود سکرتێری تایبەتیی صەددام حسێن ڕیشێکی زۆر درێژی هەیە، هێندەی ئێوە ئاگادارین، ئەوە بۆ چی دەگەڕێتەوە؟**

- لەوێ ماوەیەك ڕیشتاشین زەحمەت بوو، یان سمێڵ چاککردن، چونکە نەدەبوو هیچ کەس هیچ ئاسنەواڵەیەکی پێبێ، نە مووس، نە مقەست، هەتا شووشەواتو

ئاوێنەش، هەموو شتێك دەبوو پاسەوانەكە بۆت بێنێ، جا جاری وا هەبوو كابرا دوا دەخرا، یان جاری وا هەبوو دەیانگوت مووس نییە، بەڵكو سەرتاشینیش هێندێ جار قەدەغەبوو، من دووجار بە مقەستی سمێڵ سەریان تاشیم، جا من هەر سەریشم چڕوپڕە، كابرا هەر بە هیلاك چوو، دوایی مقەستەكەشی هەر بە كەڵك نەما.

+ ئەكرێ ناوەكەیمان پێ بڵێی؟

ـ كوڕێك بوو بەناوی خالید، ئەو زوو بەربوو، دەبوو هەر زیندانییەكان سەری یەكتریان چاككردبا، جا ئەوە زەحمەت بوو، ڕەنگە هەندێكیان بۆیە ڕیشیان هێشتبێتەوە كە مووسیان دەست نەدەكەوت، یان بەزەحمەت دەیانتوانی بەدەستی بخەن، هێندێكیشیان وەكو نیشانەی خەمباری، ڕەنگە یەك دوویەكیشیان وەكو سوونەتی هێشتبێتیانەوە.

**+ ئایا ئەمە ئیشكالێك دەرناخات سەبارەت بە نەتەوەپەرستو ڕەگەزپەرستە عەرەبەكان، دیاردەیەك هەیە لە جیهانی عەرەبیدا كە ئەوان دوای شكستیان، خۆیان هەڵداوەتە باوەشی ئیسلامییەكانەوە، خۆپیشاندان بە سیمای ئیسلامییەوە، بۆ ئەوەی ئێستا كە ڕەوتی ئیسلامیی لە نەشونمادایە، ئەوان خۆیان ون كەن تیایاندا، یا عاتیفەی ئەو خەڵكانە بورووژێنن؟ ئەو ڕیشەش ئاماژەیەكی نهێنی بێت بۆ ئەوە؟**

ـ ڕەنگە وا هەبێت، بەس كاك هاوژین لەوێ ئیسلامیبوون لە هەموو شتێ مەترسیدارتر بوو، لەوێ ئەگەر كەسێك سیمای ئیسلامیی پێوەبا، یان بۆنی ئیسلامیبوونی لێهاتبا، ئەمریكییەكان لە هەموو كەس بە خەتەرتریان دەزانی، لەبەر ئەوە، باوەڕناكەم كابرا لەوێ شتێكی وا بكات، بە مەترسیدار بێتە بەرچاو، لەوێ بەعسیبوون ئاسانتربوو لە ئیسلامیبوون، لەلای ئەمریكییەكان، بەعسییەكان مامەڵەیان ئاسانتر بوو، لەگەڵ ئیسلامییەكان زۆر سەختتر بوون، دوایی، بەتایبەتی پێش ئەوەی من بێمەوە، هەندێ خەڵكی ئیسلامییان هێنا، كەلەپچەیان دەكردن، دەستیان، پێیان، لەسەر عەرەبانەیەكیان دادەنان وەك جەنازە، ئەوجا دەیانبردن بۆ تەحقیق، نەدەبوو بەپێیان بڕۆن، سەریشیان پێچرابوو، ئەو مامەڵەیەی لەگەڵ ئیسلامییەكاندا دەكرا،

لەگەڵ کەسی تر وانەدەکرا، یا بۆنموونە: سەرانی ڕژێم بواری تەلەفۆنو شتیان هەبوو، نامەو شتیان بۆ دەهات، من تا حەوت مانگ نەیانهێشت یەك نامەم بۆ بێ، دوای حەوت مانگ ئەوجار دە نامەیان لەسەر یەك بۆ هێنام، هەمووی حیجزکراو بوو، هەمووی ئێکسپایەر بوو بوو، هەواڵی ماڵەوەی تێدابوو، هەر نەمزانی کە ماڵمان لە سلێمانییەوە گوازراوەتەوە بۆ هەولێر. دوای ساڵێك ئەوجار بواری تەلەفۆنیان دا، دەمگوت باشە بۆ بواری من نادەن، ئەوان هەموویان سەرانی ڕژێمنو من دژی ئەوان بووم، ئێوە بۆ خۆشتان دەڵێن کە هیچت لەسەر نییە. لەبەر ئەوە، پێموانییە لەوێ کەسێك خۆی وا لێکردبێ کە وەکو ئیسلامیی بێتە بەرچاو، چونکە مەترسی بوو بۆی، نازانم ئیدی، بەڵام بیستم صەددام کە هێنایانە سەر تەلەفزیۆن، ڕیشێکی درێژی هەبووە، ئایا بۆ شوێنەونی بوو ئەوە، ئایا ئەوە بوو وەکو ئیسلامیی بێتە بەرچاو، لەبەر ئەوەبووبێ ئیمکانیەتی نەبووبێ ڕیشی بتاشێ، نازانم.

**+ ئێوە کە زۆرینەی تەمەنتان لە دژایەتیی بەعسدا بەسەر بردووە، هەستتان چۆن بوو، کاتێ لەیەك شوێنی بەرتەسکدا، لە زیندانێکدا، لەگەڵ سەرکردەکانی ئەو ڕژێمەدا کۆیان کردنەوە؟**

ـ وەڵڵا زۆر ناخۆش بوو، بۆ من سەدمەیەکی نەفسی بوو، یەکەم شەو کە بردیانم بۆ قاعەکە، ڕۆژ بووەوەو ئەوانەم بینی، ئۆتۆماتیکی لەگەڵیان تێك گیرام، من ئازارو شتیشم هەبوو، بۆ من شتێکی سەیر بوو، جار جار کە لەگەڵ سەرانی ڕژێم مشتومڕمان دەبوو، دەمگوت ڕژێمی بەعس ئاواو عەلمانی ئاوا. دەیانگوت: "شێخ، باشە وا ئێمە دیکتاتۆربووینو خراپبووین، ئەوە نییە تۆشیان هێناوە بۆ لای ئێمە، خۆ تۆ هیچیت نەکردووە، خۆ ئێوە مەزڵومبوونو ئەی تۆ بۆ وا؟ کاکە ئەمریکا دژی هەموو کەسێکە"، ئاوایان دەگوت، بەڵێ هەر بە خۆشیانم دەگوت ئەگەر لەبەر بەزەیی ئیسلامەتی نەبوایەو بەزەییم پێتاندا دێتەوەو بەلێقەوماتان دەبینم، نەدەبوو سەلامتان لێ بکەم، بەڵام من پێموایە لانی کەم مامەڵەیەکی ئینسانییانە هەیە کە دەبێ ئینسان هەر پارێزگاری پێوە بکات، چونکە هەر چۆن بێت ئینسان ئینسانەو بەشەرە، لەبەر ئەوە، بەڕاستی من ئەو لانی کەمەم پارێزگاری لێدەکرد، کابرا تا ئێستا هەڵەی بووە، دەبینی

سبەینێ ڕزگاری دەبێت، ئەگەر دوو قسەی باشی بۆ بکەم سوودێکی لێ ببینێو خۆی بگۆڕێ، باشترە وەك لەوەی بە بۆچوونی هەڵەی پێشووتریەوە بێت.

**+ مامۆستا، ئایا باسی ئەو هەڵوێستەی خۆتت بۆ نەکردن، کە کاتی خۆی لەسەر بەعسییوون فەرمانی کوشتنی براکەی خۆتت دەرکردووە؟**

- با، بۆم باسکردن، دوو سێیەکیان گریان.

**+ کێبوون ئەوانەی گریان؟**

- وەڵڵا یەك دوویەکیان وەزیر بوونو لە ئاستی وەزیرو ئاستی ئەندامانی ئەنجومەنی قیادەی قوتریو شۆڕش بوون. وتیان کە بەڕاستی تۆ مسوڵمانیت، دوای هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هیچ کەسی تر شتی وای نەکردووە. وتم نا، مەدحم مەکەن. "لەسەر ئەوەت کوشتووە کە لەگەڵ ئێمە بوو، بەڕاستیی ئەوە زۆر زۆر شتێکی مەبدەئییە". پێیان سەیر بوو، وتیان: "بەس لەسەر ئەوە بوو؟". وتم: وەڵڵا بەس لەسەر ئەوە بوو.

**+ ئەو هەڵوێستانە چین کە لەگەڵ ئەو سەرکردانەی بەعسدا لەزینداندا هەتانەو هەرگیز لەیادتان ناچنەوە؟**

- وەڵڵا زۆر شتی وا هەیە، بەڵام بۆ نموونە" ڕۆژێکیان پاسەوانێکی ئەمریکی هات، ناوی مایکڵ بوو، ئەوانیش لەزمانی دراوسێ سجنەکانمەوە پێیان دەوتم (شێخ)، یان دەیانگوت ئیمام. وتی: "شێخ؟"، وتم بەڵێ، وتی: "کە تۆ بانگتدا یان کە بانگ دەڵێی، تێبینم کردووەو سەرنجم داوە هەندێك لەوانە (بەعسییەکان) سەر لە پەنجەرەکە دێننە دەرەوەو دەگرین، ئەوە بۆچی؟"، وتم باسی خواو گەورەیی خوا دەکەم، ئەوانەش دیارە غوربەتیان هەڵدەستێ، یان خۆیان بە گوناهبار دەزانن، یان سۆزیان دەجووڵێ. وتی: "من چەندجار تێبینیم کردووە کە تۆ بانگ دەڵێی، هەیان بووە گریاوە"، منیش وتم سوپاس بۆ خوا کە دڵیان نەرم بووبێ، پشت بەخوا بڕیاریان داوە دینداری بکەنو پیاوی باش بن.

یەکی دیکە کە لە مێشکمدا تۆمارە ئەوەیە، نەفەرێکی فەلەستینیو یەکێکی میسری لەوێ بوونو مردن، دوایی نوێژی غیابیمان لەسەر کردن، نوێژی جەنازە،

ئەوەش زۆر ڕایتەکاندم، چونکە هەردووکیم بەغەریب دەزانین، جا هەر بۆ سووعبەت پێم دەگوتن سێ غەریبتان لە نێواندا بوون، دوانیان مردن، یەکێکیان ماوە، فەلەستینییەك و میسرییەك و کوردستانییەك.

دەیانگوت: "نا شێخ، (ان شاء الله) جەنابت هەر دەمێنی"، یانی پێم غەریب بوون، ناشزانم چییان لەسەر بوو، فەلەستینییەکە لەوانەیە هەر ئەوەبێ کە دژی جولەکە بوو، ئەندامێکی بەرزی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی بوو، میسرییەکەش دکتۆرێك بوو، لام وایە هەر گرفتەکەی ئەوەبوو کە لە مەسەلەی تەقەمەنی و ئەوانەدا شارەزایی هەبوو، نازانم، ڕەنگە پەیوەندییەکی بەڕژێمەوە بووبێ.

بەس گرنگ ئەوەیە میسری بوو، نەمزانی دوایی ئایا لە میسر ڕۆژنامەی میسری و ڕاگەیاندنی میسری لە سەریان هەڵدابویێ یان نا، ئەوەش یەکێکە لەو حاڵەت و دیمەنانەی کاریگەرییان هەبوو.

**+ ئەو دوانە بە چی مردن؟**

- بەنەخۆشی مردن، بەعسییەکان گومانیشیان هەبوو وتیان کە لەوانەیە دەرزییان لێدابن، چونکە وتیان ساغ و سەلیم بوون، ئاوا دانیشتوون و لە ناکاو مردوون.

**+ لەو بیست و دوو مانگەی تەمەنی زیندانت کە لەگەڵ ئەواندا بەسەرت برد، هیچ شتێکی وا هەبووە لە نێوانتاندا کە دوای ئازادبوونی ئەوانیش و هاتنەدەرەوەیان لە زیندان، بە یەکەوە کۆتان بکاتەوە؟ ئیتر بە باش یان بە خراپ یەکتری ببیننەوە، هیچ باستان لەو مەسەلانە کردووە؟**

- ئەوان زۆریان باسیان دەکرد.

**+ تیایاندا هەیە حەز بکەیت کە جارێکی دیکە بیبینیتەوە؟**

- بەڵێ، تیایاندا هەیە حەز دەکەم بیبینمەوە، کە بەپێویستیان نازانم ناوەکانیان بڵێم، لەوانەی کەپێم وابوو زۆر کەوتوونەتە ژێر کاریگەرییم، پێموایە کە دەتوانن سوود بگەیەنن، ئەگەر بەوشێوە مابن کە بەجێم هێشتن، ئەگەر بەو شێوە بمێننەوە، دەتوانن سوود بگەیەنن، چونکە عەشایەرو خەڵکیان هەبووە، خزم و خەڵکیان هەبووە، وەکو بۆیان باس دەکردم، توانایان پێوە دەبینم، پێمخۆشە ئەوانە ببینمەوە، بەڵام ئەوان

زۆر داکۆکیـیان دەکـرد، دیـارە منـیش دەمگـوت پشـت بەخـوا کـە ڕزگـار بـوون، لـە پەیوەندیدا دەبین، نازانم کێش پێشتر ڕزگار دەبێ، بەڵام ئەوان زۆر داکۆکییان دەکرد، دەیانگوت کە "هەرچۆن بێت، دەبێت لە پەیوەندیدا بین، تۆ سەرمان لێنەبڕیت، ئاگات لێمان بێت، ئێمە کە بێین بۆ خزمەتت، لەوێ چۆن بتبینینەوە؟".

لەڕاستیدا لـەوێ مـن ئـەو بەدلەیەم لەبەر دەکرد، ئەوەی کە لەگوانتانامۆ هەیە، یان دشداشـەم لەبـەر دەکرد، چونکە بەرگە کوردییەکانیان لێ سەندبووم، لە مەخزەن بوو، جـا وتم ئـاوا نامبینـن، دەی وتـیان کە "چۆنت بناسینەوە؟" وتم ڕاوەستن، ڕۆژێ پێش هاتـنەوەم کـە بەرگەکـەیان بۆ هێنامەوە، ئەو ڕۆژە خۆم گۆڕی، ڕۆژی چوارشەممە بوو، کـە مـن پێنجشـەممە هاتمـەوە، وتـیان: "ئـەوە شـێخ ئـەوە چـییە؟"، وتم ئـەوە خـۆم گۆڕیـوە، کـە هاتنە کوردستان، ئاوا دەمناسنەوە، وتم بە دشداشەو ئەوانە نامناسنەوە، ئاوام لەوێ!![١٥]

ئـەوان زۆر مەبەسـتیان بوو، هەندێکیان هەتا هەبوو بانگی دەکرد: "شێخ، من نازانم حزبەکەت نـاوی چییە، بـەڵام کە بەربووم، دێمە ناو حزبەکەی جەنابتەوە"، وتم باشە، بـا بـزانین داخـۆ چـۆن دەبـێت؟ واتـە ئاوا خەڵکیان هەبوو کە زۆر داکۆکی دەکردو پێی خۆشبوو دوایی یەکتر ببینینەوە.

**+ مامۆستا، ئامادەیـیت تیایە بیانبینیت دوای ئازادبوونیان؟ هاوڕێیەتییان لەگەڵ دروست دەکەیت؟ هـەروەها وەکو کە بەڵێنیان داوە، ئەگەر ئامادەیـیان دەربڕی لەناو کۆمەڵی ئیسلامییدا کاربکەن، ئامادەییتان دەبێ وەریان بگرن؟ ئەگەر ئەوە گونجاو شتەکە سەری گرت، پێتان وانییە کاریگەریی بۆ سومعەی جەنابتانو بۆ سومعەی کۆمەڵی ئیسلامیی دەبێت؟**

- وەڵـڵا مـن پـێموایە خـەڵك دەبـێ شـانازیی بـەوەوە بکـات، کە کۆمەڵی ئیسلامیی بـتوانێ خەڵکێکـی حزبـی بەعس مێشك بشواتەوەو لە چڵكو چەپەڵی بەعسیایەتی پاکی بکاتـەوەو بـە ئیسـلام پـڕی کـاو بـیکاتە ئەندامێکـی بەکـەڵك بـۆ کۆمەڵگە، دەبێ خەڵك شـانازیی بـەوەوە بکـات، ئـێمە کاریگەریی وامان بێت، تا ئێستا هەر ئەوان خەڵکیان لە

[15] دیارە ئەم قسەم لەگەڵیان زیاتر لە قالبی قسەی خۆشدا بوو.

ئێمە کوشتووە، یان هەڵخەڵەتاندووە، یان کردوویانن بە سیخوڕ، ئێمە بتوانین ئەوان بە ڕاستە شەقامی ئیسلامدا بێنین‌و وایان لێ بکەین دان بەو مافانەی ئێمەدا بنێن کە شەریعەتی خوای دادگەر پێی داوین، ئەوە بۆ میللەتی کورد دەبێتە خاڵی هێز، بۆ میللەتەکەشمان‌و بۆ کاری ئیسلامیش دەبێتە خاڵی هێز، کابرا تا دوێنێ بەعسی بووەو تا دوێنێ میللەتی کوردی بەوە زانیوە کە هاووڵاتی پلە دوو سێ بووەو ئێستا دان بەوەدا بنێ کە کورد قەوارەی هەبێ‌و بوونی هەبێ، چونکە من لەو بارەوە قسەم لەگەڵدا کردوون، واتە ئەو کەسە کە بە مەنهەجی ئیسلام ڕازی بێ، دەبێ بەهەموو ئەو شتانە ڕازی بێت کە ئیسلام بڕیاری لەسەر دەدات. نا، من گوێ نادەمە ئەوە، چونکە ئەو مرۆڤانەی کە لە سەر زەویدان، خوای پەروەردگار هەموویانی بۆ بەندایەتیی خۆی دروست کردووە، ئێمەش هەتا بتوانین مرۆڤێکی لار ڕاست بکەینەوەو بیکەینە بەندەیەکی باشی خوا، بە کەڵکی خۆشی‌و وڵاتەکەشی بێت، بێگومان ئەوە خاڵی بەهێزە بۆ ئێمە، خاڵی لاوازی نییە تا پێمان شەرم بێت.

**+ ببوورە ماموستا، کەسیان خێزانەکانیان سەردانیان کردوون لەناو زینداندا؟**

- بەڵێ، هەندێکیان هەبوون خێزانیان دەهات، خێزانیان یان خزمیان.

**+ عەلی کیمیایی‌و ئەوان؟**

- ئەوان نا، نەمبیست، هەتا من لەوێ بووم نەمبیست، نازانم بۆ دوایی، جا ڕەنگە بووبێ‌و من نەمزانیبێ، بەس هەیانبوو وەزیر بوو، ئەندامانی ئەنجومەنی قیادەو ئەوانە، دەمبیست کە خێزانیان هاتووە، یان برایان هاتووە، یان کوڕیان هاتووە، یان منداڵەکانیان هێناون بۆ لایان.

**+ ڕۆژانی جەژن سرووتێکی تایبەتن‌و حاڵەتێکی دەروونیی تایبەت بە مرۆڤ دەبەخشن، تۆش چوار جەژنت لەوێ بەسەر برد، ئێوە چۆن جەژنتان بەسەر دەبرد؟**

- وەڵڵا ڕۆژانی جەژن ئەوان زۆریان دەگریان، تێبینیم دەکرد دڵیان پڕدەبوو، چاویان سوور دەبووەوە، زۆریشیان پێ سەیر بوو کە من بەسەرخۆم نەدەهێنا،

لەیادمە وەزیری نەوت (عامر ڕەشید) ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم، دکتۆر عامر ڕەشیدێکی دیکەشی لێبوو، بەس ئەوەی لای من دکتۆر عامر ڕەشیدی وەزیری نەوت بوو، ئەبوفاتن-یان پێدەگوت، بەیانییەکەی ڕۆژی جەژن بانگمدا، دوایی ئەوە کە (الله أکبر) دەکرێ، وتی: شێخ، وتم بەڵێ، وتی: "خۆ بانگەکانت هەمووی هەر خۆشن، بەڵام بانگی ئەمڕۆ نازانم بۆ وا کاریگەر بوو؟" وتم: چۆن؟ وتی: "وەڵڵا جەژنەو ئێمە لە بیری ماڵو منداڵدا بووینو دەنگەکە زۆر خۆشبوو، زۆر کاریگەر بوو".

جا من نوێژم بۆ دەکردن، دوایی وتاری نوێژی جەژنم بۆ دەدان، دڵم خۆشدەکردنو وتم پشتیوانمان خوایەو با بگەڕێینەوە لای خواو بۆ خوا سوڵحاو بین، ئەو بارودۆخانە هەمووی بەدەستی خوای پەروەردگارن، بەڵام هەڵەکانی ڕابردووشمان لەبەر چاو بێت، بەهۆی هەڵەکانمانەوە تووشی ئەو وەزعە هاتووین، ئایەتەکانم بۆ دەخوێندنەوە، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ) (الشورى: ٣٠)، هەیانبوو دەگریا، زۆریان دەگریان، دەیانگوت کە تۆ قسەمان بۆ دەکەیت، وەك بڵێی تەسەللاو تەسکینییەکی زۆرمان بۆ دێ. چونکە کاتی جەژنەکان، مرۆڤ بیردەکاتەوە کە جەژنانەی داوە بە منداڵەکانی، دەرو دراوسێ، بابو دایك، خزمو دۆست، ماڵو خێزان، کۆمەڵێك تەداعیاتو خولیاو ئەوانە لە مێشکیدا دێنو دەچن، بەڵام من (لەخوا بەزیاد بێت) حاڵم باشبوو، باری مەعنەویاتم، ئیتر دیارە مرۆڤ بەزەیی‌و سۆزیشی هەر هەیە، بەڵام ئەوانم دەبینی زۆر کارتێکراو دەبوون، هەیانبوو زۆر خەمگین دەبوو، هەیانبوو ئەو ڕۆژە چەندجارێك کە دەمبینی هەر دەگریا، دەمگوت چییە؟ دەیگوت: "یادی دایکم دەکەم، یادی باوکم دەکەم، خێزانم، کچێکی بچووکم هەیەو یادی دەکەم، یادی ئەوڕۆژانە دەکەم کە کاتی خۆی ئێمە چی بووینو ئێستا لە کوێین".

+ مامۆستا، شیرینی جەژنتان چی بوو؟

- هیچی لێ نەبوو، چییان بۆ دەهێنایین هەر ئەوەمان دەخوارد، جاری وا هەبوو بۆ خۆمان شتێکمان دروست دەکرد، یان من جار جار شتێکم دروست دەکرد، یان یەکێکی کە شتێکی دروست دەکرد، ئەوە نەبوو، ئەمریکییەکان (پاسەوانەکان) جار جار هێندێکیان نەك لە جەژنی ئێمە، لە جەژنی خۆیان "کریسمس" شتی شیرینییان

دەهێنا، یان کە دەیانزانی ئەوە جەژنی ئێمەیە، هەبوو ئەگەر شتێکی هێنابا، دەیگوت کە ئەوە جەژنی ئێوەیە، شیرینییەك، شتێ بخۆن. جەژنی نێو زیندان جەژنێکی دیکەیە، جەژنێکە بێ پلاوو گۆشتو بێ شیرینی، بێ سەردانو هاموشۆ، جاری واش هەبوو نەیاندەهێشت چاکو چۆنییش لەگەڵ یەك بکەین، هەر جەژنە پیرۆزەش! !




# تەوەرەی حەوتەم:
# چۆنێتیی بەسەربردنی کاتەکانی نێو زیندان

**٢٠٠٥/٧/١٠**
**ستۆدیۆی کەناڵی هەولێری تەلەفزیۆنی کۆمەڵ**

**+ پرسیاری ئەم تەوەرەیەمان تایبەتە بە چۆنێتیی بەسەربردنی کاتەکانی ئێوە لە نێو زیندان، کە دیارە عیبادەتی تێدایە، خوێندنەوەو نووسینی تێدایە، وەرزشی تێدایە، خەوتنی تێدایە. مامۆستا عەلی باپیر بەر لەدەستگیرکرانی هەردەم کاتەکانی خۆی بەرنامەڕێژ کردبوو، ئەتوانین بڵێین لە زیندانیشدا، سەرەڕای نەبوونی کتێب، ڕۆژنامە، قەڵەمو کاغەزو لەو جۆرە هاوەڵە خۆشەویستانەی جەنابت، هەر لەسەر ئەو بەرنامەڕێژییە بەردەوام بوون؟ ئەگەر وایە، چۆن بوو؟**

ـ بسم الله الرحمن الرحيم، دیارە شتێکی زەحمەتە مرۆڤ بەوەزعێکەوە ڕا هات، کاتێك دەکەوێتە نێو بارودۆخێکەوە، ئەوەی کە پێیەوە ڕاهاتووە بۆی مەیسەر نابێ، ئەوە لەسەر دڵی مرۆڤ قورسە، ڕاستە من بە زۆری بە خوێندنەوەو بیرکردنەوەو نووسینو قورئان خوێندنەوە کاتەکانم بەسەر بردووە، دیارە لەگەڵ هەڵسان بەئیشوکاری دیکە، بەڵام هەرچۆن بێ، ئەگەر لە شاخ بوومو ئەگەر لە شارو ئەگەر لە ئەشکەوتێکدا بووە، ئەگەر زستان بووە، ئەگەر هاوین بووە، لە هەر فەسڵێکی ساڵدا هەوڵمداوە لە نووسینو بیرکردنەوەو موتالەعەو تەحقیقو ئەوانە دانەبڕێم.

دیارە چەند ڕۆژی سەرەتا، ئەوە مرۆڤ نەیدەپەرژایە سەر ئەوە هەر بیر بکاتەوە لە خوێندنەوەو نووسین، وەکو پێشتر باسمانکرد، بەڵام دوای ئەوەی برامە زیندانی تاکییەوە، دیارە لەو کاتەدا هەستم بە بۆشاییەکی زۆر کرد لە تەمەنمدا، لەکاتەکانمدا، قورئانیشم لانەبوو، لە سەرەتاوە قورئانیان نەدایمێ، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك دراوسێیەکی زیندانیم، دکتۆر سەتتام ئەلگەعود، ئەو قورئانێکی بەتەرجەمەی ئینگلیزی بۆ هێنام، بەڕاستی کەلێنێکی باشی بۆ گرتم، خوا پاداشتی بداتەوە، پاشانیش نزیکەی دوای مانگێك ئەمریکییەکان خۆیان قورئانیان بەسەردا دابەشکردین، تاماوەی شەش تا حەوت مانگێك بواری موتالەعەو نووسینو شتیان نەدەدا، لەبەرئەوە هەر لەگەڵ قورئاندا خەریکبووم، ڕۆژی وا هەبوو نیوەی قورئان، واتە بە دووڕۆژ جارێك، بەڵکو ڕۆژی واهەبوو کە نزیك دەکەوتەوە لەوەی قورئان هەمووی خەتم بکەم.

ئەگەر کەمم خوێندبا، بەسێ ڕۆژ، بەچوار ڕۆژ جارێ قورئانم خەتم دەکرد، ئەوکاتانەی، ئەو مانگانەی سەرەتا بەزۆری خەریکی قورئان خوێندن بووم.

**+ لە ماوەی ئەو بیستو دوو مانگەی زیندانیتان، یان ئەوکاتەی برایتە زیندانی ئینفرادییەوە کە کاتێکی زیاترتان بۆ دروستبوو، ئەتوانین بزانین چەند خەتمتان کردووە؟**

- من سەرجەمی ئەوکاتە بە دوو ڕۆژ جارێك یان سێ ڕۆژ جارێك، یان ئەگەر زۆر بوایە بەچوار ڕۆژ جارێك قورئانم خەتم دەکرد، کە بەزۆریی لەنوێژەکانمدا خوێندوومە، دەتوانم بڵێم ئەو ماوەیەی لەوێ بووم سەدو چل جار خەتمم کردووە، دیارە دوایی کە دەستم کرد بە نووسینو موتالەعەو ئەوانە، ئەندازەی خوێندنی قورئان کەمبووەوە، لەبەرئەوەی پێویستم بە کات بوو بۆ شتی دیکە، بەڵام سەد جاری زیاتر لە نوێژدا، لە نوێژی فەرزو سوننەتدا، لە نوێژی شەوو ڕۆژدا قورئانم دەخوێند، ئەوەی دیکەیشی، چل جارێك یا کەمتر لە چل جار لە موصحەفدا دەمخوێند، ئەوانی دیکەی لەبەر دەمخوێند لە نوێژەکانمدا، کە دیارە قورئان خوێندنی نێو نوێژ، من بۆ خۆم وا لەزەتم زۆر زۆر زیاتر لێدەکرد.

**+ جگە لە قورئان خوێندن، ئەو عیبادەتو پەرستشانەی تر کە ئێوە لە زینداندا ئەنجامتان دەدان، چی بوون؟ بە تایبەت بەڕۆژووبوون، لە میانەی ئەو پرسیارەدا ئەمانەوێت پێشت بڵێین کە چەندێك بەڕۆژوو بوون، ئەگەر ڕۆژووی تێکەوتبێت؟**

- بۆ ئەوەی کە وێنەیەکی ڕۆشنتان لەبەرچاو بێت بۆ چۆنییەتی بەسەربردنی کاتەکانی نێو زیندانم، من دەتوانم ئێستا بەتەرتیب بۆتان باس بکەم، جا دوایی دێمەوە سەر باسی ڕۆژوو ئەوانەش. بەیانیان کە هەڵدەسام وەرزشم دەکرد، دیارە دوای نوێژی بەیانیو قورئان خوێندن، ئەگەر شەو ئەندازەیەك خەوتبام کە توانیبام دوای نوێژی بەیانی بێدار بم، لە دوای نوێژی بەیانی جوزئێك قورئانم دەخوێند، یان دوو جوزء، جاری وا هەبوو شەوان هەڵدەسام، شەو هەبوو سێ جوزء، بەڵکو شەوی واهەبوو تا حەوت جوزئم دەخوێند لە شەونوێژدا، یانی سێ چوار سەعات بێدار دەبووم، دیارە ئەو کاتانە نەم دەتوانی دوای نوێژی بەیانی نەخەومەوە، ئیسراحەتم دەکرد.

دوای قورئان خوێندن وەرزشم دەکرد، بەیانیان، ئینجا ئەگەر بەڕۆژوو نەبوومایە، نانی بەیانیم دەخوارد، شتێکم دەستکەوتبا دەمخوارد، دوای ئەوە دەستم دەکرد

بەقورئان خوێندن، ئەوە بەر لەوەی دەستبکەم بە نووسین، ئەگەرنا، کە دەستمکرد بە نووسینو خوێندنەوە، ئەندازەیەکی باش لە وەختەکەم تەرخان دەکرد بۆ نووسین، بۆ بیرکردنەوە، دیارە نووسین بەبێ بیرکردنەوە نابێ.

بەڵێ، ئەو کاتانە بەرلەوەی دەست بکەم بە نووسین، پاش وەرزشو نانخواردنی بەیانی، دیارە کە وەرزشم لە ژوورەکەی خۆمدا دەکرد، دەستم دەکرد بەقورئان خوێندن یاخود بەزیکر کردن، هەر ڕۆژە، یان هەر حاڵەتە دەروونییە، دیارە زیکرێکی تایبەتی خۆی هەیەو روحی ئینسان داخوازی دەکات، ئەوکاتەی هەست بەگوناهباری خۆت دەکەیت، کە مرۆڤ هەمیشە هەر گوناهبارە، زیکری (أستغفر الله) دەکەیت، داوای لێبوردن لەخوای پەروەردگار دەکەیت، ئەوکاتانەی کە هەست دەکەیت پێویستت بە جەختکردنە لەسەر تەوحید، زیکری (لاالە الا الله) دەکەیت، ئەوکاتانەی هەست بە خەمو پەژارە دەکەیت، زیکری (لاحول ولا قوة الا بالله) یان زیکری (استغفار) دەکەیت، یان سەڵاوات لەسەر پێغەمبەرﷺ دەدەیت، یان ئەو زیکرەی یونس (علیه السلام)" (لَّا إِلَـهَ إِلَّـا أَنـتَ سُبْحَانَكَ إِنِّـي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ)، جاری وا هەبووە هەزار جار ئەو زیکرەم دووبارە کردووەتەوە، هەندێك ئایەت یان هەندێك ڕستەم لە قورئان هەزار جار زیاتر دووبارە کردووەتەوە، جاری وا هەبووە لە ژوورەکەمدا، لە گۆشەیەکەوە بۆ گۆشەیەك هاموشۆم دەکرد، من کەم دادەنیشتم، بە زۆری هاموشۆم دەکرد لە کاتی قورئان خوێندن، لە کاتی زیکردا، لە کاتی موتاڵەعەش بە زۆری لە ژوورەکەمدا هاتوچۆم دەکرد، بۆ ئەوەی دانەنیشم.

دوای ئەوە ئێمە کاتەکانی کە دەریان دەکردین بۆ وەرزش کاتی جیاجیابوون، بە دەست خۆمان نەبوو، جاری وا هەبوو سەعات نۆی پێش نیوەڕۆ دەریان دەکردین، لەگەڵ سەعات حەوتی ئێوارە، دوو نیو سەعاتی، یاخود دوو یەك سەعاتی، جاری وا هەبوو ئەو ڕۆژە دەریان نەدەکردین بۆ وەرزش تا شەو، لەبەرئەوە نەمان دەتوانی هیچ ئیشێك بخەینە کاتی وەرزش، چونکە نەمان دەزانی چ کاتێکە، ڕەنگە ئەوەش بۆ لایەنی ئەمنی خۆیان بگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی هیچ قاتعێك نەزانن کەی دەردەچن، نەوەکو ڕێککەوتنێك لە بەینی خۆیاندا بکەن، چونکە ئەوان حساب بۆ هەمووش تێك دەکەن. دەتوانم بڵێم کاتەکانی ڕۆژم بەو شێوەیە بوون.

کاتەکانی شەویش، دوای نوێژی شێوان، هەندێ جار نوێژی شێوانم درێژ دەکردەوە، یانی سورەتی (الأعراف)م دەخوێند، یان سورەتێکی کورتتر لە ئەعراف، لە صەحیحی بوخاریو موسلیم-دا هاتووە: جارێك پێغەمبەرﷺ سورەتی ئەعرافی لە نوێژی شێواندا خوێند، من تەجروبەم کردو وتم: داخۆ تا کوێ دەچێت، نزیکەی سێ چارەك کاتی ویست، لە عیشا نزیك دەکەوێتەوە، کەواتە ئەوەی کە مەلاکانی پێوە ڕاهاتوون کە دەبێت هەر سورەتی (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَر)، یان هەر سورەتی (الأخلاص) بخوێنرێت لە نوێژی شێواندا، وانییە، پێغەمبەر ﷺ سورەتی ئەعرافی هەموو خوێندووە.

جاری وا هەبوو جوزئێکم قورئان لە نوێژی شێواندا دەخوێند، یا نیو جوزئم دەخوێند، بەپێی کەشو هەوای نەفسی، دیارە مرۆڤ کە ڕەغبەتی زیاتر بوو لەزەتی زیاتر دەکات، زیاتر دەچوومە نێو قووڵایی قورئان خوێندنەوە. پاشان نوێژی خەوتنان دەکرا، زۆرجار لە نوێژی خەوتنانیش جوزئێك، دوو جوزئم دەخوێند، بەتایبەتی ئەو شەوانەی کە درەنگ خەبەرم بووبا بۆ شەونوێژ، بە نوێژی بەیانیانو بەنوێژی خەوتنان قەرەبووم دەکردەوە، ئینجا هەوڵمدەدا دوای نوێژی خەوتنان زوو بخەوم، بۆ ئەوەی بۆ شەونوێژ یا بۆ پارشێوکردن بتوانم خەبەرم بێتەوە.

بۆ شەونوێژیش" لانی کەم سەعاتێك، دوو سەعات، سێ سەعاتو چوار سەعات، جاری وا هەبوو پێنج شەش سەعات دەمتوانی بێدار بم، واتە کەمێك لە شەو دەخەوتم، بەتایبەتی لە سەرەتاوە، بەر لەوەی دەست بکەم بە نووسینو ئەوانە، بەڵام کە دەستم کرد بە نووسین، بە ڕۆژێ زۆر ماندوو دەبووم، چونکە لەسەر کارتۆنێك دەمنووسی، مێزو شتم لانەبوو، زۆر پشتم کووڕ بوو، پشتم دێشاو ئەوانە، پێویستم بە ئیسراحەتی شەو زیاتر دەبوو.

نوێژی بەیانیانیش چەند جارێك سورەتی (البقرة)م دەخوێند، لە دوو ڕکاتی نوێژی بەیانی، یان سێ جوزئێك لە کۆتایی قورئان، یا سێ جوزء لە هەر شوێنێکی قورئان، چونکە من لە یەك کاتدا دوو خەتمەم دەکرد، خەتمێکیان هەموو ڕۆژێك جوزئێك یان زیاترم دەخوێند لە موصحەف، خەتمەکەی دیکەشم لە نوێژەکاندا دەخوێند، شەونوێژو نوێژەکانی دیکە. ئەوانە بڕگەو بەرنامەکانم بوون.

**+ بەڵێ، بێینەوە سەر بەڕۆژووبوونەکە؟**

ــ بەڕۆژوو بوون، نزیکەی مانگی یەکەم نەمتوانی بەڕۆژوو بم، لەبەرئەوەی شوێنەواری ناڕەحەتیو نەخۆشیو ئەوانە لە بەدەنمدا مابوو، نەمتوانی بەڕۆژوو بم، دوای نزیکەی مانگێ توانیم بەڕۆژوو بم، ئیدی پێنجشەممەو دوو شەممە بەڕۆژوو دەبووم، هەندێك جاریش دە ڕۆژ لەسەر یەك، جار هەبوو نۆزدە ڕۆژ لەسەر یەك بەڕۆژوو دەبووم، بەڵام حەوت مانگی کۆتایی، واتە حەوت مانگی پێش ڕزگاربوونم، نزیکەی هەمووی لەسەر یەك بەڕۆژوو بووم، ئنجا سەرجەم و کۆی گشتی بە هەردوو مانگی ڕەمەزانەوە کە لەوێ گرتمن، زیاتر لە نیوەی ئەو ڕۆژانە کە لەوێ بووم، بەڕۆژوو بووم، من هەمووی شەشسەدو شەست ڕۆژ مامەوە، بەو شەوەشەوە کە لە بەغدا مامەوە، لە کاتی بردنمەوە تا کاتی هاتنەوە، نیوەی زیاتر بەڕۆژوو بووم، بەڵام بە هەردوو مانگی ڕەمەزانیشەوە. بە ڕاستی پارشێوکردنیش لە سەرەتاوە زەحمەت بوو، چونکە هیچ خواردنێك نەبوو، جاری وا هەبوو زستان سارد، ژوورەکەش سارد، خواردنەکەش هەر مەیو بوو لە کیسەدا، ئەگەر ئینسان شتێکی بۆ خرەوەبا دەیخوارد، لە سەرەتاوە پارشێوکردنمان زەحمەت بوو، دوایی وایان لێکرد کە بۆ ڕەمەزانی دووەم پارشێو خواردنی ئامادەکراویان بۆ دەهێنایین، هێلکەیان دەکوڵاند، یان سوورریان دەکردەوە، یان پەتاتەیەك، دوای ڕەمەزانیش لەجیاتی نانی بەیانی، هەر کاتی پارشێو دەیانهێنا، بەڕاستی من بە تەدبیرێکی تایبەتی خواییم دەزانی بۆ خۆم، چونکە من بڕیارم دابوو، وتم: بڕیارم داوە تا ڕزگارم دەبێت هەر بەڕۆژوو دەبم، یەکێك لە زانایان دەفەرموێت (أصوم عن الدنيا وأُفطِر على الموت). جا لەوێ من بە هاوزیندانییەکانی خۆم دەوت: منیش (أصوم عن السجن وأفطر على الخروج)، ئیدی تا هاتمەوە، نانی بەیانیانیان کاتی پارشێو بۆ دەهێنایین. ئەوە بۆ من شتێکی زۆر باشبوو، خواردنەکەم بە گەرمی دەخوارد، ئێوارانیش ئاوا هەر ژەمێکی کەیان بۆ دەهێنایین، ماوەی کۆتایی مانەوەم لە زیندان باشبوو، لە ڕووی خواردنو خۆراکەوە.

**+ کە تۆ شەوان هەڵدەسایتەوە بۆ شەونوێژ، ئایا ڕێگەیان دەدا بچیتە دەرەوە تادەستنوێژ تازە بکەیتەوە، یان لە ناو ژوورەکەدا ئاوی تێدا بوو؟**

- سێ مانگی سەرەتا سەرئاوو شتی لێ نەبوو، وەزعم زۆر قورس بوو، ئینسان ئەگەر تارەتی بچووکی بگرتایە دەبوو لە نێو بتڵ، ئەوەی تارەتی گەورەی بگرتایە لە نێو سەتڵ، بەڵام من خواردنم کەم دەخوارد، زۆریش قەڵس بووم لە ناو ژوورەکەی خۆمدا تارەت بگرم، پێویستم پێی نەبوو، جا شەوو ڕۆژی جارێك یان دووجار بوایە دەچوومە سەرئاو، کێشیشم زۆر دابەزی، چونکە خواردنم نەدەخوارد بۆ ئەوەی پێویستم بە سەرئاوو شت نەبێت، بەڵام دوایی، دوای ئەو سێ مانگە، منیان گواستەوە بۆ شوێنێك، ئێمە کۆمەڵێك بووین گواستیانینەوە بۆ شوێنێك کە سەرئاوی تێدا بوو، هەر لە ژوورەکەی خۆماندا دەستنوێژمان لێدەگرت.

**+ ئێستا مامۆستا عەلی باپیر بەوە دەناسرێتەوە کە خەوی کەمە، ئەویش بەهۆی زۆریی کارەکانو سەرقاڵی بە بەرنامەی کاریەوە، شەوو ڕۆژی چەند سەعات لەوێ دەخەوتن؟**

- ئەوە جیا جیابوو، جارێ من هەمیشە کاتم کەمبوو بۆ خەوتن، جا لەوێ ڕەفیقە زیندانییەکان دەیانوت: "شێخ، سجن شوێنی خەویە، تۆ چۆنو بۆ تێر ناخەوی؟" وتم: وەڵڵاهی ئیشو کارم زۆرەو مەشغەڵەتیم زۆرە. بەتایبەتی ئەو کاتانەی دەستم بە نووسین کرد، کە من لە دووسەدو یەکەمین ڕۆژی زیندان دەستم بەنووسین کرد، هەفتەیەك پێش هاتنەوەم لێی بوومەوە.

واتە نزیکەی چوارسەدو پەنجا ڕۆژ خەریکی ئەو کتێبە بووم، بەڕاستی کاتم کەمبوو بۆ خەو، دەتوانم بڵێم کە جاری واهەبوو شەوو ڕۆژیش پێنج سەعات دەخەوتم، جاری وا هەبوو شەش سەعات، بەڵام دوایی کە هەستم دەکرد وەکو چۆن مرۆڤ ژەمبواردوو دەبێت، هەست بە برسێتی دەکات، منیش کە خەو بواردوو دەبووم، بۆ شەوو ڕۆژەکانی دیکە قەرەبووم دەکردەوە، دەمکردە حەوت سەعات، یان شەش سەعاتو نیو، پێم شك نایەت لە حەوت سەعات تێپەڕیبێ، دەچوو بۆ شەش سەعاتو بۆ پێنج سەعاتیش.

من پێموایە بۆ خەوتنو ئەوانە، بەڵێ بەدەن پێویستی پێیەتی بە ئەندازەی کە ماندوو دەبێ، پێویستی بە ئیسراحەت هەیە، بەڵام خۆڕاهێنانیش زۆر ڕۆڵی تیا دەبینێت، مرۆڤ ئەگەر خۆی ڕابهێنێت لەسەر هەشت سەعات، ئەگەر حەوت سەعات

بخـەوێت، هەسـت بەبێخەوی دەكـات، بەڵام كە خۆت ڕاهێنا، دەگۆڕێت، پێموایە بەپێی قۆناغـی تەمەنـیش خـەو فـەرق دەكـات، پێموایە بەشەش سەعاتو نیو مرۆڤ دەتوانێت ئیكتـیفا بكـات، ئەگـەر زیاتـر مانـدوو بـێ، ڕەنگە پێویستی بە ئیسراحەتی زیاتر هەبێ، بـەڵام بۆ حاڵەتـی ئاسـایی، بۆ تـەمەنـی چـل سـاڵو پشـتـەوە، مـرۆڤ بەوەنـدە ئیكتیفا دەكات.

**+ ئـێمە زۆر لەسـەر پەرستشـەكان ڕاناوەسـتین، چـونكە ئـەوە زیاتـر شێوەیەكی شەخسییان پێوە دیارە، بەڵام دەكرێ بزانین قۆناغی زیندان، لە ڕووی ئیمانـیو روحـیو ئەنجامدانـی عیبادەتەكانەوە، بە قۆناغێكـی تایبەتـی ژیانی ئێوە دادەنرێت، یـان لـە دەرەوەی زیندانیش ئێوە هەر لەسەر ئەو ڕێتمە بەردەوام بوونو بەردەوامیش دەبن؟**

ـ مـن كاتـی خۆیشـی هـەر وابووم، ئەوانەی لە منەوە نزیكنو لە نزیك منەوە ژیاون، دەزانن، هەروەكو كە لە قورئانو سوننەتدا هاتووە، لە ژیانی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی بەرێـزی ڕەنگـی داوەتـەوە، هـەوڵم داوە وا بكـەم، یانـی خوێندوومەتەوە كـە مرۆڤـی ئـیماندار، بەتایبەتـی كەسـێك كـە كـاری ئیسـلامیی دەكـات، لـە نێو مـوعاناتو ئێشو ژانـدایـە، بـەبێ بەهێزكردنـی لایەنـی روحـیو مەعنـەوی لـە خـۆیدا، ناتـوانێ بـاری كاری ئیسـلامیی بخاتـە سەرشـانی خـۆی، هـەر بۆیەش خـوای پـەروەردگار لە گەلێك شوێنی قـورئاندا فـەرمان بـە پێغەمـبەرﷺ دەكـات بـە شـەونوێژو بە زیكرو تەسبیحاتی خوای پـەروەردگار، بـە پشت بەخوابەستن، بە ڕوو لەخواكردنی زیاتر، بە دونیابەكەمگرتن، بۆ وێنـە" لـە كۆتایـی سورەتی (طـه)دا خـوای پـەروەردگار دەفەرموێت: (فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُـونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا وَمِنْ آنَاءِ اللَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ النَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَى* وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِّنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَى* وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا لَا نَسْأَلُكَ رِزْقاً نَّحْنُ نَرْزُقُكَ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَى) ئایەتی (١٣٠ ـ ١٣٢).

هـەروەها لـە كۆتایـی سورەتی (الأعراف)، لەكۆتایـی سـورەتی (الحجر)، لەكۆتایی سـورەتی (الـنحل)، لەكۆتایـی زۆر لـە سـورەتەكان، لە سورەتی (المدثر)و (المزمل)، لە هەموویاندا، لـە زۆربـەی سـوورەتەكاندا، خـوای پـەروەردگار فـەرمان بەپێغەمبەر ﷺ

دەکات کە لە ڕووی ڕوحی تەقواو لەخوانزیکبوونەوەو ئەوانەوە زیاتر کردو کۆشش بکات. من هەر لە زینداندا وانەبووم، لە پێش زیندانیشدا هەمیشە هەوڵمداوە کاتێك تەرخان بکەم، ڕۆژووی سوونەت بگرم، لە خوا بەزیاد بێ، لەوەتەی لە بیرم بێ هەر هەوڵمداوە ڕۆژووی سوونەتم هەبێ، کەمو زۆر ڕۆژووی سوننەتم هەبووە، هەوڵمداوە شەونوێژو نوێژە سوننەتەکانم هەر هەبێ، بەپێی توانا، دیارە لە حاڵەتی نەخۆشیو سەفەر ئەوە دوو حاڵەتی ئیستیسنایەو خوای کاربەجێ لە قورئاندا باسی کردووە، (عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَى وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ اللَّهِ وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ) (المزّمّل: ٢٠). ئەم سێ حاڵەتە، حاڵەتی نەخۆشی، حاڵەتی سەفەر و گەشت بۆ بازرگانیو حاڵەتی جیهادو جەنگکردن، خوای پەروەردگار کردوونی بە سێ حاڵەتی هەڵاوێردراو بۆ ئەوەی کەسانێك کە عادەتیان وایە شەونوێژ بکەن، بۆیان هەبێ شەونوێژ نەکەن، ئەگەرنا، من هەوڵمداوە ئەوانەم هەر هەبێ، هەروەها ئیعتیکافیش، هەوڵمداوە بەین بەین بچمە ئیعتیکافەوە.

جا بەڕاستی ئەو زیندانییە بۆ من ئیعتیکافێکی زۆر باشبوو، ئیعتیکافێکی خەستو خۆڵ، بەڕاستی زۆر لە مێژبوو هەستم بەتینوێتییەکی ڕوحی دەکرد، دەرفەتیشم نەبوو لەبەر سەرقاڵیی ئیشو کار، دەرفەتم نەدەبوو، ئیدی ئەوە بۆ من ئیعتیکافێکی ئیجباری بوو، پێموایە زۆر لەو تینوێتییە ڕوحییانەی پێشتر هەمبوون، ئینشا ئەڵڵا شکاون، پێموایە سوودی زۆرم لێ بینی، لە ڕووی بەهێزبوونی ئیمان، لایەنی ڕوحیو زیاتر بیرکردنەوە لە گەورەیی خوای پەروەردگارو لە ناوە بەرزەکانیو سیفاتە پەسەندەکانیو لە مەخلوقاتی و .. هتد.

یەکێك لەو شتانەی لە زینداندا بۆم دەرکەوت لە ئەنجامی بیرکردنەوەی زۆر، بۆم دەرکەوت کە خوای پەروەردگار پێداویستییە بچووکەکانی ئینسانیش جێبەجێ دەکات، بێگومان ئەو ئاگای لە هەموو شتێك هەیە، ئەوە شتێکی بەڵگە نەویستە، بەڵام پێداویستیی زۆر گچکەی ئینسانیش جێبەجێ ئەکات، با من یەکێ لەوانە بگێڕمەوە: ڕۆژێك، کە چەند مانگێ بوو میوەو شتیان نەدابووینێ، لەوێ لە سەرەتاوە میوەو شت نەبوو، دوایی بۆیان هێنایین، دیارە بەدەنی ئینسانیش ئەو خواردنانەی کە بۆ ڤیتامینو ئەو خواردنانەی کە حەزی دەچێتێ، پێویستی پێیەتی، پرتەقاڵێکم بە دەست

پاسەوانێکەوە بینی، هەروا تۆزێك دڵم بۆی چوو، ئیدی چاوم تێنەبڕیبوو، هەروا دڵم بۆی چوو، ئەگەرنا، پێم ناخۆشبوو تەماشای بکەم، دیارە ئەوان ئەوەیان هیچ ڕیعایەت نە دەکرد، بۆ من نا، بەڵکو بۆ ئەوانی دی، چونکە من هەر لە ناڕەحەتیو شتدا بووم، بەڵام ئەوانە هەموو بەرپرسانی ڕژێمی بەعس بوون، بەرپرسی گەورە گەورەو وەزیرو ئەوانە، لە خۆشیو لەزەتی زۆردا بوون، پاسەوانەکان هەموو خواردنی تازە سازکراویان دەخوارد، میوەیان دەخوارد، شتی شیرینییان دەخوارد، زەڵاتەیان دەخوارد، ئیدی ئەو بەرپرسانە دەبوو هەر زەقەی چاویان بێت، هەر ئاویان بە دەمدا هاتبایە! جا ڕۆژێك من پاسەوانێکم بینی ئەو پرتەقاڵەی پێبوو، تۆزێك دڵم بۆی چوو، ئەو ڕۆژە بەڕۆژووشبووم، دوایی هاتمەوە، وەرزشمان تەواو بوو هاتمەوە ژووری، تۆزێك خەوتم، ڕۆژ بوو، دوایی کە خەبەرم بووەوە، پرتەقاڵێکی گەورە لەسەر قەراغی پەنجەرە تەختەکە دانرابوو، من وامزانی پرتەقاڵیان بەسەردا دابەش کردووین، دوایی لێم پرسین وتم: ئەرێ ئێوەش پرتەقاڵیان دانێ؟! وتیان: "پرتەقاڵی چی؟ نەوەڵڵا کەس وەری نەگرتووە، بۆ؟" وتم: وەڵڵا پرتەقاڵێکیان لەسەر پەنجەرەکەی من داناوە.

بە هەرحاڵ، خوای پەروەردگار دڵی یەکێ لەو کافرانەی نەرمکردووە! یان بۆ خۆی لە ڕێی فریشتەیەکەوە پرتەقاڵێکی تایبەتی لەوێ داناوە، بۆ خوای پەروەردگار هەموو شتێ ئاسانە.

یەکێکی تر لەو حاڵەتانەی لە ئەنجامی بیرکردنەوەی زۆرو تێڕامان لە کاروباری خوای پەروەردگار بۆم دەردەکەوت کە خوای تەعالا گرنگی دەدا بەشتی گچکەی پێداویستی ئینسانیش. من زۆر سەغڵەت بوو بووم بەوەی کە هەموو ڕۆژێ دەبوایە دەستنوێژم لە ژوورەکەی خۆماندا گرتبایە، زۆر ناخۆشبوو، من بەتانیشم ڕادەخست، دوایی بەتانییەکە تەڕدەبوو، بەتایبەتی کە زستانبوایە ناخۆشبوو، نزیکەی نەوەدەمین ڕۆژبوو کە لەو شوێنەدا بوومو سەرئاوی تێدا نەبوو، ڕۆژی کۆتایی زۆر سەغڵەت بوو بووم، وتم: خوایە، تۆ بۆ خۆت دەزانی، نازانم چۆن دەستنوێژ بگرم، جاری وا هەیە لەشم لە نوێژ دەچێت. دوعام کرد، وتم: هەر لێرە لام بەنو بچمە شوێنێکی وا کە سەرئاوێکی لێبێو ئەوانە، دراوسێیەکەشم جگەرەکێش بوو، هەموو جارێ کە جگەرەی دەکێشا، دووکەڵی جگەرەم بۆ دەهات، جا من بە دووکەڵی جگەرەش تەنگە نەفەس

دەبمو زۆر پـێم ناخۆشـە، قـەد لـە ژیانمدا جگەرەم نەکێشاوە، زۆر پێی قەڵس دەبووم، ئـیتر شـوێنێکی واش بـێت ئـەو دووکەڵـە جگەرەشـم لێ قەتع ببێ، هەروەها لە ئەولاشم زۆرر قسـەیان دەکرد، بەتایبەت یەکێکیان دڵـی تـەنگ دەبوو، مرۆڤ کـە لـە زیندانـی تاکیدایە زۆر دڵـی تـەنگ دەبـێ، پێی خۆشە قسە بکاتو دەنگ بەرز بکاتەوە، ئەوەش وەکو تەنفیسـێك، ئـەو هـەر هـاواری دەکـرد: شـێخ! قسەی دەکرد، جاری وابوو من لە نـوێژدا دەبـووم، دەبـوو بڵێم (سبحان الله)، فێرم کردبوو، وتم: ئەگەر وتم (سبحان الله)، بـزانە لە نوێژدام. من قورئانم دەخوێند، یان بیرم دەکردەوە، یان زیکرێ دەکەم، ئەوجا هەمـوو جـارێ دەبـوو قەتعـی بکـەم، ئەو ڕۆژە بەیانییەکەی دوعام کرد، هەر بۆ ئێوارێ وتـیان: نـەقلن. ئـەمن بەڕاسـتی تۆزێ ترساشم، وتم ڕەنگە بۆ شوێنێکی ناخۆشتر بێت، تـۆزێك دڵیشـم خۆشـبوو، وتم: ئینشـا ئـەللا دوعاکـەم قەبوڵ بووە، دەچینە شوێنێکی باشـتر، هـەر بـۆ ئـێوارە بـردیانین بـۆ زنجـیرە ژوورێکـی دیکە، کە سەرئاوی لێبوو، ئەو مەنفـەزەش، ئـەو تاقەشـی لێـنەبوو، دووکەڵـیش قەتعـبوو، قسـەکانیش قەتعـبوون! هەرسێ داواکارییەکەم هاتنە دی.

**+ ئـەوە هەڵدەگـرین بـۆ تەوەرەکـەی دیکـە، تـەوەرەی هەڵوێسـتە لەبیرنەچووەکانی نێو زیندان..**

- بۆ بەتەمای جارێکی دیکە باسی کەیەوە؟!!

**+ ئەوە تەوەرەیەکـی تـرمان داناوە بۆ ئەوشتانە. مامۆستا، باست لەوەکرد سوننەتێك کە لەوەو بەر ئەنجامت نەداوەو لەوێ بوارت هەبووە، خوێندنـی سوورەتی (الاعراف) بوو لە نوێژی شێوان، لەوێوە پرسیارێك دروست دەبێ، ئەو سوننەتانە چین کە تەنها لە زیندان بواری جێبەجێکردنیانت هەبووە؟**

- هـەر ئـەوەیان ڕەنگـە یەکـەم سـوننەت بـووبێ، ئەویش لەبەرئەوەی بەردەوام لەو شـوێنانەی نـوێژ دەکـەم، هـەر ئیمامەتـی بـۆ خەڵك دەکەم، ئینجا بەردەوامیش میوانو خـەڵكو قەڵەباڵغیشـمان هـەر لەسـەرە، ئەگـەر من نوێژی شێوان سورەتی ئەعرافی تێدا بخوێنم، دەبێت کابرا دەست وەبن سەری بدا تا نوێژی خەوتنان!!

بەڕاستی پێم شك نایە بۆ سوننەتی دیکە، وەکو لە بابی هەڵسوکەوتو مامەڵە لەگەڵ خەڵك، وەکو چاکەکردن، بەزەیی نواندن، هەندێ هاوکاریکردن، ئەگەرنا، پێم شك نایە شتێکی تازەی دیکە تەنها لە زیندان دەرفەتی ئەنجامدانیم هەبووبێ.

**+ مامۆستا، بێینە سەر باسی نووسینو خوێندنەوە، ئاشکرایە ئێوە بێ کتێبو نووسینو خوێندنەوە هەڵناکەن، لە چەند مانگی سەرەتای زینداندا، هیچ یەکێك لەمانە هاوەڵتان نەبوون، ئەو کاتانە هەستتان بەچی دەکرد کە دوور لەوانە دەژیان؟**

ـ بێگومان لە سەرەتاوە زۆر ناخۆشبوو، لە وەزعێکەوە کەوتبوومە ناو وەزعێکی تر، بەڵام لەبەر ئەوەی قۆناغی پێشتر ناخۆشتر بوو، ئەوەبوو ئازارو ئەشکەنجەو نارەحەتیم هەبوو، کە بردیانم بۆ ژوورە تاکییەکە، هەرچەندە کتێبو هیچ قەڵەمو شتێکی لێ نەبوو، بڕوا بکە وام دەزانی هاتوومەتەوە بۆ ماڵێ، لەو حاڵەتە ناخۆشە نەجاتمبوو هاتم بۆ ژووری تاکی، وەك بڵێی بەسەر فەرەحناییەکی زۆردا کەوتم، بەڵام دوایی کەمامەوە، دیارە بەردەوام چەند ڕۆژو حەفتەو مانگو ئەوانە بە دوای یەکدا دەهاتن، مرۆڤ هەست بە دڵتەنگییەك دەکات، جار جار، بەڵام خوای پەروەردگار دڵی وا لێکردبووم کە نەمدەتوانی بێئیش بم، ئەویش دەبێت خوا بۆت ئاسان بکات، بەڕاستی هیچ شتێ بەشانو شەوکەتی مرۆڤ خۆی نییە، تەنانەت لەو کاتانەی کە وەرزشم دەکردو دوو نیوسەعاتی دەردەچووین، بیستو سێ سەعات لە ژوورێ، جاری واش هەبوو دوو نیوسەعاتییەکەیان دەکردە دوو نیوچارەك، چونکە چوونە سەرئاوەکەشیان دەخستە سەری، کابرای پاسەوان دەیگوت: "چارەکێك ڕۆشتووە، یا بیست دەقیقەی ڕۆشتووەو دە دەقیقەی ماوە". خوای پەروەردگار وای بۆ ئاسان دەکردم، ئەوکاتانەی وەرزشیش هەوڵم دەدا بێئیش نەبم، یان چەند زیکرێکم دەخوێند، یان سەلاواتم لە پێغەمبەرﷺ دەدا. لەبەر ئەوە من فەراغم نەبوو، لە ئەنجامی ئەوانەدا، کە تۆ بۆشاییت نەبوو، زۆر هەمو غەمو ئەوانەت نابێ، بیرم زۆر دەکردەوە، پێم خۆشبوو کتێبم لە بەردەستدا بوایە، بەڵام ئەو شتانەم کردبووە بەدیل بۆ موتاڵەعەو نووسین.

**+ بەڵێ، لەو چەند مانگەی ڕێگەی دەستخستنی کتێبو بواری نووسینتان پێدرا، چەند کتێبو بڵاوکراوەتان خوێندەوەو ناویان چی بوو، چۆن دەستتان کەوتن؟**

ـ بڕوا بکە ناوەکان زۆر بوون، بەڵام بەزۆری ئەو ڕۆمانو چیرۆکانە بوون کە چیرۆکنووسو ڕۆماننووسە ئەورووپیو ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاواییەکان نووسیبوویانو تەرجەمە کرابوون بۆ عەرەبی، بەزۆری ئەوانەبوون، دیارە ئەوە بە ئیزافەی تەوراتو ئینجیل، هەردووکیانم خوێندەوە، تەورات کە دوو هەزار لاپەڕەیەو، ئینجیلیش دەوری هەزار لاپەڕەیە بەشەرحەوە، ئەوەش کاتێکی لێگرتم، نزیکەی مانگێك پێوەیان خەریك بووم، بەزۆری کتێبی ڕۆمانو ئەوانەبوو دەمخوێندنەوە، دەتوانم بڵێم زیاتر لە (١٠٠ ـ ١٥٠) کتێبم خوێندووەتەوە، بەزۆری ڕۆمانی (تۆلستۆی)و ئەدیبو نووسەرە گەورەکانی هیند و ئینگلیز و فەرەنسا و ئەمریکا و ئەوانەبوون، دوایی هەندێ کتێبی ئیسلامیی تێداهەبوو وەکو (تحفة الذاكرين)ی (شەوکانی)، (رياض الصالحين)ی نەوەوی، تەئریخی خولەفا، (رجال حول الرسول)ی خالید موحەممەد خالید، (تأريخ العراق)، بەڵام دوایی ئەوانەیان هەموو لابرد، بەتایبەتی کتێبە ئیسلامییەکانیان هەموو لابرد، هەندێ کتێبی دکتۆر عەلی وەردی: (وعاض السلاطين)و چیو چیشی لێبوو، بەڵام دوایی ئەوانەیان هەموو لابرد، تەنیا مابوونەوە ئەو کتێبی ڕۆمانو چیرۆکانەی ئەورووپییەکان نووسیوویانەو تەرجەمە کراون بۆ عەرەبی.

**+ لە تەوەرەکانی پێشوودا باست لە نووسینی کتێبێکی عەرەبی کرد، دەکرێ لەوبارەیەوە زیاتر بزانین، ئایا کاغەزتان لابوو تا لەسەری بنووسن، هەرچەندە باستان لەوە کرد کە کاغەزتان لا نەبوو هەمووی لەسەر مقەبا نووسرا؟ دوایی چۆن توانیت بیگوازیتەوە بۆ دەرەوەی زیندان؟**

ـ لەسەرەتاوە من ئیجازەی نووسینم نەبوو، ئیجازەم نەبوو قەڵەمو کاغەزم پێ بێ، ڕۆژێك بانگیان کردم بۆ تەحقیق، موحەقیقە ئەمریکییەکان گۆڕابوون بە دووی بەریتانی، یەکیان ناوی مستەر بیڵ بوو، ئەویتریان ناوی مستەر جۆ بوو، بەڕاستی ئەو دوو برادەرە باش هاوکارییان کردم، وتیان: "ئێمە بەتەماین لاپەڕەیەکی نوێ لەگەڵ تۆ هەڵبدەینەوە، بۆمان دەرکەوتووە کەتۆ پیاوێکی پاکیو ڕاستی، ئەوشتانەی لەسەر تۆ

گوتراون درۆن، ئێمە دەمانەوێت لاپەڕەیەکی نوێت لەگەڵ هەڵدەینەوە، لەمەولا بۆ تەحقیق بانگت ناکەین، بەڵکو زیاتر پێمانخۆشە بۆ وتووێژی فکری لەگەڵت دابنیشینو ئیستیفادە بکەین، تۆ هەندێ شتی نوێت پێیەو ئەوانە"، وتم: فەرموون، وتیان: "جارێ ئەتۆ چیت پێویستە ئێمە لە خزمەتین". ئەوکات زۆر پێویستم بە سەعات بوو، چونکە نزیکەی حەوت مانگ بوو سەعاتم لانەبوو، بانگیشم بۆ خەڵکەکە دەدا، بەتایبەتی بۆ کاتی پارشێوان نەمدەزانی کات چەندە، چونکە لە ژوورێدا هیچ شت نابینی، ژوورێکی تاریک ئەوەشی تێدا نەبوو دەرێ ببینی، وتم: جارێ پێویستم بە سەعاتە، سەعاتەکەی خۆم کە لێیان سەندووم، بۆم بێننەوە، ئەوە ئەگەر بواری نووسینم بدەن، قەڵەمو کاغەزم بدەنێ، ئەوە زۆر سوپاستان دەکەم، لەبەر ئەوەی من کاتێکی زۆرم هەیە، دەمەوێ هەندێ خەواتیری خۆم دەربارەی قورئان بنووسم، دەشمەوێ تۆزێ خۆشم فێری ئینگلیزی بکەم. جا لەڕاستیدا ئەو کاتە دەمویست، بەڵام دوایی ئەوەم واز لێهێنا، بەشی مەدار سازکردنی خۆم چەند ڕستەیەکم دەزانی، وتم: لەوە زیاترم پێویست نییە، زیاتر ڕەغبەتم چووە سەر ئەوەی بە قورئاندا بچمەوە.

جا ئەو دوو موحەقیقە بەریتانییە دەرفەتێکی باشیان بۆ ڕەخساندم، بوارياندا و لای خۆشیان نووسییان، چونکە موحەقیقی دوایی کە دێت، لەسەر هی ئەو حساب دەکات، فلان کەس بۆی هەیە قەڵەمو کاغەزی لابێت، ئیدی ئەوان هەر ئەوکاتە دەفتەرێکی سەد لاپەڕەییان دامێ، وامزانی خەنییان کردم، دوو قەڵەمیشیان دامێ، دوایی جاروبار لە موحەقیقەکانیش وەرم دەگرت، بەڵام بەزۆری پاسەوانەکان خۆیان بۆیان دابین دەکردم، وەکو هاوکارییەکی ئینسانی، کە دەیانزانی من زۆر خەریکی نووسینم، هەبوو بۆ خۆی دەهاتو دەیوت: "هیچ ئیشت نییە؟"، بەپارەی خۆی دەچوو بۆی دەکڕیم. بەڕاستی ئەو هەڵوێستانەم لەبیر ناچێت، یەکێکی کەشیان ناوی جۆزێف بوو، پیاوێکی بە تەمەن بوو، نزیکەی (٥٠ ـ ٦٠) ساڵێک بوو، دەیگوت: "دافیعێك هەیەو پاڵم پێوە دەنێ کە خزمەتی تۆ بکەم، نازانم خوا وای لێکردووم، ئەتۆ بە پیاوێکی موبارەك دەزانم، پێمخۆشە خزمەتت بکەم، چیت دەوێ؟". جاری وابوو چوار قەڵەمی بۆ دەهێنام، دوو دەفتەری بە پارەی خۆی دەکڕی، ئینجا لێم پرسی، وتی: "من ماڵو منداڵم هەیە"، وتم: باشە، ڕەنگە تۆ فەقیر بیتو پێویستت بەو پارەیە بێت، دەیگوت:

"نەخێر"، دەیگوت: "من پێموایە ئەگەر یارمەتی تۆ بدەم، خوا زیاترم دەداتێ"، ئاوا خوای پەروەردگار هەندێك لەوانەی بۆ موسەخەر كردبووم، خۆیان قەڵەمو دەفتەرو كاغەزیان بۆ دەهێنام، دەنا من زیاتر لە دوو هەزار لاپەڕەم نووسی لەو كتێبە، ڕەنگە هەزار لاپەڕەم زیاتر ئیعادەنووسین كردبێتەوەو فڕێم داوە، دیارە ئەوكاتەش فڕێدانی ئەو لاپەڕانە، ڕەشنووسەكان، گرفتێك بوو بۆ من، جارێك سووتاندمن، هەرئەوەندەمزانی چواردەوری مەعەسكەرەكە بوو بەناقیلەو مودەڕڕەعە، وتیان: "بۆن چروكێك دێ"، بەڵام لەبەرئەوەی جگەرەكێش نەبووم، هیچ كەس فیكری نەدەكردەوە لە ژوورەكەی من بێ. كاتی وەرزش بوو چووینە دەرێ، ڕەفیقە سجنەكانم زانییان من سووتاندوومە، بە هەندێكیانم گوت وەڵڵا من هەندێ كاغەزم سووتاندووە، چونكە ناوی خوایان تێدایە، ئایەتیان تێدایە، تا نەكەونە بەردەستو پێ. وتیان: "جا ئەوە هەرنابێ، هەر بە شتێكی زۆر گەورەی دەزانن". دیارە زۆر مشەوەشبوون، هاتن بۆنیان بە ژوورەكانەوە دەكرد، بەس نەهاتنە ژوورەكەی من، وتیان: "ئێمە دەزانین جەنابت جگەرەكێش نیت، ئەسڵەن ئەو ئاگرو شتە پەیوەندیی بە تۆوە نییە"، هەمووشی لە ژوورەكەی مندا بوو!

دوایی مەشۆرەتم بە ڕەفیقەكانم كرد، بەزیندانییەكان، وتم: باشە من چییان لێبكەم ئەو كاغەزانە؟ وتیان: "وەڵڵا نازانین"، بەڵێ دوایی وەكو خەتەرێ هاتە دڵم، تەبعەن پێشم دروست نەبوو فڕێیان بدەم، چونكە دەكەونە بەردەستو پێ، دوایی تەكبیرێكم لێكرد، لە سەتڵێك ئاوم دەهاویشتن، كاغەزەكان هەموو دەتلیسانەوە تا دەبوون بە هەویر، نووسینو شتەكەی هەموو دەكوژایەوەو دەمكردنە هەویر، ئەوجا فڕێم دەدان، جا مەبەستم ئەو هەموو كاغەزەیە، لەوانەیە نزیكەی پەنجا قەڵەمم زیاتر سەرف كردبێت، قەڵەمی جاف، ئەگەر خوای پەروەردگار ئەو پاسەوانانەی بۆ من موسەخەر نەكردبا، دیارە بۆ من زۆر شتێكی زەحمەت دەبوو[16].

---

[16] هەروەها كاك دكتۆر سەتتام ئەلگەعودیش هەندێك جار هاوكاریی دەكردم بۆ پەیداكردنی قەڵەم و قاقەز.

**+ مامۆستا، پێشتر باست لەوە کرد کە بەخوێندنەوەی ئەو کتێبە، هەندێك لە بەرپرسانی ڕژێم، لە هاوزیندانییەکانت، لە حەقیقەتی ئیسلام تێگەیشتن، ئەوانە کێبوون کە خوێندوویانەتەوە؟ تا چەند کاریگەریی لەسەریان هەبوو؟**

ـ جارێ با هەر بەکورتی پێناسەیەکی ئەو کتێبە بکەم، ناونیشانەکەیم ئاوا داناوە: (الاسلام يتجلى في كتاب الله)، مەبەستیشم لەو کتێبە ئەوەبوو باسی هەموو ئیسلام بکەم لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا، چونکە من پێم وایە خوای پەروەردگار باسی هەموو ختوتی عەریزو زۆر لە تەفاسیلو جوزئیاتی ئیسلامی کردووە لە قورئاندا، ئیدی ئەوەی کە لێی ورد بێتەوە، دەتوانێت هەموو ئەوانەی لێ هەڵ بهێنجێ.

ئەو کتێبە لە چوار باب پێکهاتووە، یان دەتوانین بڵێین چوار کتێبە لە کتێبێکدا.

**بابی یەکەم:** (الاسلام معرفة صحيحة بالخالق (جلّ شأنه) وبالخلق)، ئەوە باسی ئەوەی کە پێی دەوترێت ئەپستمۆلۆژیا (جیهانبینی) (نظرية المعرفة)، باسی نەزەرییەی مەعریفە لە ئیسلامدا، ئیسلام چۆن تەماشای وجود دەکات، چۆن تەماشای خالیق دەکات، چۆن تەماشای بوون دەکات، تەماشای ژیانو ئادەمیزاد، دونیاو دواڕۆژو ئەوانە دەکات. ئەوە نزیکەی سێ سەد لاپەڕەیەکی گرتووە.

**بابی دووەم:** (الاسلام ايمان بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر)، ئەوە لە شەش فەصڵ پێکهاتووە، باسی هەموو بنچینەکانی ئیمان دەکات، نزیکەی نۆ سەد لاپەڕەیەکە، ئەوە گەورەترین بابە.

**بابی سێیەم:** (الاسلام التزام جاد بالشريعة على الصعيدين الفردي والجماعي)، ئەوە باسی پابەندیی تاك بە ئیسلامەوە، پابەندیی کۆمەڵگا بەئیسلامەوە دەکات لە هەموو بوارەکاندا. لێرەدا باسی دەوڵەتی ئیسلامییو قەوارەی ئیسلامییو ئەوانەشم کردووە.

**بابی چوارەم:** (الاسلام نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم)، ئیسلام چۆن تەماشای هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵك دەکات، واتە موسڵمانان چۆن دەبێت هەڵسوکەوت لەگەڵ غەیری موسڵمانان بکەن، ئەوەش چ لە حاڵەتی جەنگ، چ لە حاڵەتی ئاشتی.

کتێبەکە ئەو چوار بابەیە، ئەوانەی کە دەتوانم بڵێم هەموو فەسڵەکان هەریەکەی تۆزێکیان لێ خوێندوونەتەوە، ئەو هاوزیندانییانەی کە لەگەڵمدا بوون، جا من بەزۆری

بابی یەکەمو دووەمم دەدانێ، ئەوەی کە باسی ئیمان دەکات، بەزۆری لێی بەهرەمەند دەبوون، کە دەیانخوێندەوە، هەستم دەکرد گۆڕانیان بەسەردا بێت، باسیان دەکرد کە "ئێمە یەکەم جارە دەبینین ئاوا لە ڕوانگەی قورئانەوە هەموو شتێ لە ئیسلامدا باس بکرێو وەلام بگێڕدرێتەوە بۆ قورئان، پاشان سوننەتی پێغەمبەرﷺ". بەزۆری بابی یەکەمو دووەمم دەدانێ، ئەگەرنا، هەشیانبوو لە بابی سێیەمیشو بابی چوارەمیشی دەخوێندەوە، بەتایبەت دکتۆر سەتتام ئەلگەعود فەسلێکی خوێندبووەوە لەبابی چوارەم، وتی: "ئەگەر ئیجازە بدەیت، من نامەی دکتۆرای لێ دەردەهێنم". منیش وتم: هەرکاتێ ڕزگارت بوو، ئیجازەیە بۆ تۆ. وتی: "من باسی سەرچاوەکەش دەکەم، کە لەو کتێبەی تۆ سوودم وەرگرتووە، من لە مێژە بە دوای کتێبێکی وادا دەگەڕام".

**+ کێبوون ئەوانەی بە تایبەتی خوێندیانەوە؟**

- بەباشی نازانم ناویان بێنم. ئەو موریدانە جارێ هەر لەوێن!!

**+ ئاشکرایە زۆرێك لە نووسەرە ئیسلامییەکان، وەکو سەید قوتب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، کاریگەریی زیندان کەوتووەتە سەریان، بە تایبەت لە نووسینەکانیشیاندا ڕەنگی داوەتەوە، ئایا ئەمە بەسەر جەنابیشتا دەچەسپێت؟**

- لە هەموو ئەو کتێبەدا، تەنها لە دوو سێ شوێندا ڕەنگە ئاماژەم کردبێ بە زیندان، لە پێشەکییەکەیدا ئاماژەیەکم پێکردووە، چۆنییەتی ئەو کتێبە، چۆنم نووسیوەو لە چ بارودۆخێکدا، لە یەك دوو شوێنی دیکەش ئاماژەیەکی کورتم پێکردووە، بەڕاستی ئەمن لەوێ (لە خوا بەزیادبێ) هەستم بەوە نە دەکرد کە زیندانییم، جاری وا هەبوو دادەنیشتم لە حاڵەتی تێڕامانو قورئان خوێندنو زیکرو ئەوانەدا، بڕوا بکەن وامدەزانی لە سەحرایەکدام ئەوسەری دیار نییە. من دەزانم دەفەرموویت چی، هەستم زۆر بەوە نە دەکرد، بەتایبەتیش کەبرایەنە زیندانی تاکیش، کە ئیهانەو لێدانو ئەشکەنجەو ئەوانە نەمابوو.

بەڵێ مرۆڤ جار جار دڵی توند دەبێ، بە تایبەتی بازنەیەکیان لەدەست کردبووین، ناوو ژمارەی خۆتی لەسەر بوو، هەرجارێ ئەوەم دەبینی، زۆر دڵم ناڕەحەت دەبوو، کە

نیشانەی دیلێتیو ئەوانەیە، بەڵام لە ڕووی دەروونیو مەعنەوییەوە خۆم لە شوێنێکی بڵند دەبینی.

هەر بۆیە ڕەنگە دوایی کتێبەکە ببینن، شوێنەواری زیندانو هەستکردن بە دڵتەنگیو ئەوانەی پێوە دیارنەبێت، ئەو بەڕێزانەی لەو شوێنانەشدا نووسیویانە، ڕەنگە ئەشکەنجەیان لەسەر بووبێ، ئیهانە کرابن، ناڕەحەت کرابن، ئادەمیزاد دەبێ دەروونی ساف بێت لە کاتێك کە دەیەوێ دەربارەی ئیسلام بنووسێ یان بدوێ!

من لەو کاتەی برامە زیندانی تاکی، جگە لە قۆناغی تەحقیقی دووەم، کە هەندێ ناڕەحەتیو شت هەبوون، دوای ئەوە ئیهانەکردنی ئەنقەستو ئەوانە نەبوو، ئەوە هەبوو کە جار جار دەبێ قنچکە جگەرە هەڵبگرنەوە، دەبوو حەمامو ئاودەست پاك بکەیتەوە، بەڵام هەستمان نەدەکرد شتێکی ئەنقەستەو بۆ ئیهانەکردنە، دەیانگوت: "شوێنی خۆتانەو پاکی کەنەوە"، جگە لەوە، شتی تر نەبوو، کە بڵێی پاڵ پێوەنانێ، یان قسە پێگوتنێ، ئەوشتانە نەبوو، وەکو لە زیندانی تر هەر بەعسییەکان بۆ خۆیان بۆمنیان باس دەکرد، دەیانوت: "ئێرە لە چاو زینداندا (پێنج ئەستێرە)یە". جگە لەوەش، من لە ڕووی روحیشەوە هەر بە بەدەن لە ناو سجنەکەدا بووم، ئەگەرنا، دەتوانم بڵێم بەروح لە مەلەکوتی ئەعلادا پەروازم دەکرد.

**+ مامۆستا، نزیکەی سەدو چل جار قورئانت خوێندووەتەوە، بەڵام من دەپرسم چەند جار سوورەتی (یوسف)ت خوێندووەتەوە؟**

- هەر لەگەڵ خەتمەکانی قورئان دەمخوێند، بەجیا نەمخوێندووە.

**+ بەجیا نەتخوێندووە؟**

- نەخێر، زۆرم تەئەمولم تێدا دەکرد، زۆر بیرم دەکردەوە لە ژیانی یوسف (علیه السلام)، بەتایبەتی لە کاتی هەڵسوکەوتم لەگەڵ هاوزیندانییەکان، زۆر بیرم لەو ڕستە قورئانییە دەکردەوە (وَدَخَلَ مَعَهُ السِّجْنَ فَتَيَانَ قَالَ أَحَدُهُمَا إِنِّي أَرَانِي أَعْصِرُ خَمْراً وَقَالَ الآخَرُ إِنِّي أَرَانِي أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزاً تَأْكُلُ الطَّيْرُ مِنْهُ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِ إِنَّا نَرَاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ) یوسف (٣٦).

مـن بـیرم دەكـردەوەو دەمـوت: ئـەوە پێغەمبەرێكـی خـوایە (علـیە السـلام)و بـە تۆمەتێكـی زۆر پـیس زیندانیـی كـراوە كـە ئەصـڵو ئەسـانی نییە، دوو نەفەر كە دیارە یەكێكیان مەیگێـڕ (سـاقی) بـووە، ئـەوی دیكەشـیان وا پێدەچێت چێشتلێنەر بووبێت، هـی پادشـایەكی كافـر، لەگـەڵ یوسـف (علـیە السـلام) لەو زیندانەدان، بەڵام هەریەكەو خەونـێك دەبیـنن، دەچن بۆ لای یوسفـو دەڵێن: (نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِ إِنَّا نَرَاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ). جارێ هـیچ خـەوی بـۆ تـەعبیر نەكردوون، دەڵێن ئێمە دەبینین تۆ لە چاكەكارانی، من لـەوە بـیرم دەكـردەوە، دیـارە یوسـف (علـیە السـلام) چاكەكار بـووە، لـەو زیـندانەدا مەشـهور بـوو بـە چـاكەكردن، جـا چـاكەكردن هـەر لـە قسـەی خۆشـەوە كـە خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێت: (وَقُولُـواْ لِلـنَّاسِ حُسْـنا) (البقـرە: ٨٣)، لـە هــەر جـۆرە چاكەیەكەوە كـە دەفەرموێت، (وَأَحْسِـنُوَاْ إِنَّ اللّـهَ يُحِـبُّ الْمُحْسِنِينَ) (البقرة: ١٩٥). زۆر بـیرم لـەوە دەكـردەوە، كەواتـە باشـترین شـت بـۆ مرۆڤـی زیندانی ئەوەیە كە چاكەكار بێت، موحسـین بـێت، چونكە مرۆڤ كە زیندانیی دەكرێت، زۆر پێویستی بە چاكە هەیە، پێویستی بـە قسـەی چـاك هەیـە، بـە ڕووی خـۆش هەیـە، بـە قسـەی خـۆش هەیە، بە تەوقەیەك هەیە، بە سەلاملێكردنێك هەیە.

ئـەو ڕسـتە قورئانییە زۆر سەرنجی ڕادەكێشام، بەڕاستی هانی دام كە منیش وەكو یوسـف (علـیە السـلام) بكـەم، بـا هاوەڵـە زیندانییەكانیشـم ئەگـەر بـە موسڵمانیشـیان نـەزانم، چـونكە ئـەویان سـاقی پادشـای كافـر بوو، ئەوی دیكەشیان چێشتلێنەری بوو، چـونكە یوسـف (علـیە السـلام) كـە خەوەكەشیان بۆ تـەعبیر دەكات، دەفەرموێت چی؟ (يَا صَـاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ* مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِ إِلاَّ أَسْـمَاء سَـمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَـآؤُكُم مَّـا أَنـزَلَ اللّـهُ بِهَـا مِـن سُـلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّـاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ) (یوسف ٣٩ ـ ٤٠)، بانگیان دەكـات بـۆ یەكتاپـەرستی، كەواتـە موشـریك بـوون، بانگیان دەكـات بـۆ خواپـەرسـتی، پاشـان خەونەكـەیان بـۆ تـەعبیر دەكـات، دەفەرموێت: (يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَمَّا أَحَدُكُمَا فَيَسْـقِي رَبَّـهُ خَمْـراً وَأَمَّـا الآخَـرُ فَيُصْـلَبُ فَـتَأْكُلُ الطَّيْـرُ مِـن رَّأْسِـهِ قُضِـيَ الأَمْرُ الَّذِي فِيهِ تَسْـتَفْتِيَانِ) (یوسـف: ٤١)، مـن دام نـەنا كە لە یوسف چاكترم، ئەوانیش هەر وەكو ئەو مەیگێڕو وەكو ئـەو چێشـتلێنەرەی ئەو پاشا كافرە بوون، پێویستە لەگەڵیان چاكەكار

بم، وەکو چۆن یوسف (علیه السلام) لەگەڵ هاوزیندانییەکانی چاکەکار بووە، ئەو هاوزیندانییانەی کە ئەو پادشاو دەسەڵاتە سیاسییەی یوسفی (علیه السلام) زیندانیی کردووە بە بوختان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قەدەغەی نەکردووە کە لەگەڵیان چاکەکاربێ، فیعلەن کاریشیان تێبکات، دوایی ئەوەبوو زەمینەی بۆ خۆش بوو بتوانێ ڕۆڵێکی زۆرباش ببینێ لەو وڵاتەدا، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان سەرکردایەتییە سیاسییەکەی ئەوێ بە ستەم زیندانیی کردبوو.

سورەتی (یوسف)م بەجیا نەدەخوێندەوە، کەواتە لە سیاقی خەتمەکاندا سەدو چل جار سوورەتی (یوسف)یشم هەر خوێندووە، بەڵام سورەتی (الکهف)م ڕەنگە زیاتر لەو ئەندازەیە خوێندبێ، چونکە سورەتی (الکهف) هەوڵمدا شەوی هەینی، یان ڕۆژی هەینی بیخوێنم، جیا لە خەتمەکان.

**+ کەواتە دەتوانین بڵێین تەفسیری سورەتی (یوسف) لای تۆ کاتێ لە دەرەوەی زیندان بووی، هەندێ لایەنی شاراوەی هەبوو، بەڵام لە زیندان چاکتر لێی تێ ئەگەشتی؟**

ـ نەك هەر سورەتی (یوسف)، بەڵکو لەزۆر جێگەی تری قورئان، بۆ خۆم سەرم سوڕدەما، ئەو بەرەکەتە روحییە کە دەڵێم لە زینداندا دەستم کەوتووە، بەزۆری لەو ڕووەوەیە کە زۆر نهێنی قورئان، خوای پەروەردگار لە زینداندا بۆی ئاشکرا دەکردم، پێموابوو لە تەفسیری دی و هیچ کتێبێکی تردا نەمخوێندووەتەوە، دوایش خوێنەران دەیبینن، نەك هەر لە سورەتی یوسف، غەیری سورەتی یوسف-یش.

**+ لە ماوەی ئەو دووساڵەی زینداندا، هیچ کاتێك بووە نوێژێکت تیایدا بفەوتێت؟**

ـ نەخێر، هەر ئەوکاتەی دەستیشم بەسترابوو، لە موسڵەوە بردیانین، چەند سەعاتێك دەستم بەسترابوو لە پشتەوەو بواری هیچ شتێکمان نەبوو، نوێژەکانم هەرکرد، وتم خوایە ئەوە تۆ شاهیدی، سوننەتە ویترەکەشم هەرکرد. وتم: خۆ من هەموو ڕۆژێك زیندانیی ناکرێم، نازانم لەو جێیە نەجاتم دەبێ یان نا، بەڵام ئەوە تاقیکردنەوەیە با لاواز نەبم، ئەوکاتەش بە ساغی هەوڵم دەدا بیکەم، بەڵام دوایی کە

تۆزێك نارەحەتیان كردم، بە دانیشتنەوە نوێژەكانم دەكرد، بە پێوە بۆم نەدەكرا، سوننەتەكانیشم بۆ نەدەكرا، چونكە جاری وا هەبوو لە كاتی نوێژدا یەكێكیان دەهات، ئاوا شەقێكی تێ هەڵدەدایت، یان پاڵێكی پێوە دەنایتو نوێژەكەی پێدەبڕیت، لەبەر ئەوە، خوا خوامبوو زوو نوێژە فەرزەكەم تەواو بكەم، پێش ئەوەی پێم ببڕن، ئەگەرنا، دوایی نەك نوێژی فەرز، هەوڵم دەدا سوونەتەكانیش نەك نەچن، بەڵكو زیادیان كەم، چونكە لەوێش ئادەمیزاد كاتی زیادی بەدەستەوەیە، پێویستیشی بە بەهێزكردنی لایەنی روحی هەیە.

**+ باسی ئەوەت كرد كە خواردنی بەیانیان، پارشێو بۆیان دەهێنان، ئەوە بۆچی؟ خۆت پێت وتبوون یان هەر خۆیان كاتەكەیان گۆڕیبوو؟**

ـ هەر خۆیان گۆڕییان، هەر لە ڕەمەزانەوە كە تەرتیبەكەیان دامەزراند، كە دەبوایە پارشێو بیهێنن، ئیدی دوایی نانی بەیانیشیان هەر پارشێو دەهێنا، منیش لەڕەمەزانەوە عەزمم جەزم كردبوو وتم: تادەردەچم لە سجن، بەڕۆژوو دەبم، من وام تەسەور دەكرد وەك تەرتیبێكی خواییە بۆ منی كردووە، كە هەموو جارێ پارشێوەكانم بۆ حازربێ، سوودیشم لێ دەكرد، چونكە پێشتر پارشێوەكانم بە زەحمەت بۆ دەكرا، یان هەر پارشێوم بۆ نەدەكرا، بەربانگیش خواردنێكی وانەبوو، دیسان بۆ سبەینێش بەڕۆژوو دەبوومەوە، ئەوە قورس دەكەوت.

**+ مامۆستا، كام ئایەتە زۆری ئەگریاندیت؟**

ـ وەڵڵا ناتوانم دیاری بكەم، چونكە..

**+ كام ئایەت زۆری ئەوەستاندیت؟**

ـ دیسان ئەوەش ناتوانم دیاری بكەم، زۆر لە ئایەتەكان، بەڵام ئەوەی لە هەموو قورئاندا زیاتر كاری تێكردبم، هەر لەسەرەتای ژیانمەوە، لە ناو زیندانیشدا، سورەتی (الفاتحة) بوو، سورەتی (الفاتحة) زۆر كاری تێدەكردم، جاری وا هەبوو سورەتی (الأنبیاء)م دەخوێند، ئایەتێك لە نێو ئایەتەكاندا زۆر دەیوەستاندم، جارێكی دیكە ئایەتێكی دیكە دەیوەستاندم، شتێكم تیا دەبینی كە پێشتر نەمدیبوو، بەپێی ئەو

حاڵەتـە دەروونیـیانەش کـە تێیان دەکەویت، هەر جارەی ئایەتێك زیاتر هەڵوەستەی لە بەردەمدا دەکەیت.

**+ کام ئایەتت زۆر دووبارە دەکردەوە؟**

ـ وەڵـڵا ئەو ئایەتەم زۆر دووبارە دەکردەوە: (حَسْبِيَ اللّهُ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُـوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ)، ئەو ئایەتەم زۆر دووبارە دەکردەوە، جاری واهەبوو هەزار جار دووبـارەم دەکردەوە، (فَـإِن تَوَلَّـوْاْ فَقُـلْ حَسْـبِيَ اللّهُ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ) (التوبة: ١٢٩)، هەروەها ئەو ئایەتەی سورەتی (الأنبیاء: ٨٧) (لَّا إِلَهَ إِلَّا أَنـتَ سُـبْحَانَكَ إِنِّـي كُنتُ مِـنَ الظَّـالِمِينَ)، ئـەو ئایەتـەی (حَسْـبُنَا اللّـهُ وَنِعْـمَ الْوَكِيل) (آل عمـران: ١٧٣)، بـەڵام سـورەتی (الفاتحـة) لە هەموویان زیاتر کاریگەری لەسەرم هەبوو، یەکـەمین کتێبیشـم هەر لەبەر ڕۆشنایی سورەتی (الفاتحة)دا نووسی، بۆ زانیارییتان ئەم کتێبەشـم هەمـوو لەبـەر ڕۆشـنایی سـورەتی فاتـیحەدا نووسـیوە، هەر چوار بابەتەکەی لەبـەر ڕۆشـنایی ئایەتەکانـی سـورەتی فاتـیحەدا نووسـراون، مەتنەکەی لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحە، ئەمجا شەرحەکەی لەبەر ڕۆشنایی هەموو قورئان.

**+ سەرچاوەکانی ئەو کتێبە جگە لە قورئان چیتر بوون؟**

ـ تەنـیا قـورئان، دوایـی وەك سەرچـاوەیەکی زیـادە، ئیعتیمادیشـم کـردە سـەر صـەحیحی بـوخاری، کـە دەسـتم کـەوت، هـەروەها صـەحیحی موسـلیم، هەنـدێك لـە فەرمایشتەکانی دیکەش کە لە یادەوەریمدا مابوون.

**+ کەمیی سەرچاوە گرفتی بۆ دروست نەکردوویت؟**

ـ پـێم شـك نایـە گرفتـی بـۆ دروسـت کـردبم، هەرچـی دەمویسـت، لـە قـورئاندا دەمدۆزییەوە (سبحان الله)، هـەر شـتێکم پێویسـتبا، بەڵگەیەکم پێویستبا، لە قورئاندا چنگم دەکـەوت، هەرلایەنێکم پێویسـتبا لـە ئیسـلامدا باسـی بکـەم، لـە قورئاندا چنگم دەکەوت، دواییش دەیبینن.

**+ چ دیمەنێك، چ چیرۆکێك لە قورئاندا، دیمەن‌و چیرۆکی خۆت‌و کۆمەڵـی ئیسلامیی دەهێنایەوە پێش چاوت؟**

ـ وەڵڵا بەسەرهاتی زۆر لە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێت)، بەڵام بەتایبەت بەسەرهاتی موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت)، کە لەماڵی فیرعەوندا گەورە بوو، جار جار هەر لە زینداندا دەمگوت: ئەگەر لێم بپرسن زیندانی ئەمریکات چۆن گوزەراند؟ دەمگوت: زیندانی ئەمریکا بۆ من وەکو کۆشکی فیرعەون وابوو بۆ موسا، وەکو چۆن موسا (سەلامی خوای لێبێت) لە کۆشکی فیرعەوندا پەروەردە بوو، پێگەیشت، دەمگوت منیش پێگەیشتنی دووەمم لەو زیندانەی ئەمریکادا بوو، تێگەیشتنی دووەمم لە ڕووی ئیمانو ڕوحیو دووبارە قوڵبوونەوە بە قورئانو سووننەتدا، لەو زیندانەوە بوو.

**+ باسی ڕۆمانتان کرد، ڕۆمانی ئەدیبو شاعیرە گەورەکان، هەر لەبارەی ڕۆمانەوە پرسیارت لێ بکەین، ڕۆمانو چیرۆك، ئەدەبی ڕۆمانو چیرۆك، جەنابت چۆن ئەیبینیت؟ یان ئایا ئەدیبی موسڵمان ئەتوانێ ڕۆمانو چیرۆك بنووسێت؟ یاخود چۆن بینووسێت؟**

ـ بەڵێ، ئەوە پێویست بە باسێکی دوورودرێژ دەکات، بەڵام ئەوەی کە من سەرنجم دا، بۆ وێنە" من یەکێ لە شاکارەکانی (تۆڵستۆی)م خوێندەوە، "ئەنناکارینا"، وابزانم تەرجەمە کراوە بۆ کوردی، خوێندووتانەتەوە یان نا؟ ئەوە شاکارێکی زۆر بەناوبانگیەتی، بەڵام بەڕاستی من تەماشام دەکرد، کابرا بەحساب نەصرانییە، مەسیحییە، بەڵام تەرویجی ئەوە دەکات کە ئافرەت لە مێردی خۆی هەڵگەڕێتەوەو لەگەڵ دۆستێکی کە ڕێککەوێت، پاشان مێردەکەی دەستی لێ هەڵبگرێت بۆ دۆستەکەی، واتە ئەوە تەرویجی داوێنپیسی و خیانەتی هاوسەرێتیی دەکا، زۆرم پێ سەیر بوو! هاوزیندانییەکانم دەیانگوت: "شێخ، ئەوە بخوێنەرەوە، شتی زۆر سەیرو سەمەرەی تێدایە"، وتم: هەموو فەلسەفەکەی، جەوهەرەکەی، بریتییە لەوەی کە ئافرەتێك دڵی بە پیاوێکی کەدا چووە، غەیری مێردەکەی، کە مێردەکەشی بە حساب بە خۆشەویستی هێناویەتی، دڵی بە پیاوێکی کەدا چووە، لەوی قۆزترو جوانتری دیوە، ئەمجا ئەو ئافرەتەو دۆستەکەی هەوڵیانداوەو هەرچۆن بووە مێردەکەی دەستی لێ هەڵگرتووە، بۆ ئەوەی ئەو ئافرەتە نەمرێ لە خەفەتان! ! فەلسەفەکەی هەموو ئەوەیە، بەڕاستی زۆر لەو ڕۆمانانە کە دەمخوێندنەوە، تەماشام دەکرد، بەهای زۆر

نـزمیان تێدایه، یانی تـەرویج دەکەن بۆ بەهای نزم، دوایی کە بیرم لیٚ دەکردەوە، گۆزە چـی تـێدا بێت هەر ئەوەی لێدەڕژێت، دیارە سەرزبڵدانیش هەرشتی وای لیٚ دەڕوێت کە شایسـتـەی خـۆی بـێت، ئـەو ڕۆمانانـەی ئەوروپیـیـەکانو ڕۆژئاوایـیـەکانو غەیـری موسڵمانان، بەڕاستی هەستم نەدەکرد کـە ئینسـان هەڵدەنـێن بـۆ بـەهای بـەرز، یەك دوویەکـیان نەبێت دیفـاع لـە مەزڵـومو وەسـتانە لـە دژی زوڵـم، یـان وەفـا بـە عەهـدو پـەیمانو ئەوانەم تێدا بینین، کە یەکیٚ لەوانە هی ولیەم شکسپیر بوو، ئەگەرنا، بەزۆری هەسـتم دەکرد کـە لایەنـی جنسـی، بەرەڵڵایـی ئەخلاقـی، ئەوانـە زۆر بەشـتـی ئاسـایی وەردەگرن، پاساویشی بۆ دەهێننەوە.

**+ کتێبـی (وعـاض السـلاطین)ت خوێـندەوە، لـە نووسـینی دکـتۆر عـەلی وەردی، ئەو کتێبەش یـەك دووجار لە کوردستاندا کراوەتە کوردی، ئەگەر بە چەند دێڕێکیش بێت، سەرنجت لەسەر ئەو کتێبە دەربڕە.**

- عـەلی وەردی پیاوێکـی کۆمەڵناسـە، پێموایە بۆچوونی وردو باشی هەن دەربارەی کۆمەڵناسـی، بەڵام بە داخەوە لە ئیسلام تێنەگەیشتووە، لە ئیسلام باش حاڵی نەبووە، ئەگـەرنا، هەرچـەندە شیعەشە، هەستم نەکرد شیعەگەرایی پێوە دیاربێت، چونکە زیاتر سـەروگوێلاکی شـیعە دەکوتـێت، لـە کتێبـی (وعـاض السـلاطین)دا زۆر دیفـاع لـە هەڵوێستەکانی پێشـەوا عومەر دەکـات (خـوای لـیٚ ڕازی بـێت)، بـە پیاوێکـی بلیمەتو خەلیفەیەکـی دادگـەر و چـاکی دەزانـێت، هەنـدێك ڕەخـنەش ئاڕاسـتەی پێشـەوا عـەلی دەکـات (خـوای لـیٚ ڕازی بـێت)، کـە پـێم بێئینسـافییە، بـەڵام مەبەسـتم ئەوەیـە شیعەگەرایەتیم پـێوە نەبینی، بەڵام پێدەچێت قوڵ نەبووبێتەوە لە ئیسلامدا، بەڕاستی واپێدەچێت لە ڕووی کۆمەڵناسیو دەروونناسییو ئەوانەوە شارەزایی هەبێت.




# تەوەرەی هەشتەم:
# هەڵوێستە لە بیرنەچووەکانی نێو زیندان

**٢٠٠٥/٧/١٠**

**ستۆدیۆی کەناڵی هەولێری تەلەفزیۆنی کۆمەڵ**

**+ ئێمە لێرەدا دەچینە سەر تەوەرەیەکی تر، ئەویش تەوەرەی بەسەرهاتو هەڵوێستە لەبیرنەچووەکانی نێو زیندانە، بەتایبەت هەڵوێستە ئیمانیو روحییەکانو بەسەرهاتەکانیش لەگەڵ هاوزیندانییانی خۆت. پرسیاری یەکەممان ئەوەیە: لەم زنجیرە گفتوگۆیەداو لە میانەی وەڵامەکانتاندا بۆ پرسیارەکانی ئێمە، ئاماژەتان بە هەندێك لە ڕەحمو هاوکاریی خودایی کرد بۆ خۆتان، بەتایبەت لە کاتی ئەشکەنجەو کاتە ناڕەحەتەکاندا، دەکرێ بە تەواوی بزانین ئەو هاوکارییە خواییانە چیبوون کە بۆ ئێوە دەهاتنو هەستتان پێدەکردن؟ لە چ کاتێکیشدا دەبوون بە شێوەیەکی تایبەت؟**

- ئەوە دیارە ناگونجێ باس بکرێت، ڕەنگە هەندێك شت زۆر تایبەت بن، بەڵام ئەوەی بگونجێت باسبکرێت، ئەوا باسی دەکەم.

**یەکەم لەوانە:** ئەو حاڵەتی ئۆخژنو دڵئارامیو سەکینەیە بوو کە هەستم پێدەکرد لە هەموو حاڵەتەکاندا، لەو کاتەدا کە زۆر ناڕەحەت دەبووم، وام تەصەور دەکرد لەسەر کەناری مەرگم، یان مەرگم زۆر پێ ئاسانتر بوو لەو ناڕەحەتیو شتەی کە دەمبینی، بەڵام هەستم دەکرد لە ڕووی دەروونییەوە مورتاحم، بەدەنم ناڕەحەتە، بەڵام لە ڕووی دەروونییەوە دڵم ئارامە، ئەو حاڵەتی سەکینەت و ئارامییە، زۆر بە فەزڵو لوتفێکی گەورەی خواییم دەزانی.

**دووەم:** لە ژێر ئەشکەنجەشدا خوای پەروەردگار یارمەتی دابووم هەر قورئانم دەخوێند، زیکری خوای پەروەردگارم دەکرد، دڵم هەر پەیوەستبوو، ئێستەش لەیادمە کە شەش جوزئم لەسەرەتای قورئانەوە تا کۆتایی سورەتی (المائدة) لە ژێر ئەشکەنجەدا خوێند، ئێستاش تامو چێژی هەندێك لەو ئایەتانەم هەر لەبنی زماندایە، کە لە کاتی ناڕەحەتیدا ئەو ئایەتانەم خوێندووە، بۆ وێنە" یەکێ لەو ئایەتانە: (أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاء وَالضَّرَّاء وَزُلْزِلُواْ حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللّهِ أَلا إِنَّ نَصْرَ اللّهِ قَرِيبٌ) (البقرة: ٢١٤)، کە دەمخوێندەوە لەو حاڵەتەی من تێیدابووم، زۆر لەزەتێکی عەجیبم دەکرد، زۆر ڕەهەندی دیکە لە دڵو مێشکمدا بۆ ئەو ئایەتە دەهاتنە زەینم. هەروەها یەکێکی تر لەو ئایەتانە، ئەو ئایەتەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێت: (لَتُبْلَوُنَّ فِي

أَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ أَذًى كَثِيراً وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الأُمُورِ) (آل عمران: ١٨٦). ئیدی ئەوان لە کاتی ئەزیەتدا قسەی ناشیرینیشیان پێدەوتم، کە ئەو ئایەتەم دەخوێند: (وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ). (وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ أَذًى كَثِيراً وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الأُمُورِ). منیش وتم خوایە عەزیمەتم دەوێت، خۆڕاگرییم دەوێت، هەروەها لە شێوەی ئەو ئایەتانەی کە موناسەبەتیان هەبوو لەگەڵ حاڵەتە دەروونیو بەدەنییەکەی من، زۆر کاریان تێدەکردم.

یەکێکی دیکە لەو فەزڵو لوتفانەی خوای پەروەردگار ئەوەیە کە من دووجار سەکینەتو حاڵەتێکی روحیم بە سەردا هات کە لە ژیانمدا شتی وام نەدیبوو، شتی وەهام بۆ نەهاتبووە پێش، بەڕاستی ناتوانم بە قسە تەعبیری لێ بکەم، من لە حاڵەتی زۆر ناڕەحەتیدا بووم، لەناکاو وەك زۆر زۆر گەرمات بێتو کوپەیەك ئاوی ساردت پێدا کەن، هەرچی ئازارو ماندوێتیو ناڕەحەتییە لە بەدەنمدا نەما، جاری یەکەمیان ئاوا پێم حاڵەتێکی سەیر بوو. زۆر سوپاسی خوام کردو زۆر دڵم خۆشبوو، بەدەنم خۆشبوو، وەکو نەبام دیبێو نەباران. بۆ جاری دووەم زۆر زۆر ناڕەحەتبووم، هەر دوعام دەکرد یان لە هۆش خۆم بچم، هەر بە حەققەت هەندێك جار دوعام دەکرد کە خوایە روحم بکێشی زۆر ناڕەحەتبوومو ئەوانە، چونکە دەکەوتمو هەڵیان دەساندمەوە، ئیدی ناڕەحەتبووم، وەك بڵێی لە تەحەمولمدا نەمابوو، هەر ئەوەندەم زانی ئاوا چاوم لێکنا، وامدەزانی لە هۆشی خۆم دەچم، چونکە من لە ژیانمدا لە هۆش خۆم نەچووم، بەس زۆر پێمخۆشبوو لە هۆش خۆم بچم، کە ئاگام لە ئازارو شتەکەی نەمێنێ، چونکە مرۆڤ هەر چۆنێ بێ توانای دیاریکراوە. چاوم لێکناو وتم: ئێستا لە هۆش خۆم دەچمو ڕەنگە بکەومە خوارێ، دەکەوتمو بە ڕیش هەڵیان دەساندمەوە، بە چاڵی چاو هەڵیان دەساندمەوە، بە گوێ هەڵیان دەساندمەوە، بە گوێ زۆر قەڵس بووم، ئاوا هەڵیان دەساندمەوە بۆ ئەوەی ئازارم بگاتێو بە ناچاری هەڵبسمەوە، زۆر ناڕەحەتبووم، چاوم لێکناو وتم ڕەنگە لە هۆش خۆم بچم، هەر ئەوەندەم زانی ئەو حاڵەتی سەکینەتەم بۆ هاتە پێش، وەکو شتێ لە ئاسمانەوە هاتبێتە سەر لاشەو روحو عەقڵو زەینم، دەردو

بەڵام لێنەما، نوێ بوومەوە، دڵم خۆشبوو بەدەنم خۆش، لە ژیانمدا تەنها ئەو دووجارە ئەوەم بینیبوو.

جارێکیش زۆر دڵم توندبوو، دڵم زۆر ناڕەحەتبوو، دوعامکرد، لە خەونمدا دوو مەلائیکە هاتن و هێندێ قسەیان پێکەوە کرد، وەك بڵێی یەك سەتڵ نووریان پێدا کردم، لە حاڵەتێکی دڵ ناڕەحەتیدا بووم، یەك سەتڵ نووریان پێداکردم، وەك بڵێی تەڵقینیان کرد کە ئەو ئایەتەش بخوێنمەوە: (لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِن شَاء اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُؤُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَلِكَ فَتْحاً قَرِيباً) (الفتح : ٢٧ ). ئەمن خەوێکم بینیبوو لێی کەوتبوومە گومان، ئەو دوو مەلائیکە بڵێی نەمبینین، بەس تارمایی و شتەکەیانم بینی، زانیم مەلائیکەن ئەوەیان بە سەردا کردم، دوایی بەدەم خوێندنی ئایەتەکەوە خەبەرم بووەوە، وتم کەواتە ئەو خەونەی دیومە، دێتە دی، لەڕاستیدا هاتە دیش.

خەوی دیکەشم دەبینی بە ماڵەوە، یان بە هاوزیندانییەکانەوە، ئەگەر یەکێکیان نوێژی نەکردبا، ئەو بەیانییە دەهاتە خەونم و دەیان وت: "فلان کەس نوێژی نەکردووە"، یان ئەگەر ڕەشەباو گەردەلوولێك سبەینێ هەڵی کردبا، یان دووسبەی هەڵیکردبا، پێشتر پیشانیان دەدام، یان مەحکەمەکردنەکەم، پێش ئەوەی دادگاییم بکەن، لە خەومدا پێشانیاندام، کە ئەو دادگاییە دەبێت، هەروەها زۆرشتی دیکە پێشتر بە خەون پیشانیان دەدام، کە ئەوە دەبێ، یان جاری واهەبوو دەخرایە دڵمەوە کە ئەو شتە دەبێت، فیعلەن بەوشێوەیە دەبوو، ئەوە بەشێك لەوانەی بگونجێت باسی بکەین.

**+ هەست دەکەیت جیا لە هەموو کاتەکانی تر، لە قۆناغی زیندان زیاتر نزاو پاڕانەوەت گیرا بووبێت؟**

ـ بەڵێ، من بەشێکی زۆریشم لە کاتەکان، بەتایبەتی لە سەرەتاوە تەرخان دەکرد بۆ دوعا، دیارە مرۆڤ لە سەرەتاوە دوعا بۆ خۆی دەکا، چونکە تۆ خۆت دەبێت لە هەموو کەس بە گوناهبارتر بزانیت، ئینجا دوعام بۆ دایك و بابم دەکرد، ئینجا بۆ ماڵ و خێزان، ئینجا بۆ دۆست و خزمان، ئینجا دەهاتە سەر کۆمەڵی ئیسلامیی، بەتایبەت بۆ سەرکردایەتی دوعام دەکرد: خوایە من ئێستا لەوێ نیم، دەبێ چییان لێهاتبێ؟ دەبێ

چۆنبن؟ تەسدیدیانکەیت، هیدایەتیان بدەیت، لە نێو خۆدا تەبابن، ڕێکبن، پێکەوە باشبن، دڵی خەڵکیان بۆ نەرم کەیت، کە هاوکارییان بکەن. ئیدی چ دوعای چاك، چ دوعای چاکە بۆیان، خوایە بیانپارێزیت لە هەڵە، بیانپارێزیت لە گوناه، بیانپارێزیت لە عەیبداری. پاشان دوعام دەکرد بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان بەتایبەت، ئەوجا بۆ موسڵمانانی کوردستان بەگشتی، ئەوجا موسڵمانانی عیراق، ئەوجا فراوانم دەکرد بۆ هەموو ئیسلامییەکان، ئەوجا بۆ هەموو موسڵمانان، یانی بە دەست خۆشم نەبوو، خوای پەروەردگار هەندێك شتی دەخستە دڵم کە بەو شێوەیە ئەو دوعایانە بکەم، ڕەنگە هێندێ شتیشم پێوترابێت، وام هەست دەکرد کە ئەو دوعایانە قبوڵ دەبوون، ڕەد نەدەبوونەوە، جا هەر دوعایەکیش بە شێوەی خۆیو لە کاتی خۆیدا قبوڵ دەبوو.

**+ بەڵێ، ئەو بەسەرهاتانە چین بە خۆشیو ناخۆشیانەوە، کە لە زیندان تووشیان بوون؟ لەگەڵ ئەمریکییەکاندا، لەگەڵ سەرکردەکانی بەعسدا، لەگەڵ خودی خۆتدا؟**

ـ لەگەڵ ئەمریکییەکان“ سێجار عقوبەیان دام، زۆر لەسەر دڵم قورسبوو، جارێکیان لەسەر سەلامکردن بوو، سەلامم کرد لە کۆمەڵێك، پاسەوانێك وتی بچۆوە ژووری لەبەر ئەوەی سەلامت کردووە، ئێ وتم ڕەفیقەکەی خۆت وتی: سەلام قەیناکات، وتی: من دەڵێم قەیدەکات، بچۆوە ژووری. هاتنەدەرەوە نیو سەعاتبوو، لەوەشیان مەحروم کردم، ئەوە زۆرم پێناخۆشبوو.

جارێکی تر، لەبەر ئەوەی بردیانینە سەرئاوێ، پاسەوانەکە وتی: "دەست بشۆ، بەلام نابێ دەمو چاوتان بشۆن". وتم: ئاخر من نوێژ دەکەم، وتی: "من دەڵێم نابێت دەموچاو بشۆن، ئەوی دەموچاو بشوات، نایەڵم بچێتە وەرزش"، وتم وەڵڵا بچمو نەچم دەستنوێژەکەم هەر هەڵدەگرم، من دەستنوێژی خۆمم گرتو ئەویش وتی: جارێکی دیکە نەیەیتە دەرەوە بۆ وەرزش، ئەوجارەش عقوبەیان دام.

جارێکی کەش کە وەرزشم دەکرد، زۆر بەخێرایی دەڕۆشتم، کێبەرکێم لەگەڵ ڕەفیقەکانم دەکرد، دەمگوت: خۆمان گورجو گۆڵ بکەین، جارێك تۆزێك تێپەڕیم لە شۆستەکە، پاسەوانەکە وتی: "بچۆوە ژووری"، وتم بۆ؟ وتی: "بۆ واخێرا دەڕۆیت، خۆت ئازا پیشان دەدەی؟" وتم: ئازا نییە، بۆ خۆشتان نالێن ئەگەر ڕاشبکەن

قەیناکات؟ وتی: "نا، دەبێ بچییەوە ژووریٚ!"، چوومەوە ژووریٚ، وتم با وانەزانیٚ زۆر منەتم پێیەتی، کورسییەکیان دابوو پێم، لە ژوورێدا لەسەر کورسییەکە دانیشتم، دەرگەکەم کردەوە ویستم دەست بکەم بە قورئان خوێندن. ئەو وتی: "نابێت دەرگەکەش کراوە بێت"، دەرگەکەشی داخست. چوومە بەرپەنجەرەکە، وتی: "دەبێت پەنجەرەکەش داخەم"، ئەویشی داخست، ئیدی ژوورەکەم تاریك داهات، قورئانەکەم داناو هەروا لەبەر خوێندم.

ئەوە ئەو سێ هەڵوێستە کە پێچەوانەی یاساکانی خۆشیانبوو، تەصەورێکی میزاجی شەخسییانبوو، چونکە مرۆڤی قینلەدڵیان تێدابوو، زیندانییەکان دەیانگوت کە ئەوەی زۆر قینلەدڵ بێ، ئەوە جوولەکەیە. جا نازانم ئەوە جوولەکە بوو، چ بوو؟

جارێکی تر لەگەڵ موحەقیقێك بووم، کە زۆر لەسەر دڵم قورسە، ڕەنگە دە جار وتبێتی "أنت کذاب" منیش زۆر پێم ناخۆشبوو، ئەمریکی بوو عەرەبی دەزانی، عەرەبییەکی شڕی دەزانی، بەشی جنێودانی دەزانی! وتم: لێرە نەبێ، لە ژیانمدا پێم نەوتراوە درۆزنی. وتی: "ئا!"، وتم: بەڵێ، وتم بچۆ بپرسە، دوو سێ نەفەرم بۆ هەڵدا. وتم: بچۆ پرسی ئەوان بکە کە لەگەڵتان هاوپەیمانن، بزانە بە حەیاتی کەس لە کوردستان بەمنی وتووە درۆزن؟! چونکە درۆم لەگەڵ کەس نەکردووە، ئەسڵەن من باجی ڕاستبێژییە دەیدەم، باجی ئەوە کە درۆم نەکردووە، هەرنازانم درۆ بکەم. کابرا تۆزێك سڵەمییەوەو وتی: "یانی بەڕاستی؟"، وتم: بەڕاست، وتم: بچۆ لە هەموو خەڵك بپرسە، من ئەسیرم، ئەتۆ دەتوانی عەزیەتیشم بدەی، بەڵام ئەگەر ڕێزم بگریت، ڕێز لە خۆت دەگریت، ئەگەر بەرانبەرم بێڕێز بی، بەرانبەر بە خۆت بێڕێزیت. وتی: "ئەتۆ قسەت زۆر گەورەیە"، منیش لێم کرد بە سوعبەت، وتم: پیاوی گەورە قسەشی گەورەیە، وتی: "نا، ئاخر ئەتۆ چۆن؟"، وتم: بەڵێ، من پێت دەڵێم کە کەس بەمنی نەوتووە درۆ دەکەی. ئەوە زیاد لە دە جار کابرا هەر دەیوت "کذاب، کذاب"، درۆ دەکەیت، زۆر پێم ناخۆشبوو، هەر زیاتر وەك فشارێکی دەروونی بوو.

ڕۆژێك دڵم زۆر نارەحەت بوو، یەکەم جارمبوو لەگەڵ بەعسییەکان تێك بگیرێم، ئەوان هەموو یەك ڕەئی بوون، ئەمنیش لەوەتەری حەساسیانم دا، وتم: ئێوە تا ئێستا بتپەرستبوون، ئیدی هەموویان یەك بۆچوون بوون، وتیان: "شێخ، ئێمە ڕێزی تۆ

دەگرین، ئەگەرنا، لێت قبوڵ ناکەین"، وتم قبوڵی دەکەن یان قبوڵی ناکەن، زۆر مەمنوونیش نەبن لەگەڵتان دانانیشم، لەگەڵیشتان دابنیشم، چی بەڕاستی دەزانم پێتانی دەڵێم، ئەوجارەش تۆزێك دڵم توندبوو، لەبەر ئەوەی ئەوان هەموو یەك ڕەئی بوون، وتیان: "بەڕاستی تۆ، هەستی ئێمە ناپارێزی، چۆن ئێمە بتپەرست بووین؟ ئێمە موسڵمانین، خەڵك لە عەرەبەوە فێری موسڵمانێتی بووە"، وتم: ڕاستە، بەڵام ئێوەش پێش هەموو کەس وازتان لێهێناوە، عەرەبی بەعسی. ئیدی ئاوا تێك گیراین، تۆزێك دەمەقاڵێ و شەڕە قسەمانبوو. وتم: وادەزانن هەرچی بە عەرەبی قسە بکات، لەو سەری هاتووەتەوە، لە تێگەیشتنی ئیسلام؟ جا خۆ عەرەبییەکەشتان تەواو نییە، ئاوا تۆزێك دەمەقاڵێمان بوو، لە ڕاستیدا ئەوانیش هاتن وتیان: "گەردنمان ئازادکە، خۆ تۆش هێرشت کردە سەر ئێمە، بەڵام دەزانین لە ڕووی دڵسۆزییەوەیە، جا تۆ واتەصەور نەکەیت کە لێرە غەریبی و تەنیایت"، وتم: نەوەڵڵا، بۆ بە تەنیام، لەخزمەت خوادام، لە خزمەت مەلائیکەدام. وتم: ئەگەر زۆر مەمنوون بن، ئامۆژگاریتان دەکەم، زۆر مەمنوونیش نەبن، لەگەڵتان دانانیشم، من خۆم بە غەریب نازانم، وتیان: "ئاخر وا تەصەور نەکەی ئێمە هەموو عەرەبین، بە خوا ئێمە لە خزمەتداین، بەڵام تۆش تۆزێك لەگەڵمان نەرمبە، تا تۆزێك تێمان دەگەیەنی، ئەو شتانەی تۆ دەیڵێی، ئەمە یەکەمجارە دەیبیستین، بەڕاستی کەس پێی نەوتووین کە بتپەرستین، کەس ئەوانەی پێ نەوتووین، کە بەعسیایەتی دینە، ئێستا تۆ هاتوویت، ئەتۆش بە پەلەو بە یەکجار بتەوێت هەموو شتمان پێ بڵێیت"، وتم: نا، خۆ من هەموو شتێکتان پێناڵێم، بەڵام ئێوەش پێویستە گوێم بۆ بگرن، قسەکانی من لەگەڵتان لە ڕووی کوردایەتی و عەرەبایەتییەوە نییە، بەڵکو بەزەییم پێتاندا دێ، ئێوە دوژمنایەتیی میللەتی ئێمەتان کردووە، دوژمنایەتیی میللەتی عیراقتان کردووە، ئێستا سەرتان بە ئێرە گەیشتووە، لێرەش دەستی لێ هەڵناگرن؟! دەست لەو شتانە هەڵبگرن، وەرنەوە سەر خەتی ئیسلام و خەتی پێغەمبەر ﷺ، ئاوا ئیدی دوایی وردە وردە شتەکەمان چاك کردەوە. ئەوجارەش کە چوومەوە ژوورەکەی خۆم، دڵم تەنگ بوو.

**+ ئەی بەسەرهاتە خۆشەکان کامانەن؟**

ـ ئەوکاتانـەم زۆر خۆشـبوون کە لەگەڵ موحەقیقە ئەمریکییەکان یان بەریتانییەکان دادەنیشـتمو دوای ئـەوەی ئەوان پرسیاریان دەکرد، دەکەوتینە وتووێژەوە، لە ئاخیری مەتافـدا زۆرجـار وابـوو دەیانـوت: "ئەو ئیسلامەی کە تۆ دەیڵێی، ئێمە هیچ تێبینیمان لەسـەری نیـیە، خـۆزگە ئیسـلامییەکان هەمـوو ئـاوا بیریـان کـردبایەوە". ئـەوەم پـێ خۆشـبوو، یان هەبوو دەیگوت: "خۆزگە عەرەبیم چاك زانیبایە، بۆ ئەوەی ئەو ئیسلامە جوانە ئەتـۆ چـاکتر لـە منت تێگەیاندبایە، یان تۆ ئینگلیزیت باش زانیبایە". دیارە ئەو حاڵەتانە و ئەو ساتەوەختانە ساتەوەختی خۆشبوون.

لەگـەڵ سـەرانی ڕژێمیش، بەڕاسـتی زۆرم پـێ خۆشـبوو، کە هاتمەوە نیوەیان، یان ژمارەیەکـی زۆریـان دەگریان، یـان دڵیان پڕبوو بوو، پێیان ناخۆشبوو، پێیان خۆشبوو کـە هاتوومەوە، بەڵام پێیان ناخۆشبوو کە ئەوێم بەجێ هێشتووە. ئەوەشم پێخۆشبوو، کـە شـوێنەوارێکی چـاکم لـە نێودا جێ هێشتبوون. هەشبوو هیوای هەر نەبوو نەجاتی بێت، هەبوو دەهاتە لای منو دەیگوت: "تۆ بە شاهیدم بە بۆ قیامەتێ، لەسەر دەستی تـۆ مـن ئـەو ئیسلامەتییەی کە تۆ دەیڵێی قەبوڵی دەکەم، منیش عەقیدەم وایە، بەپێی تـواناش وادەکـەم، ناشـزانم یـەکتر دەبینینـەوە یان نا، بەڵام شاهیدم بە بۆ قیامەت من تائێستا وا تێگەیشتووم..". ئەو ساتەوەختانە خۆشبوون بۆ من.

**+ تا چەندێك ژیاننامەی زانایانـی موسڵمانی پێش خۆت، هەر لە زانایانی سـەردەمی پێشـینەوە تـا بـەر لـە ئێسـتا، بـە تایـبەت ئەوانـەیان کـە دووچـاری زیندانـیو ڕاپێچـکردنو ئەشـکەنجەبوون، کاریگـەریـیان لەسـەرت هەبـووە لـەو زیندانەدا؟**

ـ بە تەئکید بیرم لە زۆریان دەکردەوە، بە تایبەت (یوسف) (علیه السلام)، لام وابێ یەکـەمین پێغەمـبەرە زیندانیـی کرابێ، زۆرم بـیر لـێ دەکردەوە، هـەروەها لـە گـەورە پیاوانـی وەکـو ئیبـنو تەیمیـیە، کـە زۆربـەی ژیانی لە زیندانـدا بردووەتە سەر. مامۆستا سـەعید نەورەسـی، ئەبـو لـئەعلای مـەودودی، سـەیید قوتب (ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێت)و باقـی ئەوانـەی زانـای بەرجەستەنو زۆریان لە زینداندا کتێبە گەورەکانی خۆیان نووسـیوە، گۆڕانـی گـەورەیان لـە زینـداندا بـە سەر هاتووە. ئەوانە زۆر بیرم لە ژیانیان دەکردەوە، بیرم لە هەڵوێستەکانیان دەکردەوە.

**+ مامۆستا عەلی باپیر، بە درێژایی ساڵێك بەر لە ئازادبوونتان، پڕوپاگەندەی ئەوە دەكراو جارە جارە بڵاو دەبوویەوە كە ئازاد دەكرێن‌و بەرپرسە ئەمریكییەكانیش ناوبەناو دەیانوت كە هیچتان لەسەر نییە. هۆی درەنگ ئازادبوونتان بۆچی دەگێڕیتەوە؟**

- بسم الله الرحمن الرحيم، ئەمریكییەكان پاش تێپەڕبوونی (٦ - ٧) مانگ بەسەر زیندانیكردنی مندا، هەروەها تەواوكردنی تەحقیقاتیان لەگەڵ من، خۆیان هاتن‌و گوتیان: "ئێمە بۆمان دەركەوتووە كە تۆ هیچ شتێكت لەسەر نییە، داوای لێبوردنمان هەیە". من لێم پرسین ئەی هۆی هێڵرانەوەم چییە؟ گوتیان: "سەرەوەمان دەیزانێت"، گوتم ئاخر كە سەرەوەتان دەیزانن، ئەی ئێوە لەچیدا دەیبیننەوە؟ گوتیان: "بەرژەوەندیی ئەمریكاو بەرژەوەندیی ئەمنی قەومیی ئەمریكا واپێویست دەكات تۆ لێرە بمێنیتەوە، هەرچەندە هیچ شتێكت لەسەر نییە، بەڵام قازانجمان وایە".

كەواتە وادیارە ئەمریكییەكان مەترسییان هەبووەو پێیان وابووە كە ئەگەر من لەوێ بهێڵدرێمەوە بە زیندانیی، ئەو مەترسییە، یاخود بەشێك لەو مەترسییەیان كە لە بارەی منەوە هەیانبووە، دەڕەوێتەوە، ئەگەرنا، هیچ هۆیەكی تر شك نابەم.

**+ پێمان خۆشە كەمێك لەسەر كاتی ئازادبوونت بدوێی، هەرچەندە پێشتر لە میانەی چەند پرسیارو وەڵامێكدا ئاماژەت بە كاتی بەربوونەكەت كردووە، بەڵام دەمانەوێ بزانین نزیكبوونەوەی ئازادبوونتان چۆن بووە؟**

- واتە ئەو ڕۆژەی پێش ئازادبوون‌و ڕۆژی ئازادبوونم؟

**+ بەڵێ.**

- پێشتریش باسمكرد، من وشەی ڕزگاربوون، دەربازبوون بەكاردێنم نەك ئازادبوون، چونكە ئازادی پێچەوانەكەی بریتییە لە كۆیلایەتی، لە ڕاستیدا من هیچ كاتێك خۆم بە كۆیلە نەزانیوە، بەڵێ بێدەسەڵات بووم، دیل بووم، بەڵام هەر ئازاد بووم‌و لەوێش خۆم بە ئازاد زانیوە.

ڕۆژی چوارشـەممە ٢٠٠٥/٤/٢٧، بەڕێوەبەری گەنجینەی زیندان لە دەرگای داو هاتە ژوور، مـن نەمزانـی بۆچـی هاتـووە، چـەند قسەیەکی بەئینگلیزی کردو تێگەیشتم وتی: "تـۆ سـەفەرت هەیـەو کەلـوپەلەکانت بپێچـەرەوە"، هەنـدێ کەلوپەلیشم لە گەنجینەی زیـندان بـوون بـۆی هێـنابوومەوە، منیش باش لێی تێنەگەیشتم کە سەفەری چیم هەیە، وتم: ئەگـەر مۆڵەت بـدەی، یـەکێ لـە هاوزیندانییەکانم ئینگلـیزی بـاش دەزانێ، با ئەو بـانگ کـەم، تـا بزانم داخوا تۆ چیت دەوێ. وتـی: "باشە"، هاوزیندانییەکەم هاتو وتم: دەڵـێ سـەفەرت هەیـە، بـەڵام تێـناگەم سـەفەری کوێم هەیە؟ دیاربوو کە ئەمریکییەکە بۆی باسـکرد، ئـەو برادەرە منـی زۆر خـۆش دەویست، (الله أکبر)ێکی کرد. وتم: ئەوە چییە؟ زۆر بـە خۆشـحاڵییەوە وتـی: "شـێخ، ئـەوە تۆ ڕزگارت دەبێ‌و دەچییەوە ماڵ، سـەفەری ماڵت هەیە". بەڕاستی من زۆر بەسەر خۆمم نەهێنا، وتی: "ئەی چییە؟ ئەوە چۆنە زۆر دڵخۆش نابی؟"، چونکە خۆم تێك نەدا، بەڕاستی ئەوکاتە پێم شتێکی زۆر گـرنگ نەبوو، ڕەنگـە پێشـتر کاتـی وابووبێ زۆر پـێم خۆشبووبێ دەرباز بم، بەڵام لەو سـاتەدا زۆر بەلامـەوە گـرنگ نەبوو، دیارە من کەوتمە خۆ کۆکردنەوەو وتم: باشە، ئەی خۆ من بەرگی کوردیم پێبوو، قاتە کوردییەکەم بۆ بێننەوە. وتـی: "دیار نییە"، وتم: با لاتانـە لـە مەخـزەن، وتـی: "ئـەو بەرگـە لەبـەر کـە"، وتم: خـۆ مـن کـوردم، دزداشـەی عەرەبـی لەبـەر ناکـەم‌و قاتێکی کوردیم پێبوو، بـە هـەرحاڵ چوو گـەڕا، قاتەکەی بۆ هێـنام‌و وتم: سـەعات چـەند؟ وتـی: "ســـەعات (١,٣٠) دەڕۆی"، سـەعات (١,٣٠) بانگیان کـردم بـۆ ئیدارەی زیـندان، ئەوەبـوو کـە دانیشـتم، وتـیان: "خۆشـحاڵین کـە جـەنابت ڕزگـارت دەبـێ‌و دەچییەوە مـاڵ"، وتم: سوپاسـتان دەکـەم، خۆم پێچایەوەو هاوزیندانیـیەکان بانگیان دەکرد: "شێخ! ئەوە چییە بەرگی کوردیت لەبەر کردووە؟"، چـونکە بەرگـە کوردییـەکەیان لـێ وەرگـرتبوومەوەو لـە مەخـزەن دایـان نابـوو، هـەر بەرگێکت پێبوایە، مۆری (CI)یان لێدەدا، بۆ ئەوەی مۆر لە جلە کوردییەکان نەدەن، وتم: بۆم لـە مەخـزەن هەڵگرن، بـە هاوزیندانییەکانم وت: دەڵێن سەفەرت هەیە، بەڵام نـازانم داخـوا ڕاسـت دەبـێ یـان درۆ؟ دوایـی ئەوەبـوو لـە ئیدارەی زیـندان چـەند وەرەقەیەکـیان لـە پـێش دانـام، وتـیان: "ئـەوە بخوێـنەرەوەو ئیمـزای کـەو یەکسـەر دەکەویـتە ڕێ"، خوێـندمەوە، تەماشـا دەکـەم کـۆمەڵێ مەرجـی تـێدایەو بـۆ کەسـێك

دانراوه کە دەبێ بەعسی بوویێو واز لە بەعسیایەتی بێنێو بڕیار بدات جارێکی تر نەبێتەوە بە بەعسی، پاشان بەڵێن دەدا کە هاوکاری بکاو چی بکا، منیش هەر بە ئەسپایی وەرەقەکانم خستەوە پێش خۆی، وتم: هەڵیگرە، ئەمریکییەکە وتی: "ئاخر دەبێ ئیمزای کەیت"، وتم: ئەوە ئیمزا ناکەم، وتی: "بۆچی ئیمزای ناکەی؟"، وتم: لەبەر ئەوەی کۆمەڵێ مەرجی تێدایە، من چاوەڕێم دەکرد عوزرم بۆ بێننەوە، ئێستا مەرجم لەسەر دادەنێن، من ئەوە ئیمزا ناکەم. وتی: "ئاخر دەبێ بچیەوە ژوورەکەی خۆت"، وتم: هەر ئێستا دەچمەوە، جامسودەکەم لەبەر دەکەمەوە، جامسود واتە بەدلەی زەرد، وەکو ئەوەی گوانتانامۆ، زۆری پێ سەیر بوو، وتی: "تۆ چەندە لێرەیت؟" وتم: نزیکەی بیستو دوو مانگە، وتی: "لە ژووری تاکیدایت؟" وتم: بەڵێ، زۆری پێ سەیربوو وتی: "جا زۆر بێزار نەبوویت؟" وتم: بێزار بووم، بەڵام ئەو عەیبدارییەم پێ گەورەترە لەو بێزارییەو ناتوانم ئەوە ئیمزا بکەم.

بەهەرحاڵ، ئەوە مشتومڕێك بوو، دوای ئەوە لەگەڵ سەرەوەی خۆی قسەی کرد، وتی: "بەڕاستی ئەو هەڵوێستەی تۆ، بۆ من زۆر هەڵوێستێکی جوامێرانەیە، گەر دەسەڵاتم بوایەو بە دەست من بوایە، یەکسەر دەموت مەرجەکان ئیمزا مەکەو بڕۆ، بەڵام جەنەراڵێك هەیە، بەرپرسی منەو ناتوانم"، تەلەفۆنی کرد، ئەوجا کۆلۆنێلەکە هات، ئەویش زۆر پێی سەیر بوو، وتی: "بۆچی ئیمزای ناکەیت؟"، هۆیەکانم بۆ باس کرد، دوایی ئەویش وتی: "من لەگەڵ سەرەوەی خۆم قسە دەکەم کە جەنەراڵێکە"، منیش ئەو قسەیەی خۆمم پێگوت، وتی: "فەرمانی جەنەراڵەو هیچم لەدەست نایەت"، وتم: جا ئەگەر تۆ بە بێ فەرمانی جەنەراڵ ناتوانی هیچ کەیت؟ منیش بە بێ فەرمانی خوای پەروەردگار ناتوانم هیچ بکەم، وتی: "جا ئەمە خوا پێی ناخۆشە ئیمزای بکەیت؟"، وتم: بەڵێ، وتی: "بۆچی؟"، وتم: چونکە پێچەوانەی عەقیدەمە، دەبێ من ئیمزای کەم کە هاوکارییتان دەکەم، من ئەوە ئیمزا ناکەم، ئینجا ئەگەر ئیمزای کەم کە نابمەوە بە بەعسی، ئەوا من قەت بەعسی نەبووم. ئەسڵەن ئەوە هیچی پەیوەندی بە منەوە نییە، ئەوجا من چاوەڕێ دەکەم عوزرم بۆ بهێننەوە، ئێستا مەرجتان بۆ ئیمزا کەم؟! ئیمزای ناکەم.

ئیدی یەك دوو سەعاتێك لەوێ مامەوە، دوایی منیان نەقڵ کرد، بوو بە تەلەفۆن و تەلەفۆنکاری لەگەڵ کاك پوشوو ئیبراهیم دزەیی جێگری وەزیری داد، پاشان یەك دوو برای خۆمان تەلەفۆنیان کرد، کاك نەجات سورچی لە سلێمانییەوە تەلەفۆنی کرد، کاك پوشوو وتی: "مامۆستا، من ئەوە ئیشی خۆمەو تۆ موکرەهی هەرشتێ ئیمزاکەیت، هیچی لەسەر تەرەتوب ناکرێت و شتێکی ڕۆتینیاتەو ڕووکەشییە"، وتم: وەڵڵا دەزانم من موکرەهم و هیچی لەسەر تەرەتوب ناکەن، نە قانونیو نە شەرعی، بەڵام هەرپێم عەیبەو ئیش بە ڕوخسەت ناکەم، ئیش بە عەزیمەت دەکەم.

پاشان بردیانم بۆ شوێنێك، وتیان ئەوە وەکو فشاری دەروونی نییە، وەکو عەرەب دەڵێت: (یکاد المریب یقول خذوني)، ئەوە وەکو فشاری دەروونی نییە، بەڵام نامانەوێ بچییەوە بۆ ئەوێ، بردیانم بۆ شوێنێکی ناخۆش، لە وەرزشیش مەحرومیان کردم، بیست و چوار سەعاتێك لەوێ بووم.

ڕۆژی دوایی هەمان مەوعید بانگیان کردمەوە، وتیان: "تۆ شتێك بڵێ با موفاوەزەی لەسەر بکەین"، منیش وتم: هەر ئەوەندە ئیمزا دەکەم کە من بەڵێن دەدەم خزمەتی وڵات و میللەتی خۆم بکەم، وڵاتی عیراق و میللەتی موسڵمانی عیراق لە چوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامیدا، شتێکی ئاوام بۆ نووسین، هەر کەسێکیش ڕێز لە میللەتەکەم بگرێ و خزمەتی بکات، منیش ڕێزی لێدەگرم، دیاربوو دوایی کەوتنە موفاوەزە لەوەداو هێندێ بەندیش کە بە حساب شەرح و تەفسیلی ئەوەبوو کە نووسیبووم، منیش وتم: ئەو بەندانەش بە مەرجێ ئیمزا دەکەم لە خوارەوە بنووسم: ئیمزام کرد بە مەرجێ هیچ کام لەو بەندانە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامیی تێك نەگیرێ، واتە بە جۆرێك تەفسیر نەکرێ کە تێك بگیرێ. دیسان بەڕێوەبەرەکەی زیندان وتی: "ئاخر بۆچی دیسان ئەوە دەکەی؟ ڕەنگە دیسان ڕزگاربوونی تۆ بەربەستی تێ بکەوێ"، وتم: لەبەر ئەوە نەوەکو یەکێ لەو بەندانە بە جۆرێ تەفسیر بکەن کە منی پێ ناشیرین بم، وتی: "تۆ کابرایەکی زۆر حەساسی، بۆچی وای؟"، وتم: ئاخر ئەوە دەبێ مرۆڤ ئیحتیات بکات، ئاوا نەبێ من ناتوانم ئیمزای کەم، دیاربوو کەوتەوە تەلەفۆن و تەلەفۆنکاری، دوایی وتی: "ئەوە بە دڵخۆشییەوە موافەقەتیان کرد، دەباشە ئەوجا بەو شێوەیە کە بۆ خۆت پێت خۆشە، ئیمزای بکە".

ئەوەبوو کەلوپەلمان پێچایەوەو بە چەند قافڵەیەکی تانك‌و زرێپۆش لەگەڵمان هاتن بۆ بەغداد، لەوێش لەبەردەم سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیران کاك پوشوو دزەیی، جێگری وەزیری داد لە پێشوازییدا بوو، ئەوە بوو خواحافیزیمان لەیەکتر کرد، پێش خواحافیزەش، کۆلۆنێڵەکە وتی: "من زۆر سەرسام بووم بە کەسایەتیی تۆ، بۆ من شەرەفێکە کە جەنابتم ناسی، بەس یەك قسەم هەیە"، وتم: فەرموو، وتی: "پێش ئەوەی لە یەك جیابینەوە قسەیەکم هەیە، ئەوە جەنابت دەچییەوە ناو ماڵ‌و منداڵ‌و هاوەڵەکانی خۆت، قسەکەشم ئەوەیە" هیوادارم دەنگوباسی باشت ببیستم، کردەوەی چاك بکەیت‌و کردەوە باشەکانت ببیستم"، منیش وتم: سوپاسی هەستت دەکەم‌و پێم خۆشە وەڵامەکەت وەربگریەوە، وتی: "فەرموو"، وتم: ئەو کردەوە باشانەی کە پێش زیندانییکرانم لە سەریان بووم، زیاتر پەرەیان پێ ئەدەم‌و فراوانیان دەکەم، بەڵگەشم لەسەر ئەوە کە کردەوەی باشم کردووە ئەوەیە کە میللەتی خۆم، میللەتی موسڵمانی کوردستان، بە جەماوەریەوە، بە سەرکردایەتیی سیاسییەوەو بە ئەهلی فکرو قەڵەمیەوە، هەموو دیفاعیان لە من کردووە، کە لە ڕێپێوان‌و لە ئیمزاکۆکردنەوەو لە وتارنووسین‌و لە تەکلیفکردن‌و لەوانەدا بەرجەستە بوون، کەواتە من کردەوەی باشم کردووە، بۆیە خەڵکە موسڵمانەکەم پارێزگارییم لێدەکەن، لەسەر ئەو کردەوە باشانەش بەردەوام دەبم.

**+ چی وای کرد ئازاد بیت‌و لەوە زیاتر نەمێنیتەوە؟ بێتاوانیی خۆت، یان شتێکی دی؟**

ـ من پێم وایە چەند شتێك بوو، وەکو جاری دیکەش گوتوومە، یەکەم: پەرێز پاکیی خۆم، ئەوشتانەو ئەو تۆمەتانەی کەویستڕابوو منی پێ تۆمەتبار بکرێم، هیچیان بۆ ئیسپات نەبوون، خۆیان گوتیان هیچ شتێکت لەسەر ساغ نەبۆتەوە، من لە دوانامەش، کە نامەیەکیان بۆ من نووسیبوویەوە: "لەبەر ئەو هۆیانە تۆ ماویەوە.."، من وەڵامم دانەوە، نامەکە دوایی بڵاو دەکەینەوە، جوان وەڵامی ئەو تۆمەتانەم داوەتەوەو پووچەڵم کردوونەتەوە، تەحەدداشم کردوون، ئیدی دوای ئەو نامەیە، ئەوان بەردیان لەسەر دانا، جارێکی دیکە نەهاتنەوە بەلامدا.

پاشان واقعی کۆمەڵی ئیسلامیی، بەڕاستی بۆیان دەرکەوتووە ئەوە نییە کە خەڵکێك لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای کردووە، کۆمەڵی ئیسلامیی بڕوای بەوە هەیە لەگەڵ خەڵکدا بژی، بڕوای بەوە هەیە وەکو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە ڕووی بانگەوازو تێگەیاندنی خەڵکەوە کاری سیاسیی خۆی بکات.

پاشانیش پشتگیریی جەماوەریی، لە ڕێپێوان‌و دەنگدان‌و ئیمزاکۆکردنەوەو تەکلیفکردن، کە لە مامۆستایان‌و زانایانی ئاینی، لە عەشایەرو لە خوێندەواران، لە ڕۆشنبیران‌و ئەهلی فکرو قەڵەم، لە گەنج‌و پیرو لاوو هەموو چین‌و توێژەکاندا، خۆی نواندووە.

پاشانیش ئەو دەنگدان‌و بەشدارییکردنەی کۆمەڵی ئیسلامیی لە هەڵبژاردنەکانداو ئەو ئەنجامە کە بۆ هەندێ کەس شتێکی چاوەڕواننەکراو بووە، بەڕاستی ئەوەش ڕۆڵی خۆی بووە.

ئینجا ئەو هەوڵانەی دیکەش کە هەندێ کەسایەتی داویانە، وەکو سەرکردایەتیی سیاسیی کورد، بە تایبەتی مام جەلال‌و کاك مەسعود، پاشان سەرکردایەتیی سیاسیی دیکە، وەك دکتۆر موحسین عەبدولحەمید، مامۆستا صەلاحەددین موحەممەد بەهائەددین‌و خەڵکی دیکە، خەڵکی عەشایەرو کەسایەتی دیکە، بەڕاستی زۆر قەرزداری ئەو خەڵکەم کە زۆر تەکلیفیان کردووە، ڕەنگە من تا ئێستا نەمتوانیبێت سوپاسیان بکەمەوە.

پێم وابێ ئەوانە هەمووی ڕۆڵی خۆیان بووە، هەر شتەی لە شوێنی خۆیدا ڕۆڵی بووە.

**+ مامۆستا، بەر لە زیندانییکردنتان، هەڵوێستتان لە بەرانبەر ئەمریکا، وەکو ئیدارەو دەوڵەتێکی زلهێز، وەکو داگیرکەر ئاشکرابوو، بەتایبەت لە کاتی دەستپێکردنی جەنگ، یان سەرەتای هاتنیان بۆ ناو خاکی عیراق‌و دەستپێکردنی جەنگیان بۆ سەر عیراق. ئێستا چۆن بۆ ئەو دەوڵەتە دەڕوانی؟ هەڵوێستی ئێستاتان بەرانبەر بوونی ئەمریکا لە عیراقدا چییە؟**

_ هەڵوێستم هەروەکو خۆیەتی، چونکە ئەمریکا نەگۆڕاوە، ئەمنیش نەگۆڕاوم، ئەمن چۆن بووم هەروام، ئەمریکاش چۆن بووە هەروایە، هەڵوێستەکە نەگۆڕاوە، بەڵام بە

ڕاستی لەوێ زیاتر بۆم مەعلوم بوو کە ئەمریکا گوێ نادات بە مەسەلەی دیموکراسیو مافی مرۆڤ و مەسەلەی ڕێککەوتنی نێودەوڵەتی، چونکە برادەرانی خاچی سوور، ئافرەتەکانیان، پیاوەکانیان کە دەهاتن، منیشو هاوزیندانییەکانی دیکەش کۆمەڵێ پرسیارمان ئاڕاستە دەکردن، بەڕاستی ئەوان هیچ وەڵامیان نەبوو، ئەوە نەبێ دەیانگوت کە ئەمریکا ئاوا ئەو ڕێکەوتننامەیە تەفسیر دەکاو ئێمەش ئاوا تەفسیری دەکەین، من پێم گوتن ئاخر خۆ دەبێ تەفسیری ئێوە حسابی بۆ بکرێو ئێوە خاوەنی ئەو ڕێکەوتننامەیەن، دەیانگوت: "ڕاستە، بەڵام بەهەرحاڵ قسەی ئەوان دەچێتە سەر"، منیش دەمگوت: لەبەر ئەوەیە تەفسیری ئەوان تەفسیری لایەنێکی بەهێزە، تەفسیری ئێوەش تەفسیری لایەنێکی بێهێزە. دیارە ئەوان نەیاندەوێرا ئەوەش بڵێن.

جا بەڕاستی من بۆم دەرکەوت ئەمریکا لە کاتێکدا بەرژەوەندیی تێدەگیرێ، زۆرکەم گوێ دەداتە مەسەلەی دیموکراسیو ئەو دروشمانەی بەرزیان دەکاتەوە، ئەوە هەستم پێکرد بە کرداریو بە واقیعی.

پاشانیش ئەمریکا خۆی ناو ناوە داگیرکەر و نەشی شاردۆتەوەو ناشی شارێتەوە، دەڵێ: "ئەمریکا شایستەیی ئەوەی هەیە کوێخایەتیی دونیا بکاتو بەسەر دونیادا ڕابگات، قیەمی خۆی فەرز بکات". ئیدی ئەمریکا کە خۆی ئەو ناوەی لە خۆی ناوەو بەو شێوەیە خۆی ناوزەند دەکات، ئەمریکا چ ناوێکی لە خۆی ناوە، چۆن بۆ خۆی خۆی پێناسە دەکات، ئێمەش هەروای پێناسە دەکەین.

**+ چۆن بۆ ئەو هێرشانە دەڕوانی کە دەکرێنە سەر هێزەکانی ئەمریکا لە عیراق؟**

ـ سەبارەت بە هاتنی ئەمریکاو داگیرکردنی بۆ عیراق یان بۆ غەیری عیراق، ئەوە بێگومان هیچ موسڵمانێك، کە ڕێز لە دینی خۆی بگرێتو بەڕاستی پابەندبێت بە قورئانو سوننەتەوە، ناتوانێ پێم بڵێ شتێکی چاکە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (..وَلَن يَجْعَلَ اللّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً (النساء: ١٤١)، خوا ڕێگەی نەداوە کافر دەسەڵاتی هەبێت بە سەر موسڵماندا، کە تۆ دەسەڵاتت نییەو ئەو دەسەڵاتی خۆی بە سەر تۆدا ڕادەنێ، بەلای کەمەوە دەبێ بڵێی قەناعەتم پێی نییەو لەلام مەرفوزە، جا کە دەسەڵاتت نییە، ئەوە شتێکی کەیە.

سەبارەت بە مانەوەی ئەمریکا، دیارە هەڵوێست وابێ کە مەرفوزە، کەواتە دیارە بەرهەڵستیکردنی شتێکی ڕەوایە، بەڵام پێموایە دەبێ تەماشا بکرێ ئایا ئەو بەرهەڵستیکردنەی ئەمریکا قازانجی چەندەو زەرەری چەندە، چونکە لە بابی موعامەلاتو هەڵسوکەوتەکاندا، تەماشای زەرەرو قازانج دەکرێ، تەماشای مەفسەدەو مەسڵەحەت دەکرێ، ئایا ئەوە تاکە ڕێگەیە بۆ دەرکردنی ئەمریکا؟ ئایا ڕێگەی دیکە نییە؟ ڕێگەی گفتوگۆ تاقیکراوەتەوە؟ ڕێگەی فشاری سیاسیی، فشاری جەماوەری، فشاری ڕاگەیاندن تاقیکراوەتەوە؟ زانایانی ئیسلام لە مەسەلەی (دفع الصائل)، واتە کەسێك کە دەچێتە سەرماڵێك، دەڵێن: "الخفیف فالشدید"، واتە ئەگەر بەتێخوڕینێك دەرچوو، نابێ پلارێکی تێگری، ئەگەر بە قاچ بریندارکردن دەرچوو، نابێ بیکوژێو هەروەها، لەبەر ئەوە، من پێموایە دەبێ ئاوا تەماشا بکرێ، یەکەم" تەماشای ئەوە بکرێ بە تەدەڕوج (پلەپلەیی)، دوایش تەماشای مەسڵەحەتو مەفسەدە بکرێ.

لە لایەکی دیکەشەوە، من پێموایە ئەگەر لایەنێکی ئیسلامیی، مەسەلەی دەرکردنی ئەمریکا تەبەننی بکا، دەبێ ئەو سەرکردایەتییە ئیسلامییە سەرکردایەتییەکی ئاشکراو زانراوبێ، بەرنامەو پرۆژەیەکی ڕوونو ئاشکراشی هەبێ، بۆ ئەوەی کە ئەمریکای دەرکرد، بۆشاییەکی سیاسی پەیدا نەبێت، خەڵکی دیکە بیقۆزێتەوەو پڕی بکاتەوە، بەڵکو دەبێ پرۆژەیەکی هەبێت، دوایی خەڵك بزانێ کێ ئەمریکای دەرکرد؟ بۆچی دەرکرا؟ ئەوەی دەری کردووە بەرنامەی چییە؟ تاکو خەڵك پشتگیریی بکات، چونکە هەمیشە دەبێ چالاکیی سەربازی لە خزمەت ئامانجی سیاسییدا بێت، واتە ئیسلام تەقەکردنو جەنگکردنو جیهادکردنی لە خودی خۆیدا بە پێویست نەزانیوە، بەڵکو بۆ ئامانجی دیکەیە، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ..) (البقرة: ١٩٣)، لەگەڵیدا بجەنگن تا فیتنە نامێنێ، واتە ئاشوبو ئاژاوەو ئازاردانی موسڵمانان نامێنێ، کەواتە جەنگ دەکرێ بۆ ئامانجێك، دەبێ ئامانجو مەبەستی شەرعی لە پشتەوە هەبێ، ئەگەرنا، پێغەمبەر ﷺ هیچ جەنگێکی نەکردووە هەر لە بەرخودی جەنگەکە، لە ئیسلامدا ئەو دروشمانە هەمووی هەڵەن: (العلم للعلم، الفن للفن، القتل للقتل)، دەبێ هونەر بۆ ئامانجێك بێو زانست بۆ ئامانجێكو جەنگ بۆ

ئامانجێك، ماڵو سامان دەبێ ئامانجی پێ تەبەننی بكرێ، هەموو ئەوانە دەبێ ئامانجی شەرعییان لە پشتەوە بێ، ئەوجا ڕەوان.

**+ بۆ كۆمەڵی ئیسلامیی هەر لە سەرەتاوە باوەڕی وانەبوو پەیوەندی بكات بەو هێزانەی دژایەتیی سەربازییانەی ئەمریكا دەكەن لە عیراقدا؟**

ـ بەڕاستی لەبەر ئەوەی نەسەركردایەتییەكی ئاشكراو زانراویان هەیە، نە بەرنامەیەكی ڕۆشنیان هەیە، ئەوجا ئەوانەی كە ئێستا بەرهەڵستیی ئەمریكا دەكەن، بەڕاستی زۆر تێكەڵەن، واتە ئێمە ناتوانین بڵێین هەمووی ئیسلامییە، یان هەمووی بەعسییە، یان هەمووی قاچاخچییە، یان هەمووی دەستی موخابەراتی دەوڵەتانە، زۆر شتی تێكەڵە، هەركامێكیان حوكمی جیا جیای هەیە، هەركامێكیان پێویستی بەهەڵوێستەی جیا دەكات لە بەرانبەریدا، واتە ئەوەی كە دەیەوێ ئەمریكا دەركات بۆ ئەوەی ئیسلام حاكم كات، غەیری ئەوەیە كە دەیەوێ ئەمریكا دەركات بۆ ئەوەی ڕژێمی بەعس بێنێتەوە، غەیری ئەوەیە كە تەقە لە ئەمریكا دەكات لەبەر ئەوەی پارەیەك وەرگرێ، یا لەبەر ئەوەی قاچاخچییە، یان غەیری ئەوەیە كە ئامانجێكی دیكەی لە پشتەوە دەبێ.

**+ مامۆستا، چۆن لە "جەنگی دژە تیرۆر" كە ئەمریكا پێشەوایەتی دەكات، دەڕوانی؟ پێتوایە بەو هەڵوێستو مامەڵانەیان كە بە ناوی ئەو جەنگەوە دەیكەین، ئەوان دەتوانن دادگەریی‌و یەكسانیی ڕاستەقینە بۆ مرۆڤایەتی بهێنن؟**

ـ لێرەدا من دەمەوێ ئاماژە بەوە بكەم، تا ئێستا وا باوەو دەڵێن ئەمریكا تا ئێستا پێناسەی تیرۆری نەكردووە، كە خەڵك نابێ پەكی لەسەر ئەمریكا كەوتبێت تا پێناسەی تیرۆر بكات، چونكە بۆ دەبێ ئەمریكا پێناسەی بكات؟ خۆ هەر خەڵكی ئەمریكا عەقڵی نییە، خەڵكی دیكەش عەقڵی هەیەو زانستی هەیەو لە دونیا دەزانێت.

ئێمە با لە پێناسەی تیرۆرەوە دەست پێ بكەین، سەبارەت بە هەڵوێستمان بەرانبەر جەنگی دژەتیرۆر. تیرۆر زاراوەیەكی فەڕەنسییە، واتە فەرزكردنی بیروباوەڕی خۆت بەسەر لایەنی بەرانبەردا، بە هەڕەشەو گوڕەشەو بە زەبرو بە توندوتیژی

تاڕاددەی کوشتن، ئەوە پێناسەی وشەی تیرۆرە، ئەگەر ئاوا بێتو ئەوە پێناسەی تیرۆر بێت[17]، زۆر کەس دەگرێتەوە، کە من لە زیندانیش بە ئەمریکییەکانم گوتووە، پێش هەموو کەس ئەمریکا دەگرێتەوە، ئەمریکا نایشارێتەوە کە دەیەوێ شتی خۆی فەرزکات، بە زەبری ئابووریو بە زەبری سەربازیو بە زەبری دەسەڵات دەیەوێ قیەمی خۆی فەرزکات، ئەگەر ئاوا پێناسەی تیرۆر بکەیت، دیارە ئەوکاتە ئەو جەنگەی کە ئەمریکا ناوی ناوە جەنگی دژەتیرۆر، بەڕاستی دەبێ هەڵوێستەی لە بەرانبەردا بکرێت، ئەوە دەبێ ئێمە بڵێین نا، ئەو پێناسەیە وانییە، دەبێ بڵێین جەنگی دژی نەیارانی ئەمریکا، ئەمریکا هەرکەس نەیاری بێو دژایەتی بکات، ناوی لێناوە تیرۆرست، هەرکەس دژی بێو دژی بەرژەوەندییەکانی بێتو ئامادە نەبێت تەسلیمی بێت، ناوی لێناوە تیرۆرست، کە ئەوە زوڵمێکەو لەو وشەیە دەکرێت. ئەگەرنا، گەر بڕیار بێت مرۆڤایەتی هەمووی دژی کەسێك بێت، دژی هەرکەسو تەرەفو دەوڵەتێك بێت کە بیەوێ بە زۆر بیروباوەڕی خۆی فەرز بکات، ئێمەش لەو بەرەیەدا دەبین، بەڵام ئەگەر تیرۆر بەو شێوەیە پێناسە بکرێ کە بریتییە لە فەرزکردنی بیروباوەڕی خۆت بە زۆر بەسەر خەڵکدا، ئیسلام لە پێش هەموو کەسدا دژی ئەوەیە، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (..وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ..) (ق: ٤٥)، (لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ)(الغاشية: ٢٢)، (أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ)(يونس: ٩٩)، (وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ..) (الكهف: ٢٩)، فەرزکردنی بیروباوەڕی خۆت بە سەر خەڵکدا بە زۆر، ئەوە تیرۆرە، ئێمە لە پێش هەموو کەسدا دژی دەوەستینەوە، بەڵام هەرکەسێ دژی ئەمریکا بێ، یان هەرکەسێ دژی داگیرکەرو زاڵمێك بێتو بەرهەڵستی بکا، ناوی لێبنرێ "تیرۆرست"، ئێمە دەڵێین ئەو پێناسەیە هەڵەیە، بەڵکو دەبێ جۆرەکانی بەکارهێنانی توندوتیژی لێك جیا بکرێنەوە، ئەگەر بۆ پارێزگاری لە مەزلومیەتی خۆتو بۆ هەقی ڕەوای خۆت بێ، ئەوە شتێکی هەق و ڕەوایە، ئەوە نییە ئەمریکاش توندوتیژی بەکاردێنێ دژی نەیارانی خۆی، نەك هەر لە

---

[17] لە کتێبی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)دا، بە درێژی باسی تیرۆرمان کردووە. بڕوانە: چاپی پێنجەم ٢٠٠٦، نووسینگەی تەفسیر.

ناوخۆی ئەمریکا، بەڵکو لە عیراقو ئەفغانستانو کوێو کوێش، باشە بۆچی بۆ ئەمریکا ڕەوایە توندوتیژی بەرانبەر نەیارەکانی خۆی بنوێنێ، بەڵام بۆ خەڵکی دیکە ڕەوا نییە؟ بۆیە هەرکەسێ توندوتیژی دەنوێنێ بۆ فەرزکردنی بیروباوەڕی خۆی، ئەوە شتێکی مەرفوزە، ئەمریکا بیکات یان غەیری ئەمریکا.

**+ تا چەندێك گێڕانەوە، یان ئاشکراکردنو قسەکردن لە ئەو ناڕەحەتیو بێڕێزییانەی بەرانبەر ئێوەو کەسانی تری بێتاوان کراوە، یان ئەوانەی ڕۆژانە لە عیراقو ئەفغانستانو گوانتانامۆو زیندانەکانی تری ئەمریکا ڕوو دەدەن، بە پێویست دەزانن؟**

- من بایی ئەوەندەی بە پێویست دەزانم کە خەڵك ئەمریکا بناسێ، واتە ئەوەی بانگەشەی مافی مرۆڤ و دیموکراسییەتو ئازادیی بیروڕاو ڕێز لە مرۆڤگرتنو ئەوانە دەکات، ئەوەتا هەڵسوکەوتو مومارەساتی ئەمریکا بەو شێوەیە، بایی ئەوەندە کە خەڵك بیناسێ، خەڵك چەواشە نەکرێ، بە پێویستی دەزانم باس بکرێ، وەکو حەقیقەتی خۆی، بێئینسافییان لەگەڵ نەکرێ.

من پێموایە لەو گێڕانەوەیەی بەسەرهاتی خۆم بێئینسافیم نەکردووە، لە شتێکدا کە ئیجابیم لێ بینیون، باسم کردووە، کاتی خۆشی وام پێگوتوون، ئەمریکییەکان گوتیان: "تۆ کابرایەکی نووسەرو خەتیبیو شەخسیەتێکی، کە دەرچووی لە زیندان لەسەرمان دەنووسیو شتمان لەسەر دەڵێی؟" وتم: بەڵێ، وتیان: "چ دەنووسی؟" وتم: وەڵڵا چیم بینوە وا دەڵێم، چیم بیستووەو چیم بینیوە وادەنووسم، شتی چاکم بینیبێ، باسی دەکەم، شتی خراپیشم بینیبێ، باسی دەکەم، بەڵام بە پێویستی دەزانم ئەگەر چاکەیەکیشیان هەیە، باس بکرێت، خراپەکانیشیان باس بکرێت، وەکو خۆیان، نە زوڵمیان لێبکرێتو نە زوڵمیان بۆ بکرێت.

**+ بە ڕای ئێوە، هەڵوێستی ئینسانیی چییە لە بەرانبەر ئەو مامەڵە نامرۆڤانانەی ئەمریکا لە جیهاندا، لەو شوێنانەی کە دەسەڵاتی هەیە ئەنجامیان ئەدا؟ بە تایبەتیش ئەوەی هەنووکە لە عیراقدا ڕوودەدات؟**

ـ هەڵوێستی ئینسانیی ئەوەیە، خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مرۆڤایەتی ئەوەیە کە هەموو مرۆڤێ پێی خۆشە مافی پێشێل نەکرێو ڕێزی لێبگیرێ، لەبەر ئەوە، پێویستە هەموو مرۆڤەکان لەسەر ئەوە کە بە ناحەق یەکێ دەگیرێ، هەڵوێستیان هەبێ، واتە من مرۆڤێکم، بۆ بە ناحەق بگیرێم؟ بۆ لەسەر بنەمای ڕاپۆرتی هەڵەو درۆ، کە دوایی خۆیان دەڵێن: "داوای لێبوردنمان هەیە" دەستگیر بکرێم؟ عەرەب دەڵێ: "ایّاك وما یعتذر منه"، خۆت لە شتێ بپارێزە کە دوایی عوزری بۆ بێنییەوەو داوای لێبوردنی لێبکەی. واتە: دەبێ هەموو خەڵك لەسەر ئەوە یەکدەنگ بێت کە هیچ کەسێ بە بێئەوەی شتێکی لەسەر بچەسپێت، بە بێئەوەی شتێکی لەسەر هەبێ، نەگیرێ، پاشان ئەو ئەزیەتدان‌و ناڕەحەتکردنەی خەڵك بۆ ئەوە کە تۆ قسەی پێ بگۆڕی، دەبێت قەدەغە بکرێت. بۆ نموونە، من کە زۆر ناڕەحەت دەکرام، دەموت: باشە، ئێوە ئەگەر مەبەستتان هەر ئەوەیەو دەتانەوێ لە ژێر ناڕەحەتیدا من بفەوتێنن، وەرن چی دەڵێن تا بۆتان بنووسم، بەڵام دەشڵێم ئەوە بە زۆر بووە، بۆ؟ چونکە من دەمەوێ ڕزگارم بێت، بەڕاستی دەمەوێت بمرم، بەڵام چی دیکە لەو حاڵەدا نەمێنمەوە، دەیانگوت: "نەخێر، بەس دەبێ تۆ ئەوشتانە بڵێی"، دەمگوت: ئاخر ئەو شتانە ڕاست نین، درۆو بوختان بۆ خۆم بکەم؟ ڕەنگە من خاتریشم گیرابێ. یان لەوانەیە بە پێویستیان نەزانیبێ، چونکە بیستوومە خەڵکی دیکەیان زۆر زیاتر ئەزیەت داوەو ناڕەحەتیان کردووە، ئەوە دەبێ شتێکی قەدەغە بێت‌و موحەڕڕەم بێت، کە مرۆڤ لە خۆوە ئەزیەتی نەدرێت، ئەگینا ئەگەر کۆمەڵێ تۆمەت‌و شاهیدی لەسەرن‌و کابرا هەر ئینکاری دەکا، بەهەرحاڵ تۆزێ ڕێی تێدەچێ ئەزیەت بدرێت، بەڵام گەر هیچ شتێکی لەسەر نەبێ، قەدەغەیە ئەزیەت بدرێ.

من پێموایە مرۆڤایەتی هەمووی لەسەر کۆمەڵێ بنەما ڕێك بکەون کە کەرامەتی مرۆڤیان پێ پارێزراو دەبێ‌و ئازادیی مرۆڤیان تێدا بەرجەستە دەبێ، نابێ لە هیچ کەسی قبوڵ کەن، با ئەمریکاش بێت، واتە هەر کەسێ بێ، نابێ لێی قبوڵ بکرێ کە ئەو شتانەی کەرامەت‌و ڕێزو شەخسیەتی مرۆڤیان تێدا بەرجەستە دەبێ، پێشێل بکرێن.

**+ ئیدوارد سەعید دەڵێ: "شەرمەزارییە لە جیهانی عەرەبیدا بەتایبەت یەك دەزگا نییە، یەك سەنتەر نییە بۆ لێکۆڵینەوەی سیاسەتەکانی ئەمریکا، یان بۆ لێکۆڵینەوەی ئەمریکا وەکو ئیمپراتۆرییەتێك، وەکو گەورە زلهێزێکی دونیا". ئێمە ئەگەر ئەو قسەیە پێوانە بکەین لەسەر واقیعی کوردستان، لە کوردستاندا نەك دەزگایەك نابینین بەو ناوەوە، بەڵام دەبینین زۆربەی زۆری حزبەکانو دامەزراوەو پاشکۆکانیان، بە تایبەت ڕاگەیاندکارو ڕۆژنامەوانەکانیان، تاڕاددەیەك بوونەتە زوڕناژەنی سیاسەتە داگیرکاریی و ئیمپراتۆرییەکانی ئەمریکاو چاوپۆشی لە کردەوەکانیان دەکەن، کردەوە ناپەسەندەکانیان لە عیراق و لە تەواوی جیهاندا. تۆ چۆن ئەو واقیعە لێك دەدەیتەوە؟**

- ئەمن وای هەڵدەسەنگێنم کە جارێ خەڵك هەیە زۆر پێش ئەمریکای داوەتەوە، واتە لە کوردستانی خۆماندا هێزی سیاسیی وا هەیە، ئەو شێوازانەی کە بەکاریان دێنێ، بۆ پێشێلکردنی ڕێزو کەرامەتی مرۆڤ، بۆ زەوتکردنی ئازادییەکانیان، بۆ سووکایەتی پێکردنیانو بێڕێزی پێکردنیان، زۆر پێش ئەمریکای داوەتەوە، جا کەسێ بۆ خۆی پێش ئەمریکای دابێتەوە، چۆن ڕووی دێت باسی زوڵمو ستەمی ئەمریکا بکات؟ من خەڵکم پێ شك دێت، ساڵو دوو ساڵو سێ ساڵە، بەڵکو کەسی وا هەیە دەڵێن پێنج ساڵە لە یەکێ لەو زیندانانەی دەسەڵاتی سیاسیی ئەو حزبە دەستەڵاتدارانەی کوردستاندا گیراوە، تا ئێستا دەڵێن لێکۆڵینەوەی تەواو نەبووە، تا ئێستا شتێکی چەسپاوی لەسەر نییە، جا کابرا بۆ خۆی ئەوەندە خراپ بێتو ئەوەندە خاڵی ڕەشی لەسەر بێ، چۆن دەتوانێ باسی ئەمریکا بکات؟

پاشانیش، من پێموایە هەموو ئەوانەی بوونی خۆیان لە ژێر سێبەری ئەمریکادا دەبیننەوە، ناتوانن باسی ئەمریکا بکەن، مرۆڤ دەبێ بوونی خۆی لە سێبەری بنکەی جەماوەریی خۆیدا ببینێتەوە، لە پشتگیریی خەڵكو میللەتیدا ببینێتەوە، نەك بوونی خۆی لە ژێر سێبەری ئەمریکادا، یان بوونی خۆی لە پشتی ئەوەی کە پارەی بە دەستە یان دەسەڵاتی بە دەستە، ببینێتەوە، هەموو ئەوانەی بەڕاستی پێگەکەیان بریتییە لە پارەو لە دەسەڵاتو لە سێبەری شوومی ئەمریکا، هەموو ئەوانە ناتوانن

زمانێکی گۆیاو فەسیحو ڕەوانیان ببێ بۆ باسکردنی سلبییاتو کەموکوڕییەکانی ئەمریکا و بە تەئکید ئەو جۆرە کەس و لایەنانەش سەرەنجامێکی شوومیان دەبێ.

**+ مامۆستا، ئێوە لە چاوی سەربازە ئەمریکییەکانەوە، ئەوانەشی بیستو دوو مانگ ڕووبەڕوو مامەڵەتان لەگەڵیان هەبووە، چۆن کەسایەتیی هاووڵاتیی ئەمریکی شیکار دەکەن؟ پێتوایە ئەوانە خوا بۆ ئەوە دروستی کردوون کە پێشەوایەتیی مرۆڤایەتی بکەن؟!**

ـ من دەڵێم ئەگەر مرۆڤایەتی گاگەل بێت، ئەمریکا گاوانێکی باشە، ئەوانە زیاتر بە مەنتیقی هێز بیردەکەنەوە، بەڵام من پێشم بێئینسافییە کە بڵێم هەموو هاووڵاتییانی ئەمریکی لە چاوو دیمەنی سەربازو جەندرمەکانی ئەمریکادا دەبینمەوە، هەتا ئەوانیش هەموو وەکو یەك نەبوون، هەیانبوو بە ویژدانانە هەڵسوکەوتی دەکرد، ڕەحمو بەزەییەکی هەبوو، هەیانبوو قسەی بە ئەمریکا دەگوت، قسەی بە سیاسەتی ئەمریکا دەگوت، بێگومان هەموو میللەتێ چاكو خراپی تێدایە، جا خۆشتان ئاگادارن، کاتێك ئەمریکا ویستی ئەو جەنگە بکاتو ڕژێمی بەعس برووخێنێ، لە نێو خودی ئەمریکادا زۆر خۆپیشاندانو ڕێپێوانو ناڕەزاییدەربڕین هەبوو، لەبەر ئەوە، من بە ڕەوای نابینم کە بگوترێ میللەتی ئەمریکاو خەڵکی ئەمریکا هەمووی لەگەڵ سیاسەتی دەوڵەتی ئەمریکادایە، بەڵکو خەڵکێکی زۆر هەیە ناڕازین لەو سیاسەتە، بەڵام بێگومان ئیدارەی ئێستای ئەمریکا ڕووی جەماوەرو خەڵکی ئەمریکای زۆر ناشیرین کردووە، ئەگەرنا، من پێموایە تاڕاددەیەکی زۆر ئازادیی بیروڕا دەربڕینو جورئەتو بوێریو قسەکردن لە ئەمریکادا هەیە، کە لەم کوردستانەی خۆماندا نییە، بەڵام بێگومان ئەوەی خەڵك لە ئیدارەو دەوڵەتی ئەمریکای دەبینێ، وا تەسەور دەکات کەوا هەمووی هەڵقوڵاوی قەناعەتو ئیرادەی جەماوەرو میللەتی ئەمریکایە، بەڵام ئەگەر مرۆڤ قووڵ بێتەوە لێی، وانییە، لەبەر ئەوە، من بە ڕەوای نابینم هەموو بە یەك چاو تەماشا بکرێن، بەڵام بەگشتی پێموایە کەسایەتیی ئەمریکی زیاتر کەسایەتییەکی سەربازییە، کەسایەتییەکی سیاسیی نییە، ئەهلی فکرو کەلتوورو ژیارو شارستانییەت نین، جیاوازییان هەبوو لەگەڵ ئینگلیزەکان، هەتا لێکۆڵەرەکانیان جیاوازییان هەبوو، لەبەر ئەوە، پێموایە کەسایەتیی ئەمریکی بەگشتی زۆر لەوە کەمترە لە توانایدا هەبێ

سەرافەتی مرۆڤایەتی بکاو مشووری بخواو بیخاتە ژێر چاودێریو مشورخواردنی خۆیەوە، ڕەنگە بتوانێ بیخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، بەڵام دەسەڵاتڕانان بە سەر خەڵكو وڵاتو مرۆڤایەتییدا جیایە لەگەڵ مشور لێخواردنیو بەرەوپێشبردنیو ئاڕاستەکردنی.

**+ وەکو کەسێك کە بیستو دوو مانگ لەسەر دەستی ئەمریکییەکان بە ناهەق زیندانی کرانو ستەمتان لێکراو بێڕێزیتان بەرانبەر کرا، چ پەیامێك بە پێویست دەزانن کە موخاتەبەی هاووڵاتیانی ئەمریکای پێ بکەن؟ دەتەوێ چی بەوان بڵێی؟**

- من دەمەوێ بڵێم دەوڵەتی ئەمریکا، هەرشتێ کە دەیکا، با تەنیا پیاوانی دەوڵەتیش بڕیاری لەسەر بدەن، سیاسەتمەدارەکانیش بڕیاری لەسەر بدەن، بەڵام لەسەر هەموو میللەتەکە حسابە، بەتایبەتی کە لەوێ تاڕاددەیەك دیموکراسی هەیە، دیموکراسی بە خێرو شەڕیەوە، لەبەر ئەوە، ئەو خەڵکە دەنگێك دەدا، ئەو دەستەڵاتە سیاسییە هەڵدەبژێرێ، بۆیە پێویستە خەڵکی ئەمریکا زۆر وریابن، کاتێ کە دەوڵەتەکەیان لادەدات، کاتێ کە دەوڵەتەکەیان مومارەسەیەکی وا دەکات، لەسەر هەموو میللەتی ئەمریکا دەکەوێ، لەسەر مرۆڤایەتیش زۆر قورس دەکەوێ، پێویستە دەستی بگرن، دیارە ئەوان کۆمەڵێ میکانیزمی خۆیان هەیە، بواریان هەیە بۆ خۆپیشاندانو ڕێپێوان، لە ڕاگەیاندنو ئەوانەی پێویستە، بەڕاستی دەبێت بە تەنگ سومعەو ناوی خۆیانەوە بن، با خەڵك هەمووی بە چاوی ئاغاو کوێخاو بە چاوی ئەوە کە دیکتاتۆرو خۆ فەرزکەرە بە سەر جیهاندا، تەماشای ئەمریکا نەکەن، پێویستە میللەتو خەڵكو جەماوەری ئەمریکا ئاگایان لەوە بێ کە لە تەسەورو زیهنی خەڵکدا ئەو وێنە قەڵبو ناجۆرە بۆ هەموو میللەتی ئەمریکا دروست نەبێت، لە میانەی مومارەساتی ئەو دەوڵەتو ئیدارەیانەوە، کە بە ناوی ئەوانەوە حوکم دەکات.

**+ بێینە سەر تەوەرێکی تر، زیندان چی فێرکردی، بۆ تۆ چ وانەیەکی تێدابوو؟**

- زۆر وانـەی تـێدابوو، بـەڵام ئەگـەر بمـەوێ هەمـوو ئـەو وانانـە لـە یەك شتدا كورت بكەمـەوە، ئەوەیـە كـە بەڕاسـتی مـرۆڤ لـە هـەر كـاتو بارودۆخێكدا بێت، لە هەر كاتو شوێنێكدا بێت، ئەگـەر پەیوەسـت بێت بە خوای پەروەردگارەوەو پشتی بە خوا قایم بێت، دڵـی بـە خـواوە پەیوەسـت بێت، بێمنەتە لە هەموو شتێك، ژوورێكی تەنگەبەری بچووكیشـی لـێ دەبێـتە سـەحرایەك، بارودۆخێكـی زۆر ناهەمواریشـی لـێ دەبێـتە حاڵەتێكی ئاسایی.

ئـەوەی لـە زیـندان فێـری بـووم ئەوەیـە كە پێشتر هەر دوعام دەكرد خوایە تووشی زیندان نـەبم، زیـندانو دیلـیو ئەوانـەم زۆر لەسـەر دڵ قـورس بـوو، بـەڵام بەڕاستی لە سایەی ڕەحمەتـی خـواو بـە هـۆی ئـەو ئیمانو ئیسـلامەوە كە خوای پەروەردگار بۆی هـیدایەت دابـووم، ئـەوەی كـە زۆر قورسـم تەسەور دەكرد، خوای پەروەردگار زۆر بۆی ئاسـان كـردم، لەبـەر ئـەوە، مـن ئـەوە فێربووم كـە مرۆڤ هەتا پشتی بە خوا بەستبێو پشـتی بـە خـوا قـایم بێتو بە خوداوە پەیوەست بێتو دەستی بە ڕێسای خواوە بێت، خـوای پـەروەردگار بـە مشـورخۆرو پشـتو پـەنای خـۆی بزانێ، ئەگـەر لـە قورسـترین بارودۆخـدا بێت، لـە ناهەموارتـرین بارودۆخـدا بێت، خوای پەروەردگار دەرووی خێری لـێدەكاتەوەو بارودۆخەكـەی بـۆ ئاسـان دەكـات، زۆر هەسـت بـە تـاڵاوو ئێشو ژانەكان ناكات.

**+ پێتوایە بەم قۆناغەی بە سەر ژیانی تۆدا هات، لەگەڵ ئەو قۆناغانەی پێشتر، كە زۆرێك بە سەروەریی دەزانن بۆ تەمەنی تۆ، بۆ كەسایەتیی تۆ، پێتوایە ناوی مامۆستا عەلی باپیر لە دوای زەمەنێكی تر، بۆ چەند دەیەیەكی تر، وەكو كەسایەتییەكی ئیسلامی دەچێتە ڕیزی ئەوانەوە كە پێشتر لە زینداندا بوونو ئێستا بە نموونە باس لە ژیانو كەسایەتییان دەكرێ؟**

- حەزرەتـی ئیـبراهیم (علیـه الصلاة والسلام) لە دوعایەكانیدا لە خوای پەروەردگار دەپاڕێـتەوەو دەفەرمـوێ: (وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ) (الشعراء: ٨٤)، خوایە نـاوی چـاكم بـە نـاو خەڵكدا بـڵاو بكەوە، منیش ئەو دوعایەم زۆر كردووە، لەسەر زاری موبارەكـی پێغەمبەریش ﷺ مـوژدەم پـێدراوە كـە ئەو وەزعە زۆر بە خێر گەڕاوە بۆ

مـن، بۆ دونـیاو قـیامەت، لـە خـوای پـەروەردگار داواکـارین بمانخاتـە ڕیـزی ئـەو کەڵـە پیاوانەوە.

مـن هـەر ئەوەنـدە دەڵـێم، ئەگەرنا، ڕەنگە لە دەمی موبارەکی پێغەمبەرەوە ﷺ زیاتریش وترابێ.

**+ بڕوات وایە هیچ یەکێ لەو سەرکردانەی بەعس کە لەسەر دەستی ئێوە لە زیـندانـدا تەوبـەیان کـردووە، دوای ئازادبوونـیان بـە دوای ئـێوەدا بگـەڕێن و بەڵێنەکانی خۆیان ببەنە سەر، کە پێیان وتوون "دەبینە پێشمەرگەت"؟**

ـ مـن پـێموایە ئەوانـەی کـە ڕاسـتیم زۆر پـێوە بینـیون، جۆش و خرۆش و حاڵەتێکم پـێوە بینـیون کـە پـێموابووە گۆڕانـی باشـیان بە سەردا هاتووەو باش کەوتوونەتە ژێر کاریگەریـیەوە، بەڵـی، پـێموایە وەفـادار دەبـن، مەرج نییە هەموویان، بەڵام پێموایە کە لە ناویاندا هەیە وەفادار بێت.

**+ بێبیـنە سـەر واقیعـی کـۆمەڵ، کاتـێك ئازادبـوون و بارودۆخـی نوێـتان خوێـندەوە، بەتایـبەت بارودۆخـی نـێوخۆی کـۆمەڵ، چـۆن لـەو سیاسـەت و بەرنامەیـە دەڕوانـن کـە دوای دەسـتگیرکرانی ئـێوە، کـۆمەڵ کـاری لەسـەر کردووە؟**

ـ بـە گشـتی پـێم وابـووە کۆمەڵ درێژەپـێدەری ئـەو بەرنامـەو سیاسـەتە بووە کە پێشـتر دارێـژراوە، بـەڵام پێشـموایە لـە ژێـر فشاری ئەو واقیعە ناهەموارەدا کە کۆمەڵی ئیسـلامیی تێکەوتـبوو، بـە تایبـەت بـە هـۆی ئەوەی من لە زیندانی ئەمریکادا بووم، کە کاتـی وا هەبـووە کـەس جورئەتی نەکردووە سەلام لە خەڵکی کۆمەڵی ئیسلامیی بکات، بەڵکـو جـاری وا هەبـووە خـەڵك پێـی خـۆش نەبـووە خەڵکـی کۆمەڵـی ئیسـلامیی سەلامیشـیان لـێ بکـات، نـەك هـەر ئامادەنەبـووە سـەلامیان لێبکات، پـێموایە لـە ژێـر فشـاری ئەو واقیعە ناهەموارەدا، ئەو بارودۆخە تفت و تاڵەدا، خەڵکی کۆمەڵی ئیسلامیی بـە قـیادەو قاعیدەیەوە، هەندێك نەرمکێشی و شلگیرییان کردووە، کە پێیان وابووە ئاوا نەبێت ناتـوانن بوونـی خـۆیان بپارێـزن، بـۆ ئـەوەش، بـە دڵنیایـیەوە دەبـێ تەقدیـری بارودۆخـی خـەڵك بکـرێ، وەکـو زانایـان فەرمـوویانە: (الفـتوى تخـتلف زمانـاً ومکانـاً

وشخصاً). مەبەستم ئەوەیە، تێبینم هەبووە لەسەر کۆمەڵێ شت، لەگەڵ برایانی سەرکردایەتی باسم کردووە، پێموابووە هەندێ نەرمکێشیو شلگیریو تەنازول هەبووە، من بڕوام بە موداراتی هەیە، بڕواشم بەوە هەیە کە فەتواو شێوەی هەڵسوکەوت لەگەڵ واقیعدا لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر دەگۆڕێ، بەڵام پێم وایە کە هێندێ شت، هێندێ نەرمکێشی کراوە، زیاد لە حەددی خۆی بووەو ئەوەندە پێویستی نەکردووە، بە تایبەتی لە دەستکارییکردنی بەرنامەو پەیڕەودا، هەروەها لە هێندێ هەڵوێستی سیاسییدا، ڕەنگە ئەگەر خۆشم لە ناو واقیعەکەدا بام، وام کردبایە، بەڵام ئێستا کە تەماشای واقیعەکە دەکەمەوە، پێم وایە هەندێ زیادەڕۆیی کراوە، بەڵام بە هۆی ئەوەی شتەکە لە بواری ئیجتیهاددا بووە، ئەو برایانە پێیان وابووە ئەگەر وانەکەن تووشی زەرەری گەورەتر دەبن، دیارە لە قاعیدەی شەرعیشدا هەر کاتێ مرۆڤ لە نێوان دوو زەرەردا قەراری گرت، دەبێ کامیان زەرەرەکەی کەمترە ئەویان هەڵبژێرێ، هیوادارم ئەو ئیجتیهادو بیرکردنەوەیەی برایان، بامنیش تێبینم لەسەری هەبێ، بکەوێتە بەر ئەو بنچینە شەرعییانەوە، پشت بە خوای گەورە، ئەگەر دوو پاداشتیشیان نەبێ لەسەر ئیجتیهادەکانیان، کە نەیانپێکابێ، پاداشتێکیان هەر هەبێ، چونکە مرۆڤ کە ئیجتیهاد دەکات لە شتێکدا، ئەگەر نەشی پێکێ، پاداشتێکی هەر هەیە، ئەوەش لوتفو کەرەمو بەزەیی خوایە.

**+ لە کاتی دەستگیرکرانی ئێوەدا، ڕایەك لە دەرەوەی کۆمەڵەوە دەیگوت: "بە دەستگیرکرانی مامۆستا عەلی باپیر، دیاردەی توندڕەوی لە ناو کۆمەڵی ئیسلامییدا کەم دەبێتەوە". ئێستاش ڕەنگە بگوترێ کە ئازادبوونی تۆ زیندووبوونەوەی توێژێکی توندە لە ناو کۆمەڵدا. چۆن لەم ڕایە دەڕوانیت؟**

ـ من وام هەستکردووە کە کۆمەڵی ئیسلامیی بە هی خۆم دەزانم، هەستم نەکردووە توێژو چینو تەبەقەو شتی تێدا بێت، هەمووی یەکەو منیش هی هەموویمو هەمووشی بە هی خۆم دەزانمو لە خزمەتی هەمووشیدام تا هەبمو تا کۆمەڵی ئیسلامیی من بە چاوساغو ئەمیری خۆی بزانێت، من بە براگەورەی خۆی بزانێت، ئەوانەی وا تەسەور دەکەن، لە ڕاستیدا نە منیان ناسیوەو نە کۆمەڵی ئیسلامیشیان ناسیوە، جارێ من کەسێك نیم کە بە ڕەوای بزانم ڕای خۆم فەرز کەم لەسەر خەڵك، پاشان کۆمەڵی

ئیسـلامیش وابـار نەهێنراوە شتی لەسەر فەرز بکرێ، ئێمە کاتی خۆی لە واقیعێك ڕامان کـرد، کـە کەسـێك دەیوسـت شـتەکانی خـۆی لەسەر خەڵکەکە فەرز بکات، لەبەر ئەوە، ئـێمە زۆر گـرنگیمان بـە ڕاوێـژو بـە شـووراو بـە پرسـوڕا بەیەکترکـردنو بـە یەکترئیقناعکردنو ئەوانـە داوە، بـەڵام بـە دڵنیاییەوە، من دەمەوێ شتێ کە لە قۆناغو هەلومەرجێکـی نائاسـاییدا شـل کـراوەتەوە، تـوندی بکەمـەوە، ڕەنگـە هەمـوو سـەرکردایەتیی کۆمەڵـی ئیسـلامیش لـەوەدا لەگـەڵ مـن هاوبۆچـوون بـن، بـەڵام واش چاوەڕێ ناکـەم هەمـوو ئەندامانـی سەرکردایەتیی کۆمەڵی ئیسلامیی لە ئاستی بەندەدا بـن، چونکە وەکو جارێك پێیانم گوت: ئەگـەر هەرچـی من دەیڵێمو لە توانامدا هەیە، ئێوەش لـە تـواناتاندا بێتو ئێوەش وا بڵێنو بـەو شـێوەیە بـن، ئـەی بۆچـی مـن برا گـەورەتانم؟ دیـارە دەبـێ مـن هێندێ شـتی زیـادەم پـێ بێ، جا دەبێ سەرکردایەتیی کۆمەڵـی ئیسـلامیی هـەوڵ بدات خۆی بێنێتە ئاستی من، نەك من نزم کاتەوە بۆ ئاستی خـۆی، ئـەوە ڕەنگـە ئامۆژگاریـی پێغەمـبەریش ﷺ بـێ بۆ من کە فەرموویەتی: خوای پـەروەردگار بـە هـۆی ئـەو نارەحەتـی و تاقیکردنەوانەوە تـۆی گـەورە کردووە، ئاگات لێبێ خەڵکێك بچووکت نەکاتـەوە. کەواتـە بـا کۆمەڵی ئیسلامیی بە قیادەو قاعیدەوە هەوڵبدات خۆی بێنێتە ئاستی ئەمیرەکەی.

لـە ڕاسـتیدا ئەوە یەکەم جاریشە ئەو تەعبیرە بەکار دێنم، من خۆم لە هیچ کەس بە زیـاد نـازانم، ڕەنگـە لـە هەمووان گوناهبارتر بم، چونکە بارم قورسترە، بەڵام بە ڕاستی ئـەوەش دەزانم کـە مـن هێندێ شتم پێیە، خەڵك هەمووی پێی نییە، لە بواری فیکریو ڕوحیو ئیمانیو پشت بەخوابەستن، بۆ نموونە" ڕەنگە برامان هەبێ کە پێی وایە ئەگەر پارتـیو یەکێتیـی لێت تووڕە بوون، دنیا دەڕووخێ، من پێموانییە دونیا بڕووخێ، برای وامـان هەبووە پێـی وابووە ئەگەر من لە پەرلەمان هەڵنەسمەوە، دونیا کاول دەبێ، نا دونیا کـاول نابـێ، قسـەکەی منـیش دەرچـوو کـەس هـەر باسـی نەکرد، دونیا بۆ کاول دەبێ؟ مـن کابرایەکـی ئیسـلامیم، بـەو شێوە کە ئیسلام دەڵێت، هەڵسوکەوت دەکەم، موداراتیش دەکەم، بەڵام موداراتیش سنووری خۆی هەیە.

جـا ئـەوەی وا تەسـەور دەکا کۆمەڵـی ئیسـلامیی نـەرم بێتەوە لە کاتێکدا من لێرە نەبوومو ئەگـەر هـاتم تـوند بێتـەوە، ئەگـەر مەبەسـت لـەوە بـێ کـە کۆمەڵی ئیسلامیی

کاتێك فشاری دێته سەر ناچار دەبێ هەڵوێستەکانی خۆی نەرم کا، ئەوە ڕاستە، منیشی تێدابم هەر ڕاستە، ئەگەر مەبەستیش لەوە بێ کە بە بوونی من بەرەو توندڕەوی دەچێو بە نەبوونی من بەرەو نەرمڕەوی دەچێ، ئەوە لە ڕاستیدا وانییە، منیش لێرەبام، لەو واقیعەی بە سەر کۆمەڵی ئیسلامییدا فەرزکرابوو، دیارە مودارایەکم هەر دەکرد، بەڵام ئێستا کە واقیعێکی دیکەیەو ئێمەش لە زیندانی ئەمریکا هاتووینە دەر، خەڵکیش چاوەڕوانی دەکات کۆمەڵی ئیسلامیی خۆی توندو تۆڵ کاتەوە، خۆی بەرەو پێش بەرێ، خۆی فراوان بکاتو بوونی خۆی قوڵترو چاکتر لێبکا.

**+ بۆ ماوەی بیستو دوو مانگ دابڕانێك لە نێوان ئێوەو بنەماڵەو برایان لە کۆمەڵی ئیسلامییو موسڵمانانی کوردستان دروست بوو، لە کاتێکیشدا ئەو بیستو دوو مانگە هەستیارترین قۆناغ بوو، ماوەیەکی دووردرێژە کوردستان، یان ئیسلامییەکان قۆناغی وا هەستیاریان بە خۆوە نەبینیوە. تا چەندێك هەوڵت داوە لەو زنجیرە نامەیەی کە درەنگیش دەگەیشتنە دەستی کەسوکارتو برایانی کۆمەڵی ئیسلامیی، قەرەبووی ئەو دابڕانە بکەیتەوە؟**

- پێشتر باسمان کرد، تا نزیکەی حەوت مانگ تێپەڕی بە سەر مانەوەی من لە زیندان، ئەوجا بواری ئەوەیان دا کە نامەکانیماڵەوەم پێبگات، ئەوەبوو ڕۆژێك زۆر گلەییم لێیان کرد، لە موحەقیقەکان، وتم زۆرم پێ سەیرە ئێوە هەڵسوکەوتێکی تایبەتی لەگەڵ مندا دەکەن، لەگەڵ ئەوەش کە تازە پێتان ڕاگەیاندووم هیچم لەسەر نییە، ئەی باشە بۆچی دەبێ من هیچ زانیارییەکم دەربارەی ماڵو خێزانم نەبێ؟ دەربارەی کۆمەڵی ئیسلامیی، دەربارەی دۆستو برایانم، دەربارەی واقیعی کوردستان، من نەك هەر بواری نامەیان نەدا بگاتە دەستم، بواری تەلەفۆنیشیان نەدا، کە ئەوانیتر بواری تەلەفۆنیشیان هەبوو، بەڵکو هەندێکیان بواری چاوپێکەوتنی کەسوکاریشیان هەبوو. دوای ئەو ڕۆژەی زۆر گلەییم لێیان کرد، دیاربوو لە نێو خۆیاندا تۆزێ مشتومڕیان بوو، وەك بڵێی هەستیان کرد کە لەسەر حەقم، یان بە مەزڵومیان زانیم، بەو وشەیە کە ئێستاش لە یادمە پێم وتن، من دووشتم جیایە لەوانەی ئێرە (سەرانی ڕژێم): یەکەم: ئیسلامییم، دووەم: کوردم، جا یان لەبەر ئیسلامەتیمە، یان لەبەر کوردایەتیمە، یان لەبەر هەردووکیانە، وتیان: "نا، ئێمە ڕێزمان بۆ ئیسلام هەیەو

لەبەر کوردیش نییە". وتم: ئەی لەبەر چییە؟ وتیان: "تۆ بچۆوە دوایی قسەیەکی لێدەکەین"، دوای ئەوەی تەحقیقەکە تەواو بوو، چوومەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، پێنج دەقیقە، دە دەقیقەی پێچوو موحەقیقەکە بۆ خۆی هاتو دە نامەی بۆ هێنام، دە نامەی حیجزکراو، کە دیارە زۆربەیان بەسەرچووبوون، واتە زانیاریی چەند مانگ لەوەو پێشیان تێدابوو، وتی: "ئەوە نامەکانتە"، منیش وتم: هیوادارم لەمەودوا ئەگەر نامە هات، زوو تەسلیمی بکەن، بۆ ئەوەی مرۆڤ زوو زوو ئاگاداری دەنگو باس بێ.

سەبارەت بە نامەکانیش کە دەمناردن، ئەوان کۆمەڵێ کۆتو بەندیان خستبووە سەر، **یەکەم:** دەبێ بۆ خزمی پلە یەکو دوو بێت، تەنیا بۆ خێزانو منداڵو باوکو براو خوشکو ئەوانە. **دووەم:** نابێ غەیری حاڵەتی ساغو سەلامەتیم هیچ شتێکی کەی تێدا بێت. دوایی من نامەکانم لە ماڵێ بینی، ئەگەر هەر وشەیەکی تێدا بووبێ، یان تەعبیرێکی تیادا بووبێ بە دڵیان نەبووبێ، هەموویان ڕەش کردۆتەوە، وەکو چۆن نامەکانی ماڵەوەش کە بۆم دەهاتن، ئەگەر دێڕێك، وشەیەکی تێدا بووبێ کوژاندبوویانەوە، کە زۆر مەراقم پێوە دەخواردو دەموت ڕەنگە یەکێکمان مردبێ، یان شتێکیان لێقەومابێ ئەوەیان بۆیە کوژاندۆتەوە، ئەوانەیان هەموو ڕەش دەکردەوە. ئەو نامانەش کە دەمناردن، بە پلەی یەکەم بۆ خێزانم بوو، دوای ئەو بۆ منداڵەکان، بۆ موحەممەدو عەبدوڕڕەحمان، بۆ کچەکانم، هەتا بۆ وردیلەکان، دیارە نامەکانی ماڵێ ئامۆژگاریو دڵدانەوەو ورە بەرزکردنەوە بوونو باسی بارودۆخی خۆم بۆ دەکردن، کە بارودۆخم باشەو خەمی منتان نەبێ، لە ڕووی جەستەییو دەروونیو کات بەسەربردن زۆرباشم. دەمویست دڵنیایان کەمو قەناعەتیان پێبێنم کە من هیچ گرفتێکم نییە، چونکە دەمزانی خەفەتم زۆر بۆ دەخۆن، ئینجا نامەم دەنووسی بۆ منداڵەکانو ئامۆژگاریم تیا دەنووسی بۆیان، کە لەسەر نوێژو تاعەتیان بەردەوام بن، لە نێو خۆیاندا کۆك بنو ڕێزی دایکیان بگرن، ڕێزی مامەکانیان بگرن، خوێندنیان باش بخوێنن، ئەخلاقو ڕەوشتیان جوان بێت، دەرسی قورئان بخوێنن، کامەیان زیاتر قورئان لەبەر کات، دوایی زیاتر دیاری دەدەمێ، ئەگەر هاتمەوە، دڵیشم خۆش دەکردن کە هیچ نییەو پشت بە خوا دەرووی خێر نزیکە، لە زۆربەی نامەکاندا ئەوانەم دەنووسی بۆ دڵخۆشکردنیان.

هـەروەها بۆ برایەکانیشـم، بەتایبەتـی بۆ کـاك عەبدولواحـید کە چەند نامەیەکی بۆ نـاردم، بۆ بـراژنم (خێزانـی کـاك عەبدولواحـید)، دوو سـێ نامـەم بۆ باوکم نووسـی، بۆ ئەبوبەکرو ئیبراهیمی برام، کە تا ئەوکاتە من نەمزانیبوو ئیبراهیم-یش هەر بەرنەبووە، سـێ نامـەم بۆ مامۆسـتا حەسـەن بابەکر نووسـی، دیـارە سـێ نامـەی بۆ ناردبووم لە وەڵامیدا، کاك موحەممەد حەکیم نامەیەکی ناردبوو وەڵامم دابوویەوە، کاك عەبدولستار نامەیەکـی ناردبـوو، وەڵامـم دابـوویەوە، هـەروەها کـاك ئەبوبەکری ژنـبرام نامەیەکـی نووسیبوو وەڵامم دابۆوە، ئەوە نامەکان، ئەوەی تر هەموو بۆ ماڵەوە بوو (بۆ خێزانم).

**+ ئەو نامانـەی مامۆسـتا حەسـەن بابەکـرو کـاك مـوحەممەد حەکـیم، هـیچ ئاماژەی سیاسییان تیا بوو؟**

ـ تـیایاندا نەبـوو، ئەگـەر تـیایاندا بـوایە، نـەیان دەهێشـت بگەنـە دەسـتم، یاخـود ڕەشـیان دەکـردنەوە، بەس ئەوەی کاك موحەممەد حەکیم ئەوەی تێدابوو کە ئێمە زۆر هـەوڵمان داوە پارێـزەرت بـۆ بگرین، من لە وەڵامیدا بۆم نووسییەوە" کاکەگیان، قبوڵ ناکـەم هـیچ شتێکی وا بکرێت، کە دوایی منی پێ ناشیرین بم، ئێوە خەمی منتان نەبێ، مـن لێیان بـێ منـەتم، ڕەنگـە ئێسـتا نامەکـە لای کـاك مـوحەممەد حەکیم پارێزراوبێ. ئـەوەی مامۆسـتا حەسـەن بابەکـریش هـەر نووسـیبووی ئێمە وەزعمـان باشـەو خەمـی تـۆمانەو چـاوەڕێین، کـەی دێیـتەوە؟ منـیش وەڵامـم دایـەوە، مـن زیاتـر هـەوڵم دەدا تەوجیهاتـیان بـۆ بنووسـم، بـۆیە دەمخسـتنە دووتوێـی هەنـدێ ئایـەتو فەرمایشـتی پێغەمـبەرەوە ﷺ، بـە ڕاسـتی هاتنـی نامـەکانو ناردنـی نامـەکان بـۆ من شتێکی زۆر باشـبوو، هـەروەها یـەك دوو وێنـەی منداڵەکانم پێگەیشـت، ئـەوەش بـۆ مـن زۆر جێـی دڵخۆشـی بـوو، وام تەسـەور دەکـرد ئێسـتا هەندێکیان نـەمابن، نامەکانیش بەین بەین تەماشام دەکردن، دڵم پێیان خۆش دەبوو.

**+ پـێش گەیشـتنی نامـەکان، یـان کـردنەوەیان، هـەواڵت لـە بـارەی مـاڵو منداڵتەوە هەبوو؟**

ـ نەخێر، هیچ هەواڵێك نەبوو.

**+ واتە وا هەستت دەکرد کە ئەوان تووشی ئەزیەت بوون؟**

ـ دیاره ئادەمیزاد جۆرەها تەسەور دەكا، بەڵام لە خوا بەزیاد بێت، خوای پەروەردگار واقیعەكانی بە خەون پیشان دەدام، چ واقیعی كۆمەڵی ئیسلامیی، ئەندامانی سەركردایەتی، برایانی مەكتەبی سیاسیی، بارەگاكان، مەڵبەندەكان، خوای پەروەردگار زۆریانی دەخستە بەرچاوم، دڵنیا دەبووم كە وەزع باشە، ئەگەرنا، هیچ زانیارییەكم نەبوو، بەڵكو زۆرجار موحەقیقەكان وەكو فشاری دەروونی دەیانگوت: "تۆ دیفاع لە شتێ دەكەی كە بوونی نەماوە، كۆمەڵی ئیسلامیی نەماوە، داری بە سەر بەردەوە نەماوە، هەمووی گیراوە، بارەگاتان هەمووی داخراوە". ئەم فشارانەش لەبەر ئەوە بوون كە زۆر پرسیاریان دەكردو بە دڵی ئەوان وەڵامم نەدەدایەوە، جار جار دەمگوت ڕەنگە ڕاست بكەن، بەڵام لە ڕاستیدا هەر جارێ دڵم سەغڵەت دەبوو، دوعام دەكرد، خوای پەروەردگار بارودۆخەكانی دەخستە بەرچاوم كە وانییە، من دڵنیا دەبووم كە وانییە، (سبحان الله) زۆرجار خەوم بە ماڵەوە دەبینی لە هەولێرن، زۆرم پێ سەیر بوو، باشە ماڵمان لە سلێمانی بوو كە هاتووم، زۆریشم پێ سەیر بوو، خەونم دەبینی كە من دەچمەوەو دەگەڕێمەوە بۆ كوردستانو دەچمەوە هەولێر، ئیدی ئەوەم بۆ تەفسیر نەدەكرا، تا دوایی زانیاریم بۆ هات لە نامەكاندا كە: ئێمە ماڵمان گواستووەتەوە، لە خۆمان ترساوین، ئەوجا تێگەیشتم بۆچی من هەر بە زۆری خەونم بە هەولێرەوە دەبینی.

+ یەكەمجار لەگەڵ كێیاندا بە تەلەفۆن قسەت كرد؟

ـ لەگەڵ خێزانم، ئەویش قەیدیان خستبووە سەر كە دەبێ من بە عەرەبی قسە بكەم، وتم ئاخر ئەوان لە عەرەبی تێناگەن، یەك دووجار هەر بە عەرەبی قسەم دەكرد، شتێكی زۆر ناخۆشبوو، من بە عەرەبی قسەم دەكرد، ئەوان (ماڵەوە) تێنەدەگەیشتن، یان چاك حاڵی نەدەبوون، بە هەرحاڵ لە نامەیەكدا بۆ خێزانم نووسیبووم: "دیارە دیموكراسییەتی ئەمریكا جێی زمانی كوردی تێدا نابێتەوەو وەرگێڕی كوردییان چنگ ناكەوێ". پێم وتن باشە خۆ كورد زۆر لەگەڵتاندا هاوكارن، چۆن یەكێكتان دەست نەكەوتووە بێت بۆ ئێرەو تەلەفۆنەكانی من تەرجەمە بكات؟ جاری واهەبوو (٥ ـ ٦) مانگی پێدەچوو ئەوجا وەجبەیەك نامەیان تەسلیم دەكردم، جارێك بیست نامەیان

پێکەوە تەسلیم کردم، دەیانگوت: "وەرگێڕی کوردیمان لا نییە بۆمان وەرگێڕێ".
لەبەر ئەوە، ژمارەیەك لە نامەکانیشم بە عەرەبی دەنووسی.

**+ لە ئەڵقەی یەکەمی دانیشتنەکەماندا، زۆر بە کورتی ئاماژەت بە ڕۆژی ئازادبوونت دا، بەڵام ئەگەر دەکرێت لە بەغداد هەتاکو کەرکووك، بە کورتیش بێت بۆمان باس بکەیت کە هاتنەوەت چۆن گوزەرا؟**

- ڕۆژی ڕزگاربوونم، ئێوە هەر دەڵێن ئازادبوون، منیش دەڵێم ڕزگاربوون، ئەو شەوە من لە بەغداد نەخەوتم، لەبەر ئەوە وتم دیارە بەیانی خەڵك پێشوازییم لێدەکا، بەڕاستی نەشم دەزانی بەو قەبارەیە دەبێ، بەڵام وتم خۆ ڕەنگە هەروابێ‌و پێویست کات من هێندێ قسەیان بۆ بکەم، پێم خۆشە بزانم دنیا چی لێهاتووە، کەم تا کورتێك شتێکم ئاگا لێبوو، بەڵام وتم زیاتر بەرچاوم ڕۆشن کەنەوە. ئەو شەوە کاك موحەممەد حەکیم‌و مامۆستا موحەممەدی سینەمۆکی‌و کاك یوسفی برای حاجی دڵشادو کاك ئەنوەر شەمێرانی‌و کۆمەڵێك برای دیکە لەوێ بوون، بە نۆرە یەکێکم دەخەواند ئەوی دیکەم بانگ دەکرد، دەمگوت: وەرن بۆم باسکەن، لە کاتێکدا شەوی پێشتر زۆر ئەزیەتم خواردبوو شوێنەکەم نەگونجاو بوو، لە ڕێگەش هەموو دەستو پەلم پێچرابوون، دوو سێ سەعات لە ناو زرێپۆشدا بووم، هەر زۆر نارەحەت بوو، پێنجشەممەکەی کە هاتمەوە، بەڕۆژووش بووم، بەڵکو هەموو ڕۆژەکان بەڕۆژوو بووم، وەکو پێشتر باسم کرد، حەوت مانگ بەر لە بەربوونم لەسەر یەك بەڕۆژوو بووم.

ئیدی ئەو شەوە نەخەوتم، بۆ بەیانییەکەشی، دوای نوێژی بەیانی یەکسەر هاتین، ئەوی ڕاستی بێت کە دەهاتین، وردە وردە کاك موحەممەدو ئەو برایانە قسەیان دەکرد، دوایی خەڵك کە زانی من هاتووم، ئەوجا دەستیان کرد بە تەلەفۆنکردن، هەر فریا دەکەوتم وەڵامی تەلەفۆنەکان بدەمەوە، یەکی دوو قسەیان لەگەڵ بکەم، تا هاتینەوە ناو دووزو لەوێ لاماندا، خۆم شۆردو قاتێکیان بۆ هێنام‌و خۆم گۆڕی، دووبارە کەوتینەوە ڕێگا، بە ڕاستی زۆرم دوعا دەکرد، دەمگوت ڕەنگە قەرەباڵغی بێت، دوای ئەوەی کە دەمزانی قەرەباڵغییەکی زۆرە، دەمگوت خوایە ئەو خەڵکە سەلامەت بێت‌و هیچیان لێنەیەت، ڕووداوی ئۆتۆمبێل‌و کارەسات نەبێ، دوعام دەکرد: خوای پەروەردگار شتی وام بخەیتە سەر دڵ کە بە کەڵکی ئەو خەڵك‌و جەماوەرە بێ،

ئەو برایانە دەیانگوت: "مامۆستا، دنیا زۆر گۆڕاوە، زۆرشت وەك خۆی نەماوە". دەمگوت: خوایە ئەوە دنیا زۆر گۆڕاوە، شتی وای تێدا بڵێم بە کەڵك بێ، شتێکی وا نەڵێم کە هەڵە بێ، یان تۆ پێت ناخۆش بێ، یان بۆ موسڵمانان زەرەر بێت، خەریکی ئەوەبووم لە کاتی گەرمەی هاتنەوەدا، لەگەڵ وەڵامدانەوەی ئەو تەلەفۆنانەی برایان دەیانکرد.

**+ لەو کاتەی گەیشتییە ناو ئەو خەڵکە زۆرە، چاوەڕێی پێشوازییەکی لەو جۆرە هەبووی؟**

ـ نەمدەزانی بەو قەرەباڵغییە زۆرە دەبێت، بەڵام وردە وردە هەر لە ڕێگە بۆم مەعلوم دەبوو کە لە هەموو شوێنەکانەوە خەڵك هاتوون، چونکە تەلەفۆنیان دەکرد، بەڵام دوایی تەوەقوعم وانەبوو، دەمگوت ڕەنگە نەتوانرێ ئەو هەموو قەرەباڵغییە لەوێ کۆبکرێتەوە، پێشبینیم دەکرد (٤ ـ ٥) هەزار کەسێك بێت، بەڵام ئەوە بە (٤٠ ـ ٥٠) هەزارێك دەخەمڵێنرا، پێشبینیم نەدەکرد.

**+ یەکەمجار منداڵەکانی خۆت بینی یان خەڵك؟**

ـ خەڵکم بینی، منداڵەکانی خۆم، ئەگەر بڵێم هەر نەمبینین، عەبدوڕڕەحمان-م لە ناو خەڵکدا بینی، گەورەش بوو بوو، لە پێشدا خەریك بوو نەیناسمەوە، تۆزێك گریاو وتی: "بابە". ئەوجا وتم تۆ عەبدوڕڕەحمان-یت، ماشائەڵڵا زۆر کەڵەگەت بوو بوو، خێزانم نزیك کەوتەوە لە ئۆتۆمبێلەکەو تەماشای منی کردو ویستم دەرگای بۆ بکەمەوەو بێتە ناو سەیارەکەوە، قەرەباڵغییەکی زۆر بوو، وتم ئەگەر لە ناو ئۆتۆمبێلەکەدا بێت، ڕەنگە برایان تۆزێك شەرم بکەن‌و بکشێنەوە، ئیدی دوایی لەبەرچاوم ونبوو، دوایی خۆی بۆی گێڕامەوە، وتی: "کە چاوم بە تۆ کەوت، بوورامەوە". منداڵە بچووکەکانیشم نەبینی، چونکە قەرەباڵغی بوو، موحەممەدیشم بینی‌و لەگەڵ من سواربوو، دوایی بابیشم هات‌و خستیانە ناو ئۆتۆمبێلەکە، ئیدی کە هاتمەوە بۆ سلێمانی، ئەوانم لەگەڵ بوو.

**+ ئەو گوتارەی جەنابت لە (چیمەن) دات بۆ ئەو خەڵکە، لەلایەن ڕۆشنبیرانی عەلمانییەوە زۆر بە چاکیی پێشوازیی لێکراو دەستخۆشییان**

**دەکرد[18]، ئایا ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوان پێشتر مامۆستا عەلی باپیریان نەناسیوە، یان ئەو وتارەی لەوێ دات شتێکی زۆر تایبەت بووە، بەتایبەت سەبارەت بەو هەڵوێستەی کە تۆ دوو ساڵ بگیرێیت‌و بێیتەوە دەستخۆشی لەوانە بکەی کە دەستیان لە رزگار کردنتدا هەبوو، کەس تۆمەتبار نەکەی‌و داکۆکی لە هێندێ بنەمای نەتەوەیی خۆت بکەی؟**

- جا من وتارەکەم بونیادنابوو لەسەر کۆمەڵێ بنەمای نەگۆڕ، واتە مەبادیئی ئیسلامیی کە زیندان‌و ناڕەحەتی‌و سەرماو گەرماو گۆڕانی بارودۆخ نایانگۆڕێ، کۆمەڵێك نەگۆڕی ئیسلامیی هەن: مرۆڤ میللەتی خۆی خۆش بوێ، پشتی بە خوای خۆی قایم بێت، پاشان دڵی بە میللەتی خۆی خۆشبێ‌و بۆی دڵسۆز بێت، هەرواش هەمیشە بۆ خاڵی ئیجابی بگەڕێ لە خەڵکداو بە بیانوو نەبێ لە خەڵك، ڕەنگە من کۆمەڵێ شتم لە دڵدا هەبووبێ بەرانبەر بە کەسانێك، بەڵام چاك وایە بۆ خاڵی ئیجابی بگەڕێم، کابرایەك من چاکەشم لێبینیوەو خراپەشم لێ بینیوە، چاکەکەی ببینم باشە، پاشان لە زیندان ئەمریکییەکان دەیانگوت: "فلان لایەنە هاوکاریی ئێمەی کردووە"، یان هێندێ شتیان باس دەکرد، بەڕاستی دەمگوت: نەخێر، هەر ئێوە دەناسم، خەڵکێکیش هاوکاریی ئێوەی کردبێ، ئەگەر خۆتان قەناعەتتان وانەبوایە، منتان نەدەهێشتەوە، باشە ئەوە خەڵکیش هاوکارن، کە بۆتان دەرکەوت ئەو خەڵکە درۆ دەکات، ئەی بۆچی هەر دەمهێڵنەوە؟ کەواتە سیاسەتی خۆتانە.

**+ یەکەم خواردن کە دوای زیندان خواردت، چی بوو لە کوێ بوو؟**

- لە بەغداد، کاك یوشوو ئیبراهیم لە ماڵی خۆی دەعوەتێکی باشی بۆ کردین، هەندێك لەو خواردنانە دوو ساڵ بوو نەمدیبوون، لەوێ نانێکی باشی داینێ، بەڕۆژووش بووم، زۆریش ماندوو ببووم، چونکە من بە کەلەپچەکراوی هێنایانم، بەربانگم لە ماڵی ئەوان کردەوەو خورمایەکی زۆر نایابی هێنا، هەروەها ماستاوێکی خۆش، خوا ماڵی ئاوا کات، بەربانگێکی باشم لەوێ کردەوە، ماستاو لەوێ هەر نەبوو، یەکێ بوو لەو

[18] دەقی گوتارەکە لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا دەخوێنیتەوە.

شتانەی بیستو دوو مانگ بوو لێی مەحرووم بووین، جار جار ماستیان دەهێنا، کەم کەم، بەڵام ماستاوو دۆی لیّ نەبوو.

**+ لە زیندان حەزت لە چ خواردنێك بوو، ئەگەر دەستت بکەوتایە؟**

ـ من لە ماڵیش تەبیعەتم وایە، خێزانم دەڵێ بە ئاواتەوەم جاریّ بڵێیت کەیفم لە فلاّن خواردنەو حەزم لە فلاّنە خواردنە، لەخوا بەزیادبیّ (نەوسن) نیم، هەرچی بێت قەناعەتی پێدەکەم، بەڵام کە بەدەن نوقسانی پەیدا دەکات لە ڤیتامین سی، یان ڤیتامین دی، یان پرۆتینات، مرۆڤ دڵی بۆی دەچیّ، بەڵام وەنەبیّ من تامەزرۆی خواردنێکی تایبەت بووبم، بەڵام هێندیّ لە خواردنەکانی زیندانم هەر نە دەخوراد، دوایی ژەمێکیان خستە گەڵ کە خواردنی سازکراو بوو، باشبوو، بەڵام نانی لیّ نەبوو، خێزانم نامەیەکی عاتیفی بۆم نووسیبوو وتبووی: قسەکانی من زۆر بیّ سەروبەرەن، وەك هی تۆ نین، تۆ قسەی بەڕیّو جیّ دەکەیت، من هەر ئەوە دەزانم، منیش بۆ نووسیبووم: نا، قسەکانت لە نانی کوردی خۆشترن، کە ئەمڕۆ بیستو دوو مانگە نەمخواردووە. جا پێم خۆشبوو نانم دەست کەویّ، هەروەها ئەو خواردنە کوردەوارییانە کە مرۆڤ جار جار یادیان دەکات، بەڵام بڵێی زۆر بۆیان تامەزرۆ بووم، یان زۆر کاریان تێکردبم، وانەبوو، لەویّ جاری واهەبوو یەك سەعات سەرانی ڕژێم، دوو سەعات باسی خواردنیان دەکرد، یەکیان دەیگوت: "ئێستا کەللەو گیپەیەك سازکرابایە"، ئەوی دیکەیان دەیگوت: "ئێستا برنجێکی ئاواو کشمیشی بە سەرەوە بیّو.."، یەکێکی تر دەیگوت: "ئێستا کفتەیەکی حەلەبی هەبوایە". ئاوا باسی جۆرەها خواردنیان دەکرد، دەیانگوت: "شێخ، ئەی تۆ کەیفت بە چی دیّ؟"، دەمگوت: وەڵڵا لە بەردی نەرمتر بێت، پێی ڕازیم!

**+ دەمەویّ بڵێم لە زیندان پێت وابوو لەسەر هەڵەی خۆت یان کۆمەڵی ئیسلامیی دەستگیرکراویت، یان هەر سروشتی کاری ئیسلامیی وایە کە تووشی زیندانو ناڕەحەتی بیّ؟**

ـ ئەوەی من هەر باجی موسڵمانێتی بوو، هیچی کە نەبوو، پێموایە کاری ئیسلامیی، دینداریو موسڵمانێتی هەروایە، ئەگەر مرۆڤ هەر موسڵمانبیّو لە ماڵی خۆشی بیّ،

خوای پەروەردگار تاقی دەکاتەوە، ئەگەر موسڵمانێکی ڕاست بێو هەر لە ماڵی خۆی بێو کاری ئیسلامیش نەکات، تووشی گرفتاریو نارەحەتیو تاقیکردنەوە هەر دەبێ.

بێگومان ئەوەی من هەر باجدانی موسڵمانێتیو دینداریی بوو، دوایش دەرکەوت کە هیچم لەسەر نەبوو، هەر ئەوەندە بوو موسڵمانێتییەکەم مابووەوە، جگە لە موسڵمانێتیو ئیسلامیی، هیچی کەم خۆ لەسەر نەبوو، کەواتە هێڵدرانەوەکەم بەس لەبەر موسڵمانێتییەکەم بووە، لەبەر ئەوە کە من بڕوام بەوە هەبوو ئیسلام بەرنامەی ژیان بێ، ئەوان لێیان پرسیم، من گوتم: با سەری یەکتر نەیەشێنین، من بڕوام بە ئیسلام هەیە، ئەو ئیسلامەی کە بەشێکی سیاسەتەو جیهادەو مقاوەمەیە لە شوێنی خۆیداو لە کاتی خۆیدا، ئیسلام بەو شێوەی کە لە قورئانو سوونەتدا هاتووە، لەگەڵ هەمووییدام و لەدەستم بێ ئیش بۆ هەمووی دەکەم، بە فاریزەوە لە خزمەتی قورئانو سوونەتی پێغەمبەرم ﷺ، وتیان: "ئا ئاوا"، وتم: بەڵێ بەو شێوەیە، وتیان: "بە دەوڵەتی ئیسلامییشەوە؟"، وتم: بە دەوڵەتی ئیسلامییشەوە، بە هەموویەوە. جا من پێموایە ڕەنگە مەترسی ئەوەیان بووبێ کە ئێمە زەرەرێك لە ئەمنی قەومیی ئەوان بدەین، کەواتە دەرکەوت من هیچ شتێکم لەسەر نییە، هەر بۆ موسڵمانێتییەکەیە، مانای وایە من لەبەر موسڵمانێتی مابوومەوە.

**+ لە دوای نزیکەی دوو ساڵ لە ئەزموونی نێو زیندان، ئەگەر کەسێك ئێستا دەستگیر بکرێت، یان بڕیار بێت دەستگیر بکرێت، بێتە لای جەنابت، چ ئامۆژگارییەکی دەکەیت؟**

ـ جارێ ئامۆژگاری ئەوەی دەکەم کە گرتنو لێدانو نارەحەتیو گرفتاری بە شێوەیەکی ئاسایی وەربگرێت، لە پێشەوە پێشبینی بکات کە یان نابێ بڵێی موسڵمانمو خاوەنی ئیمانم، یان کە گوتت، دەبێت ئەوە لە پێش چاوی خۆت بگری کە تووشی نارەحەتیو گرفتاری دەبی. ئەوە یەك، پاشان کە دەکەویە ناو بۆتەی تاقیکردنەوەوە، مرۆڤ لە بیری نەچێت کە خوایەکی هەیەو خاوەنێکی هەیە، بڵێ خوایە ئەوە تووشی تاقیکردنەوە بووم، بەڵام سەرمخەو پشتم بگرەو سەربەرزانە ڕزگارم بکە، بەو مانایەی لەو تاقیکردنەوەیە بڕوانامەیەکی باش وەربگرمو تەوفیقم بدە، لە بیری نەچێتەوە کە خاوەنی هەیەو بێخاوەن نییە، چونکە هیچ شتێك هێندەی نائومێدیو

خۆ بێخاوەن زانین کار لە مرۆڤ ناکات، هەرکاتێك مرۆڤ ورەی ڕووخا، بەدەنیشی دادەتەپێ، بەڵام مرۆڤ کە لە ڕوحو دڵەوە بەهێزبوو، بەدەنیشی تەحەمولی هەموو شتێك دەکات.

سێهەمیش، بزانێ کە خوای پەروەردگار حەکیمەو کاربەجێیە، هەتا ئەو کاتە کە خوای پەروەردگار بە بەرژەوەندی دەزانێت بۆ دونیاو قیامەتی، دەیهێڵێتەوە، هەرکاتێ خوای پەروەردگار زانی ئەو بەرژەوەندییە تەواو بووە، دەربازی دەکات، واتە بزانێت کە هەموو شتێکی خوای کاربەجێ موقەددەرەو نەخشە بۆ کێشراوەو ئەندازەگیری کراوە، وانەزانێت کە ئەوە بێسەرو بەرەییە، (إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ) (القمر: ٤٩)، ئەوە زۆر شتێکی گرنگە، بۆ ئەوەی کە بزانێت ئەوە ئیرادەی خوای پەروەردگارە کە هێناویەتی بۆ ئەو شوێنە، هەرکاتێکیش حیکمەتی خوای پەروەردگار وای خواست دەرباز بێت، دەربازی دەکات.

پاشانیش خۆڕاگر بێت، ئەو مەرجانەی کە بۆیان دانابووم، ئەگەر ئیمزام کردبا، ڕوخسەت بوو، دەرفەتی تێدابوو، موکرەهبووم، کابرا دەڵێ ئەگەر ئیمزای نەکەی، بەرت نادەم، منیش موکرەهم، بەڵکو لەوەش زیاتر، کابرا ئەگەر هەڕەشەی لێبکرێ بەوەی لە زیندان دەیهێڵنەوە، دەتوانێ وشەی کوفریشی بە دەمدا بێت، بەڵام من کارم بە عەزیمەت کرد، جیاوازییەکەشی بیستو چوار سەعات بوو، جیاوازییەکی ئەوە کە بەسەربەرزانە بێمە دەر یان بە عەیبداری، ئیش بە عەزیمەت کەم یان بە ڕوخسەت، بیستو چوار سەعات بوو، شەوو ڕۆژێك دوای ئەوە من ڕزگارم بوو، بەو شێوە کە لە خۆم دەوەشاندەوە، بەو شێوەیە هاتمە دەر، کەواتە موسڵمان خۆڕاگر بێتو لەسەر پەلەپەل‌و لەبەر لاوازی خۆی ناشیرین نەکات.

**+ دوو ساڵی تەمەنی مرۆڤ، زۆر جار کەموکوڕیشی تیایە، زۆر جار لایەنی زۆر بە هێزیشی تیایە، ئەگەر چی ئەوانەی تۆ زۆر بەیان جێگەی شانازین، بەڵام ئەو هەڵوێستەی تۆ کامەیە کە لێی پەشیمانی، سەیری ئێستا ئەکەیتەوەو ئەڵێی بریا ئەوەم نەوتبایەو وام نەکردایە؟ لە ماوەی دوو ساڵی زیندانیش، یان ئەو هەڵوێستە کامەیە زۆر پێی دڵخۆشی، زۆر جێگەی شانازییە کە ئێستا دەیبینیتەوە؟**

ـ لە فەزڵی خوا بەزیاد بێ، هەر شتێکم گوتبێ، پێشتر زۆر دوعام لە بارەوە کردووە، ئیستیخارەم کردووە، کە زانیومە تەحقیقە، زۆر پاڕاومەوە: خوایە چی چاکەو تۆ پێت چاکەو مەسڵەحەتەو ڕاستە، بیخە سەردڵو زمانم. لە خوا بەزیاد بێ، شتێکم پێ شك نایەت کە بڵێم بریا ئەوەم نەگوتبا یان وام گوتبا، وەڵڵاهی چی بەچاکم زانیوە، گوتوومە، چی بە ڕاستم زانیوەو بە باشم زانیوە، گوتوومەو کردوومە، من پرسیاری هێندێ خەڵکی موسڵمانیان لێکردووم، هەروەها خەڵکی خۆمان، هەوڵم داوە هەموو شتەکان بخەمە سەر ملی خۆم، وتوومە من بەرپرسی هەمەکارەی کۆمەڵی ئیسلامییم، لە لایەنی سیاسی، سەربازی، هەرشتێکتان دەوێ من لێی بەرپرسیارمو هیچ کەس مەگرن، هیچ کەس ناڕەحەت مەکەن، دیارە ئەوە فەزڵو تەوفیقی خوایە بۆ مرۆڤ، دیارە کەموکورتیش هەر دەبێ، من ڕەنگە لە شتی دیکە کەموکوڕیم هەبوو بێ، پێم خۆشبوو زیاتر تاعەتم کردبایە، زیاتر تەزکیەی نەفسی خۆم کردبایە، زیاتر لەگەڵ قورئان خەریك بام، زیاتر خۆم ماندوو کردبایە، زیاتر لەگەڵ ئەوانەی دەوروبەرم خۆم ماندوو کردبایە، بەڵام لە مەسەلەی تەحیقیقو هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەمریکییەکانو ئەوانە، لە خوا بەزیاد بێ شتێکم پێ شك نایە کە بڵێم بریا وام نەکردباو وام کردبایە.

**+ ئەگەر پێش دەستگیرکرانت دوو ئیختیاریان پێ بدایتایە، دوو ساڵ زیندانی لە سجنێکی ئینفرادی بەو ناڕەحەتیانەوە، یان کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵوەشێنیتەوە، چیت دەکرد؟**

ـ کەمتر لەوەشم ڕەفز دەکرد و بێگومان هەر زیندانم هەڵدەبژارد، بگرە ئەوان پێیان عەیب بوو شتی وا لەگەڵ من باس کەن[19]، چونکە هەر لە سەرەتاوە قسەی خۆم بڕییەوە، وتیان: "ئاخر ڕەنگە ئەو قسانە وا پێویست کات ئێمە بت بەین بۆ گوانتانامۆو چاوت بە دونیا نەکەوێتەوە، جوان فکری لێبکەوە"، وتم: باش باشم فکر لێکردۆتەوە، هەرچی بێت، هەموو ئەوانە لە مردن پێم ئاسانترن، ڕەنگە خەڵکی تر وای تەسەور کردبێ: ئایا داوایان لێ نەکردووی هاوکاریی ئەوان بکەی؟ ئەسڵەن پێیان عەیب بوو شتی وا لەگەڵ من باس بکەن، لە خوا بەزیاد بێ وام ڕاهێنابوون کە پێیان

[19] واتە بەردرانم لە بەرانبەر تەنازولکردنێك شتێکدا.

عـەیب بـوو ئـەو شـتانە لەگـەڵ مـن بـاس بکـەن، هـەتا پێـیان عەیب بوو بڵێن تۆ دوایی قسـەمان لەسـەر مەکـە، یـان وا مـەڵێ یـان وا مەکـە، گوتـیان: "قسـە دەکەی؟" گوتم: بەڵێ، دەیانگوت: "لەسەرمان دەنووسی؟"، گوتم: بەڵێ.

**+ ئەگـەر بەڕێـزت ببیـتە سـەرۆکی وڵاتـێك، ئـەو وڵاتـەی تـۆ زیندانـی هاوشێوەی ''کرۆپەر''ی تێدا دەبێت؟**

- نـەوەڵڵا، ئەگەر دەسەڵاتێکی ئیسلامیی ناچاریش بێ مرۆڤێك زیندانی بکات، با لە ژوورێکـی تـۆزێ گـەورەی بکـات، ئیـنجا ئـەو ژوورە پێداویستییەکانی مرۆڤی تێدا بێت، هەر لە ڕووناکی، لە پاکو خاوێنیو لەو شتانە.

**+ لـە سـەردەمی دەسـەڵاتی جـۆرج بوشـدا، تـۆ دوو سـاڵ زیندانـی بـوویت، ئەگەر ڕۆژێك بۆش ببینی، چی پێ دەڵێی؟**

- پێی دەڵێم ئەگەر پیاوی گەورە هەڵەی هەبێت، هەڵەکەشی بە قەد خۆی گەورەیە، تـۆ کـە سـەرۆکی وڵاتێکـی وەکـو ئەمریکا بووی، دەتەویست ئەمریکا دەسەڵات بە سەر هەمـوو دونـیادا بگرێت، کەسێك خولیای هێندە گەورەی هەبێت، دەبێ عەقڵیشی هێندە گـەورە کـات، دڵیشـی ئەوەنـدە گەورە بێو ئەخلاقیشی ئەوەندە گەورە بێت، ئەگەرنا، پێـی عەیبدار دەبـێ، مەسـەلە هـەر ئەوەندە نییە ناوی گەورە لە خۆت بنێی، دەبێ کە نـاوی گـەورەت لـە خـۆنا، ناوەڕۆکی گەورەشت هەبێ، عەقڵێکی گەورە، دڵێکی گەورە، ئەخلاقێکـی گـەورە، ئەگـەرنا، لەسـەر نـاوە گەورەکـەت عەیبدارو ناشیرین دەبی، ئاوام پێدەگوت، وەکو ئێستا وای لێهات، پێی عەیبدارو ناشیرین بوو.

**+ ئەگەر بڕیار بێت من سەلامی تۆ بگەیەنم بەو ئەمریکییانەی لە زینـدان ناسیوتن، لە پاسەوان، لە موحەقیقو هەریەکێك لەوانە، تۆ پێم ئەڵێی سەلام لە کامیان بکەم؟**

- دەڵێم سەلام لەوانە بکە کە یاسای ئەمریکییان بە باری ئیجابیدا جێبەجێ دەکرد، نـەك بـە بارە سلبییەکەیداو میزاجی باشی خۆشیان دەکردە پارسەنگی یاساکان، کە بە بـاری ئیجابیدا جێبەجێیان دەکرد، نـەك میزاجی خراپی خۆیان بکەنە پارسەنگی بارە سـلبییەکەی، چـونکە بـە ڕاستی هەمووی یەك یاسا بوو، هەبوو زۆر بە ویژدانانە، زۆر بە

جوامێرانەو بە ڕێزەوە مامەڵەی دەکرد، هەبوو قینلەدڵو بوغزاویانە مامەڵەی دەکرد، جارێك لە یەکێکیانم پرسی کە عادەتی وابوو هەر جارێك نۆرە پاسەوانی ئەو بوو، پەنجەرەکانی دادەخست، یان ڕۆژی واهەبوو سیازدە سەعات پەنجەرەی دادەخست، شەویش هەر تاریك، ڕۆژیش هەر تاریك، ئەوکاتە کارەباشی تیانەبوو، لێم پرسی: ئەوە تۆ هێندێ شتت دەکرد، هۆکەی چیبوو، بۆ وات دەکرد؟ ئەوانی دیکە وەکو تۆیان نەدەکرد، وتی: "ئاخر ئێمە دەسەڵاتمان هەبوو وا بکەین، من وام بەباش دەزانی"، وتم: ئەی ئێمە بەنی ئادەم نەبووین؟ ڕووناکییەك، هەوایەك هەبوایە؟ وتی: "وەڵڵا ئێمە دەسەڵاتمان پێدرابوو، ئیدی من خۆم وام پێ باشبوو"، ئەوەشی گوت، کە ئەگەر ئێستا بام، وام نەدەکرد، وتی: "ئێستا من پەشیمانم لە هەڵسوکەوتی ئەوکاتەم، بەڵام ئەوکاتەش من لە یاسای ئەمریکی لام نەداوە، من دەسەڵاتم هەبووە واش بکەمو واش نەکەم، من لای توندییەکەم دەگرت".

**+ ئەی کەسی وایان تێدا نییە کە بتوانی پێم بڵێی سەلامی پێ بگەیەنە؟**

ـ با، بەس دەترسم تووشی بەڵایەکی بکەن، دەنا سێ چوارێکیان (ناوەکانیشیان لە مێشکمدایە) خۆشخولق بوونو بەڕێز بوون لەگەڵمان، قەڵەمیان بۆ من دێنا، یەکێك نەخۆش دەبوو لێیان دەپرسیو دکتۆریان بۆ بانگ دەکرد، هەشبوو ئیهمالی دەکرد.

**+ پاش ئازادبوونت، خەڵکی زۆر ئەهاتن بۆ لاتو بۆ بەخێرهێنانەوەت، قسەی زۆر سەیریان دەکرد، من زۆر جێگەی تێبینیم بوون، کام قسەیان زۆر جێگەی تێبینیت بوو؟**

ـ قسەیەك کە زۆریان دەیانگوت، دەیانگوت: "مامۆستا زۆرمان دوعا بۆ کردووی"، یان "زۆرمان پێ خۆشبوو هاتیتەوە"، لەبەر زاڵبوونی عاتیفە بە سەر وەزعەکەدا، نەیاندەزانی چۆن دەری ببڕن، ئاوا قسەکانیان تێکەڵ دەکرد، دووبارەیان دەکردەوە، هەبوو دەیگوت کە چەند جار لە کاتی بانگ لەگەڵماڵو منداڵم خواردنەکەمان نەخواردووەو وتوومانە دەبێ ئێستا فلان کەس چی بخوات؟ جا بەڕاستی من کە ئەو شتانەیان بۆ باس دەکردم، هەروەها ئەو پێشوازییە جەماوەرییە گەرمانە کە لە چیمەنو پاشان لە سلێمانیو دوایی لە هەولێر و ئنجا لە بتوێنو پشدەرو پاشان لە

هەڵەبجەو لە باقی شوێنەکانی تر بینیمن، دوایش هەندێ لەو فیلمانەم بینییەوە کە لە ڕێپێوان و ئیمزاکۆکردنەوەو کۆڕگرتن بە بۆنەی ساڵوەگەڕی گرتنی بەندەو ئەوانەو هەندێ لە نووسینەکان لە ڕۆژنامەی (کۆمەڵ)دا دەمخوێندنەوە، هی خۆمان و هی خەڵکی تر، ئێستا زۆر خۆم بە قەرزدارو منەتباری ئەو خەڵکە دەزانم، مەگەر بە دوعای خێر، خوای پەروەردگار بۆ خۆی پاداشتیان بداتەوە، ئەگەرنا، دەزانم کە هەم کۆمەڵی ئیسلامیی بە قیادەو قاعیدەیەوە، بە پیرو گەنجیەوە، بە پیاوو ئافرەتییەوە، بە وردو درشتیەوە، هەتا منداڵەکانیش، هەم غەیری کۆمەڵی ئیسلامیی، ئیسلامییەکان بە گشتی و موسڵمانان بە تایبەتی، بە ڕاستی زۆر قەرزداریان کردووم و من زۆر هەست بە منەتباریی و قەرزداریی دەکەم، بە ڕاستی ئەو خەڵکە زۆر بەوەفا بوون، ڕەنگە وام تەسەور نەکردبێ کە خەڵك ئەوەندە دڵسۆزو بە وەفاو خاوەن هەڵوێست بن، بە تایبەتی بۆ ئەو دوو ڕێپێوانەی کە لە هەولێرو سلێمانی کراون، ئەوکات کە گەرمە گەرمی گرتن بوو خەڵك نەیدەزانی من چیم لێدێ و نەیدەزانی کۆمەڵی ئیسلامیی چی لێدێ، ڕەنگە بەچکە گورگیان پیشانی خەڵك دابێ، هەندێك لە لایەنە سیاسییەکان هەڕەشەو گوڕەشەیان کردبێ. بە ڕاستی ئەوە مەگەر هەرخوا پاداشتیان بداتەوە.

**+ ئەگەر بکرێت بە کورتی هێندێ وشەمان بۆ پێناسە بکەیت؟**

- فەرموو..

**+ جەنگ (شەڕ)؟**

- لە زاراوەی ئیسلامییدا بریتییە لە بەکارهێنانی هێز بۆ سەرخستنی حەق بە سەر بەتاڵدا، حەق لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستە ببێت، بەتاڵێك کە لە هەواو ئارەزووی ستەمکارەکاندا بەرجەستە دەبێت.

**+ زیندان؟**

- زیندان، گوتراوە: "السجن قبر الأحياء"، ئەوە زۆر ڕاستە، بە تایبەتی بۆ زیندانی تاکی، مرۆڤ لە هەموو دنیاو لە واقیعو لە خەڵك دادەبڕێ، هەر خۆت و خوایت، واتە نیمچە گۆڕێکە، بە تایبەتی زیندانی تاکی، بەڵام نیمچە گۆڕێکە لە ڕووە ماددییەکەیەوە، ئەگەرنا، بۆ مرۆڤی ئیماندار خەڵوەتگەو شوێنی ئیعتیکافە.

+ **ئەشکەنجە؟**

ـ ئەشکەنجە، پێموایە بۆ مرۆڤی موسڵمان بە تایبەت، ڕووە مەعنەویەکەی زیاتر بە ئێشە تاوەکو لایەنە جەستەییەکەی، کە ئینسان هەست دەکات تەرەفی بەرانبەر بە سووك تەماشای دەکات، بێڕێزیی بەرانبەر دەنوێنێ، من بە زۆری بەوە قەڵس دەبم، من کە چوومە سجن، تاڵ تاڵ لە سەرم سپی ببوو، ڕیشیشم ڕەنگە یەك دوو مووی تیابووبێ، بەڵام پێموابێ بەتایبەت ئەو (٨ ـ١٠) ڕۆژەی کە قسەی ناشیرینو جەزرەبەو بە تایبەتی نارەحەتیی دەروونیو ئەوانەم تووشبوون، پێموایە بە زۆری بەوە سەرم سپی بووە.

+ **ئەمریکا؟**

ـ ئەمریکا ئەو هێزەیە کە بەڕاستی هەر لە سەرەتاوە وا دروستبووە تەنیا هێز ببینێ، دەسەڵات ببینێ، خۆتان دەزانن هیندییە سوورەکانیان قەڵاچۆ کرد، خۆیان بوونە میراتگریان، پێموایە ئێستاش هەر بە چاوی هیندییە سوورەکان تەماشای باقی مرۆڤایەتی دەکەن، لەبەر ئەوە بەو فەلسەفەو عەقڵیەتەی ئێستای کە پێوەی دەبینم، بەڕاستی پاشەڕۆژێکی زۆر تاریكو تاڵ بۆ ئەمریکا دەبینم.

+ **بەعس؟**

ـ ڕژێمی بەعس خەونێکی ناخۆش بوو بەسەرچوو، کابووسێکی زۆر خراپ بوو بەسەرچوو، پێشم وایە کە جارێکی دیکە ئەو خەونە نابینرێتەوە، بەڵام خوا بکا ئەمریکاو غەیری ئەمریکا وانەکەن کە خەڵك ئەو پەندەی بەسەردا بچەسپێ، "لە کۆلك سڵەمییەوەو بەسەر بەرازدا کەوت".

+ **خیانەت؟**

ـ خیانەت، دیارە ناپاکییە، گەورەترین ناپاکیش ئەوەیە کە مرۆڤ بەرانبەر بە خوای خۆی (جلّ شأنە) ناپاکی بکات، هەر کەسێکیش بەرانبەر بە خوا ناپاك بوو، ئەوە بەرانبەر بە خەڵكو خاك هەر ئاوی لێ ناخواتەوە، بەڵام ئەوەی کە بەرانبەر بە خوا وەفادار بوو، وەفاداریی بۆ خوا وای لێ دەکات بەرانبەر بە خەڵكو شتەکانیش وەفادار بێت.

+ **وشەی دوای ئەوەشمان وەفایە؟**

- پێچەوانەی خیانەتو ناپاکییە.

+ **پەرلەمان؟**

ـ پەرلـەمان، یان ئەنجومەنی شوورا، ئەو ئەنجومەنەیە کە دەبێ هەڵبژاردەی عەقڵی خەڵکـی بـێت بـۆ بەڕێوەبردنـی کاروبـاری وڵات، بەوشـێوەیە کـە شــەریعەتی خــوا دەفەرموێ.

+ **خۆپیشاندان.**

ـ خۆپیشـاندان بـریتییە لـە سـەلماندنی بوونـی خـۆت، بـۆ زانیاریشـتان، یەکـەمین خۆپیشـاندان کـە لـە مـێژووی ئیسـلامدا بـوو بـێت، ئـەو خۆپیشـاندانە بـوو کـە ئیمامـی عـومەرو حەمـزە (خـوایان لـێ ڕازی بێت) سـەرقافڵەییان کـرد، دوای ئەوە کە عومەری کـوڕی خەتـتاب موسـڵمان بـوو، چـەند ڕۆژێکـیش پـێش ئـەوە حەمـزە موسـڵمان بـوو، موسـوڵمانان چـوونە دەرەوەو بـە دەوری کەعـبەدا تەوافـیان کـرد بـە (الله أكبر)، ئەوە یەکـەمین خۆپیشـاندان بـوو، ئـەوەش ئـەوەی لێ وەردەگـیرێ کـە خەڵکـێك، خەڵکێکـی ئیسـلامیش وا تەسـەور دەکـات کـە خۆپیشاندان یان ڕژانە سەر جادەو شەقام لاوازییە، پێیان وایـە دەبێت حەتمـەن تەقـە بکـەی، نەخێـر وەهـا نییە، پێغەمبەر ﷺ، خۆشی لەگەڵـدا بـوو، ئەو کاروانە، ئەو کۆمەڵە موسڵمانە خۆپیشاندانیان کرد لە دەوری کەعبە، کافـرەکان وتـیان شـتێ قـەوماوە، چـۆن جورئەتـی ئـەوە دەکـەن کـە بـێن بـە دەوری کەعبەدا تەواف بکەن؟!

+ **کوردستان؟**

ـ کوردسـتان ئـەو شـوێنەیە کـە خـوای پـەروەردگار میللەتـی کـوردی لەسـەر خولّقاندووە، بـەڵام بە داخـەوە لـە نەخشەی سیاسیدا بوونی نییە، ئێستا لە دەرەوەی کوردسـتان یـان لـە دەرەوەی عـیراق، تـۆزێك لـە شـارەکانی بەغـداو ئەوانـەش وشـەی کوردسـتان دەبیسـترێ، مـن لـە یادمـە کـە لـە چـەند سـەفەرێك بـۆ هەنـدێك لـە وڵاتانی عەرەبیو ئیسـلامیی، وتـوومە خەڵکـی کوردسـتانم، وتـوویانە: "لـە کوێیە؟". دیـارە ناهەقیشیان نەبووە، چونکە لەسەر نەخشەی سیاسی، کوردستان بوونی نییە.

+ ئازادی؟

ـ ئازادی ئەوەیە کە مرۆڤ لە دەروونی خۆیدا هەست بکات کۆیلە نییە، هەست بکات دەستو پێی نەبەستراوە، دەستو پێی، نەك ڕواڵەتی، دەستو پێی ئیرادەی، دەستو پێی عەقڵی، دەستو پێی دڵی، هەر بۆیە من زۆر دژی ئەوەم بە موسڵمانێکی زیندانیی بگوترێت ئازاد نییە، بە لەزیندان هاتنەدەرەوەی بگوترێ ئازادبوون، مرۆڤی موسڵمان هەمیشە سەربەستە، هەمیشە ئازادە، عەقڵی ئازادە، ئیرادەی ئازادە، ڕوحی ئازادە، بە ڕوح پەرواز دەکات بە مەلەکووتدا، بە عەقڵ ئازادەو لە کتێبی خوا ڕادەمێنێ، لە بوونەوەر ڕادەمێنێ، ئیرادەشی ئازادە، هیچ کەس ناتوانێ وای لێبکات کە شتێك بە باتڵی بزانێ، پێی بڵێ حەق، شتێ بە حەقی بزانێ، دەستی لێ هەڵبگرێ.

دیلو کۆیلە ئەو کەسەیە شتێ بڵێ پێچەوانەی ئیرادەو قەناعەتی خۆی بێ، یان عەقڵی دیل بێ، یان دڵی دیل بێو ئیرادەی ژێر دەست بێ، ئەوە پێچەوانەی ئازادییە.

**+ مامۆستا، شتێك کە تا ئێستا ئێمە نەمانتوانیوە لە بارەیەوە پرسیار بکەین و لە دەروونی تۆدا شایەنی وتنە، پێمان خۆشە بیکەیت بە کۆتایی ئەم زنجیرە گفتوگۆیەمان؟**

ـ بەڵێ. دەمەوێت لێرەدا ئاماژە بە چەند خاڵێك بکەم کە لە میانەی وەڵامەکانی پێشوومدا بە یادمدا نەهاتوونەوە، ئەوانیش:

**یەکەم:** ئەو برایانەی لەگەڵ مندا دەستگیرکران، بێجگە لە کاك تۆفیق کەریم و حاجی عەبدوڕڕەحمان ئەحمەد و مامۆستا دارا موحەممەد ئەمین -برایانی سەرکردایەتی-، ئەمانەی خوارێ بوون:

ئیبراهیم باپیر وەتمان، زوبێر کەمال حەسەن، بورهان عەباس عەبدوڵڵا، سیروان بایر ڕەحیم، عەلی عەبدوڵڵا شەریف، موستەفا وسوو ئیبراهیم، موحەممەد ئیبراهیم حەمەد ڕەسوڵ، هیوا نەجم، ئەحمەد حەسەن، هەژار حەبیب، هاوکار عەبدولحەمید سەعید و کاك جەمال کە وەرگێڕ بوو.

**دووەم:** لە ڕۆژی ٢٠٠٣/١٢/٦دا وەفدێکی سەرکردایەتیی کۆمەڵی ئیسلامیی کە بەڕێزان مامۆستا حەسەن بابەکر و کاك عەبدولحەمید جەلالو مامۆستا موحەممەدی بامۆکی بوون، سەردانی بەغدایان کردووە کە لەوێ لەگەڵ مامۆستا ناصح مەلا صالح (خوا لێی

خۆش بێت) بەرپرسی مەکتەبی بەغدا و مامۆستا موحەممەد سینەمۆکی جێگری بەرپرسی مەکتەب و برایانی تر لە مەکتەبی بەغدا هەوڵێکی دیکەش بدەن بۆ رزگارکردنی بەندە و هاوەڵانم. بەڵام هەر هێندەیان زانیوە شەوی ۲۰۰۳/۱۲/۱۰\۹ سەعات چواری بەیانی هێزێکی گەورەی ئەمریکی بە دوو هێلیکۆپتەر و نزیکەی دە تانک و ئوتومبیلەوە هەڵی کوتاوەتە سەر نووسینگەی کۆمەڵ لەو شارە، کە ئەوان لەوێ میوان بوون و یەکسەر دیواری حەوشەکەیان رووخاندووە و جگە لەو سێ بەڕێزەی وەفدی سەرکردایەتی، جێگری بەرپرسی نووسینگەکەش کە مامۆستا موحەممەد سینەمۆکیی ئەندامی سەرکردایەتییمان بوو، لەگەڵ سەرجەم ئەو قوتابییە کوڕ و کچانەی کۆمەڵ کە لەو کاتەدا بۆ حەوانەوە لە نووسینگەکە بوون، دەستگیرکران، سەرجەمی گیراوەکان (۳۲) کەس بوو، (۱۷) ئافرەت و (۱٥) پیاو، کە زۆربەیان قوتابی بوون، مامۆستا ناصح مەلا صالحیش رۆژی بەر لە رووداوەکە گەڕابۆوە سلێمانی. ئەوەبوو ئافرەتەکان پاش سێ رۆژ و ئەوانەی دیکەش پاش نزیکەی مانگێك ئەوجار بەردران ! !

**سێیەم:** لە کۆتایی مانگی رەمەزانی ساڵی ۱٤۲٦ (۲۰۰٤/۱۱) و چوار پێنج مانگ بەر لە رزگاربوونم و بۆ یەکەمین جار و دوایین جار، وەفدێکی سەرکردایەتیی کۆمەڵی ئیسلامیی کە لە بەڕێزان حاجی قاسم موستەفا، کاك موحەممەد حەکیم و کاك عەبدولستار مەجید پێکهاتبوو، سەردانیان کردم لە زیندانی "کرۆپەر" و نزیکەی سێ چوار سەعات پێکەوە دانیشتین لە ژێر چاودێریدا و تا رادەیەکی باش لە هەواڵ و دەنگوباسی کوردستان و عیراق و گۆڕانکارییەکان ئاگاداریان کردمەوە.

**چوارەم:** هەروەها لێرەدا رووداوێکی دیکەی گرنگی زیندانییم کەوتەوە یاد، ئەویش ئەوەیە کە رۆژێکیان ئەمریکییەکان وێڕای دەرگاکانی ژووره تاکییەکان کە هەمیشە داخراوبوون، پەنجەرە بچووکە تەختەییەکانیشیان لەسەر داخستین و ژوورەکانمان بۆ ماوەی چەند سەعاتێك تاریك داهاتن! جا پاش ئەوەی کە زانیمان بڕیاریان داوە لەمەو دوا ژوورەکانمان هەر بەو شێوەیە بمێننەوە، سەرەتا لە قاتعەکەی ئێمەوە و پاشان سەرجەم قاتعەکان دەستمان کرد بە (ألله أکبر) گوتن و مست و پێلاقەدان لە دەرگا و

پەنجـەرەکان و دەنگـەدەنگ و ناڕەزاییدەربـڕین لەسـەر پێوەدانـی پەنجـەرەکان و داواکردنی کردنەوەیان.

دیـارە ئیدارەی زیندان و پاسەوان و ئێشکچییەکان زۆر مشەوەش و سەغڵەت بوون و بە هەڵـەداوان هاتن قسەیان لەگەڵ هەندێکمان کرد و پاش ئەوەی زانییان داواکارییەکەمان چییە، یەکسـەر پەنجەرەکانیان لەسەر کردینەوە و هەوڵەکەمان سەری گرت و بەریشی گرت، ئـیدی جارێکـی دیکـە مەگـەر لەسـەر داواکاریـی خـۆمان لە بەر سەرما و نەهاتنە ژوورەوەی تۆزوخۆڵ و مێش و مەگەز، ئەگەرنا، پەنجەرەکانیان لەسەر دانەخستینەوە.

بێگومان ئـەوەی کـە لـەو بیسـتو دوو مانگـەدا گوزەراوە، ئـەوەی کە گوتوومانە، چـمکێکی بووە، زۆر حاڵەتی دەروونیو روحیو ئەوانە هەن کە بە ڕاستی تەعبیریان لێ ناکرێت، ئـەوەی مـن بمـەوێ لـە کۆتاییدا بیڵـێم ئەوەیـە: ئادەمیـزاد هـیچ کـات ئـەو حەقـیقەتەی لـە بەرچاو ون نەبێت کە ئەم ژیانی دونیایە، بریتییە لە هۆڵی تاقیکرانەوە، تەمەنەکەشـی بریتییە لە دەفتەرێك کە دراوەتە دەستی تا وەڵامەکانی لەسەر بنووسێ، ئادەمیـزاد کـە ئـاوا تەماشـای ژیانـی کـرد، ئاوا تەماشای خۆی کرد، ئەوکاتە هەرشتێك بێـتە ڕێـی، مـادام ڕووی لـە خـوا بـێتو مـادام ڕاستەشـەقامی خـوای گـرتبێ، بـە سنگفراوانیو بـە دڵخۆشـی لەگەڵـی ڕووبـەڕوو دەبێـتەوە، چونکە جاری وا هەیە بەس زینـدان دەبێتە هۆی ئەوەی لە تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا دەرچێ، هەروەکو خەڵکی تر هەیـە بـە هـۆی ئـەوە کـە ڕزگـارەو لـە ژێـر دەسـەڵاتی هـیچ کەسێکدا نییەو خـۆی بـە سەربەسـت دەزانێ، لە تاقیکردنەوەکەدا دەکەوێ، جاری وا هەیە مرۆڤ بەهۆی هەژاریو نـەداری لـە تاقیکـردنەوەی ژیانـی دونـیای دەردەچـێ، بەهـۆی دەوڵەمەندیـی تێـیدا دەکـەوێ، جـاری وا هەیـە بەهـۆی بێدەسـەڵاتی دەردەچـێ و بەهۆی دەسەڵاتەوە تێیدا دەکـەوێ، مـرۆڤ کـە حەقیقەتـی ژیانـی دونیای بەو شێوەیە بینی، هەوڵدەدا لە بەرانبەر هەرشـتێ کـە دێـتە پێشـی، بەو شێوەیە ڕەفتار بکات کە شەریعەتی خوا فەرموویەتیو جێگەی ڕەزامەندیـی خـوایەو مایـەی دەرچوونو سـەرکەوتنیەتی لـەو تاقیکـردنەوەی ژیانی دونیادا.

جـا ئـەوە قسـەی کۆتایی و وەسـیەتمەو هـەر کاتـێ ئادەمیزاد بەو شێوە تەماشای ژیانـی دونیاشـی کـرد، شـتەکان هەمـوو تـامو چێژیان دەگۆڕێ، نە بە هات زۆر دڵخۆش

دەبێو نە بە نەهات زۆر دڵتەنگ دەبێ، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ) (الحديد :٢٣)، بە ڕاستی مرۆڤ کە زانی ژیانی دنیای تاقیکردنەوەیەو خوای پەروەردگار چاودێریی دەکاتو فریشتەکان دەینووسن، هەرچی دەیکاتو هەرچی دەیڵێ هەمووی تۆمار دەکرێ، زۆر لە خۆی وریا دەبێ و هەر شتێکی بێتەڕێ، تەماشای ناکا داخوا چەندی خۆشییەو چەندی ناخۆشییە، تەماشای ئەنجامەکەی دەکات، داخوا لە چەندیدا پلەی باش وەردەگرێ. زۆرکەس بە فەقیریو نەداری دەچنە بەهەشتو بە دەوڵەمەندی دەچنە دۆزەخ، زۆرکەس بە دەسەڵاتەوە دەچنە ژێرەوەی دۆزەخو بەبێ دەسەڵاتیو لاوازیی دەچنە بەهەشت، کەواتە درککردنی ئەو حەقیقەتە، بەڕاستی تامی هەموو شتەکان دەگۆڕێ، واش لە ئادەمیزاد دەکات کە بۆ هەموو حاڵەتەکان خۆڕاگر بێت، ڕاوەستاو بێ، نەلەخشاو بێت، هەر چاوەڕێی خۆشییانیش نەبێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (..وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ) (الأنبياء: ٣٥)، بە خۆشییانو بە ناخۆشییان تاقیتان دەکەینەوەو بۆلای ئێمەش دەگەڕێنەوە. خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێت کە ئەم تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا سەربەرزانە و ڕووسوورانە تەواو دەکەین، بڕوانامەیەکی باش وەدەست بێنین، ڕووی ئەوەمان بێت کە بچینە ڕیزی ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ لە ژێر بەیداخ و ئاڵای خۆیدا حەشریان دەکات و بە دوای پێغەمبەردا ﷺ دەچنە بەهەشتی بەرینەوە و لە حەوزی کەوسەری پێغەمبەر ﷺ تێر ئاو دەبن.



**HEADQUARTERS**
MULTI-NATIONAL FORCE - IRAQ
BAGHDAD, IRAQ
APO AE 09342-1400

MNFI-CD Date: 12 November 2004

Detainee Name: Mullah Al-Bapir
ISN: 300117
Internment Facility: Cropper

Subject: Article 78 Review Board

1. This is to notify you that, in accordance with Geneva Convention Relative to the Protection of Civilian Persons in Time of War, August 12, 1949 (Geneva Convention IV), Article 78, your case will be reviewed in order to determine whether adequate grounds exist to continue your internment for imperative reasons of security, pursuant to United Nations Security Council Resolution 1546. This review will take place on 26 November 2004

2. You are currently interned for the following reason:
You are a threat to the security and stability of Iraq due to your ties to Iraq and Ansar Al Islam, and your prior position as a former leader of the Islamic Group of Kurdistan (IGK).

3. You have a right to submit matters on your behalf for consideration by the review board. Please submit any statements through your camp Chain of Command addressed to MNF-I Detention Operations. Statements are due by 22 November 2004.

4. You will be notified of the board decision upon completion of the board.

**Proof of Service:**

Detainee # 300117 was served this notification on [illegible] November 2004 by personal service

(Signature of person serving notice)

دەقی ئەو چوار تۆمەتەی بە ڕەسمیی درابوونە پاڵ مامۆستا عەلی باپیر

ن ١١٦

إلى مركز قيادة القوة المتعددة الجنسيات - العراق
بواسطة: إدارة السجن / كروبر،

جواباً على كتابكم المؤرخ ([illegible]) والذي تضمنتم فيه أسباب احتجازي، أقول:
إلا أنني أعتقد جازماً بأنكم تقتنعون تماماً أن الأسباب الأربعة التي ذكرتم بها بقائي محجوزاً هنا، قد استنفدت أغراضها وفقدت مفعولها من زمان، حيث أن المحققين قد استجوبوا لي أكثر من مرة، وعرضوها لي بأنه لم يبق لهم شيء عليّ، وذلك بعد أن فندت كل التهم الموجهة إليّ بحجج واضحة، وثبتت أنها ليست سوى افتراءات وأقاويل [illegible] أرادوا الإساءة إليّ وإلى جماعتي من خلال أمريكا أو قوات التحالف! بل قال محققي الأخير قبل أكثر من شهرين: كان من المفروض أن نطلق سراحك منذ فترة طويلة، إذ لم يبق مبرر لإبقائك هنا! وقال: إني لا أعلم لماذا بقيت هنا كل تلك الفترة!

لذا أكتفي بهذا الجواب الموجز:

١- أما كوني مسؤولاً عن الجماعة الإسلامية سابقاً ولاحقاً والآن بمشيئة [illegible] الحكيم سبحانه وتعالى، فصحيح، ولكن هل العمل الإسلامي صار محظوراً في البلاد الديمقراطية حتى يشكل كوني أميراً للجماعة الإسلامية تهمة أستحق بسببها أكثر من خمسمائة (٥٠٠) يوماً في حبس انفرادي؟! أنا شخصياً لم أسمع بأن تهمة كهذه قد صدرت، وإن كانت صادرة فلكي [illegible] أنا والناس كي نكون على بصيرة من الأمر!

٢- وأما القول بأن الجماعة الإسلامية قد ساعدت مجموعة أنصار الإسلام، فقول عارٍ عن الصحة، والجماعة الإسلامية لها برنامجها السياسي ومنهجها الفكري والعملي الخاص، وموقفها واضح من تلك المجموعة، وهذا يعرفه القاصي والداني في كردستان.

٣- وأما القول بأنه كانت هناك علاقة بين الجماعة الإسلامية وبين النظام العراقي السابق، فادعاء لا أساس له أبداً، وها هي الحكومة السابقة بقياداتها [illegible] من أكبرها إلى أدناها حاضرة ومحبوسة لديكم فاسألوهم بهذا الشأن، وأنا على يقين بأنكم قد سألتموهم، ولو أنكم عثرتم على أدنى دليل لما تأخرتم بعرضه عليّ، ولاطلعتموني عليه وواجهتموني به من خلال التحقيقات المطولة والمكررة التي أجريتموها معي!

٤- وأما القول بكوني مصدر تهديد للعراق، فقول في غاية الغرابة! كيف وأنا كمسلم ثم كمواطن أعتبر خدمة مجتمعي والحرص على إيمانه وأمنه وعزه وسعادته فريضة شرعية عليّ، وكيف يكون المسلم الفاهم لدينه ضرراً وخطراً على مجتمعه ووطنه، وقد أوجب الإسلام على أتباعه أن يبذلوا الأنفس والأموال من أجل أوطانهم ومجتمعاتهم بكل ما في وسعهم!

ثم إن الجماعة الإسلامية التي تسير على الأصول [illegible] والخطوط العامة التي استنبطها كاتب هذه السطور من الكتاب والسنة، وصادق عليها مجلس شورى الجماعة بالإجماع منذ إعلان الجماعة عن نفسها، لها ثوابت معترف بها من كل الأطراف السياسية، ولها مقرات ومكاتب

دەقی وەڵامی مامۆستا عەلی باپیر بە عەرەبی بۆ ئەو چوار تۆمەتەی درابوونە پاڵی

## دەقی وەڵامی مامۆستا عەلی باپیر بۆ ئەو چوار تۆمەتەی بە رەسمیی درابوونە پاڵی*

### بۆ مەڵبەندی فەرماندەیی/ هێزە فرەڕەگەزەکان ـ عیراق

### بە هۆی ئیدارەی گرتووخانەی (کرۆپەر)ەوە

لە وەڵامی ئەو نامەیەتاندا کە لە بەرواری ۲۰۰٤/۱۱/۱۲دا بۆتان ناردوومو هۆیەکانی زیندانییکرانمتان تێدا نووسیون، دەڵێم:

لە سۆنگەی ئەوەوە کە پێم وایەو دڵنیام کە خۆتان بە تەواوی گەیشتوونەتە قەناعەت کە ئەو چوار هۆیەی کردووتانن بە پاساوی هێشتنەوەم لە زیندانی ئێوەدا، لە مێژە ئیکسپایەر بوونو بێبایەخییان دەرکەوتووە، بە بەڵگەی ئەوە کە لێکۆڵەرەوەکان (المحققین) چەندان جار داوای لێبوردنیان لێکردوومو بە ڕاشکاویی گوتوویانە: کە هیچمان لەسەر تۆ نییەو نەماوە. ئەویش دوای ئەوەی کە بە بەڵگەی دەمکوتکەر هەموو ئەو تۆمەتانەی کە ئاڕاستەم کراون، پووچەڵم کردنەوەو ڕوونم کردەوە کە ئەو تۆمەتانە جگە لە بوختانو قسەو قسەلۆکی کەسانێکی غەرەزاوی کە ویستوویانە لە ڕێی ئەمریکا، یان هێزەکانی هاوپەیمانانەوە ! خۆمو کۆمەڵەکەم تووشی زیانو سەرئێشە بکەن، چی دیکە نین، بەڵکو لێکۆڵەرەوەی ئەم دواییەم بەر لە دوو مانگ زیاتر گوتی: پێویستبوو ماوەیەکی زۆر لەمەوپێش تۆ بەربدرێی، چونکە هیچ پاساوێك بۆ هێشتنەوەی تۆ لێرە نەماوە، گوتیشی: من نازانم تۆ بۆچی ئەو هەموو ماوە زۆرە لێرە هێڵراویەوە !

بۆیە بەم وەڵامە کورتە واز دێنم:

۱ـ ئەوە کە من بەرپرسی کۆمەڵی ئیسلامیی بووم لە ڕابردوودا و ئێستاشو هەتا ئەوکاتەش[1] کە خوای زاڵو کاربەجێ بیەوێ، ڕاستە. بەڵام ئایا کارو چالاکیی ئیسلامیی لە وڵاتانی ئیسلامییدا قەدەغەکراوە، تاکو (ئەمیر)بوونم بۆ کۆمەڵی

---

* مامۆستا عەلی باپیر دەقی وەڵامەکەی خۆی بۆ ئەم کتێبە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

[1] بۆیە وام گوتووە چونکە لە نامەکەیاندا بەندەیان بە (خَبَر)ی (کانَ) دانابوو.

ئیسلامیی بە تۆمەتێك دابنرێ كە بە هۆیەوە زیاتر لە (٥٠٠)[2] ڕۆژ لە ژوورێكی تاكیی (زنزانة إنفرادیة)دا زیندانی بكرێم؟! من خودی خۆم نەمبیستووە بڕیاری وا دەرچووبێ‌و، ئەگەر شتی واش هەیە، با ئێمەش‌و خەڵكیش بیزانین بۆ ئەوەی بەرچاومان ڕوون بێ لەو بارەوە!

٢ـ ئەوە كە دەڵێن كۆمەڵی ئیسلامیی یارمەتی گرووپی (ئەنصار)ی داوە، قسەیەكی زۆر ناڕاستە، چونكە كۆمەڵی ئیسلامیی بەرنامەی فیكری‌و پرۆژەی سیاسیی تایبەتی‌و ئاشكرای خۆی هەیەو هەڵوێستیشی لە بەرانبەر ئەو تاقمەدا ڕوونەو ئەمەش وردو درشتی خەڵكی كوردستان دەیزانن.

٣ـ دیسان ئەوە كە گوایە كۆمەڵی ئیسلامیی‌و ڕژێمی پێشوو پەیوەندییان هەبووە، قسەیەكی ڕووتەو هیچ بەڵگەیەكی لە پشت نییە، دەجا ئەوەتە ڕژێمی پێشوو بە سەركردایەتیی سیاسیی‌و بەرپرسانی ئیدارییەوە لە سەرێوە بۆ خوارێ لێرە لە لاتان زیندانیین، دەفەرموون لەوبارەوە لێیان بپرسن! هەرچەندە دڵنیاشم كە پرسیارتان لێكردوون‌و ئەگەر بچووكترین بەڵگەتان لێیان چنگ بكەوتایە، ڕژدییتان لەگەڵ نەدەنواندم‌و ئاگادارتان دەكردمەوەو لە میانەی ئەو هەموو لێكۆڵینەوە دووروودرێژو دووپاتكراوانەدا كە لەگەڵتان كردووم، پێشانتان دەدام!

٤ـ هەروەها ئەو قسەیەتان كە دەڵێن: تۆ سەرچاوەی هەڕەشەو مەترسیی بۆ عیراق، قسەیەكی یەكجار سەیرو سەمەرەیە!

ئاخر چۆن لە حاڵێكدا كە من وەك موسڵمانێك‌و پاشان وەك ئیسلامییەك خزمەتی كۆمەڵگاكەم‌و داكۆكیكردن لەسەر ئیمانی‌و ئاسایشی‌و عیززەتی‌و بەختەوەریی بە پێویستییەكی شەرعی خۆم دەزانم؟! ئنجا چۆن دەگونجێ مسوڵمانێك كە لە ئایینەكەی گەیشتبێ، مایەی زیان‌و مەترسی بێت بۆ كۆمەڵگاو نیشتیمانی، لە حاڵێكدا كە ئیسلام لەسەر پەیڕەوانی خۆی پێوست كردووە كە هەتا پێیان دەكرێ مەترسی‌و زیان لە نیشتیمان‌و كۆمەڵگاكانیان دوور بخەنەوە؟!

---

[2] دوایی سەرەنجام (٦٥٩) ڕۆژم تەواو كرد.

پاشان ئەو کۆمەڵە ئیسلامییەی کە بەپێی ئەو بنەما شەرعیو هێڵەگشتییانە بەڕێوە دەچێ کە نووسەری ئەم نامەیە لە قورئانو سوننەتی هەڵهێنجاونو کۆڕی ڕاوێژی کۆمەڵ بە کۆڕا پەسندیان کردوون هەر لە ڕۆژی ڕاگەیەنرانی (کۆمەڵ)ەوە، کیانو بوونێکی دانپێداهێنراوی هەیە لە لایەن سەرجەم لایەنە سیاسییەکانەوە، هەروەها چەندان نووسینگەو بارەگای ئاوەدانی هەیە لە ژمارەیەك لە شارەکانی عێراقدا کە بەغدادی پایتەخت یەکێکیانە ! کەواتە:

ئایا واقیعی کۆمەڵی ئیسلامیی بەس نییە بۆ دوورخستنەوەی ئەو گومانو وەهمانە ؟!

کەواتە:

ئائەوەیە وەڵامی کورتم لەسەر پاساوی هێڵرانەوەم لە زینداندا کە پشت بەو چوار هۆیە دەبەستێ، پێشم وایە وەڵامێکی ئیقناعکەرە بۆ هەرکەسێك کە بە دوای هەقدا دەگەڕێو بە هێزی بەڵگە دەدوێ، نەك بە بەڵگەی هێز.

**دووشەممە:**

**١٠ی شەووال/ ١٤٢٥ کۆچی - ٢٦/١١/٢٠٠٤**

**117 CI/ کرۆپەر**

# دەقی گوتاری مامۆستا عەلی باپیر لە ڕێوڕەسمی پێشوازییلێکردنیدا لە ناوچەی چیمەن

**الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر..**

بسم الله الرحمن الرحيم، الحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام على النبي الأمين، المبعوث رحمة للعالمين، وآله أجمعين من الصحب والقرابة والتابعين، لهم بإحسان الى يوم الدين.

سەرەتا سوپاسی خوای پەروەردگار دەکەم کە بە لوتفو کەرەمی خۆی لە سجنێکی بە زوڵم بۆ من ئامادەکراو ڕزگاری کردم، پاش سوپاسو ستایشی خوای پەروەردگار، پڕ بە دڵ سوپاسی هەموو لایەك دەکەم، چ ئەوانەی کە ئێستا تەشریفتان هاتوون، مامۆستایان، ڕیشسپیان، برایان، دایکان، خوشکان، زۆر لێتان مەمنوونم، دەزانم ئەو خۆئەزیەتدانەتان هەمووی دڵسۆزییە، هەمووی حەماسەتە، هەمووی دڵگەرمییە، هەمووی پەرۆشە، زۆر لێتان مەمنوونم، سوپاستان دەکەم، خوای پەروەردگار بۆتان بخاتە تەرازووی حەسەناتتانەوە.

**بەڕێزانو خۆشەویستان:**

دیارە من دوای سجنکرانێکی بیستو دوو مانگە لە سجنێکی ئینفرادیدا، خوای پەروەردگار سەربەرزانە دەربازی کردم، بەڵام من لە سجندا بە ڕاستی بەو جەماوەرە موسڵمانە، بە هەموو چینو توێژەکانیەوە، لە ناو سجندا زۆر سەربەرز بووم، هەرجارێك ئێوە خۆپیشاندانتان کردبێت، ئیمزا کۆکرابێتەوە، کۆبوونەوە کرابێت، دوعاو نزا کرابێ، لە کاتەکانی تاریکی نیوەشەودا، پیرەژن، پیرەپیاوان، گەنجێکی خوێنگەرم، خوشکێکی بە شەرم، دایکانی دڵگەرم، باوکانی بەڕێز، ئەوە بە ڕاستی بۆ من جێی فەرەحنایی و سەربەرزی بووە، بۆ ئەوانەش کە لە پشت گرتنی منەوە بوون، زەختو فشارێکی زۆر گەورە بوو.

بەڵام وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (لايَشكُر الله مَن لَم يَشكُرِ النّاس). لەبەر ئەوە، من سوپاسی هەرکەسێك دەکەم، بە قسەیەك، بە وشەیەك، بە نووسین، بە هەر هەنگاوێك، بە هەر هەڵوێستێك، دیفاعی لە مەزڵومیەتی بەندە، یا هەرکەسێکی دیکەی

وەکو بەندە، کە بە زوڵم سجنکراوەو سجن دەکرێت، کردبێت، بە تایبەتی لێرەدا ناوی لایەنە سیاسییەکان دێنم بە گشتی، بە تایبەت مام جەلال، کاک مەسعود، مامۆستا صەلاحەددین موحەممەد بەهائەدین، کاک موحەممەدی حاجی مەحمود، پاشان کاک کۆسرەتو کاک دکتۆر بەرهەم، کاک فازڵ میرانی، دکتۆر مەحمود عوسمان، پاشان پارتی پارێزگاران بە هەردوو بەشەکەی هەولێرو سلێمانییەوە، پاشان هەموو لایەنە سیاسییەکانی دی، عەرەبو کورد، سووننەو شیعە، ئیسلامییو غەیرە ئیسلامیی، تورکو ئاشووریو هەموو ئەو کەسانەی کە هاودەردییو هاوغەمییان لەگەڵ ئێمە دەربڕیوە، پڕ بە دڵ بە ناوی خۆمو بە ناوی هەموو ئەندامانی کۆمەڵی ئیسلامیی بە وردو درشتەوە، سوپاسی هەموولایەك دەکەم، هەروەها برایانی حزبی ئیسلامییو هەرکەسێکی تر، پاشان زۆر سوپاسی مامۆستایانو زانایانی ئیسلامیی بەڕێز دەکەم، ئەوەی کە ئیمزای کۆکردبێتەوە، وتاری دابێت، دوعای خێری کردبێت، ئامۆژگارییەکی خێری کردبێت بە هەر شێوەیەك، هەروەها شێخانی تەریقەت، موریدو مەنسوبانیان، پاشان قەڵەمبەدەستو ڕۆشنبیران، نووسەران، ئەوەی شتێکی نووسیبێت وەکو حەق، ئینجا سەرۆك عەشیرەتو ڕیشسپییەکان، بە تایبەت لە ناو سەرۆك عەشیرەتەکاندا ئەوانەیان کە زیاتر دەوریان بینیوە، لە نێوانیاندا کاك ئاکۆی عەباسی مەمەند ئاغا کە دەورێکی بەرچاوی بووە، هەرکەسێکی دیکەش کە مەرج نییە هەموویانم لە یاد بێت، زۆر سوپاسی هەموو لایەکیان دەکەین، لە خوای پەروەردگار داواکارم کە بە چاکترین شێوە پاداشتیان بداتەوە، بە ڕاستی پاداشتی ئەو ماندووبوونە، ئەو دڵسۆزییە تەنها بە خوای گەورە دەدرێتەوە.

من دەمەوێ لەم بۆنەیەدا چەند قسەیەك بکەم بۆ ئێوەی بەڕێز، لە پشت ئێوەی بەڕێزیشەوە بۆ جەماوەری موسڵمانی کوردستان. یەکەم، میللەتی کورد ساڵەهای ساڵ بە دەست ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی کە لە بەغداد حاکم بوون، بێبەش کراوەو چەوسێنراوەتەوە، کە ئێستا خوای پەروەردگار هەلومەرجێکی هێناوەتە پێشو میللەتی کورد شتێکی باشی دەست کەوتووە، خوای پەروەردگار سەربەرزییەکی بە نسیب کردووە، من وەکو موسڵمانێك، وەکو کوردێکی موسڵمان، وەکو دڵسۆزێك بۆ میللەتی خۆم، بۆ وڵاتی خۆم، زۆر پێی دڵخۆشم، بە تایبەتیش کە بیستم تەبایی هەیە

لە نێو قیادەی سیاسیی کورددا، هیچ میللەتێك بە درێژایی مێژوو هیچ شتێکی باشی پێنەکراوەو هیچ هەنگاوێکی ئیجابی بۆ نەنراوە بە بێ برایی‌و تەبایی، بە ڕاستی من کە لە سجن بووم، جار جار ڕۆژنامەیان بۆ دەهێناین، هەندێك هەواڵ‌و دەنگوباسمان لەم دواییانە بیست کە میللەتی کورد نێو ماڵی خۆی ڕێکخستووەو تەرتیب کردووە. لەبەر ئەوە کە نێو ماڵی خۆی ڕێکخستووە، دەتوانێت لە بەغداشدا لە حکومەتی مەرکەزی پشك‌و بەشی باشی هەبێت، چونکە هەرکەسێك بۆ خۆی هەبوو، دەتوانێ بۆ خەڵکیش هەبێ، بەڵام کەسێك بۆ خۆی نەبوو نێو ماڵی خۆی بۆ ساز نەکرێ، هیچیشی بۆ خەڵك پێناکرێ. ئەوە بە ڕاستی بۆ ئێمە نیعمەتێکی گەورەیە، ئەو نیعمەتە دەبێ بە سوپاس‌و ستایش پێشوازی لێ بکرێ، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ) (إبراهيم: ٧)، زانایان دەڵێن شوکرانەی نیعمەت سێ شتە، بڕوات وابێ کە ئەو نیعمەتە لە خواوەیە، بە زمان سوپاس‌و ستایشی خوا بکەی، بە کردەوەش ئەو نیعمەتە لە ڕەزامەندیی خوادا بە کار بهێنی، بەو شێوەیە کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی، خوای پەروەردگار منەت دەکات لەسەر قورەیش، کە کاتی خۆی براگەورەو چەقی عەرەب بوون، منەتیان بە سەردا دەکات بە دوو شت، یەکەم کە ئاسایشی بۆ ڕەخساندوون بەهۆی کەعبەی پیرۆزەوە، دووەم کە لە ڕووی ئابوورییەوە گرفت‌و کێشەی ئابووری بۆ چارەسەر کردوون، واتە نان‌و ئەمانی بۆ دابین کردوون، دەفەرموێ: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ، لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ، إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاء وَالصَّيْفِ، فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ، الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ).

ئەمڕۆ میللەتی کورد ئەمن‌و ئاسایشێکی باشی هەیە لە وڵاتی خۆیدا، ئەوە نیعمەتێکی زۆر گەورەیە، پاشان لە ڕووی ئابوورییەوە بوژاندنەوەیەکی ئابووریی باشی هەیە، ئەوەش نیعمەتێکی زۆر گەورەیە، ئەو نیعمەتە دەبێ بە سوپاس‌و ستایش بۆخواکردن‌و، دەبێ بە بە کارهێنانی نیعمەتەکان لە ڕەزامەندیی خودا پێشوازییان لێبکرێ، ئومێدیشم وایە کە میللەتی ئێمە بە سەرکردایەتیی سیاسییەوە، بە مامۆستاو زانایانەوە، بە قەڵەمبەدەست‌و نووسەرانەوە، بە هەموو چین‌و توێژەکانەوە دەستبار بۆ یەکتر بگرن، شایستەی ئەوە بین خوای پەروەردگار نیعمەتی گەورەتریشمان بە

سـەردا بـڕژێنێ، چاکەی گەورەتریشـمان لەگەڵدا بکـات، (.. لَـئِن شَـكَرْتُمْ لأَزِيـدَنَّكُمْ..) (إبراهيم: ٧). ئەگەر سوپاسم بکەن بۆتان زیاد دەکەم.

مـن بـە ڕاستـی گەشـبینم، ئومێدەواریشـم کـە میللەتی موسڵمانی کوردستانمان بەو شێوەیە بێ کـە شایستـەی ئەوەبێ خـوای گەورە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی بۆی زیاد بکـات، پاشـان دەمـەوێ ئـەوەش بڵێم کە ئەمڕۆ کەسانێك هەن حەسوودی (ئیرەیی) بە میللەتـی کـورد دەبـەن (مـن ئاگادارم)، دیارە میللەتی کورد خوای پەروەردگار ئاوڕێکی لێداوەتەوە، دوای ئـەوە کـە زۆر چەوسێنراوەتەوەو زۆر بێبەش کـراوەو مافی پێشێل کـراوە، ئـەو ئاوڕلـێدانەوەیەی خـوای پـەروەردگار لوتفێکـی خوایـیەو دەبـێ برایانـی موسـڵمان لـە عـەرەبو تـورکمان، لە وڵاتانی دەرو دراوسێ، ئەوانیش خۆشحاڵ بن کە ئـەوە بەشـێك لـە میللەتێکی موسـڵمانی برایان، خـوای پـەروەردگار چاکەیەکی لەگەڵ کـردوون و نیعمەتێکـی بـە سـەردا ڕشـتوون، بـەڵام میللەتـی کـوردیش، بـە تایـبەت سـەرکردایەتیی سیاسـی دەبـێ دووربـین بـێ، سـنگفراوان بـێ، لێزان بێ، بە ڕاستی من دڵخۆش بـووم بـە هەندێ هەواڵ کە قیادەی سیاسیی کورد دەیەوێ هەندێ هەنگاو بنێ بـەرەو کرانەوە لەگـەڵ ئـەو خـەڵكو مـیللەتانەی دیکـە، ئـەو نەتەوانـەی دیکـەی کـە لە عیراقـدا لەگەڵـیدا دەژیـن، بـا ئێمە پەند وەربگرین لەو خەڵکانەی دیکە کە کوردو غەیرە کوردیان بێبەش دەکردو تەنیا دەیان ویست هەموو شتێ بۆ خۆیان بێت، هەموو شتیان بـۆ خـۆیان دەکـرد، ئـێمە دەبێ پەنـدیان لـێ وەربگرین، با ئێمە بەرەو پێش بچین، با ئـێمە بـە ڕوحـی تـۆڵەوە مامەڵـە لەگـەڵ خەڵکدا نەکـەین، بەڵکو بـە ڕوحـی لێبوردن و سنگفراوانی، مـن پێشموایە کە میللەتی کورد بە دوو شت ناودارە، یەکەمیان ئازایەتیو دووەمیان دڵپاکیو دڵسۆزی.

میللەتـی کـورد لـەوە قـازانج دەکـات، بـە تایبەت کـە ئێستـا هاتیەتی، ئێستا با بە قازانجـی کورد هەڵیکردووە. ئنجا ئەوە کە ئێستا دەنگی خەڵکی تێدەخوێنرێتەوەو رای خـەڵك و جـەماوەر حیسابی بۆ دەکرێت، ئەوە بۆ منێکی موسڵمانو ئیسلامیی زۆر جێی خۆشـحاڵییە، هەرکاتـێك مـیللەت تێبخوێنـرێتەوە، ڕێـزی لێبگیرێ، قسەی لێ وەربگیرێ، ئـەو مـیللەتە، ئـەو سـەرکردایەتییە سیاسییە بەرەو سەرڕاستی دەچێ، بەڵام هەرکاتێك قـیادەی سیاسـیی، وەکـو ڕژێمـی عێـراق تەنیا بە عەقڵی خۆیو ئەوانەی کە جەماعەتی

(أشهد بالله)نو (نا) يان نييه له بەرانبەر هيچ بڕيارێكيدا، بەو شێوەيە جووڵايەوە، سەرى هەر لە چۆرتم دەردەچێو هەر تووشى گرفتارىو نسكۆو نەهامەتى دێت.

بەڵێ، ئەوە زۆر جێى دڵخۆشييە كە ڕێگە دەدرێت هەڵبژاردن بكرێت، ئەوە جێبەجێكردنى ئايەتى خواى پەروەردگارە كە دەفەرموێت: (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ)، كە بێگومان ئەم رستەيە بەشێكە لە ئايەتى (٣٨)ى سوورەتى (الشورى): (وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ) (الشورى: ٣٨)، وەك دەبينين خواى بەرزو مەزن كاروبار بە شووراو ڕاوێژو بە پرسو ڕا بەيەكترى لە نێو مسوڵماناندا، خستۆتە نێوان نوێژو زەكاتەوە، كە ديارە نوێژو زەكات دوو ڕوكنى ئيسلامن، واتە خواى پەروەردگار پێمان دەفەرموێ ئەى موسڵمانان، ميللەتى موسڵمان، بزانە كە كاروباربەڕێوەبردنيش بە ڕاوێژو پرسوڕا بە يەكتر وەكو نوێژ و زەكات لەسەرت فەرزە، ڕوكنى دينەكەتە، جا ئێمە ئەگەر بەو ئاڕاستەيەى كە دەستمان داوەتێ ئاوا بڕۆينو هەركەسەو لە شوێنى خۆيەوە ڕێزى لێبگيرێ، بوارى پێ بدرێ، وەكو ئێستا ئەم كۆبوونەوە جەماوەرييە، ديارە هەردوو ئيدارەكە هاوكارييان كردووە، ئێمە سوپاسيان دەكەين، بۆ خۆشيان قازانج دەكەن، هەتا زياتر ڕێگە بە غەيرى خۆيان بدەن، ئەوە زياتر ئيسپاتى ڕەسەنايەتيى خۆيان دەكەن، ئيسپاتى دەكەن كە ڕاست دەكەن لەگەڵ ميللەتى خۆياندا. ديارە خەڵكى ئيسلاميى، خەڵكى دينداريش، خەڵكێك كە دەڵێ دەبێ بە دواى (محمد المصطفى) بكەوين، خەڵكێك كە دەڵێ دەبێ كيتابى خودا حاكم بێ، هەڵقوڵاوى نێو جەرگەى ئەم ميللەتەن، ڕەگو ڕيشەيان بە ناخى ئەم وڵاتو ميللەتەدا چووەتە خوارەوە، لەبەر ئەوە خاوەنن، بەشدارن، خاوەنى پشكو بەشن، جا ئەگەر ئاوابين، ئەوە وەكو خواى پەروەردگار فەرموويەتى: (.. فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ..) (الرعد: ١٧)، چى سوودى هەبێ بۆ خەڵك، چ لە منى ئيسلاميى، چ لە كەسى ديكە، ئەگەر ئەوەى شتێكى باشى پێبێ، ئەوە دەچەسپێ، ئەگەر من هەڵەيەكم هەبێ، ئەوا هەڵەكە لا دەچێ، ئەگەر بوار بە يەكتر بدەين، ڕێز لە يەكتر بگرين، چى چاكەو چ بە كەڵكە بۆ خەڵكو حكومەت ئەوە دەچەسپێ، چى بە كەڵك نايەتو چى لەگەڵ ميللەت ناگونجێ، چى لەگەڵ بەرژەوەندييەكانى ناگونجێ، ئا ئەوە لادەچێ، بە تەئكيد ئێمەى

موسڵمانو دیندار کە میللەتەکەمان میللەتێکی موسڵمانو دیندارە، دڵنیاین کە هەرچی شەریعەتی خوا فەرموویەتی، هەرچی لە (کتاب الله)دا هاتووە، هەرچی لە سوونەتی (محمد المصطفى)دا هاتووە خێرو قازانجو سەربەرزیو بەختەوەریی دنیاو قیامەتی هەموو خەڵکی تێدایە، بە موسڵمانو غەیرە موسڵمانەوە، چونکە ئیسلام تەنها بۆ موسڵمانان نەهاتووە، خوای پەروەردگار دەفەرمویَ: (كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْراً لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ) (آل عمران: ١١٠)، واتە ئێوە باشترین کۆمەڵن، باشترین ئوممەتن، ئەی ئوممەتی موحەممەد، بۆ هەموو مرۆڤایەتی پەیدا کراون، هەرچی چاکەیە دەیچەسپێنن، هەرچی شتی خراپیشە ڕیشەکێشی دەکەنو لای دەبەن، دیارە لە هەر قۆناغەدا بە شێوازی خۆی ئیمان بە خوای پەروەردگار دێنن، وەك دەبینین خوای زانا (عزّ وجلّ) ئیمانی خستۆتە دوایەوە تاکو تێبگەین کە ئیمانێك لای خوا ئیمانەو ئیعتباری پێدەکریَ کە خاوەنەکەی وا لێبکات چاکە بچەسپێنیَو خراپە لابەریَ، چ لەسەر ئاستی تاك، چ لەسەر ئاستی خێزان، چ لەسەر ئاستی گەڕەكو شارو چ لەسەر ئاستی وڵات.

**لە کۆتاییشدا دەڵێم:**

من کە ڕۆژێك دوا کەوتم، لەبەر ئەوە بوو کە هەندێك مەرجیان دیاریی کردبوو، ئەو مەرجانە لای من ڕەفز بوون، پێم وتن: ئەگەر سەد ساڵی تر لە سجندا بم، ئامادەنیم ئەو مەرجانە ئیمزا بکەم. دوایی ئەو برادەرە، کە دیارە بەرپرس بوو لە ناو ئەمریکییەکانداو کۆلۆنێلێك بوو، وتی: "فلان کەس! بە ڕاستی من سەرسامم بە هەڵویستی تۆ، چونکە هەر کەسێك لێرە وتوومانە بڕۆ بەرت دەدەین، ئەگەر پەنجا مەرجیشمان بۆ دانابیَ، هەر تەماشایشی نەکردووەو ئیمزای کردووە، من پێم سەیرە تۆ دوای دوو ساڵ زیندانییت لە ژوورێکی (٢م×٢م) دەڵێی دەچمەوە ژوورەکەی خۆمو ئامادە نیم ئەوە ئیمزا بکەم". وتم: بەڵیَ. وتی: "بە ڕاستی من سەرسامم، بۆ من مایەی شەرەفە کە تۆم ناسی". وتم: سوپاست دەکەم، من هەر کوردێکی موسڵمانم. وتی: "بەڵام من خۆزگە دەسەڵاتم هەبوایە، ئێستا مەرجەکانم هەموو لادەبرد، پیاوی وەکو تۆ نابیَ لە زینداندا بمێنێتەوە"، وتم: سوپاست دەکەم، ئەی تۆ پرس بەکیَ

دەکەی؟ وامزانی بەرپرسی و قسەبەدەستی. وتی: "من جەنەراڵێکم لە پشتەوەیە، ئەگەر ئەو ڕازی نەبێت ناتوانم". جا وتم ئەگەر تۆ جەنەراڵێکت هەیە، من (رب العالمین)ێکم هەیە. تۆ دیارە دەسەڵاتت نییە، دەسەڵاتت سنووردارە، بە ڕاستی منیش دەسەڵاتم نییە شتێك ئیمزا بکەم پێچەوانەی دینو عەقیدەم بێت، پێچەوانەی دینی میللەتەکەم بێت، لەبەر ئەوە دەچمەوە ژوورەکەی خۆم. ئاوا بەرگی کوردیم لەبەر کردبوو، حازر، وامزانی هیچ مەرجو بەندێکیان نییە، پێشم وت: برادەر! یەك شتت پێ بڵێم، وامزانی عوزرم بۆ دەهێننەوە. وتی: "چۆن؟"، وتم: وامزانی لەبەر ئەوەی دوو ساڵە منتان بە بەلاش گرتووە، خۆتان بیست جار بەمنتان وتووە کە داوای لێبوردنت لێدەکەین، تۆ لە بەلاش گیراوی، بە زوڵم لێرەی، نازانین بۆ لێرەی، کە دەمگوت باشە کە ئێوە نەزانن بۆ لێرەم، من چۆن بزانم؟ دەیانگوت ڕاست دەکەی، بەڵام سەرەوەمان دەزانن. من پێم گوت: "ئەگەر تۆ مەعزووری لەبەر ئەوەی کە لە سەرەوە لایەنێك هەیە، منیش مەعزوورم لەبەر ئەوە کە خوای باڵادەست ڕێگە نادات شتێ ئیمزا بکەم کە پێچەوانەی دینەکەم بێت، لەبەر ئەوە دەچمەوە ژوورەکەی خۆم"، دوایی کە دوێنێ هاتین، زۆر بەڕێزەوە لەگەڵمان هات بۆ سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیران، لێرەوە دەبێ زۆر سوپاسی کاك پوشوو ئیبراهیم دزەیی بکەم کە ئەو لەوێ پێشوازیی لێکردمو لە ماڵەوە دەعوەتی کردم و ڕێزی گرتم، زۆر سوپاسی دەکەم، لە کاتی خواحافیزیدا کۆلۆنێلەکە وتی: "فلان کەس؟"، وتم: بەڵێ، وتی: "تۆ ئینسانێکی بەڕێزی، من یەك قسەم هەیە، تۆ ئازادی"، وتم: بەڵێ، وتی: "هیوادارم دەنگوباسی باشت ببیستم، هیوادارم لە ڕۆژنامەکاندا کردەوەی باشی تۆ بخوێنمەوە". وتم: "سوپاسی هەستی دڵسۆزانەت دەکەم، با منیش قسەی خۆمت پێ بڵێم، پێش ئەوەی بڕۆین"، وتی: "بەڵێ"، وتم: "منیش ئەو کردەوە باشانەی کە پێش سجنم لە سەریان بووم، کە دەچمەوە، زیاتر پەرەیان پێدەدەم، خوا پشتیوان بێت، وتم شاهیدیشم لەسەر ئەوەی کە ئێمە کردەوەی باشمان بووە لە ناو میللەتی خۆماندا ئەوەیە کە خۆپیشاندان کراوە لە شارەکان، پەنجا هەزاریو سی هەزاری، ئیمزا کۆکراوەتەوە، پاشان هەڵبژاردن کراوە، هەرچەندە من لەوێ نەبووم، لەوانەیە خەڵکێك حەزەری کردبێت کە کۆمەڵی ئیسلامیی ڕەنگە قاچاغ بێت، ڕەنگە ئەگەر دەنگ بدەین بە کۆمەڵی ئیسلامیی،

تووشـی گێروگرفت ببین، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا کۆمەڵی ئیسلامیی شەش ئەندامی لە پەرلەمانـی کوردسـتاندا هەیەو دوو ئەندامیش لە ئەنجومەنی نیشتیمانیی بەغدا، کەواتە ئـەوەش باشترین شاهیدو بەڵگەیە کە ئێمە کردەوەی باشمان هەبووە پێش سجن، بۆیە خـەڵك دەنگی بۆ داوین، بۆیە لـە نێو جەماوەری خۆماندابن. وتی: "ڕاستە، من ڕێزی خۆم دووبارە دەکەمەوە".

جـا بـرایانو خوشـکانو دایکـان، گەنجـە خوێـنگەرمەکان، خوشـکە بەشـەرمەکان، دایکـە دڵنەرمەکان، باوکـە بەڕێـزەکان، مامۆسـتاو زانـا دڵسـۆزەکان، هەمـوولایەك، من جارێکـی تـر سوپاسـی خۆمو سوپاسی هەموو برایان لە قیادەی کۆمەڵی ئیسلامیی، لە بـنکەو بارەگاکـان بـۆ هەمـوو لایەکـتان دووبـارە دەکەمـەوە، بـۆ هەرکەسـێك کـە بـە دوعایەکـی خێـر بـووە، ئەگـەر بـە فرمێسکڕشـتنێکە، بـە هـەر شـێوەیەك بـووە، بـە خۆپیشـاندانێك بـووە، بەو هەموو نارەحەتیو ئەزیەتەی ئێستاتان بووە، کە زۆر خۆتان ئەزیـەت دا، بـە ڕاسـتی منـتان قـەرزداری خۆتان کرد، من ترسام لەوەی یەکێك لاقێکی بشـکێ، خوانەخواسـتە لە ژێر پێیاندا تووشی نارەحەتی ببێ، ئەمن ئەو کاتە شەرمەزار دەبـووم، زۆر سوپاسـی هەمـوو لایەکـتان دەکـەین، مـن لـە کۆتایـیدا ئامۆژگارییەکـی بـرایانەو دڵسـۆزانەم هەیـە، ئـەویش ئەوەیـە دینـی خـوای پـەروەردگار وەکـو چـۆن حەماسـەتو دڵگەرمـیو دڵسـۆزیی پێویسـتە، هێـندەش عـەقڵو لێـزانینو حیکمەتـی پێویسـتە، هـاوەڵان خـوایان لـێ ڕازی بێت وەکو چۆن دڵسۆز بوون، بە حەماسەتو بە شـەجاعەت بوون، حەکیمو لێزانیش بوون، با ئێمەش وابین، ئێمەش بە دوای ڕێوشوێنی هاوەڵـە بەڕێزەکانـی پێغەمـبەرﷺ بکـەوین، دوای ڕێوشوێنی زاناو پێشەوایانمان بکەوین کە هەم دڵگەرمو ئازاو بە حەماسەت بوون، هەم بە حیکمەت و لێزانیش بوون.

وصلّی الله علی محمد وآله وصحبه أجمعین. والحمدلله رب العالمین.

**چیمەن**

**٢٠٠٥/٤/٢٩**

١١٧

**FAMILY NEWS ONLY**

اخبار عائلية فقط

مراجعة

بسم الله الرحمن الرحيم

زوجتي العزيزة شكرية

السلام عليكم ورحمة الله

الملابس التي أرسلتموها لي وصلتني وأفرحتني جداً إذ لم تكن عندي إلا ملابس رقيقة والجو بارد.

بعد السلام والتحية لك وللأولاد ولجميع الأقارب والأصدقاء بالأخص والدي المحترم، أدعو الله تعالى لكم التوفيق والنجاح في أمور الدنيا والفوز والفلاح في الأخرى.

وأنا والحمد لله بخير وصحة وعافية همي الوحيد بعدي عنكم وعن الأقرباء والأصدقاء وهذا أيضاً سهل بإذن الله إذ نتوقع أن إطلاق سراحنا بات وشيكاً.

وقد أرسلت رسالة بتاريخ ٢٠٠٤/٢/١٠ في جواب رسالة شقيقي عبدالوهاب وكتبت له أن رسائلكم الثلاث التي وصلتني في (٢/١٠) والتي كتبت في (٧/٢١) هي الرسائل الوحيدة التي وصلتني وهذه هي المرة الأولى أستلم فيها جواب رسالة من رسائلي.

والسلام

Date ٢٠٠٤/ ٢ /١٧ التاريخ

Signature ........ التوقيع

The Addressee is my الزوجة صلة قرابة المرسل اليه

نامەی ڕۆژی ٢٠٠٤/٢/١٧ی مامۆستا عەلی باپیر بۆ شوکریەخانی هاوسەری

## نامەی ڕۆژی ٢٠٠٤/٢/١٧ی مامۆستا عەلی باپیر بۆ شوکریەخانی هاوسەری

**بسم الله الرحمن الرحيم**

زوجتي العزيزة شكرية

السلام عليكم ورحمة الله

بعد السلام والتحية لك وللأولاد ولجميع الأقارب والأصدقاء بالأخص والدي المحترم، أسأل الله تعالى لكم التوفيق والنجاح في أمور الدنيا والفوز والفلاح في الأخرى.

وأنا والحمدلله بخير وصحة وعافية غمّي الوحيد بُعدي عنكم وعن الأقرباء والأصدقاء وهذا أيضاً سهل بإذن الله إذ نتوقع أن إطلاق سراحنا بات وشيكاً.

وقد أرسلت رسالة بتأريخ ٢٠٠٤/٢/١٠ في جواب رسالة شقيقي عبدالواحد وكتبت له أن رسائلكم الثلاث التي وصلتني في (٢/١٠) والتي كتبت في (١/٢١) هي الرسائل الوحيدة التي وصلتني وهذه هي المرة الأولى أستلم فيها جواب رسالة من رسائلي.

**والسلام**

**٢٠٠٤/٢/١٧**

**ملاحظة:**

الملابس التي أرسلتموها لي وصلتني وأفادتني جداً إذ لم تكن عندي إلا بيجامة رقيقة والجو بارد.

## نامەی ڕۆژی ٦/٧/٢٠٠٤ی مامۆستا عەلی باپیر بۆ شوکریەخانی هاوسەری

**بسم الله الرحمن الرحيم**

هاوسەری بەڕێز و خۆشەویستم شوکریەخان

السلام عليكم ورحمة الله

پاش سەلام و ڕێزی زۆرم بۆ خۆت و منداڵەکان و سەرجەم خزم و دۆستان، لە خوای بە بەزەیی داوام وایە هەموو لایەکمان هیدایەت بدات لە هەر کات و شوێن و بارودۆخێکدا بۆ نواندنی هەڵوێستێك و ئەنجامدانی کارێك کە جێگای ڕەزامەندیی خۆیەتی.

هاوسەری بەڕێزم، دەزانم ماوەی ئەو یەك ساڵە کە لێتان دوورم تووشی خەم و پەژارەی زۆر بووی، سەربارەی خەمی دووریی من مشووری ماڵ و خێزانیشت بە تەنها کەوتۆتە ئەستۆ! بەڵام دڵنیابە (إن شاء الله) بۆ قیامەتت پاداشتێکی گەورە و بۆ دونیاشت بە سەربەرزی تەواو دەبێ.

ژیانی دنیاش ئەگەر ئینسان بتوانێ ڕەزامەندیی خوا و پاداشتی دواڕۆژی تێدا مسۆگەر بکات، ئەوە حیکمەتی بوونی خۆی تێدا تەحقیق کردووە. ئەگەرنا با هەر لە خۆشی و ئیسراحەتی رواڵەتیشدا بووبێ، هەر زیانبار و دەسخەڕۆیە.

دیارە خوای کاربەجێش بەندەکانی خۆی لە قەدەر ئیمان و دینیان تاقی دەکاتەوە و هەتا ئیمان چاکتر و دینداریی کامڵتربێ ئیمتیحانەکەشی قورستر دەبێ، وەك پێغەمبەری خوا (صلّى الله عليه وسلّم) فەرموویەتی: (يبتلى الرجل على قدر دينه، فكلّما زيد في الدين زيد له في البلاء). کەواتە: ئەگەر هات تاقیکردنەوەکانمان قورس و نارەحەت بوون، با دڵمان بە خۆمان خۆش بێ و وریا بین نەکەوین، چونکە ئیمتیحانی قورسیش عەزیمەتی لە قەدەر خۆی و خۆئامادەکردنی باشی پێویستە.

وەك پێشتریش بۆم نووسیبوون، چاوەڕێ دەكەم بەم زووانە رزگارم ببێ و هەر چۆنیش بێ (إن شاء الله) خێری تێدایە.

**والسلام**

**٢٠٠٤/٧/٦**

**تێبینی:** شوكریەخان! ئەم هەفتەیە ئەوە سێ نامەمان بۆ بهێنن! جاران هەفتەی بەس نامەیەكمان هەبوو. نامەكانیشم بۆ تۆ و كاك ئەبوبەكری برات و كاك عەبدولواحید نووسیون.

# نامەی ڕۆژی ٢٥/١٠/٢٠٠٤ی مامۆستا عەلی باپیر بۆ کاك موحەممەدی کوڕی و ڕۆڵەکانی تری

**بسم الله الرحمن الرحيم**

ڕۆڵە شیرینەکانم! کاك موحەممەد و سەرجەم خوشك و برایەکانی

السلام عليكم ورحمة الله

پاش سەلام و ڕێزم بۆ خۆتان و دایکتان و سەرجەم خزم و دۆستان، سەربەرزی و سەرفرازیتانم لە خوای بەخشەر داوایە و ئەم نامەیەشم تەواوکەری نامەی پێشوویە و لەسەر ئامۆژگارییەکانم بەردەوام دەبم:

١ـ ئیمان بە خوای بەرز و مەزن بەندایەتی (عبادة) لە ئینساندا پەیدا دەکات و هەرکات ئیمان لە دڵدا ڕسقا و ڕەگی داکوتا، هێندە نابات گوڵ و میوەی خواپەرستی دەردەکات. بۆیە بە ئەندازەی بەندایەتیمان بۆ خوا بە ئیماندار دادەنرێین.

٢ـ نوێژیش گەورەترین جۆری خواپەرستییە و ئەو بەندایەتییەی کە لە نوێژدا بۆ خوا دەدرەوشێتەوە، بە دەگمەن لە ئەرکەکانی دیکەدا دەبینرێ، هەربۆیەش خوای کاربەجێ و بە بەزەیی فەرمانی کردووە بە دووبارەکردنەوەی نوێژ لە شەو و ڕۆژدا چەند جارێك. کەواتە ڕۆڵەکانم هەتا دەتوانن نوێژەکانتان بە ڕێکی بکەن لە ڕووی نێوەرۆك و ڕواڵەت و پابەندی بە کاتی دیاریکراوەوە، ئەگەر دنیا تێکچووە بە سەر یەکدا مەهێڵە نوێژێکتان بچێ و بە خشوع و ملکەچی و ئارامی و پاکی و ڕێکی لە خزمەت خوادا بوەستن، نوێژەکانتان بکەن و بیریش لە مانای شتەکان بکەنەوە و بزانن چۆن چۆنی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا دەدوێن و چی دەڵێن!

٣ـ جا هەرکات نوێژی ڕاستەقینەتان بۆ خوا کرد، سەرەڕای ئۆخژن و ئارامیی دڵ و دەروون و پشت قایمبوون بە خوا (جلّ جلاله)، پارێزراویش دەبن لە هەرچی مایەی گوناهباریی لای خوا و عەیبداریی لای خەڵکی بێت، چونکە خوای پەنهانبین فەرموویەتی: (اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ) (العنكبوت: ٤٥). کەواتە: پێوەر و تەرازووی نوێژی ڕاستەقینە و هی ڕواڵەتی ئەوەیە کە سەرنج بدەن تا چ ڕاددەیەك لە

هەموو ئەو قسە و کردار و رەفتارانە دوورن کە مایەی گوناهباریی و عەیبدارییەن، چونکە خوا فەرموویەتی: نوێژ ئینسان قەدەغە دەکات لە هەرچییەك کە ناشیرین و خراپە! مانای وایە ئینسان بە ئەندازەی دووریی لە خراپە نوێژەکەی قبووڵە و بە نوێژی راستەقینە بۆی لە قەڵەم دراوە.

٤ـ بەڵام بێگومان تەنها دووریی لە خراپە (کافي) نییە و خواپەرستی بە راستی، خەڵکدۆستیش دەبێ، هەروەك بە پێچەوانەوە بابای دوورلەخوا بۆ خەڵکیش بێوەفایە و بە کەڵکی هیچ نایەت، دیارە پێش هەموو کەسیش خزمان و نیزیکان و دایك و بابیش لە پێش وان و هەقی دایکیش لە هی باب زیاتر و گەورەتر و چەند بەرانبەرترە.

**والسلام**

**٢٠٠٤/١٠/٢٥**

## نامەی رۆژی ٣١/١٢/٢٠٠٤ی مامۆستا عەلی باپیر بۆ شوکریەخانی هاوسەری

### بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله العزيز الرحيم، والصلاة والسلام على نبيه المبعوث للإنس والجن.

زوجتي العزيزة أم شفاء

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بعد السلام والتحيات، أسأل المولى جلّ شأنه أن يديم لكم التوفيق والعناية ويزيدكم تقوىً وهداية.

سبب كتابتي لهذه الرسالة بالعربية هو أن ادارة السجن أبلغوني عدم وجود مترجم كردي في الوقت الراهن لترجمة رسائلي قبل أن يبعثوها لكم عن طريق الصليب الاحمر. وربما لنفس السبب لم يسلموني رسائلكم التي جاء بها الصليب، حيث لم أتسلم رسائلكم منذ الشهر التاسع، وآخر رسالة وصلتني منكم كانت بتأريخ (٢٣/٩)!

على أي حال أنا اسبوعيا كتبت واكتب لكم رسالة ولا أدري هل مصير رسائلي اليكم هو نفس مصير رسائلكم اليّ أم لا؟

وإذا وصلتكم هذه الرسالة او غيرها اكتبوا لي بشأن رسائلي لانني كتبت لكم مجموعة رسائل ضمنتها نصائح مهمة للاولاد.

وبالنسبة لوضعي فهو بخير والحمدلله ولا احتاج سوى المزيد من رحمة الله ولطفه وفضله، وانا والحمدلله منشغل من الشعور بضيق السجن وحرّه وبرده بتلاوة كتاب الله المبارك والتدبر فيه -فأنا الان في ختمة (١٢٠)- وبالصيام المتواصل واحيانا بالكتابة والمطالعة وبنصح رفقائي وتدريسهم وتعليمهم.

وقصدي من ذكر هذه الاشياء أن تطمئنوا على صحتي ولا تغتموا بسبب بقائي هنا، اذ لولا انني صحيح سالم قوي لما كان بوسعي القيام بما أقوم به.

وبالنسـبة للعـيد أنصحك أن تكوني قوية وأن تعطي للاولاد بدلاً عني هدية العيد بقلب مطمـئن ووجه مستبشر وألاّ تظهري الضعف امام الاولاد أو امام النـاس، والله متـى اذن الله العزيز الحكيم بخروجي يرغم انوف العبيد على مايريده هو سبحانه.

**والسلام**

**٢٠٠٤/١٢/٣١**



مامۆستا عەبدوڵڵای قەصری، کە ڕۆژی ٢٠٠٢/٢/٤ لە بارگەی تاسڵوجە تیرۆر کرا



تەرمی مامۆستا عەبدوڵڵای قەصری، مەڵبەندی سلێمانیی کۆمەڵ، ٥/٢/٢٠٠٢



مامۆستا عەبدوڵڵای قەصری پاش کفنکردنی، مزگەوتی جیهاد، شەوی ١٤/٥/٢/٢٠٠٢



گەشتی ڕۆژنامەنووسانی بیانی بۆ ناوچەی ئەحمەدئاوا و خورماڵ، ٢٠٠٢/٢/٨



مامۆستا عەلی باپیر لەگەڵ ڕۆژنامەنووسانی بیانی، ئەحمەدئاوا ٢٠٠٢/٢/٨



دیمەنێکی بارەگایەکی کۆمەڵ دوای مووشەکبارانکردنی، ئەحمەدئاوا ٢٠٠٣/٣/٢١



شەهیدێکی مووشەکبارانکردنەکەی بارەگاکانی کۆمەڵ، ئەحمەدئاوا ٢٠٠٣/٣/٢١



گواستنەوەی بارەگاکانی کۆمەڵ بۆ ناوچەی دارەشمانە، ٢٧/٢/٢٠٠٢



مامۆستا عەلی باپیر لە ژێر خێمەدا لە دارەشمانە، ماوەیەک بەر لە دەستگیرکرانی



بیل ستیوارت، مامۆستا عەلی باپیر، باڵیۆز ولیام ئیگلتن، ٢٠٠٢/٦/٢٢




خۆپیشاندانی جەماوەری شاری هەولێر، ٢٠٠٢/٧/٢١



خۆپیشاندانی جەماوەری شاری هەولێر، ٢١/٧/٢٠٠٢




خۆپیشاندانی جەماوەری شاری سلێمانی، ٢/٨/٢٠٠٢



خۆپیشاندانی جەماوەری شاری سلێمانی، ٢/٨/٢٠٠٢




خۆپیشاندانی رەهەندی کورد لە شاری لەندەن، ٧/٨/٢٠٠٢

گۆنگرەی پشتیوانیی لە ئازادبوونی مامۆستا عەلی باپیر، سلێمانی ٢٠٠٤/٧/١٢

## بەناوی خودای گەورەومیهرەبان

سالێك بەر لە ئێستا ، رۆژی (٢٠٠٣/٧/١٠) بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوە دەستگیرکرو لەو رۆژەوە تا ئەمرۆ نا ئازاد کراوە ئەو هۆکاری بەندکردنەکەی راگەیەنراوە نە رێگەدراوە کەکەسوکارو هاورێیان سەردانی بکەن. مامۆستا عەلی باپیر وێڕای ئەوەی سەرکردەیەکی خەباتکارو سیاسەتمەدارو تێکۆشەرێکی گەلەکەمانە، رۆشنبیرو قەڵەم بەدەستێکی بەتواناو کارامەیەو دۆستی نزیکی نووسەران و رۆژنامەنووسان و رۆشنبیرانە و تا ئێستا زیاتر لە (٤٠) کتێبی چاپکراوی هەیە.

بۆیە ئێمە، ئەوانەی لەخوارەوە ناو ئیمزامان هاتووە وەکو بەشێك لە نووسەران و رۆشنبیرانە و رۆژنامەنووسانی گەلی کورد گرتنی کەسایەتییەکی لەو شێوەیە ئیدانە دەکەین و داوای دەستبەجێ ئازادکردنی لەهاوپەیمانان و حکومەتی کاتی عێراقی دەکەین

| ژ | ناوی سیانی و نازناو | پیشە | واژوو (ئیمزا) |
|---|---|---|---|
| ١ | ئاسۆ عبداللطیف | رۆژنامەنووس | |
| ٢ | دیدار عزیز | // | |
| ٣ | داود کریم | // | |
| ٤ | محمد کریم | جێگری [illegible] | |
| ٥ | عبدول [illegible] | رۆژنامەنووس [illegible] | |
| ٦ | کاوە انور قادر | // ([illegible]) | |
| ٧ | دانا شاسوار رضا | رۆژنامەنووس / [illegible] | |
| ٨ | فاروق جمیل کریم | سەرنووسەری [illegible] | |
| ٩ | جوان اسعد | [illegible] | |

بەشێك لە ئیمزای رۆژنامەنووسان لە میانەی هەڵمەتی ئیمزاکۆکردنەوەدا.



مامۆستا عەلی باپیر بۆ هاوژین عومەر دەدوێت، هەولێر ١٢/٦/٢٠٠٥



مامۆستا عەلی باپیر، هاوژین عومەر، عومەر عەبدوڵلا گولپی، هەولێر ١٢/٦/٢٠٠٥



ماموستا عەلی باپیر و وەفدێکی سەرکردایەتیی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەسەر بانگهێشتی سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان سەردانی سەرکردایەتی یەکێتییان کردووە، بە مەبەستی توندوتۆڵکردنی پەیوەندیی نێوان حزبە کوردستانییەکان و هاریکاریکردنی یەکتر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ڕژێمی بەعس.

دەرکەوتووان لە لای ڕاستەوە:

١- ماموستا حەسەن بابەکر. ٢- دکتۆر فوئاد مەعسوم. ٣- ماموستا عەلی باپیر. ٤- مام جەلال تاڵەبانی.

٥- ماموستا مەلا مەحمودی ئازادی. ٦- ماموستا مەلا سەلمان. ٧- ماموستا مەلا ڕەسوڵی زەنگڵی.

قاسمەڕەش - ١٩٨٩

## دەقی فەتوای مامۆستا عەلی باپیر بۆ کوشتنی عومەری برای،
## ٢٨/رەمەزان/١٤٠٩ کۆچی

بەروار: ٢٨/ رەمەزان/١٤٠٩

ژمارە: ٨٩٥

ب: کوشتنی تاوانبار

**بسم الله الرحمن الرحيم**

الحمدلله والصلاة والسلام على محمد رسول الله وآله وصحبه ومن اهتدى بهداه.

(وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَاْ أُولِيْ الأَلْبَابِ..) (البقرة: ١٧٩)

برایانی بەشی ڕێکخستنی نێوەوە

السلام عليكم ورحمة الله

پاش سەلام و ڕێز و هەواڵپرسین.

ئاگادارتـان دەکەمـەوە کـەوا ئـێمە هەواڵێکمان دەربارەی (عمر باپیر) بیستووە، جا لەگـەڵ هەڵگرانی نامەدا لێی بکۆڵنەوە و هەر کاتێك گەیشتنە قەناعەتی تەواو و بەڵگەی شـەرعیتان دەست کەوت لەسەر ڕاستی هەواڵی ناوبراو، ئەوە فەرمانتان پێ دەکەین کە بـە زووتـرین کات کابرای ناوبراو بەرەو دۆزەخی بەڕێ بکەن، هەڵگرانی نامە دەتوانن بۆ خۆیان بیکەن یان هەر کەسێك بیانەوێ ڕای سپێرن و کارەکەی عاید بکەن.

ئیشـەڵڵا پاداشـتی هـەر کەسـێك کـە لـەو بارەیـەوە هاوکـاری دەکـات لـە لای خـوا پارێزراوە.

**براتان**

**عەلی باپیر**

**٢٨/رەمەزان/١٤٠٩**

**تێبینی:**

١ــ سـەبارەت بـە شەخسـی ناوبـراو ئەگـەر گریمان ئـەو هەواڵـەش بەڵگـەی شەرعی لەسـەر نەبـوو، بـەڵام ئیسپات بوو –بە بەڵگەی شەرعی– کە سەر بە دائیرەی ئەمن یان (استخبارات)ـە، ئەوە لە لایەن منەوە فەتوا هەیە لەسەر کوشتنی.

٢ـ هەڵبەتە ئەم حوکمەش تایبەت نییە بەس بەویەوە، بەڵکو هەموو کەس دەگرێتەوە کە سیفەتی ناوبراوی تێدا هەبێ، بەڵام ئەمن لە خۆمەوە دەست پێ دەکەم.

٣ـ بە پێی یاسای (ما من عام إلاّ وقد خصّص) چەند حاڵەتێکی تایبەتیش لەم حوکمەی سەرێ هەڵداوێررێن و (إستثنا) دەکرێن.

**ئیمزا**

**عەلی باپیر**

**٢٨/ڕەمەزان/١٤٠٩**






کە مامۆستا عەبدوڵڵامان شەهید بوو، چل و سێ کەسمان بە مووشەکباران شەهید بوون، من زیندانیی کرام، هەندێك کەس، لە خەڵکی خۆمان و غەیری خۆمان، وا تەصەور دەکەن کە دەبێ فڵان کەس بە تەمای چی بێت و چۆن بیر لە تۆڵە و ئەوانە بکاتەوە؟

من بە یەك دێڕ دەڵێم: ئێمە تۆڵەی خۆمان لەوەدا دەبینینەوە کە ئەو ئامانجەی هەمانە، بێتەدی، ئامانجیشمان بریتییە لە بەختەوەرکردنی خەڵك لە دونیا و دوارۆژدا، بۆ ئەوەی لە سایەی شەریعەتی خوادا بژین، بە پێی دینەکەی خۆیان بەڕێوە بچن، ئەوە مانای وایە ئامانجی منێکی ئیسلامیی و مسوڵمان هاتۆتە دی. ئەمما وەڵڵا فڵان کەس وابوو بکوژرێ، ئەوە وا کرا و غەدر کرا، ئەوانە شتی بچووکن، ئێمە رقی شەخصیمان لەگەڵ هیچ کەسێك نییە، ئەوەش کە زوڵممان لێدەکات، دەڵێین خوایە هیدایەتی بدەی کە جارێکی دی زوڵم نەکات تا گوناهبار نەبێ، ئەوەش کە خوێنی بە ناهەق دەڕێژێ، دەڵێین خوایە هیدایەتی بدەی خوێنی بە ناهەق نەڕێژێ.

بەڕاستی ئامانجی ئیسلام بریتییە لە زیندووکردنەوەی خەڵك نەك مراندنیان.

**مامۆستا عەلی باپیر**